# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

## بەرگی بیست و یەکەم

سوورەتەکانی

(الرّوم) و (لقمان) و (السّجدة)



عەلی باپیر

## تەفسیری سوورەتەکانی

# الرّوم و لقمان و السجدة

نووسینی : عەلی باپیر

دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

چاپی یەکەم ١٤٤٣ك - ٢٠٢١ز

٤٨٣ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للَّـهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إلَـهَ إلاّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمران.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ النساء.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب .

أَمَّا بَعْدُ: فإنَّ أَصْدَقَ الحَديث كَلاَمُ اللَّه، وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار[1].

**خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!**

هیچ گومانی تێدانییە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرین و ڕامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێ و، خاوەنەکەی لە دنیاو دوارۆژدا لێی بەهرەمەندە.

---

(١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد، پێش هەر قسەیەکی گرنگ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و... هتدو، ئەم وتارە، هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، النسائي: (١١٠٤)، ابن ماجه: (١٨٩٢) أحمد: (٣٧٢٠)، الطّبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (**التحدّث بنعمة اللّه**) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردوومو، بەر لە تەمەنی بیست ساڵیی یەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەرێزو پێز لەبەر بکەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان و تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو، کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم و خۆمی بۆ یەکلایی (**متفرّغ**) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون و، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (**القرآن يُفَسِّر بَعضُهُ بَعْضَاً**)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (**مُبَيِّن**)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: هەروەها زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزن و تەفسیرەکانی و کتێبەکانی سوننەتدا خەریکم و، دەیان کتێب و بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیست و دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالى) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانی یەوە، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلّى في كتاب اللّه تعالى**)دا زۆر چاك درەوشاوەتەوە[١]، بەڵام هەڵبەتە ناڵێم و هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنووردارbوونی تواناو بڕستم، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕووێکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە کە زۆر بەملاولادا بچم و بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو

---

(١) ئەو مەوسووعەیە کە ئێستا چاپ کراوەو، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەران و، سەرجەم هەشت بەرگ و دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەم و، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوونەت، کە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

شــارەزا نیم، یـان خوێنــەر پێویســتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیــەوێ لـە قوڕئان تێبگات و، بزانـێ خـوا (تبـارك وتعــالـی) ڕاسـتەوخۆ چـی پـێ فــەرمووە؟!

ئنجـا هــەر لێرەشـەوە بە پێویستـی دەزانم پڕ بە دڵ سـوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح ســووك و گـورج و گـۆڵ و دڵسـۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسـینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگیــریی، ســەرجـەم ئـەم زنجیــرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هــەروەها هـەڵسـا بـە (تخریج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەوە کێشـــاوە، خـــوا بـە باشـتـرین شــێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هــەر صـالح و سـاغ و سـەلامەت و ســەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسیــرەماندا، بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قوڕئـان و دابەشـکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حـزب) - ناکەیـن، چونکـە هــەر ســووڕەتێك بۆخـــۆی شـــتێکی ســەربەخۆیـــەو، ســەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قوڕئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قوڕئـــان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیرەشـدا، دیسـان حیســـاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســووڕەتەکان، بەرگــەکانی دیــاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بــرا دڵسـۆزە ئێســتاش پاش تەواوکردنـی زۆربـەی قوڕئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشــی جــەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمـــان بەردەوام بێ، هەتــا کۆتــایی ئەم تەفسیــرە ســەرگەرمی کارەکـەی بێ .

دوا قسـەشـم ئەوەیـە کە:

ئـەم تەفسـیرە - وەك پێشـتـر گوتمـان - لـە ئەسـڵدا بەشـێوەی دەرس و وتـار پێشـکەش کـراوە، بـەڵام دواتـر خـۆم دووجـار بـە وردیـی پێیدا چوومـەوەو، بەپێـی پێویسـت دەسـتکارییم کـردوە، دیـارە هـەموو دەرسـێکیش بەنـاوی خـواو سـتایشی خـوا ﷻ دەسـتی پێکـردوە، بـەڵام ئێمـە لـە سـەرەتای دەرسـەکانەوە، ئەوانەمـان لابـردوە، بـۆ زۆر دووبـارە نەبوونـەوەو، ئـەو (خطبـة الحاجـة)یەی لـە سـەرەتای ئـەم پێشـەکەییەوە هاتـوە، لەجیـاتی سـەرەتای سـەرجەم دەرسـەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هـەولـێر

## بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بەڕێز نووسیون، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو برگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنین، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتیی خۆمم، دەربارەی کۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو برگەیەکی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی

دیکەش - یەکێکیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

# پێشەكی ئەم بەرگە

**الحمدلله كما ينبغي لجلال وجهه وعظيم سلطانه والصلاة والسلام على نبيه محمد أعظم رُسُله وخاتم أنبيائه وأوضح برهانه، وآله المهتدين به، من الصحب والقرابة والأزواج والتابعين لهم بإحسان.**

خوێنەری بەڕێز و خۆشەویستم:

ستایشی شایستە بۆ خوای میهرەبان بە یارمەتیی و ئاسانكاریی تایبەتیی خۆی و، هەوڵ و هیممەتی دڵسۆزان، توانیمان ئەم بەرگی بیست و یەكەم (٢١)ەش لە تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز ئامادە بكەین.

ئەم بەرگەش سێ سوورەتی: (**الروم و لقمان و السجدة**) دەگرێتە خۆی و، وێڕای تەفسیركردنی سەرجەم ئایەتە بەپێزەكانی ئەم سێ سوورەتە بەپێزە، بە حەوت قۆناغ - وەك بەرنامەمان لەكۆی ئەم تەفسیرەدا -، كۆمەڵێك كورتە باسی گرنگییشی گرتوونە خۆی، كە گرنگترینیان ئەمانەن:

## یەكەم لە سوورەتی (الروم) دا:

١- كورتەباسێك: هەشت كورتە سەرنجی گرنگ / ٤٥-٤٩.

٢- كورتەباسێك: دەربارەی بیست وردەكاریی جەستەی مرۆڤ../٩٥-١٠٦.

٣- قسەیەكی نەستەقی غەززالیی / ١١٢-١١٥.

٤- كورتەباسێك: چوار هەڵوەستە لەبەردەم ئایەتەكانی : ٣٠-٣٢ دا / ١٤٠-١٤٤.

## دووەم : لە سوورەتی (لقمان) دا:

١- كورتەباسێك: لەبارەی چەمك و واتای (**لهو الحديث**)ەوە / ٢٤٤-٢٥٤.

٢- پێنج كورتە سەرنج / ٢٦٢-٢٦٥.

٣- کورتەباسێك لە بارەی لوقمان و حیکمەتەکەیەوە / ٣٠٤-٣١٣.

٤- شەش سەرنج لەسەر ئایەتی ژمارە: ٢٧ / ٣٤١-٣٤٦.

٥- حەوت سەرنج لەسەر ئایەتی ژمارە: ٣٤ / ٣٧٤-٣٧٩.

**سێیەم: لە سوورەتی (السجدة) دا:**

١- ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی (ثم استوى على العرش)ەوە / ٤١١-٤١٣.

٢- ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی (ثم یعرج إلیه في یوم كان مقداره ألف سنة مما تعدون)ەوە، / ٤١٥-٤١٦.

٣- پرسیارێك و وەڵامەکەی / ٤٢٦-٤٢٩.

٤- مامەڵەی ڕاست و دروست لەگەڵ قوڕئان دا / ٤٥٠-٤٥٢.

هواداریشم تۆی بەڕێزیش بە جیددیی و دەستگەرمیی و قووڵیی، ئەم بەرگە و بەرگەکانی دیکەش موتاڵا بکەی و بەهرەیان لێوەربگری و بە سەرنج و تێبینییەکانیشت دەوڵەمەندمان بکەی.

والسلام علینا وعلى عباد الله الصالحین

٤١ / رمضان / ٢٤٤١ك

٧٢ / ٤ / ١٢٠٢ز

هەولێر

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

خـــوا پشـــتیوان بـێ، ئەمڕۆکـە: (٣٠)ی شـــەووالی (١٤٤٠)ی کۆچییـە، بەرانبـەر: (٢٠١٩/٧/٣٠)ی زایینـی، دەسـت دەکەیـن، بـە تەفسـیر کردنـی سـوورەتی (الـروم).

## پێناسەی سووڕەتی (الروم)و بابەتەکانی

### ١)- ناوی ئەم سووڕەتە:

ئـەم سـوورەتە لـە ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ و هاوەڵانیشـیدا، هـەر بـە سـوورەتی (الـروم) ناسـراوەو، (السـيوطي)یش ئـەم دەقـەی هێنـاوە: {**عَـنْ عَبْـدِ اللَّـهِ بْـنِ عَبَّـاسٍ رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْهُمَـا، قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَةَ الـرُّوم بِمَكَّـة، وَعَـنِ ابْـنِ الزُّبيـر مَثْلِـهِ**}[1].

### ٢)- ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنەخواردا:

لـە ڕیزبەندیـی دابەزیـن (**ترتيـب النـزول**)دا، ئـەم سـوورەتە ژمـارە هەشـتاو چـوار (٨٤)ە، هەڵبەتـە هەندێکیـش گوتوویانـە: هەشـتاو پێنـج (٨٥)ە، لـە (**الإتقـان فِـي علـوم القـرآن**)ی (**الحافـظ جـلال الدِّيـن السـيوطي**)دا، هەشـتاو پێنـج (٨٥)ی بـۆ دانـراوە، بـەڵام زۆربەیـان دەڵێـن: هەشـتاو چـوارە.

---

(١ ) الـدر المنثـور (٤٧٨/٦) ونسـبه لابـن الضريـس والنحـاس وابـن مردويـه والبيهقـي في (الدلائـل)، الإسـتيعاب في بيـان الأسـباب، ج٣، ص٥٠ .

هەڵبەتـە هەشـتاو چـوارو، هەشـتاو پێنـج و، هەشـتاو شـەش، ئـەو ژمارانـە ناگونجێ بڵێیـن زۆر جێـی دڵنیاییـن و، هیـچ مشـتومڕیان لەسـەر نیـە، ئـەم سـوورەتە لـە دوای سـوورەتی (**الإنشـقاق**)ەو، پێـش سـوورەتی (**العنكبـوت**) دابەزیـوەو، لـە ڕیزبەندیـی (**مصحف**)یشـدا، ژمـارە سـی (٣٠)یـە، واتـە: بیسـت و نـۆ (٢٩) سـوورەتی دیکـە، لـە پێـش ئـەم سـوورەتەوە هـەن، لـە سـوورەتی (**الفاتحـة**)وە، تاکـو (**العنكبـوت**) کـە ژمـارە (٢٩) بوو.

### ٣)- شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە مەککەییـەو، (**القرطبـي**) گوتوویەتـی: (**سُـوَرَةُ الـرُّومِ مَكِيّـةٌ كُلُّهَـا مِـنْ غَيْـرِ خِلَافٍ وَهـيَ سِـتُّونَ آيَـة**)[1]، واتـە: سـوورەتی (الـروم) هەمـووی مەککەییـە، بەبێ ئـەوەی ڕاجیایـی تێدابێ، ژمـارەی ئایەتەکانیشـی شەسـت (٦٠)ە.

### ٤)- ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمـارەی ئایەتەکانـی ئـەم سـوورەتە، بـە لای زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـانەوە، شەسـت (٦٠)ە ، هەندێکیشـیان گـوتوویانە: پەنجـاو نـۆ (٥٩)یـە.

### ٥)- نێوەڕۆکی:

نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتەش، هەمـان نێوەڕۆکـی سـوورەتە مەککەییەکانـەو، بـە تایبـەت هـەردوو ئەصڵـی گـەورەو سـەرەکیی ئیمـان:

أ- خواناسیی و خوا بە یەکگرتن و، بەڵگەو نیشانەکانی یەکتایی خوا.

ب- ڕۆژی دوایی بە تایبەت ئاخیر زەمان (**ساعة**)، هەروەها باسی چەند ڕاستییەکی دیکەش نێواخنی ئەو دوو بابەتە گەورەو گرنگە کراون.

---

(١ ) الجامع لأحكام القرآن: ج٣، ص١٤ ، و (الإستيعاب في بيان الأسباب)، ج٣، ص٥٠ .

## ٦)- تایبەتمەندییەکانی:

ئێمە حەوت (٧) تایبەتمەندییمان لەم سووڕەتە موبارەکەدا کەوتوونە بەرچاو:

**تایبەتمەندیی یەکەم:** وشەی (**الروم**)، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە لە هەموو قورئاندا، واتە: جارێکی دیکە دووبارە نەبۆتەوە.

**تایبەتمەندیی دووەم:** ئەم سووڕەتە لە قەدەر قەبارەی خۆی زۆرترین نیشانەکانی خواو چاکەو نیعمەتەکانی بۆ بەشەری تێدا خراونە ڕوو، کە زیاتر لە بیست و پێنج (٢٥) ئایەت، لەو شەست ئایەتەی بۆ تەرخانکراون.

**تایبەتمەندیی سێیەم:** لەم سووڕەتەدا دەوری هەژدە (١٨) ئایەت، بۆ باسی ڕۆژی دوایی تەرخانکراون، کە پێشتریش گوتمان: دوو تەوەری بنەڕەتیی و سەرەکیی ئەم سووڕەتە: باسی خوا بە یەکگرتن و خواناسیی و چاکەو نیعمەتەکانی خواو، بەڵگەکانی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی خوا، لەگەڵ ڕۆژی دوایی دا، لەوێ هەژدەو، لەوێ بیست و پێنج ، ئەوە چل و سێ ئایەت لە شەست ئایەت.

**تایبەتمەندیی چوارەم:** یەکەمین سووڕەتی مەککەییە کە باسی سوود خۆریی (**ربا**)ی تێدا کراوە، بە سەرزەنشتکردنەوە، لە ئایەتی ژمارە: (٣٩)دا: ﴿ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَاْ فِىٓ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرْبُواْ عِندَ ٱللَّهِ ﴿٣٩﴾ ﴾.

**تایبەتمەندیی پێنجەم:** تاکە سووڕەتێکە کە باسی بارودۆخی سیاسیی و نێو دەوڵەتیی ڕۆژگاری پێغەمبەری ﷺ تێدا کرابێ، کە شەڕی نێوان دوو زلهێزی ئەو کاتەی فارس و ڕۆمە، کە سەرەتای سووڕەتەکە، بەوە دەست پێ دەکات.

**تایبەتمەندیی شەشەم:** تەنیا لەم سووڕەتەدا (**فطرة**) و (**دین**) وەك دوو ڕووی ڕاستییەك خراونە ڕوو، کە لە ئایەتی ژمارە: سێ (٣)دا هاتوە.

**تایبەتمەندیی حەوتەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی ڕاستکردنەوەی ئەوانەی زانیاریی وئیمانیان پێدراوە: ﴿ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ﴾، کراوە لە ڕۆژی قیامەتدا، بۆ کافرەکان، لە بارەی ئەندازەی ماوەی مانەوەیان لە ژیانی دنیاو بەرزەخدا، لە ئایەتەکانی: (٥٥ - ٥٦)، واتە: تەنها لێرەدا باسی ئەوە کراوە کە ئەو زانایانەی کە بڕوادارن، هەڵەی کافرەکان ڕاست دەکەنەوە، کە ئەوان پێیان وایە سەعاتێك ماونەوە لە دنیادا، یاخود لە دنیاو قۆناغی بەرزەخدا، بەڵام ئەوان بۆیان ڕاست دەکەنەوە، کە نەخێر هەتا ڕۆژی زیندوو کرانەوە، ماونەوەو، ئەمڕۆش ڕۆژی زیندوو کرانەوەیە.

## ٧)- دابەشکردنی ئەم سوورەتە بۆ چەند دەرسێك:

**دەرسی یەکەم:** لە ئایەتەکانی: (١ - ١٠)، واتە: دە (١٠) ئایەت پێك دێ و وەك پێشەکیی وایە بۆ ئایەتەکانی دیکە، کە دوایی دێن، واتە: ئەم ئایەتانە، دەتوانین بڵێین: پوختەو خوڵاسەی ئەوەیە کە دوایی لە ئایەتەکانی دیکەی سوورەتەکەدا دێ.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانی: (١١ - ٢٧)، واتە: حەڤدە (١٧) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە باسی یەکتایی خواو، نیشانەکانی پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی خواو، باسی نیعمەت و چاکەکانی خوا لە ژیانی مرۆڤدا، دەکەن.

**دەرسی سێیەم:** لە ئایەتەکانی: (٢٨ - ٣٩)، واتە: لە دوازدە (١٢) ئایەت پێك دێ، کە ئەمانیش هەر باسی خوا بە یەکگرتن و باسی زگماکی مرۆڤ، کە لەگەڵ ئایینی تێرو تەواوی خوادا، وەك دوو ڕووی دراوێك وان، یان دوو دیوی ڕاستییەکن، پاشان باسی ئەوە کە خوا ﷻ کاتێك بەندەکانی تووشی خۆشییەك دەکات، دڵخۆش دەبن و، کاتێك ناگوزوورییەکیان دێتە ڕێ، هەڵوێستێکی نەرێنییان دەبێ و، چەند بابەتێکی دیکەی پەیوەست بەو سوورگەیەوە، باسکراون.

**دەرسی چوارەم:** لە ئایەتەکانی: (٤٠ - ٥٣)، واتە: چواردە (١٤) ئایەت پێکدێ، دووبارە باسی یەکتایی خواو، باسی نیشانەکانی خواو، باسی نیعمەتەکانی خوا لە ژیانی مرۆڤدا، دەکات.

**دەرسی پێنجەم:** لە ئایەتەکانی: (٥٤ - ٦٠)، واتە: حەوت (٧) ئایەت پێکدێ، کە باسی ڕۆژی دواییە، واتە: هەم ئاخیر زەمان و هەم قیامەت، بەڵام بە تایبەتی باسی قیامەت و زیندوو بوونەوەو سزاو پاداشت، هەروەها لە کۆتاییدا باسێکی کورتی قورئان و، وێنە هێنانەوەکانی قورئان کراوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دە (١٠) ئایەتی سەرەتای سوورەتی **(الروم)** دەگرێتە خۆی، کە وەك پێشەکیی وان، بۆ کۆی بابەتەکانی ئەم سوورەتەو، سێ (٣) بابەتی سەرەکییان تێدا خراونە ڕوو:

**أ)**- باسی تێشکانی ڕۆم لە بەرانبەر فارسداو، دووبارە کەوتنەوە جەنگیان و، سەرکەوتنی ڕۆم بەسەر فارسدا، لە ماوەی **(بضع سنين)** چەند ساڵێکدا: (٣ - ٩) ساڵ.

**ب)**- باسی ئامانجداریی گەردوون کە خوا ﷻ بەهەق نەبێ دروستی نەکردوەو، مرۆڤەکان ڕۆژێك دێ، بە دیداری پەروەردگاریان دەگەن، هەرچەندە زۆربەیان لەو ڕاستییە بێ ئاگان.

**ج)**- سەرنجڕاکێشانی خەڵك بۆ مێژووی ڕابردووی کۆمەڵگایەکان، کە لە ئەنجامی ستەم و تاوان و لادانیاندا، فەوتێندراون و سەریان بە فەتارەت چووە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِيٓ أَدْنَى ٱلْأَرْضِ وَهُم مِّنۢ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴿٣﴾
فِي بِضْعِ سِنِينَ ۗ لِلَّهِ ٱلْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِنۢ بَعْدُ ۚ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾
بِنَصْرِ ٱللَّهِ ۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَعْدَ ٱللَّهِ ۖ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ
وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ
غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِيٓ أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ
وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ
فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا۟ ٱلْأَرْضَ

وَعَمَرُوهَآ أَكۡثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿٩﴾ ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ ٱلسُّوٓأَىٰٓ أَن كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ بِهَا يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿١٠﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە . ئەلیف لام میم ﴿١﴾ ڕۆمەکان (لە جەنگدا لە بەرانبەر فارسەکاندا) تێشکان ﴿٢﴾ (لە شوێنێك کە) نیزیکترین سەر زەمینە (لە وڵاتی گەلی عەرەبەوە)و دوای تێشکانەکەشیان بە دڵنیایی (بەسەر دەوڵەتی فارسدا) زاڵ دەبن ﴿٣﴾ لە ماوەی چەند ساڵێکدا (سێ تاکو نۆ)، کاروباری (زاڵبوون و تێشکان)یش هەر بەدەست خوایە، پێش ئەو ڕووداوەو، دوای ئەویش و، ئەو ڕۆژەش (کە ڕۆم بەسەر فارسدا زاڵ دەبێ)، بڕواداران زۆر دڵخۆش دەبن ﴿٤﴾ (زۆر شادمان دەبن) بە یارمەتیی خوا (بۆ خاوەن کتێبەکان کە بەسەر بتپەرستەکاندا زاڵ دەبن)، (خوا) هەر کەسی بوێ، یارمەتیی دەدات و، ئەو (خوا) زاڵی میهرەبانە ﴿٥﴾ ئەوە بەڵێنی خوایە، خوا بەڵێنی خۆی ناشکێنێت، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن ﴿٦﴾ ڕواڵەتێك لە ژیانی دنیا دەزانن، لە حاڵەتێکدا کە لە ژیانی دوایی بێ ئاگان ﴿٧﴾ ئایا لەبەر خۆیانەوە بیریان نەکردۆتەوە! کە خوا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانی بە هەق و بۆ کاتێکی دیارییکراو نەبێ، نەهێناونە دی! زۆربەی خەڵکیش بە دیداری پەروەردگاریان بێبڕوان ﴿٨﴾ ئایا بە زەوییدا نەڕۆیشتوون و سەرنج بدەن! سەرەنجامی ئەوانەی پێش وان چۆن بوو؟ لەوان بەهێزتر بوون و زەمینیشیان لەوان پتر کێڵاو هەڵکۆڵی و ئاوەدان کردەوەو، پێغەمبەرانیشیان بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هێنان (کەچی بڕوایان پێ نەهێنان و، خواش سزای دان)، هەرگیزیش نەدەگونجا، خوا ستەمیان لێ بکات (لە خۆڕا

سزایان بدات)، بەڵكو ئەوان ستەمیان لە خۆیان كرد ﴿٩﴾ دواییش سەرەنجامی ئەوانەی خراپەیان كرد، خراپترین (سزا) بوو، چونكە بە نیشانەكانمان بێبڕوا بوون و گاڵتەیان پێ دەكردن ﴿١٠﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ): (أَدْنَى: أَي أَقْرَبُ، أَو أَصْغَر، أو أَخْفَضُ)، وشەی (أَدْنَى) سێ واتای هەن، ئەوانیش: نیزیكترین، یان بچووكترین، یان نزمترین.

(بِضۡعِ): بریتیە لە ژمارەیەك كە لە نێوان سێ تاكو نۆ (٣-٩)دا بێ، (المُقْتَطَعُ مِنَ العَشْرَةَ)، (بِضْعِ) بریتیە لە شتێك لە دەیان دابڕابێ، (بَيْنَ الثَّلَاثِ وَالعَشْرَة).

(ٱلسُّوٓأَىٰٓ): (عُبِّرَ عَنْ كُلِّ مَا يَقْبحُ، بِالسُّوْى ضِدُّ الحُسْنَى)، وشەی: (سُؤى) تەعبیری پێكراوە لە هەر شتێك كە زۆر ناقۆڵاو دزێوو ناشیرین بێ، (سُؤى)، واتە: خراپترین، (مؤنث) مێینەی (أسوء) پێچەوانەكەی بریتیە لە (حُسْنَى)، كە مێینە (مؤنث)ی (أحسن)ە، واتە: چاكترین، یاخود ناشیرینترین و جوانترین.

(وَأَثَارُواْ): (أَثَرْتُ الأَرْضَ: حَرَثْتُهَا)، (أَثَارُوا) یانی: (حَرَثُوا) زەوییەكەیان كێڵاو هەڵیانكۆڵی، مەرج نیە بەس بۆ كێڵانی دانەوێڵەو كشتوكاڵ بێ، بەڵكو بە گشتیی (أَثَارُوا الأَرْضَ) یانی: زەوییان پشكنی، هەڵیانكۆڵی، كێڵایان، یانی: لێی بەهرەمەند بوون.

(وَعَمَرُوهَآ): واتە: ئاوەدانیان كردۆتەوە، (العِمَارَةُ: نَقِيْضُ الخَرَابِ: يُقَالُ: عَمَرَ أَرْضَهُ: يَعْمُرُهَا عِمَارَةً، وَعَمَرْتُهُ فَعَمَرَ فَهُوَ مَعْمُورٌ، وَالعَمْرُ وَالعُمُرُ: إِسْمٌ لِمُدَّةِ عِمَارَةِ البدَنِ بِالحَيَاة)، (العِمَارَةُ: نَقِيْضُ الخَرَابِ)، (خَرَاب) یانی: كاول بوون و وێران بوون، پێچەوانەی ئاوەدانكردنەوەیە، (عَمَرَ أَرْضَهُ)، زەوییەكەی ئاوەدان كردەوە، واتە: كێڵای و بەروبوومی لێ هەڵگرت، (وَعَمَرْتُهُ فَعَمَر فَهُوَ مَعْمُورٌ)، زەویەكەم یان

شـوێنەكەم ئـاوەدان كـردەوە، ئەویـش ئـاوەدان بـۆوە، ئێسـتا ئاوەدانـە، (عَمْـر وعُمُـر) نـاوە بـۆ ئـەو ماوەیـەی كـە جەسـتە لـە ژیاندایـە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

بـۆ هــۆی هــاتنە خــوارەوەی ئــەم ئایەتانــە: ﴿الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ﴾، چەنـد گێڕدراوەیـەك هاتـوون، كـە ئەمـە یەكێكیانـەو لـە هەمـووان زیاتـر مانـا بـە دەسـتەوە دەدات و، پێـم وایـە لـە ڕووی سەنەدیشـەوە ڕاسـترە:

{عَـنْ ابْـن عَبَّـاسٍ رَضِـيَ اللـهُ عَنْهُمَـا، قَـالَ: غُلِبَـتْ وَغَلَبَـتْ، كَانَ الْمُشْـرِكُونَ يُحِبُّـونَ أَنْ يَظْهَـرَ أَهْـلُ فَـارِسَ عَلَـى الـرُّومِ، لِأَنَّهُـمْ وَإِيَّاهُـمْ أَهْـلُ الْأَوْثَـانِ، وَكَانَ الْمُسْـلِمُونَ يُحِبُّـونَ أَنْ يَظْهَـرَ الـرُّومُ عَلَـى فَـارِسَ، لِأَنَّهُـمْ أَهْـلُ الْكِتَـابِ، فَذَكَـرُوهُ لِأَبِـي بَكْـرٍ، فَذَكَـرَهُ أَبُـو بَكْـرٍ لِرَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ قَـالَ: أَمَـا إِنَّهُـمْ سَـيَغْلِبُونَ، فَذَكَـرَهُ أَبُـو بَكْـرٍ لَهُـمْ، فَقَالُـوا: اجْعَـلْ بَيْنَنَـا وَبَيْنَـكَ أَجَـلًا، فَـإِنْ ظَهَرْنَـا، كَانَ لَنَـا كَـذَا وَكَـذَا، وَإِنْ ظَهَرْتُـمْ، كَانَ لَكُـمْ كَـذَا وَكَـذَا، فَجَعَـلَ أَجَـلًا خَمْـسَ سِـنِينَ، فَلَـمْ يَظْهَـرُوا، فَذَكَـرُوا ذَلِـكَ لِلنَّبِـيِّ ﷺ فَقَـالَ: أَلَا جَعَلْتَـهُ إِلَـى دُونَ، قَـالَ أُرَاهُ الْعَشْـرَ، قَـالَ أَبُـو سَـعِيدٍ وَالْبِضْـعُ مَـا دُونَ الْعَشْـرِ، قَـالَ: ثُـمَّ ظَهَـرَتْ الـرُّومُ بَعْـدُ قَـالَ: فَذَلِـكَ قَوْلُـهُ تَعَالَـى: ﴿الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ﴾، إلـى قولـه: ﴿يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ﴾، قَـالَ سُـفْيَانُ: سَـمِعْتُ أَنَّهُـمْ ظَهَـرُوا عَلَيْهِـمْ يَـوْمَ بَـدْرٍ}[1].

واتـە: عەبدوڵـڵای كـوڕی عەببـاس (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) دەڵـێ: ڕۆم تێشـكان و دواییـش سـەركەوتن، هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەكان، حەزیـان دەكـرد خەڵكـی فـارس

---

(١) أخرجـه البخـاري في التأريـخ الكبـير: ٢٦٢٠٠، والترمـذي: ٣١٩٣، والنسـائي في التفسـير:٤٠٩ وقـال الحاكـم: صحيـح عـلى شرط الشـيخين ولم يخرجـاه ووافقـه الذهبـي، قلنـا: وهـو كـما قـالا، وصححـه أحمـد شـاكر في تحقيقـه للمسـند: ٢٤٩٥، الإسـتيعاب في بيـان الأسـباب: ج٣، ص٥١.

بەسەر ڕۆمدا سەركەون، چونكە خەڵكی فارس و هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان ئەهلی بت و صەنەم بوون، (ئەوان ئاگریان دەپەرست و ئەوانیش پەیكەرو دارو بەردیان دەپەرست) مسوڵمانانیش پێیان خۆش بوو ڕۆم بەسەر فارسدا سەركەون، چونكە مسوڵمانان و ڕۆمەكان خاوەن كتێب بوون، (بڕوایان بەوە هەبوو كە خوا كتێبی لە ئاسمانەوە دابەزاندوە)، ئنجا ئەوەیان بۆ ئەبووبەكر باسكرد (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەبووبەكریش ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسكرد، (كە مسوڵمانان خۆزگە دەخوازن ڕۆم بەسەر فارسدا زاڵ بن و، كافرو بتپەرستەكانیش خۆزگە دەخوازن فارس بەسەر ڕۆمدا زاڵ بن)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئاگادار بە! ئەوان سەردەكەون، (واتە: ڕۆمەكان سەردەكەون، بەسەر فارسەكاندا، كە ئەوە دوای تێشكانی ڕۆمەكان بوو لە بەرانبەر فارسەكاندا)، ئەبووبەكریش (خوا لێی ڕازی بێ)، بۆ كافرەكانی قورەیشی باسكرد كە ڕۆم سەردەكەون، (پێغەمبەر ﷺ وای هەواڵ پێداوە، یانی: جەنگی داهاتوو ئەگەر بكرێ، ڕۆم بەسەر فارسدا زاڵ دەبن)، كافرەكان گوتیان: كاتێكی دیارییكراو لە نێوان خۆمان و خۆتدا دابنێ، ئەگەر سەركەوتین، (سەركەوتنی فارسەكانیان بەهی خۆیان زانیوە!) ئەوە فلان شتەو فلان شتە بۆ ئێمەبێ، (ئەوەندە حوشترە، ئەوەندە دیاریی و خەڵاتە، گرەو بووە)، ئەگەر ئێوەش سەركەوتن، (مسوڵمانانیشیان لەگەڵ ڕۆمەكان دا، بە یەك بەرە داناوە)، فلان شتەو فلان شتە بۆ ئێوە بێ، (بۆ وێنە: دە (١٠) حوشتریان داناون، ئەگەر فارسەكان سەركەوتن، دە حوشترەكە بۆ ئێمە بن، ئەوان پێنجیان داناون، ئەوانیش پێنج، هەر دە (١٠) حوشترەكە ئەوان ببەن، یان ئەگەر سەد (١٠٠) بێ، یەكی پەنجایان داناوە، هەموویان بۆ وان بن، ئەگەر ڕۆمیش سەركەوتن بە پێچەوانەوە، ئەبووبەكر (خوا لێی ڕازی بێ) گرەوی لەگەڵ كردن (كە (رِهَان)ی پێ دەڵێن)، بۆ ماوەی پێنج ساڵان، بەڵام لە ماوەی پێنج ساڵەكاندا ڕۆمەكان سەرنەكەوتن، ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ باسكرا، ئەویش فەرمووی: بۆچی ماوەكەت بۆ كەمتر لە دە (١٠) ساڵان دانەدەنا! (نەك پێنج)، (أبو سعید) گوتی: (**بضع**) لە دە (١٠) كەمترە.

ئنجا ڕۆم دوای ئەوە سەرکەوتن، ئەوەش فەرمایشتی خوایە: ﴿الٓمٓ ١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ٢﴾ تاکو ﴿يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ﴾، سوفیان گوتوویەتی: بیستوومە لە ڕۆژی بەدردا بەسەریان دا زاڵبوون.

شایانی باسە: ئەم (**فَلَمْ يَظْهَرُوا**)، مەرج نیە، لە دەقی بەسەرهاتەکەدا هاتبێ، واتە: دوایی دەرکەوتوە کە لە ماوەی پێنج ساڵەکەدا، شەڕەکە نەبووە تاکو سەرکەون، نەك پێنج ساڵەکە تێپەڕیبن، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووبێتی: زیادی بکەن! پێم وایە ئەوە بەم شێوەیە نیە، بەڵکو دوایی گێڕەرەوە (**راوي**) خستوویەتە ئێرە، واتە: دوایی دەرکەوت کە لە ماوەی پێنج ساڵدا، شەڕەکە نەبوو، ئەو موژدەیەی کە خوا داویەتی لە ماوەی پێنج ساڵدا نەهاتۆتە دی، خواش ﷻ نەیفەرمووە لە ماوەی پێنج ساڵدا، فەرموویەتی: ﴿فِي بِضۡعِ سِنِينَ﴾، یانی: لە (٣ - ٩)، کەواتە: تاکو نۆیەکە تەواودەبن دەرفەتی هەر هەیە.

وەك پێشتریش گوتمان وهێنامان:

(سوفیان) یەکێکە لە ڕاوییەکان، دەڵێ: بیستوومە کە سەرکەوتنی ڕۆم بەسەر فارسدا کەوتۆتە ڕۆژی جەنگی (بدر)ەوە، ساڵی دووەمی کۆچیی، لە ساڵی حەوتەمدا کە دەکەوێتە جەنگی (بدر)ەوە، وەك چۆن مسوڵمانان زاڵبوون بەسەر کافرەکاندا، ڕۆمیش بەسەر فارسەکاندا زاڵ بوون، واتە: ئەو ساڵە ساڵی زاڵبوونی خواناسان بووە بەسەر خوا نەناسان دا و، هی خاوەن کتێبان بووە بەسەر بێ کتێباندا، ئنجا بەو بۆنەوە بووە خوای پەروەردگار ئەم ئایەتانەی بەو شێوەیە دابەزاندوون، کە وەك دوایی باسی دەکەین، ئەمە ئیعجازێکی مێژوویی زۆر گەورەو گرنگی تێدایە.

لەڕیوایەتێکی دیکەدا کە (**ابن کثیر**) لە تەفسیرەکەیدا هێناویەتی (٣٨٠٦/٩) بەژمارە (١٧٤٥٨) گوتراوە: موشریکەکان داوای گرەویان لە ئەبووبەکر کردوەو، دواتریش کە ئەبووبەکر لێی بردوونەوە، ماڵەکەی هێناوە بۆ لای پێغەمبەری خوا

ﷺ فەرموویەتی: (**هـذا السُّحْتُ تَصَدَّقَ بـه**) ئەوە حەڕامە بیکە بەخێر بیبەخشە.

شایانی باسە:

زانایانیش زۆر قسەیان لەبارەی گرەو (رهان)ەوە کردووە، کە جۆرەکانی ڕەوای چەند مەرجێکیان هەن، بەڵام زۆربەیان ئەمجۆرەی لێرەدا هاتووە بە حەڕام و جۆرێك لە قوماریان داناوە.[١]



(١) بڕوانە: (أصول المخالفات الشرعية في الأسواق المالية) ص١٦٥-١٧١، عبدالملك بن محمد الجاسر.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

پێش ئەوەی مانا گشتییەکەی بکەین، سەرنجی خوێنەرانی بەڕێز ڕادەکێشین بۆ مەسەلەیەك: سێ سوورەت لە قورئاندا هەن، کە بەپیتە پچڕ پچڕەکان دەستیان پێکردوەو، باسی قورئانیان تێدا نەهاتوە، یەکسەر دوای پیتەکان، بەڵام ئەوانی دیکە یەکسەر دوای پیتەکان، باسی قورئان کراوە، بۆ وێنە:

١- لە سووڕەتی (**البقرة**)دا: ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَۛ فِيهِ ﴾.

٢- هەروەها لە سووڕەتی (**آل عمران**)دا: ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ﴿٢﴾ نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٣﴾ ﴾.

٣- ﴿ قٓۚ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ ﴿١﴾ ﴾.

٤- ﴿ صٓۚ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ﴿١﴾ ﴾.

٥- ﴿ يسٓ ﴿١﴾ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ ﴾، بەڵام لە سێ سووڕەتاندا کە پیتە پچڕ پچڕەکان دێن، یەکسەر باسی قورئان نیە، ئەوانیش:

١)- ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓا۟ أَن يَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴾ **العنكبوت**.

٢)- ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِىٓ أَدْنَى ٱلْأَرْضِ وَهُم مِّنۢ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴾ **الروم**.

٣)- ﴿ نٓۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴾ **القلم**.

١- ئەم سێیانە تەنیا سێ سووڕەتێکن، لەو بیست و نۆ (٢٩) سووڕەتە، کە پیتە پچڕپچڕەکان لەگەڵیاندا باسی قورئان نەکرابێ، ئنجا وەك لە هەموو سووڕەتەکانی دیکەدا، باسمان کردوە: خوا ﷻ دەیەوێ بە مرۆڤایەتیی بفەرموێ بە گشتیی و، بەوانەی گومان و دوو دڵیی دەخەنە سەر قورئان، بە تایبەت، کە ئەو قورئانە هەر لەو پیت و دەنگانە پێکهاتوە

كە ئێوە قسەیان پێدەكەن، وەك: (**أ، ل، م، ص، ظ، ق، ن**...هتد) ئنجا ئەگەر ڕاست دەكەن، كە قورئان خوا ﷻ نەیناردوەو، لەو پیت و دەنگانە خوا پێكی نەهێناوە، ئێوەش فەرموون ئەو پیت و دەنگانە لەبەر دەستی ئێوەشدا هەن، شتێكی وەك وی بێنن!

بەڵام بە نسبەت ئەو سێ سوورەتەشەوە، كە بێگومان ئەوە ڕێگر نیە لەوەی خوا بفەرموێ: ئەو قورئانە كە ئێوە دەیخوێنن، لەو پیتانە پێكهاتوە، ئنجا هەرچەندە لەم سێ شوێنانەدا باسی قورئان ناكرێ، بەڵام لە (**العنكبوت**)دا باسی تاقیكردنەوەی خوا بۆ خەڵك دەكات و، لە سوورەتی (**الروم**)دا باسی تێشكانی ڕۆمەكان لە بەرانبەر فارسەكان دا و، دوایی سەركەوتنیان دەكات و، لە سوورەتی (**القلم**)دا سوێند دەخوات بە (**قلم**)و بەو دێڕەی كە پێی دەنووسن، ئنجا دەگوترێ: ئەو قورئانەی باسی ئەو ڕاستییانە دەكات، باسی تاقیكردنەوەی خوا بۆ مرۆڤ دەكات، باسی تێشكانی ڕۆم لە بەرانبەر فارس و دوایی زاڵبوونەوەیان دەكات و، خوا ﷻ هەواڵی پێ دەدات، پاشان باسی سوێند بە قەڵەم دەكات و بەو دێڕەی كە پێی دەنووسن، یانی: خوایەك ﷻ كە قورئانی ناردوەو لەو پیت و دەنگانە پێكی هێناوە، بەس خۆی ئەو جۆرە زانیارییانەتان دەخاتە بەردەست.

**٢-** ئەم سوورەتی (**الروم**)و، سەرەتای سوورەتی (**الروم**)، تاكە شوێنێكە لە هەموو قورئاندا، تێیدا باسی ڕووداوێكی سیاسیی هاوچەرخی دابەزینی قورئان كرابێ، كە جەنگی نێوان فارس و ڕۆمە، هەڵبەتە باسی شتی دیكە كراوە لە قورئاندا، بەڵام ڕووداوێكی جیهانیی لەسەر ئاستی دنیای ئەو كاتە، كە ئەو كاتە ڕۆم و فارس دوو زلهێزی دنیا بوون، زۆربەی دنیایان لە ژێر دەستدابوو، باسی شەڕی یەكەمیان و دووەمیان كرابێ، تەنیا لێرەدا ئەوە هاتوە.

**٣-** ئەو ئایەتانە ئیعجازێكی مێژووییان تێدایە، كە دوایی زیاتر تیشكیان دەخەینە سەر كە بریتیە لەوەی: خوا ﷻ بەر لەوەی (ڕۆم و فارس) بەگژیەكدا بێنەوە، بۆ جاری دووەم، هەواڵ دەدات كە ئەم جارە ئەگەر جەنگی نێوان ڕۆم و فارس بوو، ڕۆم بەسەر فارسدا زاڵ دەبێ و، دەبێتە مایەی دڵخۆشیی بڕواداران.

## ئێستاش دێینە سەر مانای گشتیی ئایەتەكان:

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: ( بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ )

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

دەستپێكردنم بە ناوی خوایە، كە ئەوەش بەلای كەمەوە چوار مەبەستی سەرەكیی تێدان:

١ - ئەم كارە: تەنیا بۆ خوا دەكەم.

٢ - بە پێی شەرعی خوا دەیكەم.

٣ - بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەیكەم.

٤ - بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجامی دەدەم.

﴿ الٓمٓ ﴾، ئەمە سێ پیتن: (**ئەلیف، لام، میم**)، كە بەم شێوەیەش دەخوێنرێنەوە، پێشتریش باسمان كردوە، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەم قورئانەی لەبەر دەستتاندایە، هەر لەو پیت و دەنگ و وشانە پێك دێ، كە ئێوە قسەیان پێدەكەن، بەڵام ئێوە ناتوانن نەك قورئانێكی ئاوا بێنن، ناتوانن دە سووڕەتیش بێنن، بەڵكو ناتوانن سووڕەتێكیش بێنن، كەواتە: بزانن كە ئەو قورئانە لە لایەن خواوە هاتوە.

﴿ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴾، ڕۆمەكان تێشكان، واتە: لە جەنگ دا لە بەرانبەر دەوڵەتی فارسدا دەوڵەتی ڕۆم تێشكا، لە كوێ؟ ﴿ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ ﴾، لە نیزیكترین زەوی، واتە: لە نیزیكترین زەوییەوە لە نیوە دوورگەی عەرەبیی، كە ئەو كاتە كۆمەڵی مسوڵمانانی لێبوون، كە جارێ نەبووبوونە قەوارەیەكی سیاسیی، یاخود: ﴿ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ ﴾، واتە: نزمترین شوێنی سەر زەوی لە ئاستی ڕووی دەریاوە، كە وەك دوایی باسی دەكەین، ئەوە ئیعجازێكی عیلمییشە، یاخود لە نیزیكترین زەوییەوە لە ڕۆمەكان، واتە: لەوێوە لە ڕۆمی ڕۆژهەڵات، ئەو شوێنە (شام) زۆر

لێیانەوە نیزیك بوو، ﴿وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ﴾، ئەوان دوای ئەوەی کە ئەمجارە تێشکاون، لەمەودوا زاڵ دەبن، ﴿فِي بِضۡعِ سِنِينَ﴾، لە ماوەی چەند ساڵێکدا، واتە: (٣ - ٩)، کە دیارە بەڵێنی خواش ﷻ هاتۆتە دی.

﴿لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُ﴾، فەرمان، یاخود: کاروبار هەر بە دەست خوایە، لەوەو پێش و لەوەو دواش، واتە: پێش ئەو جەنگەش و دوای ئەو جەنگەش، یاخود بە ڕەهایی لە پێشداو لە دواییدا، کاروبار هەر بەدەست خوایە، ﴿وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِ﴾، لەو ڕۆژەشدا بڕواداران زۆر دڵخۆش و شادمان دەبن بە یارمەتیی خوا، بۆچی دڵخۆش دەبن؟ لەبەر ئەوەی ڕۆمەکان هەر نەبێ خواناس بوون و، بڕوایان بە وەحیی و پێغەمبەرایەتیی و بە ڕۆژی دوایی و بە کتێبەکانی خواو بە پێغەمبەران هەبووە، ئەوەش خاڵی هاوبەشی بەینی خاوەن کتێبەکان و مسوڵمانان بووەو، بە پێچەوانەوەش: فارسەکان ئاگر پەرست بوون، وەك چۆن هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی مەککەش بتپەرست بوون، ئەوەش خاڵی هاوبەشیان بووە، خواناسان پێیان خۆش بووە: خواناس سەرکەون بەسەر کەسانێك دا کە خوانەناسن و، کەسانێك کە بڕوا دەکەن بە کتێبەکانی خوا، پێیان خۆش بووە بەسەر کەسانێکدا سەرکەون، کە بڕوا بە کتێبەکانی خواو پێغەمبەرانی خوا ناکەن، ﴿يَنصُرُ مَن يَشَآءُ﴾، خوا ﷻ هەر کەسێکی بوێ سەری دەخات، پشتی دەگرێ، ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾، خوا باڵادەستی میهرەبانە.

﴿وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ﴾، ئەوە بەڵێنی خوایەو خوا بەڵێنی خۆی زایە ناکات، بەڵێنی خوا پێچەوانە نابێ، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، واتە: زۆربەی خەڵکی نازانن کە ناگونجێ بەڵێنی خوا ڕاست دەرنەچێ، یاخود زۆربەی خەڵکی نازانن کە ئەم کەون و کائیناتە هەمووی لەبەر دەستی خوای پەروەردگار دایەو، هیچ شتێك بەبێ ویستی خواو، بێ تواناو دەسەڵاتی خوا، ناقەومێ و ڕوونادات.

﴿ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، (خەڵـك بەگشـتیی) ڕواڵەتێـك لـە ژیانـی دنیـا دەزانـن، ﴿ وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ﴾، بـەڵام لـە ژیانـی كۆتایـی و، لـە قۆناغـی كۆتایـی بـێ ئـاگان، كـە قۆناغـی ڕۆژی دواییـە، ﴿ أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۗ ﴾، ئایـا لەبەرخۆیانـەوە بیریـان نەكردۆتـەوە، مرۆڤـەكان لەبـەر خۆیانـەوە ڕانەمـاون، بیریـان نەكردۆتـەوە؟ ﴿ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۗ ﴾، خـوا ئاسـمانەكان و زەوی و ئـەوەی دەكەوێتـە نێوانیـان، بەهـەق نەبـێ دروسـتی نەكـردوون، واتـە: بـە شێوەیەكی هـەق و حیكمـەت و، بـۆ ئامانجێك كـە پەیوەندیـی بـە مرۆڤەكانـەوە هەیـە، ﴿ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۗ ﴾، بـۆ كاتێكـی دیارییكراویـش؟! ﴿ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآيِٕ رَبِّهِمۡ لَكَٰفِرُونَ ﴾، زۆرێـك لـە خەڵكیـش بـە دیـداری پەروەردگاریـان بێبـڕوان.

﴿ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ ﴾، بۆچـی بێبـڕوان؟ ئایـا بـە زەوییـدا نەڕۆیشـتوون، سـەرنج بـدەن سـەرەنجامی ئەوانـەی پێـش ئـەوان چـۆن بـوون! لـە ئەنجامـی بێبڕواییـان دا چـۆن سـەریان بـە فەتـارە چـوو، ﴿ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ ﴾، ئایـا بەهێـزو توانـای خۆیـان دەنـازن؟ ئەوانـی پێـش وان، لـەوان بەهێزتـر بـوون، هێزیـان سـەختتربوو، توندتربـوو، ﴿ وَأَثَارُواْ ٱلۡأَرۡضَ وَعَمَرُوهَآ أَكۡثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا ﴾، زەوییشـیان هەڵكۆڵـی و، كێڵایـان و، پشـكنییان زیاتـر لـەوەی كـە ئـەوان زەوییـان ئـاوەدان كردۆتـەوەو هەڵیانكۆڵیـوەو پشـكنیویانە، ﴿ وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ ﴾، پێغەمبەرانیـان بەڵگـە ڕۆشـن و ئاشـكرایەكانیان بۆهێنـان، ﴿ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ ﴾، نەشـدەگونجا خـوا ستەمیان لـێ بـكات، لێی ناوەشـێتەوە، ﴿ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾، بەڵكـو ئـەوان خۆیـان سـتەمیان لـە خۆیـان دەكـرد، لـە ئەنجامـی بێبڕواییانـدا، تووشـی بـەڵاو سـزای خـوا بـوون، كەواتـە: خۆیـان سـتەمیان لـە خۆیـان كـرد.

﴿ ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ ﴾، دوایـی سـەرەنجامی ئەوانـەی خراپەیـان كـرد: ﴿ ٱلسُّوٓأَىٰٓ ﴾، بریتـی بـوو لـە خراپتریـن سـزا، یاخـود: ﴿ ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ

﴿ٱلسُّوٓأَىٰٓ﴾، ئەوانەی کە کارە هەرە خراپەکانیان دەکرد، سەرەنجامیان چی بوو؟ ﴿أَن كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾، ئەوەبوو کە بڕوایان بە نیشانەکانی خوا نەکرد، بەڵام باشتر وایە ئاوا لێکبدرێتەوە: ﴿ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ ٱلسُّوٓأَىٰٓ﴾، ئەوانەی کە خراپەیان دەکرد، سەر ئەنجامیان ئەوەبوو کە خراپترین سزایان بە ملەوە بوو، بۆیان هاتە پێش، بۆچی؟ ﴿أَن كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە ئایەتەکانی خوایان بە درۆ دانا، ﴿وَكَانُواْ بِهَا يَسْتَهْزِءُونَ﴾، گاڵتەشیان بە ئایەتەکانی خوا دەکرد، نەك هەر بەدرۆیان دادەنا، بەڵکو بەگاڵتەجاڕیشیان گرتبوون، بۆیە سەرەنجام ئەوەیان بەسەرهات کە بەسەریان هات، هەروەها ئەوەشیان بەسەر دێ، کە بەسەریان دێ، وەك خوا ﷻ هەواڵی پێداوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**باسی ڕووداوی تێشکانی دەوڵەتی ڕۆم لە بەرانبەر دەوڵەتی فارسداو، ڕاگەیاندنی سەرکەوتنی دەوڵەتی ڕۆم بەسەر فارسدا، لە ماوەی چەند ساڵێك (٣ - ٩)دا، کە ئەوەش دەبێتە مایەی شادمان بوونی مسوڵمانان و، خستنەڕووی ئەو ڕاستییەش کە خوا ﷻ هەموو شتێکی بە دەستەو، بەڵێنی خۆی دەباتە سەر:**

خوا دەفەرموێ: ﴿الٓمٓ ١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ٥ وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٦ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ٧﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿الٓمٓ﴾ ئەلیف، لام، میم، لە بارەی ئەو پیتە پچڕپچڕانەوە کە لە پێش بیست و نۆ (٢٩) سووڕەت لە سووڕەتە موبارەکەکانی قوڕئاندا هاتوون، دووانیان مەدینەیین و، ئەوانی دیکە مەککەیین، زۆرجار قسەمان کردوە کە باشترین ڕا لەو ڕایانەی، زانایان لە بارەی ئەو پیتانەوە گوتوویانە: ئەوەیە کە خوا ﷻ بە هێنانی ئەو پیتانە لە سەرەتای بیست و نۆ لە سووڕەتەکانی قوڕئاندا، کە جگە لە سێ سووڕەتیان، سووڕەتەکانی: (**العنکبوت، الروم، القلم**)، بیست و شەش سووڕەتەکەی دیکە، یەکسەر دوای هاتنی ئەو پیتانە، باسی قوڕئان کراوە، بۆ وێنە:

**١**- لە سوورەتی (**البقرة**)دا: ﴿ الٓمٓ ١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِ ﴾، ٢- هەروەها لە سوورەتی (**آل عمران**)یش: ﴿ الٓمٓ ١ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ٢ نَزَّلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ٣ ﴾.

**٣**- ﴿ قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ١ ﴾ق،

**٤**- ﴿ صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ١ ﴾ص،

**٥**- ﴿ يسٓ ١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ٢ ﴾**یس**،باشترین ڕا ئەوەیە کە خوا ﷻ دەیەوێ بە مرۆڤەکان بفەرموێ: ئەو قورئانەی لەبەر دەستتاندایە، دەتوانن بیخوێننەوەو، بە نووسراوەیی لەبەر دەستتاندا هەیە، بە خوێندراوەیی لەبەر دەستتاندا هەیە، ئەو قورئانە ئەو دوایین کتێبەی خوا ﷻ، هەر لەو پیت و دەنگانە پێکهاتوە، کە ئێوە بەکاریان دێنن لە ئاخاوتن و قسەکردنی ڕۆژانەتاندا، ئنجا بەڵگە لەسەر ئەوە کە ئەو فەرمایشتە (قورئانە)، فەرمایشتی خوایە ﷻ و سەرچاوەکەی خوای پەروەردگارە، نە موحەممەدەو ﷺ نە هیچ کەسێکی دیکەیە، لە فریشتەو جندو مرۆڤ، ئەوەیە کە ئێوە ناتوانن وەك ئەو قورئانە بێنن، نەك وەك ئەم قورئانە هەمووی، بەڵکو وەك دە (١٠) سوورەتی، بەڵکو وەك سوورەتێکیشی، کەواتە: بزانن: ئەو زاتەی لەو پیت و دەنگانەی کە ئێوە قسەیان پێ دەکەن، ئەم قورئانەی پێکهێناوە، خوای پەروەردگارە، چونکە پێکهاتنی فەرمایشتی خوا لەو پیت و دەنگانە، چ لە ڕووی فۆڕم و دیکۆڕو شێوەوە، چ لە ڕووی ڕەوانبێژیی و پاراوییەوە، چ لە ڕووی نێوەڕۆك و ئامانج و مەبەستەکانیەوە، کە گرتوونیە نێو خۆی، دەستەوسانکەرە بۆ مرۆڤ و، مرۆڤ ناتوانێ قسەی وا بکات، نە وەك ڕواڵەتی بێژەکانی، نە وەك نێوەڕۆکی واتاکانی.

**٢**)- ﴿ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴾، ڕۆم تێشکان، لە بەرانبەر کێدا تێشکان؟ خوا ﷻ لایەنی بەرانبەری باس نەکردوە، بەڵام بە پێی سەرچاوە مێژووییەکان دیارە، کە لە بەرانبەر دەوڵەتی فارسدا، دەوڵەتی ڕۆم تێشکاوە، کە وەك دوایی باسی دەکەین، لە ساڵی (٦١٥) زایینی دا بووە، ئنجا پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ لە پێنجسەدو حەفتا (٥٧٠)ی زایینی دا لە

دایك بووەو، لە ساڵی شەشسەدو دە (٦١٠) لە تەمەنی چل ساڵیی دا، کراوەتە پێغەمبەر، کەواتە: پێنج ساڵی زایینی تێپەڕیون بەسەر ڕەوانە کردنی پێغەمبەردا ﷺ کە ئەو جەنگە ڕوویداوەو، ئەم سەرەتای سووڕەتی (**الروم**)یش، باسی ئەو ڕووداوەی کردوە.

## ئایا لە کوێ ڕۆمەکان، یان دەوڵەتی ڕۆم تێشکا، لە بەرانبەر دەوڵەتی فارسدا؟

**٣)**- ﴿ فِي أَدْنَى ٱلْأَرْضِ ﴾، لەنیزیکترین زەوییەوە، (**أَدْنَى**) پێشتریش گوتمان: بە مانای (**أَقْرَب**) دێ، یانی: (**أَقْرَب أَرْضِ الرُّوم المُتَحَدَّثِ عَنْهُمْ إلى الأَرْضِ العَرَب**)، واتە: لە نیزیکترین سەر زەمینی ڕۆمەوە، لە وڵاتی عەڕەب، (شام) کە تخووب و سنووری نێوان ئەو کاتەی وڵاتی عەڕەبنیشین، لەگەڵ دەسەڵاتی ڕۆمەکان بووە، چونکە ئەو کاتە شام شوێنکەوتووی دەوڵەتی ڕۆم بووە، واتە: ئەو سەر زەمینەی کە شامی پێ دەگوترێ، لە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی ڕۆمدابووەو، نیزیکترین شوێنیش بووە لە ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمەوە، بە نسبەت عەڕەبەکانەوە، نیزیکترین شوێن بووە لە وڵاتی عەڕەبنشین، لە دەوڵەتی ڕۆم.

هەڵبەتە واتایەکی دیکەشی هەیە کە دوایی باسی دەکەین و، ئیعجازێکی زانستییە لە ڕووی جوگڕافییەوە، بەڵام: ﴿ فِي أَدْنَى ٱلْأَرْضِ ﴾، هەندێکی دیکە وایان لێکداوەتەوە: لە نیزیکترین سەر زەمینەوە، خوا ﷻ هەر وایفەرمووە، ئیدی نەیفەرمووە بۆ وڵاتی عەڕەبەکان، یان بۆ وڵاتی فارس، یان بۆ وڵاتی ڕۆم!

دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ: نیزیکترین سەر زەمین لە وڵاتی فارس، کە ئەو شوێنە لە وڵاتی فارسەوە نیزیك بووە.

دەشگونجێ مەبەستی وڵاتی ڕۆم بێ، بەڵام بەهەر حاڵ زۆربەی زانایان دەڵێن: (**الأرض**) کە (أل)ی ناساندنی لەسەرەو بۆ (**عهد**)ە، واتە: لە نیزیکترین سەر زەمینەکەوە، ئەو سەر زەمینەی کە زانراوەو ناسراوە، کە سەر زەمینی عەڕەبە، لەبەر ئەوەش کە خوا ﷻ ئەم قوڕئانەی بە زمانی عەڕەبیی ناردوەو، ئەو کاتەش پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە مەککە بووە، ئنجا خوا ئەو ڕووداوەش

باس دەکات بۆ ئەو خەڵکەی کە لەو کاتەدا لە مەککەی شاری پێغەمبەر ﷺ بوون، کە هۆزی قوڕەیش بوون بە پلەی یەکەم، هەروەها هۆزەکانی دیکە بوون کە لە شاری مەککەو دەوروبەری نیشتەجێ بوون.

وەك هەواڵێك، خوا ﷻ ئەو هەواڵەیدا، دوایی دەفەرموێ:

٤)- ﴿وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ فِي بِضۡعِ سِنِينَ﴾، ئەوەی پێشێ هەر هەواڵێکی مێژووییەو خەڵکی دیکەش زانیویەتی، بەڵام ئەوەی دوایی ئیعجازێکی مێژووییە، ﴿وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ﴾، (**وَهُمْ**)، ئەوان (ڕۆمەکان) لە دوای تێشکانیان، ﴿مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ﴾، (**مَصْدرٌ مُضافٌ إلى مَفْعُولِه**)، (**غَلَبْ**) چاوگەو پاڵدراوەتە لای بەرکارەکەی، یانی: (**مِنْ بَعْد مَغْلُوبِيَّتِهِم**) دوای ئەوەی تێشکاون، دوای تێشکانەکەیان، لەماوەی چەند ساڵێك (٣-٩)دا، زاڵدەبن.

﴿سَيَغۡلِبُونَ فِي بِضۡعِ سِنِينَ﴾، لە ماوەی چەند ساڵێکدا زاڵ دەبنەوە، بەسەر کێدا زاڵ دەبنەوە؟ لەبەرانبەر ئەوانەدا کە ئێستا لەو جەنگەدا بەرانبەریان تێشکاون، کە دەوڵەتی فارسە، ئنجا خوا ﷻ نەیفەرمووە: (**وَالرُّوم مِنْ بَعْدِ مَغْلُوبِيَّتِهِم سَيَغْلِبُونَ عَلَى فَارِس أو دَوْلَة فَارِس**) واتە: ڕۆم دوای تێشکانیان بەسەر فارس، یان دەوڵەتی فارس دا زاڵدەبن، چونکە خوا ﷻ فەرمایشتی خۆی خستۆتە نێو کەمترین پیت و وشەوەو، زۆرترین واتا بە دەستەوە دەدات، کە دەفەرموێ: (**وَهُمْ**)، دیارە مەبەست ڕۆمەکانە، چونکە قسە لەوان دەکرێ، واتە: ڕۆمەکان، ﴿مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ﴾، دەگونجێ (**غَلَبْ**) کە چاوگ (مصدر)ە، پاڵ بدرێتە لای بکەر (**فَاعِل**)، ﴿مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ﴾، یانی: (**غَلَبَتِهِمْ**)، سەرکەوتن و زاڵبوونیان، دەگونجا وا لێکبدرێتەوەو، ئەو واتایەش هەڵدەگرێ و، دەشگونجێ بگوترێ: چاوگەو پاڵ دراوەتە لای بەرکار (**مَفْعُول**)ەکەی، یانی: دوای تێشکانەکەیان، ئەوەش بەپێی ڕەوت (سیاق) دەزانرێ، ئێستا ئەگەر قسە لە فارس بووایە، کە زاڵ بوون، ئەو کاتە: ﴿وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ﴾، یانی: دوای ئەوەی

کـە ئەمجـارە زاڵ بـوون، زاڵ دەبنـەوە لـە مـاوەی چەنـد سـاڵێك دا، بـەڵام قسـە لەسـەر ڕۆمـە، بۆیـە (**وَهُـمْ**)، یانـی: ڕۆمـەكان (**مِـنْ بَعْـدِ غَلَبِهِـم**): (**مَغْلُوبِيَّتِهِـم**) دوای تێشـكانیان (**سَـيَغْلِبُونَ فِـي بِعْـضِ سِنِين**) لـە مـاوەی چەنـد سـاڵێكدا زاڵ دەبـن.

وشـەی: (**بِضْـعِ**)، لـە زمانـی عەرەبیـی دا بـە مانـای ژمارەیەكـی كـەم (**عَـدَد قَلِيْـل**) دێ، چەنـد سـاڵێك، بـەڵام زانایـان زۆربـەی هـەرە زۆریـان سـنوورێكیان بـۆ دانـاوە: (**بِضْـعِ**) ئەوەیـە لـە سـێ كەمتـر نەبـێ و، لـە دە (١٠)ش زیاتـر نەبـێ، لـە (٣ - ٩) پێـی دەگوتـرێ: (**بِضْـعِ**)، كەواتـە: لـە مـاوەی (٣ - ٩) سـاڵدا، یـان دە سـاڵدا زاڵ دەبنـەوەو، ڕۆمـە تێشـكاوەكان زاڵ دەبنـەوە بەسـەر كێـدا؟ بەسـەر ئـەو لایەنـەدا كە لـە بەرانبەریدا تێشـكاون، كـە دەوڵەتـی فارسـە، ئەمـەش ئیعجازێكـی مێژووییـە، خـوا ﷻ هەواڵـی پێـدەدات، كـە دەفەرمـوێ: (**سَـيَغْلِبُون**)، یانـی: بـە تەئكیـد لەمـەودوا زاڵ دەبـن.

٥)- ﴿لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُ﴾، كاروبار هی خوایەو بە دەست خوایە، پێش ئەوەش و دوای ئەوەش، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- یانی: (**مِنْ قَبْلِ مَغْلُوبِيَّتِهِم وَمِنْ بَعْدِ غَلَبَتِهِمْ**)، پێش ئەوەی ڕۆمەكان تێبشكێن و، دوای ئەوەش كە زاڵ دەبن، كاروبار هەر بە دەست خوایە، بۆیە خوا ﷻ هەواڵمان پێدەدات بە زانیاریی.

ب- یاخود: (**مِنْ قَبْلُ و مِنْ بَعْد**) پێش ئەوەو دوای ئەوە، یانی: لە ڕابردوو و لە داهاتووش دا، بێ ئەوەی پاڵ بدرێتە لای شتێك، بە ڕەهایی لە پێش داو لە دوایی دا، لە ڕابردوو و لە داهاتوودا، كاروبار هەر بە دەست خوایە، بۆیە خوا ﷻ دەزانێ چی ڕوودەدات و چی دەقەومێ؟

٦)- ﴿وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِ﴾، لەو ڕۆژەشدا بڕواداران زۆر دڵخۆش دەبن بە یارمەتیی خوا.

پێشـتر باسـمان كـردوە: (**الفَـرَح: أَشَـدُّ السُّـرُور**) نـەك هـەر دڵخۆشـیی ئاسـایی، بەڵكـو شـادمان بـوون، زۆر دڵخـۆش بـوون، لـەو ڕۆژەدا بـڕواداران زۆر دڵخـۆش دەبـن بـە یارمەتیـی خـوا، ئەمـەش دوو واتـای هـەن:

**١-** شادمان دەبن بە یارمەتییدانی ڕۆمەکان کە خاوەن کتێب بوون، بڕوایان بە پێغەمبەران بووەو، بڕوایان بە کتێبەکانی خوا بووەو، بڕوایان بە ڕۆژی دوایی بووەو، بڕوایان بە فریشتان بووە، بڕوایان بە وەحیی و پەیامی خوا بووە، بۆیە خاڵی هاوبەشیان زۆر بوون لەگەڵ بڕواداران دا، بڕواداران تێشکانی ڕۆمیان پێ ناخۆش بووەو، سەرکەوتنیشیانیان پێ خۆش بووە.

**٢-** لەو ڕۆژەدا بڕواداران بە یارمەتیی خوا زۆر دڵخۆش دەبن، چونکە ئەو ڕۆژە بە ڕای زۆرێك لە توێژەرەوانی قورئان، هەمان ڕۆژی ڕوودانی جەنگی بەدر بووە لەساڵی دووەمی کۆچیی دا، ئنجا ئەگەر واشبێ ناگونجێ دابەزینی سوورەتی (الروم) لەساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتییدا بووبێ، بەڵکو بەلای کەمەوە دەبێ لەساڵی (٦-٧)دا بووبێ، ئەوکاتەش: (٦+٩ = ١٥) یانی: ساڵی دووەمی کۆچیی، یان: (٧+٨=١٥)، ئەوکاتە: چەمکی چەند ساڵێك (**بضع سنين**) لەگەڵ گرەوکردن (رهان)ەکەی ئەبووبەکر وهەندێك لە زل زلانی هۆزی قورەیش دا، دەگونجێ، چونکە وەك پێشتر باسمان کرد، زانایان گوتوویانە: ئەو ڕۆژە کە جەنگی فارس و ڕۆم تێیدا ڕوو دەداتەوەو، ڕۆم بەسەر فارسدا زاڵ دەبێ، دەکەوێتە ئەو ڕۆژانەوە کە جەنگی بەدر تێیاندا ڕوویداوەو، مسوڵمانان بەسەر هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی مەککەدا زاڵبوون.

ئنجا هەندێك لە زانایان دەڵێن: ﴿وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ﴾، یانی: بە یارمەتیی خواو سەرخستنی خوا بۆ بڕواداران لە جەنگی بەدردا، بەسەر هاوبەش بۆ خوا دانەرەکاندا، دەشتوانین بڵێین: بە هەردووکیان، چونکە ئەگەر هەردووکیان لەو ڕۆژانەدا ڕوویاندابن، بڕواداران هەم بە سەرکەوتنی خۆیان، بەسەر هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و بتپەرستەکانی مەککەدا، دڵخۆش بوون و، هەم بە سەرکەوتنی ڕۆمە خواناسەکان، بەسەر فارسە بتپەرست و ئاگر پەرستەکان دا.

**٧)-** ﴿يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ﴾، خوا هەر کەسێکی بیەوێ سەری دەخات، لە میانی ئەو سیستم و یاسایانەدا کە دایناون.

٨)- ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾، خوا باڵادەستی میهرەبانە، باڵادەستە بۆ ناحەزان و دوژمنان و، میهرەبانیشە بۆ دۆستەکانی.

٩)- ﴿وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ﴾، ئەوە بەڵێنی خوایە، خوا بەڵێنی خۆی پێچەوانە ناکات، بەڵێنی خۆی دێنێتە دی.

ئایا ﴿وَعۡدَ ٱللَّهِ﴾، لێرەدا بەچی (**مَنْصُوب**) بووە؟ زانایان دەڵێن: (**وَعْدَ اللهِ**) بەرکاری ڕەها (**مَفْعُول مُطْلَق**)ە، وەك ئەوەیە بڵێی: (**وَعَدَ اللهُ وَعْداً**)، خوا بەڵێنی داوە، ئەو بەڵێنی خواش زایە نابێت و لە شوێنی خۆیداو لە کاتی خۆیدا دێتە دی.

١٠)- ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

(**النَّاسِ**) کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، بۆ هەموو گرتنەبەر (**إسْتِغْرَاق**)ەو، بۆ تێکڕا (**جِنْس**)یە، یانی: زۆربەی تێکڕای خەڵکی نازانن، نازانن کە ئەم کەون و کائیناتە، شاری بێ خاوەن نیەو، خوا ﷻ سەرپەرشتیی دەکات و بەسەری ڕادەگات.

١١)- ﴿يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾، ڕواڵەتێك لە ژیانی دنیا دەزانن، تەنیا ڕواڵەتێکی ژیانی دنیا دەزانن.

١٢)- ﴿وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ﴾، بەڵام لە مەنزڵگای کۆتایی و قۆناغی کۆتایی، کە هیچ قۆناغێکی دیکەی بە دوادا نایەت، کۆتایی نایەت و نابڕێتەوە، کە ڕۆژی دوایيە، بێ ئاگان.

# کورتە باسێک

## هەشت کورتە سەرنجی گرنگ

١- دەوڵەتی ڕۆم لە جەنگێکدا کە دەکەوێتە ساڵی (٦١٥)ی زایینی، لە بەرانبەر دەوڵەتی فارسدا، تێشکاون، کە ئەو کاتە پادشای دەوڵەتی فارس (خوسرەوی کوڕی هورموز) بووەو ئەو تێشکانە تێشکانێکی گەورە بووە بۆ ڕۆم، زیانێکی زۆریان پێکەوتوەو، شام و لە نێویشیدا فەڵەستین و (**بیت المقدس**) کە شوێنێکی بە پیرۆز گیراو بووە، لە لایەن جوولەکەکان و نەصڕانییەکانیشەوە، کەوتە ژێر دەستی دەوڵەتی فارس و، خراپەکاریی زۆریان تێدا کردوە.

٢- کە دەفەرموێ: ﴿ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ ﴾:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی نیزیکترین سەر زەمین بێ لە وڵاتی عەڕەبانەوە، کە ئەوەش ڕاستییەکەو ئەو شوێنە کە: شامە، بە تایبەت نێوان (**بُصری و أذرعات**)، کە شەڕەکە لێی ڕوویداوە، نیزیکترین شوێنە بە نسبەت دەوڵەتی ڕۆمەوەو، ئەو ناوچەیەش ئەوکاتە گەلی عەڕەب لێی نیشتەجی بوونە.

ب- وێڕای ئەمە وشەی: (**أدنی**) بە مانای نزمترین (**أخفض**)یش دێ، کە ئەوەش ئیعجازێکی زانستیی تێدایە، چونکە ئەو گۆمڵاییەی فەڵەستین، بە نزمترین شوێنی سەر زەوی دادەنرێ، لە ئاستی دەریاوە، بە تایبەت ناوچەی دەریاچەی مردوو، کە لە ڕووی ئاستی دەریاوە، نزمترین شوێنە لە سەر خڕۆکەی زەوی، کەواتە: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ ﴾، یانی: (**فِي أَخْفض نقطة الأرْض**)، لەنزمترین خاڵی زەوییدا (ئەو جەنگە ڕوو دەدات)، بۆیەش ئەمە بە ئیعجازێکی زانیاریی دادەنرێ، چونکە ئەو کاتە نەزانراوە، کوێ لە هەموو دنیادا نزمترە؟ دوایی کە زانیاریی جوگرافیاو، زانیاریی زەویناسیی بەرەو پێشەوە چوو، بۆیان دەرکەوت کە ئەو شوێنە لە هەموو سەر زەوی، لە ئاستی دەریاوە نزمترە.

**٣-** مسوڵمانان پێویستە هەمیشە هاوسەنگیی بکەن، لە نێوان بەرژەوەندییەکان و خراپەکاندا (المصالح والمفاسد)و لە نێوان زیانێکی گەورەو زیانێکی گچکەدا، ڕۆم ئەو کاتە نەصرانیی بوون، نەصرانییش مسوڵمان نەبوون، بەڵکو دوایی دەبن بە دوژمنێکی سەرسەختی مسوڵمانانیش، بەڵام لەو کاتەداو لەو ئان و ساتەدا، خاڵی هاوبەشی نێوان مسوڵمانان و ڕۆم کە نەصرانیی بوون، زۆر بوون و، خاڵی هاوبەشی نێوان مسوڵمانان و دەوڵەتی فارس کەم بوون، ڕۆمەکان خواناس بوون، بڕوایان بە کتێبەکانی خواو، پێغەمبەرانی خوا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) بووەو، بڕوایان بە ڕۆژی دوایی بووەو، بڕوایان بە وەحیی بووەو، بڕوایان بە حەڵاڵ و حەڕام بووە، کە دەبێ خوا دیاریيان بکات نەك مرۆڤ، بەڵام فارس هیچ کام لەوانەیان نەبووە، بتپەرست و ئاگر پەرست بوون، لە ڕووی ڕەوشتییەوە: مەحرەمەکان (محارم): دایك و خوشك و کچی، خۆیانیان هێناون، مەجووسییەکان ئاوابوون و، گەلێك خاڵی جیاواز لە نێوان ئەهلی ئیمان و فارسەکان دا بوون، بۆیە مسوڵمانان هەقی خۆیان بووە کە بە تێشکانی ڕۆمەکان دڵ سەغڵەت بن و، بە دووبارە هەڵسانەوەو سەرکەوتنەوەیان بەسەر فارسدا دڵخۆش بن، لەبەر ئەوەی خاڵی هاوبەشیان لەگەڵ ڕۆمدا زۆرتر بووە، تاکو فارس، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەشدا باسمان کرد، کە ئەصڵەن قوڕەیشییە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، ڕۆم و مسوڵمانانەکانیان وەك یەك بەرە تەماشا کردووەو، خۆیان و دەوڵەتی فارسیشیان وەك یەك بەرە تەماشا کردووەو، گرەویان کردوە لەگەڵ ئەبووبەکردا (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەبووبەکریش گرەوەکەی لێ بردوونەوە، کەواتە: پێویستە ئێمەش بەیەك چاو تەماشای بەرانبەرەکانمان نەکەین و پۆلێنیان بکەین.

**٤-** مسوڵمانان پێویستە هەمیشە ئاگایان لە ڕووداوە جیهانیی و ناوچەییەکانی خۆیان بێ، هەڵبەتە ئەو کاتە دەوڵەتی فارس لە ڕۆژهەڵاتەوەو دەوڵەتی ڕۆم لە ڕۆژئاواوە، گەورەترین دوو زلهێزی سەر زەوی بوون، بەهێزترین دوو دەوڵەت بوون و، زۆرترین پانتایی سەر زەمینیان بە دەستەوە بووە و، زۆرترین ئیمکانیەتی ماددیی و بەشەرییان لەبەر دەستدا بووە، بەڵام تەماشا دەکەین: خوا ﷻ مسوڵمانان ڕادێنێ و مەشقیان پێ

دەکات، کە دەبێ کارلێك بکەن لەگەڵ ڕووداوەکانی کە لە دنیادا ڕوودەدەن: ڕۆم تێشکاوە لە بەرانبەر فارسدا، ئەوە هەواڵێکی ناخۆشە بۆ مسوڵمانان و، دەبێ مسوڵمانان کارلێك بکەن، لەگەڵ ئەوەدا، بۆچی هەواڵێکی ناخۆشە؟ چونکە ڕۆمەکان هەرنەبێ خواناسن، بڕوایان بە وەحیی و پێغەمبەرایەتیی و، زیندوو بوونەوەو، سزاو پاداشت هەیە، بەڵام فارسەکان وا نین، ئنجا ئەمە جۆرێکە لە ڕاهێنان و مەشق پێکردنی مسوڵمانان، کە ئەم ئیسلامە ئایینێکی عەشیرەتیی و، ئایینێکی نەتەوەیی و، ئایینی سەرزەمینێکی دیارییکراو نیە، بەڵکو ئایین و بەرنامەیە بۆ هەموو بەشەر لە هەموو سەر زەوییدا، بۆیە پێویستە شوێنکەوتووانی ئەو ئایینە، کارلێك (**تفاعل**)یان هەبێ، لەگەڵ هەموو ئەو ڕووداوانەدا کە لە دنیادا ڕوودەدەن.

٥- بە تەئکید ئەم هەواڵ پێدانە، بە ئیعجازێکی مێژوویی لە قەڵەم دەدرێ، چونکە پێش چەند ساڵێك، ئنجا حەوتە، هەشتە، نۆیە، بە تەئکید لە دە (١٠) کەمتر بووە، پێش ئەوەی جەنگی دووەمی نێوان فارس و ڕۆم ڕووبدات، خوا ﷻ زۆر بە جەختکردنەوەو، زۆر بە ڕوونیی ڕایدەگەیەنێ: کە لە ماوەی چەند ساڵێکدا دەوڵەتی ڕۆم بەسەر دەوڵەتی فارسدا زاڵ دەبێ و، دەبێتە هۆی دڵخۆشیی مسوڵمانانیش، دڵخۆشییەکەش هەم بە خودی سەرکەوتنەکەی ڕۆمە خواناسەکانە بەسەر فارسە ئاگرو بتپەرستەکانداو، هەم لەو ڕۆژەو لەو ئان و ساتەدا، یان لەو ڕۆژانەدا ڕووداوێکی گرنگترو مەزنتریش، بە نسبەت مسوڵمانانەوە، ڕوویداوە کە بریتی بووە لە زاڵبوونی بڕواداران بەسەر بتپەرستەکاندا لە جەنگی بەدردا.

٦- خوا ﷻ کە باسی زۆربەی خەڵکی دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، یانی: ئەو شتانە نازانن کە لە ڕێی وەحییەوە نەبێ نازانرێن، بۆچی دەفەرموێ: زۆربەی خەڵکی؟! چونکە کەمێکیان کە پابەند بوون بە وەحیی خواوەو، لەبەر ڕۆشنایی وەحییدا بیریان کردۆتەوەو بەهرمەند بوون لە وەحیی، ئەو شتانەی کە لە ڕێی وەحییەوە دەزانرێن، زانیویانن، دوایی دەفەرموێ: ﴿ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، ڕواڵەتێك لە ژیانی دنیا دەزانن، واتە: ئەو زۆرینەیەش کە ئەو

شتانە نازانن، لە ڕێی وەحییەوە نەبێ نازانرێن، ئەو زۆرینەیەش ڕواڵەتێك لە ژیانی دنیا دەزانن، خوا ﷻ نەیفەرمووە هەر هیچ نازانن، دەفەرمووێ: ڕواڵەتێك لە ژیانی دنیا دەزانن.

کەواتـە: ئێمـەش دەبـێ بـە ئینصـاف بـن، کەسـێك کـە شـتێك نازانـێ، دەبـێ بڵێیـن، ئـەو شـتە نازانـێ، بـەڵام نەڵێیـن: هیـچ نازانـێ، کەسـێك شـتێك ناتوانـێ، بڵێین: ئـەو شـتە ناتوانـێ، بـەڵام نەڵێیـن: هیـچ ناتوانـێ، ئەگـەر تەماشـای قورئـان بکەیـن، هیـچ قسـەیەکی هەڵقـوڵاوی عاتیفـەو سـۆزی تێدانیـە، جـاری وا هەیـە کەسـێك لـە کەسـێك تـووڕە دەبـی دەڵـێ: تـۆ هـەر هیـچ نازانـی، یـان هیـچ ناتوانـی، یـان هیچـت لـێ نایـەت! بـەڵام خـوا ﷻ واینەفەرمـووە، دەفەرمـوێ: زۆربـەی خەڵکـی، یاخـود زۆریـان، یـان کەمیـان بـۆ وێنـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ﴾سبأ، واتـە: کەمێـك لـە بەندەکانـم سوپاسـگوزارن، بـەڵام دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾**یوسـف**، لـە شـوێنێکی دیکـە دەفەرمـوێ: ﴿ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾**البقـرة**، نافەرمـوێ: هیچیـان ئیمـان ناهێنـن، بەڵکـو دەفەرمـوێ: زۆربەیـان، لێـرەش دەفەرمـوێ: زۆرینـەی خەڵـك کـە نازانـن، واتـە: ئـەو شـتانە نازانـن کـە لـە ڕێـی وەحییـەوە نەبـێ دەرکیـان پـێ ناکـرێ و نازانرێـن، ئـا ئەوانـە: ڕواڵەتێـك لـە ژیانـی دنیـا دەزانـن.

٧- ﴿ وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ ﴾، ئەوانە لە ڕۆژی دوایی خۆیان بێئاگان، واتە: زانیارییەکیان نیە، دەربارەی ڕۆژی دوایی و قۆناغی کۆتایی، چونکە زانیاریی هەبوون بەوە، لە ڕێی وەحییەوە نەبێ وەدەست نایەت، ئەوانیش بڕوایان بە وەحیی نەبووە، بۆیە لە ڕۆژی دوایی و، لەو قۆناغی کۆتایی ژیانی بەشەر، بێئاگان.

٨- شایانی باسە: ڕۆم کۆمەڵگایەك بووە، پێکهاتەیەکی تێکەڵ بوون لە: یۆنانییەکان، سەقاڵیبەکان، ڕۆمانییەکان، کە ئەصڵیان لە لاتینییەکانەوە بووە، کە دانیشتووانی ئیتاڵیان، قوستەنتین قەیسەری ڕۆم لە ساڵی (٣٢٢)ی زایینی دا، دوو پایتەختی بۆ دەوڵەتی ڕۆم

دانان: یەكەم: (ڕومە یان ڕۆما) كە ئێستاش پایەختی ئیتاڵیایە، دووەم: (بیزەنتا) ئەو كاتە (بیزەنتا)یان پێ دەگوت، دوایی ناوی لێنرا: (**قُسطنطينية**)، دوایی دەوڵەتی ڕۆم بوو بە دوو بەشەوە: ڕۆمی ڕۆژهەڵات و، ڕۆمی ڕۆژئاوا، ڕۆمی ڕۆژئاوا (**الروم البيزنطينية**)یان پێ دەگوتن، چونكە پایەختەكەیان (بێزەنتە) بوو، كە (**قُسطنطينية**)یان پێ دەگوت و، (ئەستەنبۆل)ی ئێستایە.

ڕۆمی ڕۆژئـاواش پایەختەكـەی شـاری (ڕۆما) بـوو، كـە ئێسـتا پایەختـی ئیتاڵیایـە، كەواتـە: ڕۆم كـە كاتـی خـۆی بـوون، لـە كۆمەڵێـك نەتـەوە پێكهاتبـوون، یۆنانییـەكان و، سـەقالیبەكان و، ڕۆمانییـەكان، كـە ئەوانیـش ئەصڵـی خـۆی لـە لاتینییـەكان بـوون، كـە دانیشـتووانی ئیتاڵیـا بـوون

{ئـەم زانیارییانـە (**محمـد الطاهـر بـن عاشـور**)، لـە تەفسـیری: (التحریـر والتنویـر)ی خۆیـدا هێناونـی}.

### مەسەلەی دووەم:

**ئەگەر مرۆڤەکان لەبەر خۆیانەوە بیرێکی جیددیی بکەنەوە، دڵنیا دەبن کە خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق و بۆ کاتێکی دیاریکراو نەبێ، نەهێناونە دی، بەڵام حەیفێ زۆربەی خەڵکی بە دیداری پەروەردگاریان بێبڕوان، لەبەر ئەوەی بە عەقڵێکی سەلیم و زگماکێکی پاك بیر ناکەنەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ ﴿٨﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِم ﴾، أ- ئایا بیریان لە خۆیان نەکردۆتەوە؟ ب- یاخود: ئایا لەبەر خۆیانەوە بیریان نەکردۆتەوە؟ هەردوو واتایەکەی هەن، **(فُلَان فَكَّرَ فِي الشَّيء)** فڵانکەس بیری لەشتەکە کردەوە، هەمزە (أ)ی **(أَوَلَمْ)**، هەمزەی پرسیارکردنە، بەڵام پرسیارکردنەکە بۆ سەرسوڕماندن (تعجيب)ە، یانی: شتێکی سەیرو جێی سەرسوڕمانە کە بیریان لە خۆیان نەکردۆتەوە، یان: لە بەرخۆیانەوە بیریان نەکردبێتەوە، بیر کردنەوە **(تَفَكُّر)**یش بریتیە لە بەکارهێنانی بیر (فکر) کە جووڵاندنی عەقڵە، بۆ بەهرەمەند بوون لەو عەقڵە، کە دەفەرموێ: **(أَنْفُسِهِم)**، **(أَنْفُس)** کۆی **(نَفْس)**ە، کە بە خود **(ذات)**ی مرۆڤ دەگوترێ، بە هەمووی، یاخود تەنیا بە دیوی نێوەوەی مرۆڤ و باری مەعنەویی دەگوترێ، بیریان لە چی نەکردۆتەوە لەبەر خۆیانەوە؟ یاخود: بیریان لە خۆیان نەکردۆتەوە لە بارەی چییەوە؟

٢)- ﴿ مَّا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، کە خوا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، بە هەق نەبێ و بۆکاتێکی دیاریکراو نەبێ، نەیهێناونە دی.

هەق بە مانای حیکمەت دێ و، بە مانای ئامانجێکی ڕاست دێ و، بە مانای شتی چەسپاویش دێ و بەگوێرەی ڕەوت (سیاق)ەکە منایەکەی دیاریی دەکرێ.

﴿ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، هەروەها بۆ کاتێکی دیارییکراویش نەبێ دروستینەکردوون (مُسَمًّى: أي مُقَدَّر، مُعَيَّن) ئەندازەگیریی کراو ودیارییکراو، ئەم گەردوونە بە سەروخواریەوە، کە دوو پێکهاتە سەرەکییەکەی بریتییە لە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، بەهەق و بۆ کاتێکی دیارییکراو، دروستکردوە، تەمەنێکی دیارییکراوی هەیە، ئایا بیریان لەوە نەکردۆتەوە کە خوا ئەم گەردوونەی بە هەق نەبێ بۆ کاتێکی دیاریکراو نەبێ، نەهێناوەتە دی؟

٣)- ﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآيِٕ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴾، بە دڵنیایی زۆربەی خەڵکی بە دیداری پەروەردگاریان بێبڕوان، لێرەدا نەیفەرمووە: (**إِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ**)، وەك پێشێ بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا ﴾، زۆرێك لە خەڵکی، بۆچی؟ چونکە ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی بووە، ئەوانە زۆر بوون، یاخود زۆرینە بوون، ئەوانەی کەم و زۆر لە ژێر کاریگەریی وەحیی خوای پەروەردگاردا بوون، کە بە پێغەمبەران دا (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ**)دا، پێش پێغەمبەری کۆتایی ﷺ ناردوویەتی.

شایانی باسە: لە سەرەتای سووڕەتی: (**یونس**)دا، باسێکی چڕوپڕمان لە بارەی ئەو بابەتەوە کردوە کە خوا ئاسمانەکان و زەوی، بە هەق نەبێ نەهێناونە دی و، باسمان کردوە: هەموو ئەو ئایەتانەی لەو بارەوە هاتوون کە پازدە (١٥) ئایەتن، لە پازدە (١٥) شوێنی قورئاندا هاتوون، هەموویانمان هێناوەو، هەر حەقیقەتێك لە یەك ئایەتی قورئاندا بێ، بەسە تاکو بزانین ئەوە ڕاستییەکە، بەڵام ڕاستییەك لە پازدە شوێنی قورئاندا، یاخود لە کەمتر، یاخود زیاتر بێت، بە ئەندازەی ئەوە کە زۆر دووبارە دەبێتەوەو، جەختی لەسەر دەکرێتەوە، دیارە گرنگە.

پێشتریش باسمان کرد، کە لە سووڕەتی (**الجاثية**)دا خوا ﷻ ئەو هەقە ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ

﴿بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾﴾، واتە: خوا ئاسمانەكان و زەوی بە هەق هێناونە دی و، تاكو هەر كەسە بە پێی كردەوەی خۆی سزاو پاداشت بدرێتەوەو، ستەمیشیان لێ ناكرێ، كەواتە: ئەوە هەقەكەیە كە مرۆڤ تاقیی دەكرێتەوەو دوایی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەكرێ، دواییش سزاو پاداشت ڕووی تێدەكەن، بە پێی شێوەی ژیانی و، كردەوەكانی.

شایانی باسە: ئێمە لە مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد)، (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر تیشكی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحییدا)دا، باسی ئەو ئیشكالەمان كردوە كە هەندێك لە مولحیدەكان دەیخەنەڕوو، دەڵێن: زەوی زۆر بچووكە لە چاو گەردوون، مرۆڤیش لە نێو زەوییدا خاڵێكی زۆر بچووكەو ناگونجێ بگوترێ: خوایەك ئەو گەردوونەی هێناوەتە دی، ئەو زەوییە بچووكەو، ئەو مرۆڤە وردیلانەی لەسەرن، كە لە چاو گەردوون زۆر زۆر بچووكن! لەوێدا باسمان كردوە، كە ئەمە قسەیەكی پووچە، چونكە ئەو ئیعجازو وردەكارییەی لە مێشوولەدا هەیە، هەر ئەوەش لە فیلدا هەیە، بەڵكو ئەوەی لە ڤایرۆسێكدا هەیە، گرنگتریشە لەوەی كە لە ژیاندارێكی بە كەلەشی بینراودا هەیە، چونكە ئەو ڤایرۆسە كەس نایبینێ، بەڵام ژیانێكی تێدایەو وردەكارییەكانیشی تێدان، زاووزێشی هەیە، بەرگریی لە خۆ كردنیشی هەیەو، خۆ گۆڕینیشی هەیە، كە میكرۆبێك چەند هەزار هێندەی ڤایرۆسێكە، كەچی میكرۆبیش هەر بە چاو نابینرێ، چ جای ڤایرۆس، كەواتە: ئەو قسەیە قسەیەكی پووچە كە تۆ ئەوە بكەی بە پێوەرو تەرازوو، چ شتێك گەورەتر بێ، پێتوابێ گرنگترەو، چ شتێك بچووكتر بێ، پێتوابێ بایەخ و گرنگیی كەمترە.

پاشان مرۆڤ، بە پێی ئەوە كە هەتا ئێستا بۆ ئێمە دەركەوتوە، سنوورێكی میانجیی هەیە، لە نێوان دروستكراوە زۆر زەبەلاح و گەورەكانی خواو، دروستكراوە زۆر وردیلەكاندا، جەستەی مرۆڤ كە بە مەزەننە لە سەد تریلۆن (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) خانە پێكهاتوەو، هەر خانەیەكی لە سەد تریلۆن

(١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) گەردیلە پێکهاتوە، کەواتە: مرۆڤ لە شتی زۆر وردیلەی لە خۆی بچووکتر پێکهاتوە، بەڵام لە سەرووی مرۆڤەوە، وەك پێشتریش باسمان کرد، ئەم گەردوونە لە یەك تریلۆن (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) کەهکەشان پێك دێ، کە هەر کەهکەشانێك بە شێوەیەکی نیزیککراوەیی، لە یەك تریلۆن ئەستێرە (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) پێك دێ، واتە: لە سەرووی مرۆڤەوە، شتی زەبەلاح و گەورە زۆر هەن، لە خوار مرۆڤیشەوە شتی وردیلەی بچووك زۆر زۆر هەن، مرۆڤ لەو نێوەڕاستەدا قەراری گرتوە، کە هەم دەتوانێت دەرکی شتە گەورەکان بکات، هەم دەتوانێت پەی بە شتە وردیلەکانیش ببات.

هەڵبەتە لێرەوە ئامۆژگاریی براو خوشکانی بەڕێزم دەکەم، کە مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد) سوپاس بۆ خوا چاپی دووەمی دەکرێتەوەو، بە شێوەیەکی ڕێکترو، هەڵە چاپییەکانی تێی کەوتبوون، هەموویان ڕاست کراونەوە، پێم خۆشە گرنگییەکی باشی پێ بدەن، پێم وایە هەر کەسێك ئەو مەسووعەیە بە وردیی بخوێنێتەوەو لێی تێبگات، ئەگەر ئیماندار بێ، ئیمانی باشتر دەبێ و، ئەگەر ئیمانیشی نەبێ و خواناس نەبووبێ، ئەگەر لەگەڵ عەقڵ و زگماك و زانست دا ڕاست بکات، پێم وایە دەبێتە هۆی لە دڵ دا پەیدابوونی خواناسیی، پاشان ئیمان هێنانی، ستایش بۆ خواش ئەو کتێبە هەوڵدراوە، کە تەرجەمەی هەر کام لە زمانەکانی عەرەبیی و فارسیی و تورکیی بکرێ و، کاری لەسەر کراوە.

## مەسەلەی سێیەم:

**سەرنجراکێشانی بێبڕوایان بۆ مێژووی گەلانی فەوتاو، کە بەهێزتریش بوون لە کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ و زەوییشیان زیاتر هەڵکۆڵیوەو ئاوەدان کردۆتەوە، بەڵام بە هۆی ستەمەوە فەوتێنراون و، بە هۆی خراپەکارییشیانەوە، سەرەنجامێکی هەرە خراپ و شوومیان هەبووە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا۟ ٱلْأَرْضَ وَعَمَرُوهَآ أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ ۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَـٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ثُمَّ كَانَ عَـٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَـٰٓـُٔوا۟ ٱلسُّوٓأَىٰٓ أَن كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ بِهَا يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ ﴾.

## شیرکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون؟ ئەم هەمزە (أ)یەش دیسان بۆ پرسیارکردنە، کە دەگونجێ پرسیارکردنی سەرزەنشتکارانە (**إستفهامٌ توبيخي**) بێ، دەشگونجێ پرسیارکردنی نکووڵییلێکردن (**إستفهام إنكاري**) بێ، ئایا بە زەوییدا نەڕۆیشتوون و سەفەریان نەکردوەو گەشت گەڕانیان نەکردوە؟ (**السَّيْرُ: قَطْعُ المَسَافَاتِ مِنْ مَكَانٍ إِلى مَكَان**)، (**سَيْر**) ئەوەیە مرۆڤ ماوەیەك ببڕێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی.

بۆچی خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، لە نێو زەوییدا ڕۆیشتوون؟ لەبەر ئەوەی بەرگە هەوای زەوییش هەر بەشێکە لە زەوی، کەواتە: مرۆڤ کاتێك بە زەوییدا دەڕوات، مانای وایە بە نێو زەوییدا دەڕوات، چونکە بەرگە هەوای زەوییش بەشێکە لە زەوی، لە ڕاستییدا ئەم زەوییەمان پێك دێ، لە:

أ- بەرگە ئاوییەکەی کە چوار لەسەر پێنج (٥/٤)ی پانتاییەکەی دادەپۆشێ.

ب- بەرگە هەواییەکەی کە بە بەرزیی هەزار (١٠٠٠) کیلۆمەتر بەرگە هەوا دەوری زەویداوە، دیارە ئەویش دەبێتە چەند چینێك.

جـ- بەرگە خاکییەکەی.

ئێمە لە مەوسووعەی (ئیمان و ئیلحاد)دا، زۆر بە وردیی باسی گرنگیی و بایەخیی بەرگە هەوای دەوری زەوییمان کردوە، کە مرۆڤ و ژیانداران بە هۆی بەرگە هەوای دەوری زەوییەوە، دەتوانن لەسەر زەویی دا بژین، کەواتە: بەرگە هەوای زەویش بەشێکە لە زەوی، بۆیە دەفەرمویٚ: ﴿ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِى ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئایا بە نێو زەویدا نەڕۆیشتوون؟ چونکە کاتێك مرۆڤ بەسەر زەوییشدا دەڕوات، بەرگە هەوا لەسەریەتی، مانای وایە هەر بە نێو زەوییدا دەڕوات، بە نێو بەشێك لە زەوییدا کە پانتاییەکەیەتی و، بەرگە هەوایەکەشی لە سەرەوەیەتی.

٢)- ﴿ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾، سەرنج بدەن! ئەوانەی پێش وان سەرەنجامیان چۆن بووە، چییان لێ بەسەرهات؟

٣)- ﴿ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ ﴾، لەوان هێزیان توندتر بوو، لەکۆمەڵگای ڕۆژگاری تۆ، ئەی موحەممەد ﷺ! لە کافرەکانی ڕۆژگاری تۆ، چ لە نیوە دورگەی عەرەبیی دا و، چ لە دەوڵەتانی ڕۆم و فارس و، چ لە هەموو دنیا، بەهێزتر بوون.

کە دەفەرمویٚ: ﴿ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ ﴾، واتە: لە ڕووی سەربازییەوەو، لە ڕووی ماددییەوەو، لە ڕووی ئاساییش و هەواڵگرییەوە، لە هەموو ڕووەیەکەوە ئەو دەوڵەتانە کە پێشتر بوون، بە هێزتر بوون.

٤)- ﴿ وَأَثَارُواْ ٱلۡأَرۡضَ ﴾، زەوییان کێڵا، یاخود زەوییان هەڵکۆڵی و پشکنیی، چونکە: (أَثَارَ، يُثِيرُ، إِثَارَةً) یانی: بە پەیداکردنی شتێك لە شتێکدا، وەك دەفەرمویٚ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرۡسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابٗا ﴾، خوا ﷻ ئەو کەسەیە کە بایەکان دەنێریٚ، ئنجا هەوران پەیدا دەکات، لەبەر ئەوەی هەور هەڵمی سەر دەریاکانە، کە با لەگەڵ خۆی دەیهێنێ و پەیدای دەکات، ئنجا ﴿ وَأَثَارُواْ ٱلۡأَرۡضَ ﴾، یانی: زەوییان کێڵا، پشکنییان، پێیدا گەڕان.

٥)- ﴿ وَعَمَرُوهَآ أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا ﴾، ئاوەدانیان کردەوە (سەر زەوی)، زیاتر لەوەی ئەوانەی ڕۆژگاری تۆ ئاوەدانیان کردۆتەوە، واتە: بە کشتوکاڵ و نەمام ناشتن، بە بینا لەسەر کردن، بە ڕووبارو جۆگە تێدا ڕاکێشان، بە ڕێگە تێدا دروست کردن، بە پرد تێدا هەڵبەستن، هەمووی دەگرێتەوە، سەر زەوییان ئاوەدان کردەوەو لێی بەهرەمەندبوون.

٦)- ﴿ وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾، پێغەمبەرەکانیان بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هێنان.

(البَيِّنات: **الحُجَجُ الظَّاهِرَة عَلَى صِدْقِهِم**)، بەڵگە ڕۆشنەکان لەسەر ڕاستیی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام**)، بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە چوون بۆ لایان، هیچ پێغەمبەرێك نەبووە موعجیزەیەکی نەبێ، دەستەوسانکەر بێ بۆ خەڵکی ڕۆژگاری خۆی، بەڵگەش بێ بۆ ئیسپاتی ڕاستیی خۆی، وەك لەو فەرمایشتەدا هاتووە، کە زۆرجاری دیکەش هێناومانە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**مَا مِنَ الْأَنْبِيَاءِ مِنْ نَبِيٍّ، إِلَّا وَقَدْ أُعْطِيَ مِنَ الْآيَاتِ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ**} (**أخرجه البخاري: ٦٨٤٦، ومسلم: ١٥٢ عن أبي هريرة**)، واتە: هیچ کام لە پێغەمبەران نەبووە، مەگەر شتێکی پێدراوە کە لەسەر ئەوە بەشەر بڕوا بێنن، هەر پێغەمبەرێك بە پێی ڕۆژگاری خۆی موعجیزەی پێدراوە.

٧)- ﴿ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ ﴾، ئنجا نە دەگونجا خوا ﷻ ستەمیان لێبکات، واتە: بەر لەوەی بیانترسێنێ و هۆشیاریان بکاتەوە، بیانفەوتێنێ، بەڵکو ئەوە کە خوا سزای خۆی دابەزاندە سەریان، بەهۆی ستەمی خۆیانەوە بوو، نەك پێش ئەوەی خوا ئاگاداریان بکاتەوەو بیانترسێنێ و پێغەمبەرانیان بۆ بێنێ، سزایان بدات، ئەوە لە حیکمەت و دادگەریی خوا عز وجل چاوەڕێ ناکرێ.

٨)- ﴿ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾، بەڵام ئەوان خۆیان ستەمیان لە خۆیان دەکرد، واتە: پێغەمبەرانیان (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام**) بەڵگە ڕوون و ئاشکراکانیان بۆ هێنان، ئەوانیش پێغەمبەرانیان بە درۆ داناو، بەرپەرچیان دانەوەو بڕوایان پێنەهێنان، خوای کاربەجێش سزای دان.

٩)- ﴿ ثُمَّ كَانَ عَـٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَـٰٓـُٔواْ ٱلسُّوٓأَىٰٓ ﴾، دوایی سەرەنجامی ئەوانەی کە خراپەیان کرد، خراپترین سزابوو، (عَاقِبَة) هەم بە (عَاقِبَةَ) خوێنراوەتەوەو، هەم بە (عَاقِبَةُ) کە هەر یەك واتای هەیە، چ (**منصوب**) بێ و، چ (**مرفوع**) بێ، سەرەنجامی ئەوانەی خراپەیان کرد سزایەکی هەرە خراپ بوو.

﴿ ٱلسُّوٓأَىٰٓ ﴾، (**السُّوأى مُؤَنَّثُ أَسْوَأ مِثْلُ أَحْسَن وَحُسْنَى**)، هەروەها وەك: (**أَصْغَر وَصُغْرَى**)، کە (**فِعْل**)ی (**تَفْضِيْل**)ە لە (**سُوء**)ەوە، بە بارە مێینە (**مؤنث**)ەکەیدا، (**صیغة تَفْضِيْل**)ی (**أَسْوَأ**)ە، ئنجا کە دەفەرموێ: (**السُّؤاى**)، (**أل**)ی ناساندنی لەسەرە، ئەمە بۆ (**جنس**)ە، واتە: سزایەکیان بۆ هات کە جینسی هەموو سزایەکی خراپترینی تێدابوو.

هەڵبەتە هەندێکیش لە زانایان وایان لێکداوەتەوە: ﴿ ثُمَّ كَانَ عَـٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَـٰٓـُٔواْ ٱلسُّوٓأَىٰٓ ﴾، دوایی سزای سەرەنجامی ئەوانەی کە خراپەیەکی هەرە خراپیان کرد،یانی: (**السُّوأى**)، دەبێتە بەرکار (**مفعول بە**)، ﴿ أَن كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ﴾، سەرەنجامەکەیان ئەوە بوو کە بڕوایان بە ئایەتەکانی خوا نەهێنا، ﴿ وَكَانُواْ بِهَا يَسْتَهْزِءُونَ ﴾، هەروەها گاڵتەیان بە ئایەتەکانی خوا دەکرد.

بەڵام مانای یەکەمیان بەهێزترە، کە دەڵێ: دوایی سەرەنجامی ئەوانەی خراپەیان کرد، (**السُّوأى**)، سزایەکی هەرە خراپ بوو، بۆچی؟

١٠)- ﴿ أَن كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ﴾، بە هۆی ئەوەی کە ئایەتەکانی خوایان بە درۆ دانا.

١١)- ﴿ وَكَانُواْ بِهَا يَسْتَهْزِءُونَ ﴾، هەروەها وێڕای ئەوە کە بە درۆیان دادەنان: گاڵتەشیان پێ دەکردن، گاڵتەیان بە ئایەتەکانی خوا دەکردو، گاڵتەیان بەئایەتەکان و بەو پێغەمبەرەش ﷺ دەکرد کە ئایەتەکانی خوای پەروەردگاری هێنابوون.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ کە ملکەچ دەبن بۆ نیشانەکانی کە بۆ پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**)، نێردراون و، بڕوا بە

هەموویان دێنن و، ملکەچ دەبن بۆ پەیامی خوا، کە پەیامی خوا تەنیا بۆ بەختەوەریی و سەرفرازیی دنیاو دوارۆژی مرۆڤەکان هاتوە.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان حەڤـدە (١٧) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، کـە ئایەتەکانـی: (١١ - ٢٧)، تـەوەری سـەرەکییان بریتیـە لـە یەکتایـی خـوا (**وحدانيةُ الله**)، لـە بەدیهێنەرایەتیـی و، پەروەردگارێتیـی و، خاوەنداریێتیـی و مشـوورخۆریەتیی، پاشـان پەرسـتراوێتیی دا، بـەڵام تێکهەڵکێـش لەگـەڵ باسـی ڕۆژی دوایـی دا، هەڵبەتـە لـە میانـی خسـتنە ڕووی ئـەو دوو پایـە بنەڕەتـە مەزنـەی ئیمانـدا، واتـە: (بـڕوا بـە یەکتایـی خـواو بـڕوا بـە ڕۆژی دوایـی)، ژمارەیەکـی زۆریـش لـە نیشـانەکانی خـواو، لـە چاکـەو نیعمەتەکانـی خـوا لـە ژیانـی بەشـەردا، خراونـە ڕوو، وەك بەڵگـە هێنانـەوە لەسـەر هـەردووك پایـەو بنەڕەتـە مەزنەکـەی ئیمـان.

﴿ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿١١﴾ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ
يُبۡلِسُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿١٢﴾ وَلَمۡ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمۡ شُفَعَٰٓؤُاْ وَكَانُواْ بِشُرَكَآئِهِمۡ
كَٰفِرِينَ ﴿١٣﴾ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوۡمَئِذٖ يَتَفَرَّقُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَهُمۡ فِي رَوۡضَةٖ يُحۡبَرُونَ ﴿١٥﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا
وَلِقَآيِٕ ٱلۡأٓخِرَةِ فَأُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ ﴿١٦﴾ فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمۡسُونَ وَحِينَ
تُصۡبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَعَشِيّٗا وَحِينَ تُظۡهِرُونَ ﴿١٨﴾ يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ
مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ وَيُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ وَكَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ ﴿١٩﴾ وَمِنۡ
ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٞ تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم
مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ
لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ

وَأَلْوَٰنِكُمْۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلْعَٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبْتِغَآؤُكُم
مِّن فَضْلِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوْمٖ يَسْمَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ يُرِيكُمُ
ٱلْبَرْقَ خَوْفٗا وَطَمَعٗا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَيُحْيِۦ بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآۚ إِنَّ فِي
ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوْمٖ يَعْقِلُونَ ﴿٢٤﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦۚ ثُمَّ إِذَا
دَعَاكُمْ دَعْوَةٗ مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴿٢٥﴾ وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ
قَٰنِتُونَ ﴿٢٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يَبْدَؤُاْ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِۚ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{خـوا (هێنانـە دی) دروسـتکراو دەسـت پێـدەکات، دوایـی (پـاش نەمانـی) دەیگێڕێتـەوە (بـۆ بـوون) دواییش بـۆ لای وی دەگێڕدرێنـەوە (لـە ڕۆژی قیامەتـدا) ﴿١١﴾ ئـەو ڕۆژەش کـە قیامـەت دێ، تاوانبـاران نائومێدانـە بێ دەنـگ دەبن ﴿١٢﴾ (وەك خەیاڵیـان دەکـرد) لـە نێـو هاوبەشـاکانیاندا تکاکاریـان نەبـوون و، بـە هاوبەشـەکانیان بێبڕوابـوون (لـە ڕۆژی قیامەتـدا) ﴿١٣﴾ ئـەو ڕۆژەش کـە قیامـەت دێ، لـەو ڕۆژەدا (مرۆڤـەکان) لـە یـەك جیادەبنـەوەو پەرتـەوازە دەبـن ﴿١٤﴾ ئنجـا ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو کـردەوە چاکەکانیـان کـردوون، ئەوانـە لـە نێـو بـاغ و گوڵـزاردا شـادمان دەکرێـن ﴿١٥﴾ بـەڵام ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون و، نیشـانەکانی ئێمـەو دیـداری مەنزڵگای کۆتاییـان بـەدرۆ دانـاون، ئـا ئەوانـە لـە سـزاو ئـازاردا ئامـادە کـراون و نیشـتەجێن ﴿١٦﴾ دەجـا پاکیـی بـۆ خـوا، کاتێـك ئێوارەتـان لـێ دادێ و، کاتێـك بەیانیـی دەکەنـەوە ﴿١٧﴾ هەروەهـا ستایشـیش هـەر شایسـتەی ویـە، لـە ئاسـمانەکان و زەوییـدا، لـە شـەوگارداو کاتێـك نیوەڕۆتـان لـێ دادێ ﴿١٨﴾ خـوا زینـدوو لـە مـردوو دەردێنـێ و،

مـردوو لـە زینـدوو پەیـدا دەکات و، سـەرزەمینیش (دوای وشـك هەڵگـەڕان)و مردنـی دەژیەنێتـەوەو، هـەر بەو شـێوەیەش (لـە قیامەتدا لـە زەوی) دەهێنرێنەوە دەرێ ﴿١٩﴾ هەروەهـا لـە بەڵگـەو نیشـانەکانی (خاوەندارێتیـی) وی، ئەوەیـە کـە (سـەرەتا) لـە گڵ دروسـتی کـردوون، دوایـی ئێـوە کـت و پـڕ (بـە شـێوەیەکی سەرسـوڕهێنەر) دەبنـە مـرۆڤ و (بـە زەوییـدا) بڵاودەبنـەوە! ﴿٢٠﴾ هەروەها لـە نیشـانەکانی (پەروەردگارێتیی خـوا) ئەوەیـە، کـە لـە خۆتـان هاوسـەرانێکی بـۆ ڕەخسـاندوون، تاکـو هۆگریـان بـن و خۆشەویسـتیی و بەزەیـی خسـتۆتە نێوانتانـەوە، بێگومـان لـەوەدا نیشـانە هـەن بـۆ کۆمەڵێـك بیـر بکەنـەوە ﴿٢١﴾ هەروەهـا لـە نیشـانەکانی (مشـوورخۆریی خـوا) دروسـتکردنی ئاسـمانەکان و زەوی و، جیاوازیـی زمانـەکان و ڕەنگەکانتانـە، بـە دڵنیایی لـەوەدا نیشـانە هـەن بـۆ زانایـان ﴿٢٢﴾ هەروەهـا لـە نیشـانەکانی (میهرەبانیـی خـوا) خەوتنتانـە بـە شـەوو ڕۆژ (و کاسـبیی کـردن ) و خواسـتنی (بژیو)تانـە لـە بەخششـی (خـوا)، بـە دڵنیایـی لـەوەدا نیشـانە هـەن، بـۆ کۆمەڵێك ببیسـتن ﴿٢٣﴾ هەروەهـا لـە نیشـانەکانی (بـاڵا دەسـتیی خـوا) ئەوەیـە کـە برووسـکەتان پێشـان دەدات، مایـەی تـرس و ئومێدیشـتانەو، لەسـەرێوە ئاوێـك دادەبەزێنـێ، زەوی دوای مردنـی پـێ دەژیەنێتـەوە، بێگومـان لـەوەدا نیشـانە هـەن، بـۆ کۆمەڵێـك بفامـن ﴿٢٤﴾ هەروەهـا لـە نیشـانەکانی (زانایـی و توانایـی خـوا) ئەوەیـە کـە ئاسـمان و زەوی، بـە فەرمانـی وی ڕاوەسـتاون، ئنجـا هـەر کات لـە زەوییشـەوە بانگێکـی تایبەتـی کـردن، کـت و پـڕ (لـە زەوی) دێنـە دەرێ ﴿٢٥﴾ هـەر کەسـیش کـە لـە ئاسـمانەکان و زەوییدایـە، هـی ویـەو، هەموویـان بـۆی ملکەچـن ﴿٢٦﴾ تەنیـا ئەویـش دروسـتکراو دێنێتـە دی، دوایی (پـاش نەهێشـتنی) دەیگێڕێتـەوەو، پێـی ئاسانتریشـە (لـە دروسـتکردنی)و وەسـفی هـەرە بـەرزی هەیـە، لـە ئاسـمانەکان و زەوییـداو، ئـەو زاڵـی کارزانـە ﴿٢٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يُبْلِسُ): (أَي: يَيْئَسُوا، أو يَسْكُتُوا)، (إبلاس) هەم بە مانای نائومێد بوون، هەم بە مانای بێ دەنگ بوون دێ، دەگوترێ: (الإبْلَاسُ: الحُزْنُ الشَّدِيدُ مِنْ شِدَّةِ اليَأْسِ)، (إبلاس) بریتیە لە دڵ تەنگییەکی زۆر لە زۆر نائومێدییدا، کە ئینسان زۆر دڵتەنگ ببێ، دەگوترێ: (أَبلَسَ فُلَانٌ إذَا سَكَتَ)، کەسێك کە بێدەنگ دەبێ و، لە بێ هیوایی دا هیچ قسە ناکات، ئەوەش پێی دەگوترێ: (أَبلَسَ)، کە چاوگەکەی (إبْلَاس)ە، هەندێك گوتوویانە: (إبليس)یش، لەوەوە هاتوە، کە لە بەزەیی خوا نائومێد بووە.

(رَوْضَةٍ): (رَوْضَة) بە (رِيَاض) کۆدەکرێتەوە، (رِيَاضُ الجَنَّةِ: مَحَاسِنُهَا وَمَلَاذُّهَا)، (رِيَاضُ الجَنَّةِ) شوێنە خۆشەکانی بەهەشت و شوێنە پڕ لەززەتەکانی بەهەشتن، (الرَّوْضَةُ: مُسْتَنْقَعُ المَاءِ والخُضْرَة)، شوێنێکە کە ئاودار بێ و، سەوزایی لێ بێ، دەڵێم: لە ڕاستییدا (رَوْضَة)، بە مانای باغ و بێستان و گوڵ و گوڵزار دێ.

(يُحْبَرُونَ): دڵخۆش دەبن، تاکو شوێنەواری نازو نیعمەت لەسەریان دەردەکەوێ، (يَفْرَحُونَ حَتَّى يَظْهَر عَلَيْهِم حِبَار نَعِيمِهِم، الحِبْرُ وَالحَبْرُ: الأَثَرُ المُسْتَحْسَنُ)، وشەی (حِبْر و حَبْر) بە شوێنەواری جوان و چاك و پەسەند دەگوترێ، (حِبْر و حَبْر) بە زاناش دەگوترێن، بابای زانای خاوەن کتێبان، لەبەر ئەوەی ئەویش زانیارییەکەی لێ دەردەکەوێ و جوانی دەکات.

(لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا): تاکو بە هۆیەوە هۆگریان بن وئارامییتان بۆ بێ و، ئۆخژنتان بۆ بێ، (السُّكُونُ: ثُبُوتُ الشَّيْءِ بَعْدَ تَحَرُّكٍ)، (سُكُون): بریتیە لە چەسپاندن و سەقامگیربوونی شتێك، دوای جووڵە جووڵێ.

(ٱلۡبَرۡقَ): (لَمَعانُ السَّحَابِ)، درەوشانەوەی هەور، ئێمە برووسکەی پێ دەڵێین، هەروەك دەنگەکەی کە (رَعْد)ە، کە ئێمە هەورە تریشقەی پێ دەڵێین، بەڵام تیشکەکەی (بَرْق)ی پێدەگوترێ: برووسکە.

(قَٰنِتُونَ): واتە: ملکەچن، (القُنُوتُ: لُزُومُ الطَّاعَةِ مَعَ الخُضُوعِ)، (قنوت): بریتیە لە فەرمانبەریی لەگەڵ ملکەچیی، واتە: فەرمانبەریی ڕواڵەتیی و ملکەچیی دەروونیی.

(ٱلۡمَثَلُ): (أي: الوَصْفُ) وەسف، سیفەت، (وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ) واتە: سیفەتی هەرە بەرز هی خوایە ﷻ، هەر ناوو هەر سیفەتێکی هەرە بەرز هەیە، تایبەتە بە خواوە.

(المَثَلُ: عِبارَةٌ عَنْ قَوْلٍ في شَيءٍ يُشْبِهُ قَوْلاً فِي شَيْءٍ آخَر، بَيْنَهُمَا مُشَابَهَةٌ لِيُبَيِّنَ أَحَدُهُمَا الآخَرُ نَحْوَ: الصَّيْفَ ضَيَّعتِ اللَّبَن: أَهْمَلْتِ وَقْتَ الإمْكانِ أَمْرَكِ)، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: (وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ) مانای: سیفەتی هەرە بەرز هی خوایە، (مَثَل) بریتیە لە قسەیەك لە بارەی شتێکەوە کە بشوبهێتە قسەیەك لەبارەی شتێکی دیکەوەو لە نێوانیاندا وێکچوون هەبێ، تاکو یەکێکیان ئەوی دیکە ڕوون بکاتەوە، بۆ وێنە کە گوترا: (الصَّيفَ ضَيَّعتِ اللَّبَن)، لە هاوینێ دا شیرەکەت زایە کرد، مەبەست پێی ئەوەیە: لە کاتێکدا کە بۆت دەگونجا، کارێك بکەی، نەتکرد، کە ئەوە بەسەر هاتێکی لەسەرە، بەڵام (المَثَلُ يُضْرَبُ وَلَا يُقَاس)، یانی: ئەگەر تۆ بە کەسێك بڵێی: (الصَّيفَ ضَيَّعتِ اللَّبَن)، مانای ئەوە نیە، کە ئەو کەسەت وەك ئافرەت داناوە، چونکە ئەصڵی پەندەکە لەوەوە هاتوە: پیاوێك داخوازیی لە ئافرەتێك کردوە، ئەویش شووی پێ نەکردوەو، ئامادە نەبووە هاوسەرگیریی لەگەڵ بکات، دوایی ئافرەتەکە شووی کردوە، بەڵام ئاتاج بووە، چۆتە بەردەم ماڵی کابرای کە هەبوو بووە، داوای یارمەتیی لێکردوە، ئەویش پێی گوتوە: (الصَّيف ضَيَّعتِ اللَّبَن)، واتە: لە هاویندا شیرەکەت زایە کرد، دیارە ئەو کاتە

کـە داوای هاوسـەرگیریی لـێ کـردوە، هاویـن بـووە، یانـی: ئەگـەر کاتـی خـۆی ئامـادە بـای هاوسـەرگیریی لەگـەڵ منـدا بکـەی، ئێسـتا پێویسـتی نەدەکـرد بێیـە بـەر دەرگای مـن، هەمـوو شـتێك هـی خـۆت دەبـوو.

بـە هـەر حـاڵ (وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ)، یانـی: سـیفەتی هـەرە بـەرزو، نـاوی هـەرە بـەرزو، حاڵـی هـەرە بـەرز لـە ئاسـمانەکان و زەوییـدا هـی خـوای پـەروەردگارە، واتـە: هیـچ شـتێك نیـە لـە ئاسـمانەکان و زەوییـدا بشـوبهێتە خـوای پـەرەوەردگارەوە، یاخـود هاوتـای خـوا ﷻ بـێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ دوای دە (١٠) ئایەتـی ڕابـردوو، ئەمجـار پێناسـەی خـۆی دەکات، بـەڵام تێکهەڵکێـش لەگـەڵ باسـی ڕۆژی دوایـی و دیداری خـۆی دا و، لەم سـووڕەتە موبارەکەدا چـوار جـار، خـوا ﷻ وشـەی (ألله) لـە سـەرەتای ئایـەت دا دووبـارە دەکاتـەوە:

١- ﴿ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ﴿١١﴾ ﴾.
٢- ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ﴿٤٠﴾ ﴾.
٣- ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ ﴿٤٨﴾ ﴾.
٤- ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ﴿٥٤﴾ ﴾.

لـە هـەر کام لـەو چـوار جارەدا، کە خـوا ناوی خـۆی دەخاتە سـەرەتای ڕستەکەوە، باسـی کۆمەڵێـك کاروبـارو، کۆمەڵێـك لەسـیفەتەکان و، کۆمەڵێـك لەحاڵەکانـی خـۆی دەکات، بـۆ ئـەوەی لـە میانـی ئـەوەدا خـۆی بـە بەندەکانـی بناسـێنێ، کـە ئـەو خوایـەی، پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام) داوا دەکـەن مرۆڤـەکان بیپەرسـتن، کێیـەو کارەکانـی چیـن و سـیفەتەکانی چۆنـن و ناوەکانـی چیـن؟

لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ۝١١ ﴾، خوا ﷻ ئەو کەسەیە کە دروستکراو دەست پێدەکات، واتە: لە سەرەتاوە دەیخوڵقێنێ و دەیهێنێتە دی، لە نەبوونەوە پەیدای دەکات، ﴿ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ﴾، دوای ئەوەش کە دەیفەوتێنێ و لایدەبات، جارێکی دیکە دەیگێڕێتەوە، بۆ وێنە: مرۆڤەکان پێشێ دروستیان دەکات لە نەبوون، دوایی کە دەیانمرێنێ، دووبارە زیندوویان دەکاتەوەو دەیانگێڕێتەوە، کە هەمیشە ئەم دروستکردن و دووبارە دروستکردنەوە بەردەوامە، وەك جاری دیکەش گوتوومانە: لە هەر چرکەیەکدا بە مەزەندە، سەدو بیست و پێنج ملیۆن (١٢٥,٠٠٠,٠٠٠) خانە لە جەستەی مرۆڤدا دەمرێ و، سەدو بیست و پێنج ملیۆن (١٢٥,٠٠٠,٠٠٠) خانەی دیکەش شوێنیان دەگرنەوە، کەواتە: ئەم هێنانەدی (**خَلق**) و دووبارە دروستکردنەوە (**إعادَةُ الخَلق**)ە، بەردەوام لە جەستەی مرۆڤدا هەیە، بە نسبەت ژیاندارانیشەوە بە گشتیی هەروایە، ﴿ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾، دواییش بۆ لای وی دەگێڕدرێنەوە، بۆ سزاو پاداشت.

﴿ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبۡلِسُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ۝١٢ ﴾، ئەو ڕۆژەش کە ئاخیر زەمان (**سَاعَة**) هەڵدەستێ، تاوانبارەکان نائومێدو بێ دەنگ دەبن، (**تقُوم**)، یانی: هەڵدەستێ، ڕاست دەبێتەوە، (**سَاعَة**) بە زۆریی لە قورئاندا بە مانای: کاتی تێکچوونی گەردوون دێ، واتە: ئاخیر زەمان، بەڵام لە هەندێك شوێندا بە مانای ڕۆژی دوایی دێ، بە گشتیی یان بە مانای قیامەتیش دێ، ئەگەرنا قیامەت بە مانای هەڵسان و زیندوو کرانەوە دێ، بەڵام جاری واش هەیە (**سَاعَة**) لە جیاتی قیامەت دێ، کە ئێرە یەکێ لەو جارانەیە، ﴿ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبۡلِسُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾، ئەو ڕۆژەی کە (**سَاعَة**) دێ تاوانبارەکان نائومێدو بێ دەنگ دەبن، کە بە تەئکید مەبەست پێی هەڵسان و زیندوو بوونەوەیە، ﴿ وَلَمۡ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمۡ شُفَعَٰٓؤُاْ ﴾، هەروەها لە هاوبەشەکانیاندا کە پێیان وابوو، هاوبەشیانن و، دەیانکردنە هاوبەش لە بەندایەتیی کردندا، بەشێك لە بەندایەتییشیان بۆ ئەوان دەکرد، لە نێو ئەواندا هیچ تکا کاریان نەبوون، ﴿ وَكَانُواْ بِشُرَكَآئِهِمۡ

كَـٰفِرِينَ ﴿١٣﴾، بـە هاوبەشـەكانیان بێبڕوابـوون، یانـی: یەخەیـان لەبـەردا دڕیـن و حاشـایان لێكـردن، گوتیـان: ئێـوە هاوبەشـی خـوا نەبـوون و، ڕاسـت نەبـوو كـە ئێمـە ئێوەمـان بـە هاوبەشـی خـوا لـە پەرسـتندا، دانابـوو.

﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ ﴿١٤﴾ ﴾، ئـەو ڕۆژە كـە (سَـاعَة) دێ، واتـە: قیامـەت دێ، ئـەو كاتـە دێ، كـە مرۆڤـەكان تێیـدا زینـدوو دەكرێنـەوەو هەڵدەسـتێنرێنەوە، لـەو ڕۆژەدا دەپڕژێـن، (سـاعة)، یانـی: كاتێكـی دیارییكـراو، ڕۆژێ ئـەو كاتـە دیارییكـراوە دێ، كـە مرۆڤـەكان تێیـدا هەڵدەسـتێنرێنەوە، زینـدوو دەكرێنـەوە بـۆ سزاو پاداشـت، ﴿ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ ﴾، لـەو ڕۆژەدا لێـك بـڵاو دەبـن و، دەپڕژێـن و، پۆلێـن دەكرێـن.

﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَهُمْ فِى رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ﴿١٥﴾ ﴾، ئنجا هەرچـی ئەوانـەن كـە بڕوایـان هێنـاوەو، كـردەوە باشـەكانیان ئەنجام داون، ئـا ئەوانـە لـە نێـو بـاغ و بێسـتان و گـوڵ و گوڵـزاردا دڵخـۆش دەكرێـن و، شـوێنەواری دڵخۆشـیی و شـادمانییەكە لـە ڕووخسـاریاندا دیـارە، ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلْـَٔاخِرَةِ فَأُوْلَـٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴾، بـەڵام ئەوانـەی كـە بێبـڕوا بـوون و ئایەتەكانـی ئێمـەو، دیـداری ئێمەیـان بـە درۆ دانـاوە، ئـا ئەوانـە لـە نێـو ئـازارو سـزادا ئامـادە دەكرێـن، وەك چـۆن پۆلیـس بـە دوای كەسـێكدا دەگـەڕێ، دەیگـرێ ودەیهێنـێ، ئەوانـەش ئـاوا دەهێنرێـن بـۆ نێـو سـزا، چونكـە ئەگـەر بـە خۆشـیی خۆیـان هاتبـان، خۆیـان دەهاتـن، بـەڵام دیـارە ئەوانـە هێنـراون، ڕەپێچـەك دراون و دەسـتگیركراون و، بـە ناچاریـی پەلكێـش كـراون بـۆ لای سـزای خـوا.

﴿ فَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ ئنجـا پاكیـی بـۆ خـوا، یـان: خـوا بـە پـاك بگـرن، یـان خـوا پـاك و بێگـەردە، لـە كاتێكـدا كـە دەچنـە نێـو ئێوارەوەو، لـە كاتێكـدا كـە دەچنـە نێـو بەیانییـەوە (ئێـواران و بەیانییـان)، یاخـود لـە ئێـوارەوە تاكـو بەیانیـی، هەروەهـا لـە بەیانیـی تاكـو ئێـوارە، ﴿ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، سـتایش هـەر بـۆ ئـەوە لـە ئاسـمانەكان و زەوییـدا، ﴿ وَعَشِيًّا

﴿ وَحِينَ تُظۡهِرُونَ ١٧ ﴾، هەروەها لە شەواندا (عَشِيّ)، لە دوای نوێژی ئێوارە (نوێژی عەسر)ەوە، پێی دەگوترێ (عَشِيّ)، ﴿ وَحِينَ تُظۡهِرُونَ ﴾، هەروەها لە کاتێکدا دەچنە نێو نیوەڕۆیەوەو، لە کاتی نیوەڕۆشدا، واتە: لە هەموو کاتەکاندا، پاکیی بۆ خواو، ستایش بۆ خواو، لە هەموو شوێنەکاندا کە ئاسمانەکان و زەوییـن.

﴿ يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ ﴾، (خوا) زیندوو لە مردوو دەردێنێ و، مردووش لە زیندوو دەردێنێ، ﴿ وَيُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا ﴾، زەوییش دوای ئەوەی مردوە، دەیژێنێتەوەو زیندووی دەکاتەوە، مەبەست لە مردنی زەوی، ئەوەیە کە ڕووبەری زەوی کە پێشتر گژوگیای لێ بووەو، دەغڵ و دانی لێ بووەو، کشتوکاڵی لێ بووە، کاتێك دێ، هەمووی زەرد هەڵدەگەڕێ، دوایی وشك هەڵدەگەڕێ و، با وەك کەڕەگەڵ ڕای دەدات و، زەوییەکە سوورو سەقەتاڵە دەبێتەوەو هیچی لێ نامێنێ، هیچ نیشانەی ژیان و سەوزایی لێ نامێنێ، مەبەست لە مردنەکە ئەوەیە، ﴿ وَيُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا ﴾، دوای ئەوەی ئەو زەوییە مردوە، زیندووی دەکاتەوەو، دووبارە ژیان لەو سەر زەوییە، سەر دەردێنێتەوە لە کەشی بەهاراندا، ﴿ وَكَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ ١٨ ﴾، ئێوەش هەر بەو شێوەیە دەردەهێنرێنەوە لە زەوی، وەك چۆن ئێوە ساڵانە زەوی دەبینن، وشك و قاقڕو بێ کشتوکاڵ سوورو سەقەتاڵە، دەبێتەوەو، گیایەکەی لەسەر پشتیەتی و، دەغڵ و دانەکەی هەر هەمووی دەدروێتەوە، یاخود دەبێتە پووش و پەڵاش، بەڵام ساڵی دوایی جارێکی دیکە سەر زەوی دەڕازێتەوە، ئێوەش هەر بەو شێوەیە، ئێستا لەسەر زەویین، ئنجا دوای ئەوەی دەمرن و دەنێژرێن و دەبنەوە بە خاك، هەر بەو شێوەیەی ئەو ڕووەکە، دەردەهێنرێنەوە لە زەوی.

﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ ﴾، هەروەها لە نیشانەکانی خوا ﷻ، واتە: نیشانەکانی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریەتیی و مشوورخۆریەتیی وی و، لە نیشانەکانی باڵادەستیی خواو، زانایی خواو، میهرەبانیی خواو، کاربەجێیی خوا، ﴿ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ﴾، ئەوەیە کە ئێوەی لە گڵ دروست کردوە، ﴿ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٞ

﴿تَنتَشِرُونَ ﴿١٩﴾﴾، دوایی ئێوە کت و پڕ دەبنە بەشەرێك و بڵاودەبنەوە، ئنجا لە گڵەوە تاکو بەشەر، خوا ﷻ قۆناغەکانی هەموویان هەڵبواردوون و باسی نەکردوون، تاکو دەرکەوێ کە سەرەتای ئێمە گڵەو، کۆتاییەکەمان ئەوەیە کە دەبینە بەشەرێك، مرۆڤێکی پڕ بە کراس و، بە زەویدا بڵاو دەبینەوە!

﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا﴾، هەروەها لە نیشانەکانی خوا، ئەوەیە کە لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون، ئنجا ئەمە ئەگەر دوێندراوەکان (مخاطبین) پیاوان بن، واتە: ئافرەتانی بۆ دروستکردوون و، ئەگەر دوێندراوەکان ئافرەتان بن، واتە: پیاوانی بۆ دروستکردوون، ﴿لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا﴾، تاکو هۆگریان بن و ئارامیی و ئۆخژنتان بۆبێ و، دڵتان دابمرکێ و، هەست بە ئاسوودەیی بکەن، ﴿وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾، لە نێوانتاندا خۆشەویستیی و بەزەیی داناوە، هەم یەکدییتان خۆش دەوێ و بەرەو یەك پەلکێش دەکرێن، هەم بەزەییتان بەرانبەر بە یەك دەبێ، ئەگەر بەڕاستیی ژن و مێردی یەکدی بن و، لەسەر بناغەیەکی ڕاست و دروست، ئەو هاوسەرگیرییەتان پێك هێنابێ.

هەڵبەتە لێرەدا وەك لە تەفسیری سوورەتی (النساء)یش دا، باسمان کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا﴾، لە نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە لە خۆتان هاوسەرانتانی بۆ دروستکردوون، واتە: لە جینسی خۆتان ولە شێوەی خۆتان، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا ﴿١﴾﴾النساء، واتە: ئەی خەڵکینە! پارێز لەو پەروەردگارتان بکەن، کە ئێوەی لە یەك نەفس هێناوەتە دی و، هاوسەرەکەشی هەر لە خۆی هێناوەتە دی، ئا ئەوە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی حەووا لە ئادەم جیا بۆتەوەو، لە پەراسووی ئادەم دروستبووە، ئەوە لە پەیمانی کۆندا هاتوەو لە ڕاستییدا قورئان وا نافەرموێ، ئنجا ئەگەر حەووا لە ئادەم جیا بووبێتەوە، بە پێی ئەو ئایەتەی سوورەتی (النساء)، بە پێی ئەم ئایەتی سوورەتی **(الروم)** یش، دەبێ هەموو ژنەکان لە مێردەکانیان جیابووبنەوە، یان هەموو مێردەکان

لـە ژنەکانیـان جیـا بووبنـەوە! کـە بـە تەئکیـد وانیـە، بەڵکـو هـەم ئـەوەی سـوورەتی (النسـاء)و، هـەم ئـەوەی ئێـرەش مەبەسـتی ئەوەیـە، کـە ژنیـش دروسـتبووە لـە هەمـان جـۆرە نەفـس کـە پیـاوی لـێ دروسـتبووەو، پیاویـش لـە هەمـان جـۆرە نەفسـە، کـە ژنـی لـێ دروسـت بـووە، یانـی: لـە ڕووی نەفـس و سروشـتەوە، یـەك نەفـس و سروشـتیان هەیـە، یـەك شـێوە پێکهاتەیـان هەیـە.

لـە هەندێـك لـە فەرمایشـتاندا پێغەمبـەر ﷺ ئامۆژگاریـی پیـاوان دەکات، کـە لەگـەڵ هاوسـەرەکانیان بـاش بـن و، باسـی ئـەوە دەکات کـە ئافـرەت لـە شـێوەی پەراسـوودا دروسـتبووە، بۆوێنـە دەفەرمـوێ: {**الْمَـرْأَةُ كَالضِّلَـعِ، إِنْ أَقَمْتَهَـا كَسَـرْتَهَا، وَإِنْ اسْـتَمْتَعْتَ بِهَـا، اسْـتَمْتَعْتَ بِهَـا وَفِيهَـا عِـوَجٌ**} (**أخرجـه البخـاري: ٤٨٨٩، ومسـلم: ٥٩**)،

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە رضي الله عنه دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی: ئافـرەت وەك پەراسـوویە، ئەگـەر ڕاسـتیبکەیەوە دەیشـکێنی، ئەگـەر بەهرەشـی لێوەربگـری بەلاریـی لێـی بەهرەمەنـد دەبـی، ئنجـا لـە هەنـدێ شـوێنان دەفەرمـوێ: {**خُلِقَـتْ الْمَـرْأَةَ مِـنْ ضِلَـعٍ**}، واتـە: لـە پەراسـوو دروسـت بـووە، یانـی: لـە شـێوەی پەراسـوودا دروسـت بـووە، چونکـە فەرموودەکـەی دیکـە دەفەرمـوێ: (**كَالضِّلَـعِ**) وەك پەراسـوو وایـە، ئنجـا ئـەوەش کـە دەفەرمـوێ: ئافـرەت لـە پەراسـوو دروسـتبووە، واتـە: لـە شـێوەی پەراسـوودا دروسـتبووە، شـێوەی پەراسـوو چییـە؟

ئینسـان بیسـت وچـوار (٢٤) پەراسـووی هـەن، کـە دوازدە لـەولاو دوازدەش لـەولا (لـە لای ڕاسـت و چـەپ)، قەفەسـەی سینگیان دروسـتکردوە، ئـەو قەفەسـەی سـینگەش جـەرگ و دڵ و سـیپەلاك و سـپڵ و ئەوانـەی هەموویـان گرتوونـە خـۆی، پەراسـووەکان بـە هـۆی لاریانـەوە، توانیویانـە دەفـەی سـینگ دروسـت بکـەن، ئەگـەر لار نەبوونایـەو ڕاسـت بوونایـە، بـە کەڵـك نەدەهاتـن، ئافرەتیـش لـە چـاوی پیـاودا لارییەکـی تێدایـە، ئەویـش ئەوەیـە کـە عاتیفـەو سـۆزی زاڵـە بەسـەر عەقڵیـدا، بـەڵام بـە هـۆی ئـەو لارییـەوە کـە لـە چـاوی پیـاودا وایـە، ئەگەرنـا ئافـرەت لـە

خودی خۆیدا لار نیە، خوای پەروەردگار لەبەر ئەوەی ئەرکی دایکایەتیی و، بە خێوکردنی منداڵ و، منداڵ بوونی بە ئافرەت سپاردوە، وەك شتێکی سروشتیی کە هەموو پیاوی دنیا، ناتوانن منداڵێکیان ببێ، ئەوە ئەرکێکی سروشتیی و زگماکیی ئافرەتانە، ئنجا خوا ﷻ ئەو توانایەشی داوە بە ئافرەتان، کە ئەو ئەرکەیان پێ جێبەجێ بکرێ، ئەویش بریتیە لەوە کە شەفەقەت و بەزەییان زیاترە لە عەقڵ و بیر کردنەوەیان، واتە: عەتف و سۆزیان بەهێزترە، بەڵام مانای ئەوە نیە کە عەقڵیشیان نیە، ئافرەتی وا هەیە لە زۆر پیاوان عاقڵترە، هەروەك پیاوی وا هەیە لە زۆر لە ئافرەتان عاتیفییترەو سۆزو هەڵچوونی زیاترە، بەڵام بەگشتیی ئافرەتان، سۆزو عەتفیان تێدا بە بەهێزترە، هەروەك پیاوان عەقڵ و هۆشیان تێدا بەهێزترەو، پەیوەندیی نێوان پیاوان و ئافرەتان، پەیوەندییەکی تەواوکاریە، نەك پەیوەندییەکی دژ بەیەکدی بوون و مل بەملەکردن لەگەڵ یەکدی، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٍ لِّقَوۡمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾، بەڕاستیی لەوەدا نیشانە هەن، بۆ کۆمەڵێك بیر بکەنەوە، ئەگەر بیر نەکەنەوە لەنهێنیی وحیکمەتەکانی خوا تێناگەن، تەماشا دەکەی: ئافرەت کۆمەڵێك تایبەتمەندیی هەن و، پیاویش کۆمەڵێك تایبەتمەندیی هەن، تایبەتمەندییەکانی پیاو بۆ ئەرکە زگماك و خواڕسکەکانی پیاو گونجاون و، تایبەتمەندییەکانی ئافرەتیش بۆ ئەنجامدانی ئەرکە زگماك و خواڕسکەکانی خۆی گونجاون، ئەگەر بیری لێ بکەیەوە، ئنجا لەحیکمەتی خوا تێدەگەی کە بۆچی خوا ﷻ ئەو مەسەلەیەی جووتیەتیی (**زوجیة**)ی داناوە، کە هەم لە جیهانی بەشەردا هەیە، هەم لە جیهانی ژیاندارانداو بە هەموو جۆرەکانیانەوە: ئاژەڵان و پەرەوران و، لە جیهانی ڕووەکەکانیش دا، بەڵکو ئەو جووتییەتە لە ماددەی بێ ژیانیشدا هەیە، گەردیلەکانیش لە بارگەی موجیب و سالیب پێك دێن، ئەگەر بیری لێ بکەیەوە، ئنجا حاڵیی دەبی کە خوا ﷻ تەنیا خۆی تاکە، ﴿وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ ٣﴾ **الفجر**، ئەگەر هەموو دروستکراوەکان جووت (**شفع**)ن و، تەنیا خوا تاك (**وتر**)و بێ وێنەیە.

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ﴾، هەروەها لە نیشانەکانی خواو (لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی خوا) دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازیی زمانەکانتان و ڕەنگەکانتانە، ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ ﴾، بەڕاستیی لەوەدا نیشانە هەن، بۆ زانایان، یانی: کەسانێك لەوە تێدەگەن کە بزانن خوا چۆن ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی، ئەو گەردوونە چۆن دروستکراوە؟ پاشان لە جیاوازیی زمانەکان بکۆڵنەوە کە زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) زمان لە دنیادا هەیە، دیسان جیاوازیی ڕەنگەکان، تەماشا دەکەی هیچ دوو مرۆڤێك لەم سەر زەوییە، وەك یەك نین، لە ئادەمەوە تاکو دوا مرۆڤی ئەم سەر زەوییە، قەت دوو کەس وەك یەك نین ونابن، تەنانەت دووانەکان (**توائم**)یش، ئەوانیش جیاوازیی ورد لە نێوانیاندا هەر هەیە، ئنجا کە وەك یەك نین، نەك تەنیا لە ڕواڵەتیان دا، بەڵکو دەنگیان، سروشتیان، جۆری ڕۆیشتنیان، جۆری هەڵسوکەوتیان، جۆری (DNA)یان، هیچیان وەك یەك نین.

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ﴾، هەروەها لە نیشانەکانی خوا، بریتیە لە خەوتنتان لە شەوگارو لە ڕۆژگاردا، ﴿ وَٱبْتِغَآؤُكُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ﴾، دیسان خواستنتان لە بەخششی خوا، واتە: کارو کاسبیی و گەڕانتان بە دوای بەخششی خوادا، کە ئەو بژیوو ڕۆزییەیە، پەیدای دەکەن، کە دەفەرمویّ: ﴿ مَنَامُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ﴾، لە شوێنی دیکەدا خوا ﷻ فەرموویەتی: لە شەوگاردا دەخەون و، لە ڕۆژگاردا کاسبیی دەکەن، ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ﴿٦٧﴾ ﴾**یونس**، واتە: شەوی بۆ وا لێکردوون، کە تێیدا بسرەون و بخەون و، ڕۆژگاریشی بۆ وا لێکردوون تێیدا ببینن و کاسبیی بکەن، بەڵام لێرە کە هەردووکیانی پێکەوە هێناون، لەبەر ئەوەیە کە دەگونجیّ مرۆڤ بە شەویش کاسبیی بکات و بەڕۆژیش بخەویّ، هەندێك کەس وای بۆ هەڵدەسووڕیّ کە بە شەویّ بێداربیّ و کارو کاسبیی بکات، وەك کاروانچیی و قاچاغچیی و ئەوانەی کاری بارو سوار دەکەن، بە ڕۆژیّ ئیسراحەت بکەن و پشوو بدەن، یاخود زۆر

کەس بە شەو پاسەوان و ئێشکچیەو، بە شەوێ کارەکەی خۆی دەکات، بە ڕۆژێ پشوو دەدات و ئیسراحەت دەکات، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾، لەوەدا نیشانە هەن، بۆ کۆمەڵێك ببیستن، واتە: هێزی بیستنیان بەکاربێنن کە لە دەرەوەی خۆیانەوە زانیاریی وەربگرن، چ زانیاریی وەحیی، چ زانیاریی خەڵکی دیکە لە ڕێی بیستنەوە، دەتوانن خۆیانی پێ دەوڵەمەند بکەن.

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾، دیسان لە نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە برووسکەتان پێشان دەدات، هۆی ترساندن و هۆی تەماع وەبەرنانیشتانە، ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾، لە سەرێوەش ئاوێك دادەبەزێنێ، ﴿فَيُحْيِي بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾، ئنجا زەوی لە دوای مردنی، پێ دەژیێنێتەوەو زیندووی دەکاتەوە، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾، بە دڵنیاییەوە لەوەدا نیشانە هەن، بۆ کۆمەڵێك بفامن، عەقڵیان بەکاربێنن و تێبفکرن، نیشانەی زۆر دەبیننەوە لەوەدا: لە هەورە تریشقەدا، لە برووسکەدا، لە دابەزینی ئاودا لە ئاسمانەوە، کە لە ئەنجامی متوربەبوون (تلقیح)ی هەورەکاندا برووسکەو هەورە تریشقە پەیدادەبن، پاشان زەوی چۆن زیندوو دەبێتەوە بەو ئاوەو، چۆن زەوییەکی قاقڕو دێمەکار، کە هیچ جۆرە جووڵەو سەوزایی لێ نیە، دوایی تەماشا دەکەی پڕ دەبێ لە چەندان جۆرە ڕووەك و، پڕ دەبێ لە گوڵ و لالەو نەسرین، یاخود دڕك و داڵ و ڕووەکی جۆراوجۆر، یان دانەوێڵەی جۆراوجۆر، یان سەوزەو تەڕەکارو ... هتد.

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَن تَقُومَ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ بِأَمْرِهِ﴾، دیسان لە نیشانەکانی وی (خوا ﷻ) ئەوەیە، کە ئاسمان و زەوی بە فەرمانی خوا ڕابوەستن.

خوا ﷻ لە زۆر شوێن دا ئاماژەی بەوە کردوە، کە ئاسمانی ڕاگرتوە، بۆوێنە: ﴿وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَن تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ ۝٦٥﴾ **الحج**، خوا ئاسمانی ڕاگرتوە کە بکەوێتە سەر زەوی، مەگەر بە مۆڵەتی خۆی، هیچ پارچەیەك لەو ئاسمانە

بەر نابێتەوە سەر زەوی، ئەگەرنا هەموو خڕۆکەی زەوی تەنیا بەشی ئەوە دەکات، پارچە ئەستێرەیەك، یاخود پارچە خڕۆکەیەکی لەسەر بکەوێتە خوار، ﴿ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ﴾، دوایی کاتێك خوا ئەو بانگکردنەی لە زەوییەوە بانگی کردن، ﴿إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ﴾، ئێوە یەکسەر دێنە دەر، واتە: لە ڕۆژی دواییدا، دوای ئەوەی خوا بانگتان دەکات، ئیسرافیل بۆ جاری دووەم فوو بە صوڕ (کەڕەنا) دا دەکات، ئێوە هەمووتان هەر کەسە لە ئاستی خۆی لە گۆڕەکەی خۆی دێتە دەر، یاخود جەستەکەی لە کوێدا بڵاوبۆتەوە، دێتەوە دەرو، ڕووحی بە بەردا دەکرێتەوە.

﴿وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾، هەر کەسێك لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەمووی هی خوایەو، هەموویان بۆ خوا ملکەچن.

ئەمە وا پێدەچێ مەبەستی پێ فریشتەکان بن، چونکە فریشتەکان بۆ خوا ملکەچن، فەرمانبەری خوان، ئەگەر مەبەست پێی مرۆڤ و جند و فریشتەکانیش بن، واتە: لەو ڕووەوە کە ناتوانن لە سیستمی خوا لابدەن و، لەو ڕووەوەش کە یاسا گەردوونییەکان بەسەریاندا حاکمن، هەموویان ملکەچن بۆ خوا.

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾، خوا ئەو زاتەیە کە دروستکراو دەست پێدەکات و دوایی دەیگێڕێتەوە، ﴿وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾، ئەوە لە لاشی ئاسانترە، سێناترە بۆ خوا، هەڵبەتە خوا بەپێی عەقڵی ئێمە فەرمایشت دەکات، ئەگەرنا بە نسبەت خواوە، ئاسان و قورس نیە، ئاسان و ئاسانتر نیە، هەمووی وەك یەکە، وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾﴾ یس، واتە: فەرمانی خوا ئەگەر ویستی شتێك بکات، بەس بفەرموێ: ببە، یەکسەر دەبێ، بێگومان وشەی (کن) ببە، دیسان بۆ تێگەیاندنی ئێمەیە، ئەگەرنا خوا ﷻ ئەو وشەیە بەکارناهێنێ، یانی: وەك چۆن ئێوە بە شتێك بڵێن: ببە، هەڵسە، یەکسەر ئەو کەسە هەڵسێ، یان دابنیشە، یەکسەر دابنیشێ،

یـان لاچۆ، یەکسـەر لابچـێ، وەك چـۆن ئێـوە کـە فەرمانێکـی وا دەکـەن، شـتەکەتان بـۆ بێتـە دی، چەنـد ئاسـانە بـۆ خـوای پەروەردگاریـش ئاوایـە، یانـی: مەبەسـت ئەوەیـە هـەر کاتێـك ویسـتی خـوا ڕوو بکاتـە ئـەو شـتە، یەکسـەر پەیدادەبێ، ﴿ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، سـیفەتی هـەرە بەرزیـش تەنیـا بـۆ خوایـە، لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا، کەواتـە: ئـەو شـتانەی کـە دەکرێنـە هاوبەشـی خـوا، لەگـەڵ خـواداو لـە جیاتـی خـوا دەپەرسـترێن، شـتی پووچـن، بـەس خـوا خاوەنـی سـیفەتی هـەرە بـەرزە لـە ئاسـمانەکان و زەوییـدا، بۆیـە هـەر ئەویـش شایسـتەی پەرسـتران و بەندایەتیـی بـۆ کرانـە، جگـە لـە خـۆی هەمـووی دروسـتکراوی خوایـەو بەنـدەی خوایـە، دروسـتکراوی خوایـە، ئەگـەر خاوەنـی ئیـرادەو شـعوورو هەسـت نەبـن، دروسـتکراوو بەنـدەی خـوان، ئەگـەر خاوەنـی ئیـرادەو هەسـت و شـعوور بـن، وەك فریشـتەکان و مرۆڤـەکان و جنـدەکان، ﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، هـەر خـواش ﷻ زاڵـی کاربەجێیـە، زاڵ و باڵادەسـتەو، کاربەجێشـە کارەکانـی هەمـووی لـە شـوێنی خۆیانـدان.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**هاتنی ڕۆژی دوایی مسۆگەرەو، لە كاتی هاتنی قیامەت دا، تاوانباران بێ دەنگ و نائومێد دەبن، حاشا لە هاوبەشەكانیان دەكەن و، لەو ڕۆژەدا خەڵك لە یەك جیادەكرێنەوەو پەرتەوازە دەبن، بڕوادارانی چاكەكار لە بەهەشت داو، بێبڕوایانی بە درۆدانەری نیشانەكانی خواو دیدارەكەی، لە ئازاری دۆزەخدا ئامادە دەكرێن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿١١﴾ وَيَوۡمَ تَقُومُ
ٱلسَّاعَةُ يُبۡلِسُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿١٢﴾ وَلَمۡ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمۡ شُفَعَٰٓؤُاْ وَكَانُواْ بِشُرَكَآئِهِمۡ
كَٰفِرِينَ ﴿١٣﴾ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوۡمَئِذٖ يَتَفَرَّقُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَهُمۡ فِي رَوۡضَةٖ يُحۡبَرُونَ ﴿١٥﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا
وَلِقَآيِٕ ٱلۡأٓخِرَةِ فَأُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ ﴿١٦﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ﴾، خوا ﷻ دروستكراو دەست پێدەكات، لە سەرەتاوە دەیهێنێتە دی، دوای دەیگێڕێتەوە پێشتریش گوتمان: لەم سوورەتەدا چوار جاران وشەی (ألله) كراوە بە سەرەتای ڕستە، ئەمە شوێنێكیانە، شوێنی دووەمیان: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ ثُمَّ رَزَقَكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ﴿٤٠﴾ ﴾، شوێنی سێیەم: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي يُرۡسِلُ ٱلرِّيَٰحَ ﴿٤٨﴾ ﴾، شوێنی چوارەم: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعۡفٖ ﴿٥٤﴾ ﴾، كە مەبەست پێیان ئیسپاتی یەكتایی خوایە لە پەروەردگار بوون و، بەدیهێنەر بوون و، پەرستران و بەندایەتیی بۆ كراندا.

٢)- ﴿ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾، دوای ئەوەی کە فەوتاندنیشنی جارێکی دیکە دەتانگێڕێتەوە، (**تُرجَعُون**)، خوێندراویشەتەوە: (**يُرْجَعُون**)، بۆ لای وی دەگێڕدرێنەوە بە شێوەی نادیار، بەڵام (**تُرْجَعُون**)، بە شێوەی حاڵەتی دوێنراو (**مُخَاطَب**)ە.

٣)- ﴿ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبۡلِسُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾، ئەو ڕۆژە کە (**ساعة**) هەڵدەستێ، قیامەت هەڵدەستێ، قیامەت ڕادەبێ، ئەو کاتە دێ کە مرۆڤەکان تێیدا زیندوو دەکرێنەوە، تاوانباران بەخەفەتبارییەوە نائومێد دەبن.

﴿ يُبۡلِسُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾، تاوانباران نائومێد دەبن، خەفەتبار دەبن، زۆر دڵ داگیراو دەبن، پاشان بێ دەنگ دەبن، چونکە: (**الإِبْلَاسُ: سُكُوتٌ بِحِيرَة**)، یان (**سُكُونٌ بِحِيرَة**)، بێ دەنگیی، یاخود بێ جموجۆڵیی بە سەرسامیی و بە سەراسیمەییەوە.

٤)- ﴿ وَلَمۡ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمۡ شُفَعَـٰٓؤُاْ ﴾، لە نێو هاوبەشەکانیاندا تکاکاریان نەبوون، وەك خەیاڵیان دەکرد، ئەوە خەیاڵ پڵاوێك بوو، پێیان وابوو ئەوانەی دەیانکەن بە هاوبەشی خوا، لە ڕۆژی دواییدا، تکاو ڕەجایان بۆ دەکەن، لەلای خوا، وەك یەکێك لەوانەی کە بە هەڵە لە تەصەووف حاڵیی بووە، ئەگەرنا تەصەووف و تەزکیەی ڕاستەقینە لایەنێکی ڕەسەنە لە ئیسلامدا، کە مسوڵمانان پەروەردە دەکات لە ڕووی ئیمانیی و، ڕووحیی و، ڕەوشت و ئاکارەوە، ئنجا یەکێك لەوانە کە بە هەڵە حاڵیی بووەو، بە هەڵە بەو ڕێیەدا ڕۆیشتوە، بە شێخەکەی خۆی دەڵێ:

بۆیە لە دنیا دەستم گر وە تۆ

تاکو لە قیامەت نەبم ڕەنجەڕۆ

یانی: لە دنیادا دەستی بەشێخەکەیەوە گرتوە، تاکو لە قیامەتێ شەفاعەتی بۆ بکات، لە ڕاستییدا پێغەمبەران و شەهیدان و ڕاستان و صاڵیحان و، هەر کەسە لە قەدەر خۆی، تکاو شەفاعەت دەکات، بەڵام دەبێ دەست بە خوا بگری و، بە ڕێی خوادا بڕۆی و، بەندایەتیی خۆت بۆ خوا ساغ بکەیەوەو، هیچ چاوەڕوانییەکت لە جگە لە خوا نەبێ، لەو شتانەدا کە تەنیا بە خوا دەکرێن: شیفا هێنانەو،

سەرخستنەو، ژێر خستنە، هەر شتێك لەو ئیش و كارانەی كە تەنیا بە خوا ﷻ دەكرێن، داواكردن و چاوەڕوانیی كردنیان لە غەیری خوا، بە شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانان لە قەڵەم دەدرێ، ئنجا دەفەرموێ: لە نێو هاوبەشەكانیاندا كە لەلای وان هاوبەشی خوا بوون، نەك لە واقیعدا، شەفاعەت كارو تكاكاریان نەبوون.

٥)- ﴿ وَكَانُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ كَـٰفِرِينَ ﴾، لەوێ بە هاوبەشەكانیان بێبڕوا بوون، واتە: نكووڵیی دەكەن، لەوەی كە سەرپەرشتییان كردبن و، دۆستایەتییان كردبن، حاشایان لێ دەكەن و، لێیان پشت پەل دەبن، پێیان وایە كە بەو شێوەیە دەرباز دەبن، لەوەی كە لە دنیادا دوایان كەوتوون و پەرستوویانن و لە جیاتی خوا بەشێك لە بەندایەتیی، یاخود زۆرێك لە بەندایەتییان بۆ تەرخان كردوون.

٦)- ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ ﴾، ئەو ڕۆژەش كە كاتی دیارییكراو **(ساعَة)** دێ و، ڕۆژی قیامەت دێ، ڕۆژی سزاو پاداشت و لێپرسینەوە دێ، لەو ڕۆژەدا مرۆڤەكان پەرتەوازە دەبن و، لێك بڵاو دەبن.

ئنجا خوا ﷻ ڕوونی دەكاتەوەو چۆن پەرتەوازە دەبن:

٧)- ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَهُمْ فِى رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ﴾، ئەمە ڕوونكردنەوەی وشەی: **(يَتَفَرَّقُونَ)**ە، ئاوا لێك بڵاو دەبن: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، كردەوە باشەكانیان ئەنجام داون، ئەوانە لە نێو باغ و بێستان و گوڵ و گوڵزاردا، دڵخۆش دەكرێن، شادمان دەكرێن، **(فَهُمْ فِي الرَّيَاحِينِ والنَّبَاتَاتِ الملتفَّة، وَبَيْنَ أَنْواعِ الزَّهْرِ فِي الجَنَّاتِ يُسَرُّونَ)**، لە نێو گوڵ و گوڵزارو ڕووەكە لێك ئاڵاوەكان و هەموو جۆرەكانی گوڵدا، لە نێو باغەكاندا، دڵخۆش دەكرێن.

﴿ يُحْبَرُونَ ﴾، **(أي: يُسَرُّون، يُكْرَمُونَ، يُلَذَّذُونَ بالسَّمَاعِ والغِنَاءِ، يُنَعَّمُون)**، زانایان بە هەموو ئەو وشانە لێكیانداوەتەوە: ﴿ يُحْبَرُونَ ﴾، دڵخۆش دەكرێن، ڕێزیان لێ دەگیرێ و، دەكرێنە خاوەن لەززەت و، چێژ وەردەگرن، بە گۆرانیی و قسەی خۆش و، نازو نیعمەتیان پێشكەش دەكرێ.

٨)- ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلْأَخِرَةِ فَأُوْلَٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴾، بەڵام ئەوانەی کە بێبڕوا بوون، بێبڕوابوون بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بە کتێبەکانی خواو بە ڕۆژی دوایی، هەروەها ئایەتەکانی ئێمەو، دیداری ڕۆژی دواییان بە درۆ داناوە، ئا ئەوانە لە سزاو ئازاردا ئامادە دەکرێن.

وشەی: ﴿ مُحْضَرُونَ ﴾، دوو واتای هەن:

١- (مُحْضَر: أي حَاضِر بِحَيثُ لَا يَغِيبُ عَنْهُ)، واتە: ئامادەیەو، لەو سزاو ئازارە ناچێتە دەرێ.

٢- (مُحْضَرُون: مَأْتِيٌّ بِهِم، وَمُحْضَر لَا يُقالُ إِلاَّ فِي الشَّر)، واتە: دەهێنرێن و، پەلکێش دەکرێن، چونکە (مُحْضَر)، تەنیا لە خراپەدا بەکاردەهێنرێ، چونکە مرۆڤێك بۆ چاکە بۆ خۆی دەچێ، بەڵام بۆ سزاو ناخۆشیی و بۆ خراپە، دەبێ پەلکێش بکرێ و، ڕەپێچەك بدرێ و، بە تۆبزیی بهێنرێ، ئەوانەی بێبڕوا بوون و، ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ داناوەو، دیداری ڕۆژی دواییان بە درۆ داناوە، ئا ئەوانە لە سزادا ئامادە دەکرێن و پەلکێش دەکرێن.

خـوا بـە لوتـف و کەڕەمـی خـۆی، ئێمـە لـەو کەسـانە بگێـڕێ کـە بـە هـۆی ئیمـان و کـردەوەی باشـەوە، بـاغ و گـوڵ و گوڵزارەکانـی بەهەشـتمان بـە قسـمەت دەبـن، دڵخۆشـیی و شـادمانیی ئەوێمـان بـە قسـمەت دەبـێ، کە هەر دڵخۆشـیی و شـادمانیی ئـەوێ، ئـەو دڵخۆشـیی و شـادمانییەیە، کـە هەرگیـز ناخۆشـیی بـە دوادا نایەتـەوە، خـوا ﷻ بمانپارێـزێ لـەوەی کـە بـە هـۆی کوفـرو بـە درۆ دانانـی ئایەتەکانـی خـواو دیـداری خـواوە، پەلکێـش بکرێیـن بـەرەو سـزاو ئـازارو جەزرەبـەی خـوا، کـە لـەوێ خـەم و مەینەتییـەك بەسـەر ئـەو کەسـانە دادێ، هەرگیـز لـە کۆڵیـان نابێتـەوە، خـوا بـە لوتـف و کەڕەمـی خـۆی سـەرەنجامامان خێـر بـکات.

## مەسەلەی دووەم:

**زگماك و عەقڵی ساغ، بە پاكگرتن و ستایشكردنی خوا لە هەموو كاتەكاندا، پێویست دەكەن: ئێواران و بەیانییان، نیوەڕۆیان و شەوان، هەروەها لە هەموو شوێنەكاندا: ئاسمانەكان و زەوی، بە بەڵگەی ئەوەش كە خوا بەردەوام زیندوو لە مردوو، مردوو لە زیندوو دەردێنێ و، زەمین دەژێنێتەوە، مرۆڤایەتییش دەژیەنێتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴿١٨﴾ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَيُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١٩﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ ﴾، ئنجا پاكیی و بێخەوشیی بۆ خوا، پیتی (ف) لە: (فَسُبْحانَ)دا، پەیوەندیی بە قسەكانی پێشەوە هەیە، واتە: مادام حاڵ بەو شێوەیە، كەواتە: پاكیی بۆ خوا، وشەی: ﴿ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ ﴾:

أ- دەگونجێ بە مانای (تَسْبِيحاً لِله) بێ و، (سُبْحَانَ) چاوگ (**مصدر**) بێ، یان لە شوێنی چاوگ بێ، (تَسْبِيحَاً لِله): پاكیی بۆ خوا ﷻ.

ب- دەشگونجێ ئەمە فەرمان بێ، یانی: (**سَبِّحُوا اللهَ تَعَالى**)، واتە: خوای بەرز بە پاك بگرن، (**عَن تَصَوُّر الْمُشْرِكِين أَنَّهُ يَعجِزُ عَن إِحْياءِ الأَمْوَات**)، لە بیرو بۆ چوونی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، كە خوا بێ توانایە لە زیندوو كردنەوەی مردووان.

جـ- یان: ﴿ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ ﴾، یانی: (**مُسَبَّحٌ الله تَعَالى**)، واتە: خوا بە پاكگیراوە.

كەواتە: ﴿ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ ﴾، ئەو سێ حاڵەتە ڕێزمانییانەی تێدا ڕەچاو دەكرێن:

أ- (تَسْبِيحاً لِله)، پاكیی بۆ خوا بە ڕەهایی.

ب- (سَبِّحُوا اللهَ)، خوا بە پاك بگرن.

ج- (مُسَبَّحٌ للهُ تَعالی)، خوا بە پاكگیراوە.

ئنجا بە پاكگرتنی خوا، بە دوور گرتنی خواو، بە بەرز گرتنی خوایە، لە هەموو ئەو شتانەی كە لە لایەن خەڵكی نەفام و نەزانەوە، پاڵدەدرێنە لای خوا ﷻ، لێرەدا بە پێی سیاقەكە دیارە كە كافرەكان پێیان وابووە، خوا ﷻ بێ توانایە لەوەی دوای ئەوەی مردوون و دەبنەوە بە خاك، زیندوویان بكاتەوە.

٢)- ﴿ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴾، لە كاتێكدا دەكەونە نێو ئێوارەوەو، لە كاتێكدا بەیانیی دەكەنەوە، دەكەونە نێو بەیانییەوە، (الإِمْسَاءُ: حُلُولُ المَسَاءِ، وَالإِصْبَاحُ: حُلُولُ الصَّباحِ، وَالمَقْصُودُ الدُّخُولُ فِي المَسَاءِ وَالصَّباحِ، مِثْلُ: أَيْمَنَ وَأَنْجَدَ وَأَشْأَمَ)، وشەی (إِمْسَاء)، واتە: داهاتنی ئێوارەو، (إِصْبَاح) واتە: داهاتنی بەیانیی، بەڵام لێرەدا مەبەست: چوونە نێو ئێوارەو چوونە نێو بەیانییەوەیە، وەك: (أَيْمَنَ) واتە: چوو بۆ وڵاتی یەمەن، (أَنْجَدَ)، واتە: چوو بۆ وڵاتی نەجد، (أَشْأَمَ) واتە: چوو بۆ وڵاتی شام.

٣)- ﴿ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، خوا ﷻ بە پاكگیراوەو، بە پاكی بگرن، بەپاكگیران بۆ خوا ئێواران و بەیانیان، ستاییش هەر بۆ ویە لە ئاسمانەكان و زەوییدا، ئەوەی پێشێ باسی كاتەكان بوو، باسی كۆتایی كات و سەرەتای كات، كۆتایی ڕۆژ (ئێوارە)و سەرەتای ڕۆژ (بەیانیان)، ئەمەشیان: ﴿ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، ستاییش هەر شایستەی ئەوە لە ئاسمانەكان و زەویدا، واتە: لە سەرەوەی دروستكراوەكان و لە خوارەوەیان دا.

وەك پێشتریش گوتوومانە: ( وَلَهُ ٱلْحَمْدُ )، كە (الجار والمَجرور) پێش دەكەون، ئەمە كورت هەڵێنان دەگەیەنێ، ئەگەرنا دەیتوانی بفەرموێ: (الحَمْدُ لَهُ)، بەڵام ( وَلَهُ ٱلْحَمْدُ ) وەك: ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥ ﴾ الفاتحة، كورتهەڵێنانی

ستاییشـە لـە خـوادا ﷻ، یانـی: سـتایش بـۆ كـران لـە ئاسـمانەكان و زەوییـدا، هـەر شایسـتەی ئـەوە.

٤)- ﴿ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴾، دێتەوە سەر كاتەكان: هەروەها شەوانەو، كاتێك دەكەونە نێو نیوەڕۆیانیش.

هەندێـك گوتوویانـە: (العَشِـيّ: مَـا بَعـدَ العَصْـر)، واتـە: لـە دوای عەسـرەوە پێـی دەگوتـرێ: (عَشِـيّ)، بـەڵام دەشـگونجێ مەبەسـت پـێ شـەوگار بـێ، چونكـە (تُمْسُـون)، دیـارە دوای نوێـژی ئێـوارە دەگرێتـەوە بـۆ ئـەوەی دووبـارە نەبـێ، ﴿ وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴾، لـە كاتێكـدا كـە دەكەونـە نێـو نیـوەڕۆ.

٥)- ﴿ يُخْرِجُ ٱلْحَيَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ ﴾، زیندوو لە مردوو دەردێنێ.

٦)- ﴿ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَيِّ ﴾، مردووش لە زیندوو دەردێنێ.

ئەمـە هۆكاردانـان (**تعليـل**)ە، بـۆ بـە پاكڕاگرتـن و سـتاییش كردنـی خـوا لـە ئاسـمانەكان و زەوییـدا، بۆیـە خـوا پێویسـتە بـە پـاك بگیـرێ و، بـە پاكگیـراوە، بۆیـە بـە پاكگرتـن بـەس بـۆ وی، چونكـە ئـەو كارە ناوازانـە، تەنیـا بـەو دەكرێـن، زینـدوو لـە مـردوو، مـردوو لـە زینـدوو دەردێنـێ، وشـەی (**مَيِّت**) لـە هـەردوو شـوێنەكان دا بـە (**مَيْت**)یـش خوێندراوەتـەوە.

٧)- ﴿ وَيُحْيِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ﴾، سەر زەمینیش، دوای مردنی زیندوو دەكاتەوە، مردنی زەوی بریتیە لە نەمانی ڕووەك و كشتوكاڵ و، جموجۆڵی زیندەوەران و ژیانداران لەسەری، كە دیارە جموجۆڵی زیندەوەران و ژیاندارانیش لەسەر ڕووی زەوی بە هۆی ئاوو، ڕووەك و شیناوردو دارو درەختەوەیە، كە زەوی ئەوانەی لەسەر نەمان، ئەوانیش نامێنن، وەك گوتراوە: (ئاوو ئاوەدانیی).

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: زەوی زینـدوو دەكاتـەوە دوای مردنـی، واتـە: دوای نەمانـی دیـاردەی ژیـان لەسـەری، كـە ڕووەك و شـیناوردو كشـتوكاڵە.

٨)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ ﴾، هەر بەو شێوەیەش دەردەهێنرێن، واتە: وەك چۆن خوا ﷻ ئێستا زیندوو لە مردوو، مردوو لە زیندوو دەردێنێ.

ئنجا کاتی خۆی زانایان چەمکی ئەو زیندوو لە مردوو دەرهێنان و، مردوو لە زیندوو دەرهێنانە لە لایان، چەمکێکی تەسك بووەو، چەند شتێکی سنوورداری گرتۆتەوە، بۆ وێنە:

گوتوویانە: جووجکە کە زیندووە لە هێلکەی دەردێنێ کە مردووە، هێلکە کە مردووە لە مریشکی دەردێنێ کە زیندووە، یان گوتوویانە: گوڵە گەنمی زیندوو، لە دەنکە گەنمی مردوو دەردێنێ و، پاشان دەنکە گەنمەکان کە مردوون، لە گوڵە گەنمێکی زیندووی خاوەن ژیان دەردێنێ.

بەڵام ئێستا بۆ ئێمە، چەمکی زیندوو لە مردوو دەرهێنان و، مردوو لە زیندوو دەرهێنان، زۆر فراوانە، وەك زۆر جاری دیکە گوتوومانە: بە مەزەندەی زانایانی توێکاریی (**علم التشريح**) دەڵێن: لە هەر چرکەیەکدا سەدو بیست و پێنج ملیۆن (١٢٥,٠٠٠,٠٠٠) خانە لە جەستەی مرۆڤدا دەمرێ و، سەدو بیست و پێنج ملیۆن (١٢٥,٠٠٠,٠٠٠) دیکەی زیندوو شوێنیان دەگرنەوە، خانە زیندووەکان لە خواردنی هەرسکراو کە لە خوێندا هەیە، لەوێوە دروست دەبنەوەو، خانە مردووەکانیش لە جەستە فڕێدەدرێنە دەرەوە، لە ڕێی میزوو پاشەڕۆو، هەناسە فڕێ دانەوە.

هەروەها ئێستا بۆ ئێمە ئەو چەمکە زۆر زۆر فراوانترە، کە دەزانین لە چرکەیەکدا ملیاران ڤایرۆس و، میکرۆب و بەکتریا دەمرن و، هی دیکە شوێنیان دەگرنەوە، کەواتە: ئەو زیندوو لە مردوو پەیداکردن و، مردوو لە زیندوو پەیدا کردنە، پرۆسەیەکی زۆر گشتگیرە، هەم جیهانی بەشەر، هەم جیهانی ژیانداران بە گشتیی ئاژەڵ و پەڕەوڕو زیندەوەرە وردەکان و، هی نێو هەواو، هی نێو دەریاو، هی سەر زەوی و، هی بن زەوی، هەمووی دەگرێتەوە، هەروەها جیهانی ڕووەك و شیناوردو دارو درەختەکانیش دەگرێتەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ﴾، واتە: وەك دەرهێنانی زیندوو لە مردوو، مردوو لە زیندوو، چۆن ئێستا بەردەوام ئەو پرۆسەیە هەیە، ئێوەش هەر بەو شێوەیە خوای موتەعال کاتێك کە مردن، لە هەر کاتێکدا کە ویستی لەو زەوییە مردووە، ئێوە بە زیندوویی دەردێنێتەوە.

هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ﴾، واتە: ئا بەو شێوەیە کە ئێستا لەبەر چاوتانە، هەر بەو شێوەیەش لە قیامەتدا دەردەهێنرێنەوە.

فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ هەیە، لەو بارەوە: {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** رضي الله عنه **أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** ﷺ **قَالَ: «كُلُّ ابْنِ آدَمَ يَأْكُلُهُ التُّرَابُ، إِلاَّ عَجْبُ الذَّنَبِ مِنْهُ خُلِقَ وَفِيهِ يُرَكَّبُ»**} **(أخرجه البخاري: ٤٦٥١، ومسلم: ٢٩٥٥، وأبو داود: ٤٧٤٣، والنسائي: ٢٠٧٧).**

واتە: ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو جەستەی ئادەمزاد گڵ دەیخوات، جگە لە ئێسکی کلێنجە (**عَجْبَ الذَّنَبِ**) کە لێی دروست بووەو لەویش پێکدەهێنرێتەوە.

(**عَجْبَ الذَّنَبِ**) ئێسکی کلێنجەی پێ دەڵێن، لەکۆتایی بڕبڕاگەکانی پشت دا، ئێسقانێکی بچووك هەیە، کە لە نێو ئەو ئێسکە گچکەیەدا (**عَجْبُ الذَّنَب**) هەیە، (**عَجْب**) یانی: نێوك، (**ذَنَب**)یش بە مانای کلك دێ، واتە: کۆتایی بڕبڕەی پشت، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ ئێستا ئیعجازێکی زانستییشی تێدایە، کە ئێستا زانست دەریخستوە، کە نێوکە کلکە (**عَجْبُ الذَّنَب**)ە بەهێزترین ماددەیەو بە تێزابیش نافەوتێ و لە بەین ناچێ.

**مەسەلەی سێیەم:**

**خستنە ڕووی دوازدە نیشانەو بەڵگەی گەورەو گرنگ، لەسەر بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگاریتیی و، مشوورخۆریی خوا ﷻ، بۆ ژیان و مرۆڤ و گەردوون، وەك بەڵگە لەسەر تەنیا پەرستراویێتیی خواو ﷻ ناڕەوایی هاوبەش بۆ دانانی:**

خوا دەفەرمویّ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ
﴿٢٠﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم
مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّلْعَـٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ وَمِنْ
ءَايَـٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبْتِغَآؤُكُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ
يَسْمَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ
مَآءً فَيُحْىِۦ بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٤﴾
وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ ۚ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ
تَخْرُجُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەژدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ﴾، لە نیشانەکانی (واتە: لە نیشانەکانی بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگاریتیی و خاوەنداریتیی وی)، ئەوەیە کە ئێوەی لە گڵ هێناوەتە دی.

ئادەم ﷺ ڕاستەوخۆ لە گڵ دروست بووە، بەڵام وەچەی ئادەم بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە گڵ دروست بوون، چونکە جەستەی ئێمەش سەرەتا لەو نوتفەیەی کە لە ئاوی باب و دایك پێك دێ، وەك لە سەرەتای سوورەتی **(المؤمنون)** باسێکی تایبەتمان دەربارەی چۆنیەتی دروست بوونی مرۆڤ کرد،

ئـەو نوتفەیـە لـە حەیمەنێکـی پیـاوو هێلکۆڵـەی ئافـرەت دروسـت دەبـێ، کـە هەردووکیـان دوو زینـدەوەری زینـدوون، ئەوانیـش لـە خوێـن دروسـت دەبـن و، خوێنیـش لـە خواردنـی هەرسـکراو و، خواردنـی هەرسـکراویش، دووبـارە دەگەڕێتـەوە بـۆ زەوی، کەواتـە: ئـادەم ڕاسـتەوخۆ لـە گڵ دروسـت بـووە، بـەڵام وەچەکـەی بـە شـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ لـە گڵ دروسـت بـوون.

٢)- ﴿ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴾، دوایی ئێوە یەکسەر، کت و پڕ، دەبنە مرۆڤێك کە بە زەویدا بڵاودەبنەوە، چونکە مرۆڤ سەرچاوەکەی و دەستپێکەکەی: گڵە، چ وەك باب و دایکی: ئادەم و حەووا سەلامی خوایان لێبێ، چ وەك یەك یەکی مرۆڤەکان.

(**ثُمَّ**) بـۆ ڕیزبەندیـی پلەییـە (**للتَّرتیـبِ الرُّتبـي**)، (**إذَا**)ش بـۆ (**مُفاجَئَة**)یـە، کتـو پـڕ ئێـوە دەبنـە مرۆڤێـك کـە بڵاودەبنـەوە، واتـە: بەسـەر زەوییـدا بڵاودەبنـەوە، ئنجا گڵ لـە کـوێ و مـرۆڤ لـە کـوێ؟ مەسـافەو ماوەیەکـی زۆر دووریـان لـە نێـوان هەیـە، بۆیـە خـوا ﷻ وشـەی (**ثُمَّ**)ی بەکارهێنـاوە، واتـە: دوایـی پلەیەکـی زۆر بەرزتـر بـۆ ئێـوە دێتـە پێـش، کـە دەبنـە مـرۆڤ.

ئەمـە نیشـانەی یەکەمـە لەسـەر خواناسیی، کـە خـوا ئێمـەی لـە گڵ هێناوەتـە دی و، دوایـی بووینـە مرۆڤانێـك کـە بەسـەر زەویـدا بڵاوبووینـەوە.

٣)- ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا ﴾، هەروەها لە نیشانەکانی خوا، واتە: لە نیشانەکانی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و مشوورخۆرێتیی و خاوەنی ئەوپەڕیی زانیاریی و کاربەجێیی بوونی خوا، ئەوەیە کە لە خۆتان هاوسەرانی بۆ هێناونە دی، ئنجا ئەمە ئەگەر دوێنراوەکان پیاو بن، واتە: ئافرەتانی بۆ هێناونە دی و، ئەگەر دوێنراوەکان ئافرەتان بن، واتە: پیاوانی بۆ هێناونە دی.

مانـای وایـە ئافرەتـان و پیـاوان لـە یـەك جـۆرە نەفسـن، وەك پێشـتریش گوتمـان: مانـای ئـەوە نیـە، ژن لـە پیـاو جیابووبێتـەوە، یـان پیـاو لـە ژن جیابووبێتـەوە، بەڵکـو یانـی: لـە یـەك جـۆرە نەفسـن، کەواتـە: ئایەتـی یەکەمـی سـوورەتی (**النسـاء**)یش،

کـە دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا ۝١﴾، کـە زۆرێـك لـە توێژەرەوانـی قورئـان، ئەوەیـان کردۆتـە بەڵگـە کـە حـەووا لـە ئـادەم جیابۆتـەوە، ئنجـا هەندێـك دەڵێـن: لـە پەراسـووی چەپـی، لـە ڕاسـتییدا ئـەو ئایەتـەی سـووڕەتی (النسـاء) نابێتـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوە، چونکـە ئەگـەر ئـەو ئایەتـە بەڵگـە بـێ لەسـەر ئـەوەی حـەووا لـە ئـادەم جیابۆتـەوە، دەبـێ ئـەم ئایەتـەی سـووڕەتی (**الروم**)یـش، بەڵگـە بـێ لەسـەر ئـەوە: کـە هەمـوو ژنـەکان لـە پیاوەکانیـان جیابوونـەوە! کـە لـە ڕاسـتییدا ئـەوە وانیـەو، مەبەسـت ئەوەیـە کـە حـەوواش هـەر لـەو جـۆرە نەفسـە دروسـتبووە، کـە ئادەمـی لـێ دروسـتبووە، یانـی: ئـەی پیـاوەکان! ژنـەکان و هاوسـەرەکانتان لـە هەمـان جـۆرە نەفـس، کـە ئێـوەی لـێ دروسـتبوون، ئەوانیـش لـەو جـۆرە نەفسـە دروسـتبوون.

ئنجـا ڕەنگـە بڵێیـن: ئـەوە بـۆ ئێمـە شـتێکی بەڵگـە نەویسـتە، بـەڵام بەشـەر کاتـی خـۆی کـە لـە ڕووناکیـی پێغەمبەرایەتیـی و وەحیـی دوور کەوتۆتـەوە، بیرۆکـەی سـەیرو سـەمەرەی بـۆ دروسـتبوون، کاتـی خـۆی لـە نێـو یۆنانییەکانـدا مشـتومڕ بـووە لەسـەر ئـەوە کـە: ئایـا ئافرەتیـش وەك پیـاو خاوەنـی نەفسـە یـان نـا؟ هەندێکیـان گوتوویانـە: نەخێـر خاوەنـی نەفـس نیـە، یانـی: خاوەنـی ڕووح نیـە، دوایـی هاتوونـە سـەر ئـەوە کـە بەڵـێ، ئەویـش خاوەنـی نەفـس و ڕووحـە، بـەڵام خاوەنـی نەفسـێکی حەیوانییـە، نـەك ئینسـانیی، بۆیـە خـوا ﷻ لـە سـووڕەتی (النسـاء)دا، دەفەمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا ۝١﴾، واتـە: ئـەی خەڵکینـە! پارێـز لـەو پەروەردگارەتـان بکـەن کـە ئێـوەی لـە یـەك نەفـس دروسـتکردوە (کـە ئادەمـە)و، هـەر خۆیشـی هاوسـەرەکەی دروسـتکردوە، واتـە: هـەر لـە جـۆری خـۆی، مانـای وایـە: دایـك و بابـی مرۆڤایەتیـی لـە یـەك جـۆرە نەفسـن و، ئێـوەش ئـەی پیـاوەکان! بزانـن کـە ئافرەتەکانتـان هەمـان جـۆرە نەفـس و ڕووحیـان هەیـە، کـە ئێـوە هەتانـە[1].

---

(١) لـە تەفسـیری سـووڕەتی (النسـاء) ئـەو دەقـەی (پەیـمانی کۆن)مـان هێنـاوە کـە دەڵـێ: هاوسـەریی ئـادەم (حـەووا) لەپەراسـووی چەپـی ئـادەم دروەسـتبووە.

کە ئەوەشیان نیشانەی دووەمە لە نیشانەکانی خوا.

ئنجا بۆچی خوا ﷻ هەر لە جۆری نەفسی پیاوەکان، ئافرەتەکانی هێناونە دی؟ یان هەر لە جۆری نەفسی ئافرەتەکان، پیاوانی هێناونە دی؟

٤)- ﴿لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا﴾، تاکو هۆگریان بن، تاکو بەهۆیانەوە ئۆخژنتان بۆ بێ و، پێیان دڵخۆش بن، (**السُّكُونُ مُسْتَعارٌ للتَّأَنُّسِ وَفَرَحِ النَّفْسِ، وَضُمِّنَ «لِتَسْكُنُوا»، مَعْنى لِتَمِيلُوا فَعُدِّيَ بِـ «إلى»**)، (**سكون**) بۆ هۆگریی ودڵخۆشبوونی نەفس خوازراوەتەوەو، وشەی (**لِتَسْكُنُوا**)، مانای: (**لِتَمِيلُوا**) مەیل بکەن بە لایانداو، بە لایاندا بچن و، هۆگریان بن، ئەم مانایەی خراوەتە نێو، بۆیە بە (**إلى**) تەعەددای پێکراوە، دەنا دەیتوانی بفەرموێ: (**تَسْكُنُوا**) یان (**تَسْكُنُوا بِها**)، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا﴾، هەم مانای ئارامیی و ئۆخژن، هەم مانای مەیل بەلادا کردن و هۆگربوونیش دەگەیەنێ.

٥)- ﴿وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةً﴾، خۆشەویستیی و بەزەییشیی خستۆتە نێوانتان، ئەم ئۆخژن بۆ هاتن و هەبوونی خۆشەویستیی و بەزەیی لە نێوانی ئافرەتان و پیاواندا، یەکێکی دیکەیە لە نیشانەکانی (نیشانەی سێیەم) پەروەردگارێتیی خوا، کە (**مَوَدَّةً**) بە مانای خۆشەویستیی دێ و، (**رَحْمَةً**)یش بەزەیی، کە سیفەتێکە پاڵ بە ئینسانەوە دەنێ مامەڵەی چاك بێ.

٦)- ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾، بەڕاستیی لەوەدا نیشانە هەن، بۆ کۆمەڵێك بیر بکەنەوە، بۆچی فەرموویەتی: بیردەکەنەوە؟ چونکە بەدڵنیایی هەبوونی ئۆخژن و هۆگریی و، هەبوونی خۆشەویستیی و ڕەحم و بەزەیی لە نێوان ژن و پیاودا، بە فیکرو عەقڵ دەرك دەکرێ و، کەسێك بیر نەکاتەوە، ئەو ڕاستییانەی بۆ دەرك ناکرێن کە حیکمەتی ئەوە چییە، هەم پیاو بە هۆی ئافرەتەوەو، هەم ئافرەت بە هۆی پیاوەوە، هەست بە ئۆخژن و ئارامیی و تەسکینیی دەکەن؟!

٧)- ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، هەروەها لە نیشانەکانی پەروەردگارێتیی و بەدیهێنەرایەتیی و مشوورخۆرێتیی خوا، دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوییە، واتە:

گەردوون، ئەم گەردوونە زۆر نیشانەیەکی گەورەیە، وەك لە سوورەتی (**العنكبوت**) دا، خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾.

لە ڕاستییدا ئەم گەردوونە موڵکی خوایەو زۆر زۆر فراوانە، پێشتریش باسمان کردوە: کە ئێستا نوێترین بیردۆزەی فیزیایی و گەردوونیی، ئەوەیە کە تیرەی گەردوون بەدەوری پازدە ملیار (١٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵی تیشکیی مەزەندە دەکرێ، واتە: تیشك بە پازدە ملیار (١٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵ، ئنجا ئەمسەرو ئەوسەری گەردوون دەکات، هەڵبەتە ئەوە هەر بە مەزەندەی زانایانە، ئەوەندەی کە بە دووربینەکان بۆیان کەشف بووە.

٨)- ﴿ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ﴾، هەروەها لە نیشانەکانی خوا: جیاوازیی زمانەکانتان و ڕەنگەکانتانە، دیارە لە قورئاندا هەمیشە وشەی (**لِسان**) بە مانای (**لُغَة**)ە، ئەو وشەو دەربڕینانە کە مرۆڤەکان بە هۆیەوە لێك حاڵیی دەبن، نەك ئەو زمانەی کە شتی پێ دەخورێ و قسەی پێ دەکرێ، جیاوازیی زمانەکان کە بە مەزەندەی زانایان، ئێستا چوار هەزار (٤٠٠٠) زمان، لە نێو مرۆڤایەتییدا هەیە، چوار هەزار (٤٠٠٠) زمانی سەربەخۆو سەرەکیی، جگە لە زارو لەهجەکان، هەڵبەتە مرۆڤ خۆیان زمان دروستدەکەن، خوا ﷻ توانایەکی داوەتە مرۆڤ کە زمان دابێنێ، هەروەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (**البقرة**) دەلالەتی لەسەر دەکات، کە کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (**البقرة**)دا، باسمان کرد کە دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کردن، یانی: توانایەکی بە ئادەم دا کە بتوانێ ناو لە شت بنێ و، زمان دروستبکات.

(**وألْوَانِكُمْ**)، هەروەها جیاوازیی ڕەنگەکانیشتان بەڵگەو نیشانەی خواناسییە، کە دیارە جیاوازیی ڕەنگەکانیش بە هۆی جیاوازیی ژینگەکان و، جۆری خواردن و خواردنەوەو، ئیش وکارو...هتد لە ئەنجامی ئەوانەدا جیاوازیی ڕەنگەکان دروست دەبێ.

ئەوانـەش سـێ نیشـانەی دیکـەی خـوای پـەروەردگارن، کەواتـە: (٣+٣=٦) هەتـا ئێسـتا.

٩)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡعَٰلِمِينَ ﴾، لەوەدا نیشانەی زۆر هەن، بۆ زانایان، چونکە ئەم سێ شتە: دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی، واتە: گەردوون و، جیاوازیی زمانەکان و ڕەنگەکان، بەهۆی زانست و لێکۆڵینەوەوە دەردەکەون، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡعَٰلِمِينَ ﴾، هەڵبەتە خوێندراویشەتەوە: (**لِلعالَمِين**) واتە: بۆ جیهانییان بۆ هەموویان.

١٠)- ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ ﴾، لە نیشانەکانی بەدیهێنەرێتیی و پەروەردگارێتیی و مشوورخۆرێتیی و، خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو چاك بوونی خوا ﷻو، شایستەی هەموو ستاییش کردنێك و بە پاکگرتنێك، حەوتەمین لە نیشانەکان و بەڵگەکانی بریتیە لە: خەوتنتان بە شەوگارو بە ڕۆژگار.

پیتـی (ب) لێـرەدا لـە (**باللَّيْـلِ**)دا، بـۆ (**ظـرف**)ەو، بـە مانـای (**فـي**) دێ، یانـی: (**فـي اللَّيْـلِ وَالنَّهـار**)، بـە زۆریـی لـە قورئانـدا، خـوا ﷻ کـە باسـی خـەو دەکات دەیبەسـتێتەوە بـە شـەوگارەوەو، کاتێـك باسـی کاسـبیی دەکات، دەیبەسـتێتەوە بـە ڕۆژگارەوە، بـەڵام لێـرەدا هەردووکیانـی تێکـەڵ کـردوون، لەبـەر ئـەوەی هەرچەنـدە بـە زۆریـی وایـە کـە خەڵـك بـە شـەو دەخـەوێ و بـە ڕۆژ کـە دنیـا ڕووناکـە، کارو کاسـبیی دەکات، بـەڵام جـاری واش هەیـە خەڵـك بـە شـەوێ بـۆی ناکـرێ بخـەوێ و، کارو کاسـبیی دەکات: ئێشـکە دەگـرێ، کاروان دەکات، یـان لەبـەر هـەر هۆکارێـك، بـە ڕۆژگار دەخـەوێ، کەواتـە: هـەم شـەوگارو هـەم ڕۆژگاریـش، هـەم بـۆ خەوتـن و، هـەم بـۆ کارو کاسـبیی و بـە دوای بەخششـی خـوا کەوتـن، بەکاردەهێنرێـن.

١١)- ﴿ وَٱبۡتِغَآؤُكُم مِّن فَضۡلِهِۦٓ ﴾، خواستنتان بۆ بەخششی خوا (**طَلَبُكُم لِلرِّزْقِ الَّذي هُوَ فَضْلُ اللهِ تَعالى عَلَيْكُم**)، داواکردنتان بۆ بژیوێك کە بەخششی خوایە ﷻ لەسەرتان، ئەمیش نیشانەی هەشتەمین.

کەواتە: لێرەش دوو نیشانە هەن: هەم خەوتن لە شەوو ڕۆژداو، هەم کارو کاسبیی کردن لە شەوو ڕۆژدا، هەر کامیان نیشانەیەکی سەربەخۆن.

١٢)- ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾، لەوەدا نیشانە هەن، بۆ کۆمەڵێك ببیستن، بۆیە دەفەرموێ: بۆ کۆمەڵێك ببیستن، چونکە بابای خەوتوو، ئاگای لە هیچ شتێك نیە، مەگەر دوایی بۆی بگێڕنەوە، بڵێن: کە خەوتبووی ئاوات گوت، وڕێنەت کرد، بەو شێوەیە خەوتی، ئەگەرنا بۆخۆی ئاگادار نیە، دەبێ دوایی بۆی بگێڕنەوەو ببیستێ، لە ڕێی بیستنی خۆیەوە، دوایی دەزانێ کە لە حاڵەتی خەوتنەکەیدا چی گوزەراوە!

١٣)- ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾، هەروەها لە نیشانەکانی خوا ﷻ ئەوەیە کە برووسکەتان پیشان دەدات، هەم دەبێتە هۆی ترساندنتان و، هەم دەبێتە هۆی ئومێدەوار کردنتان (**يُخِيفُكُم خَوْفاً، وَيُطْمِعُكُم طَمَعاً**)، ترسەکە بۆ ئەوەیە بترسن، کە ئەو برووسکەیە زیانیان پێ بگەیەنێ، کە زۆر کەس بە برووسکەو، بە هەورە تریشقە لە بەین دەچێ، ئومێدەواربوونیشیان بە هۆی ئەوەوەیە کە دەزانن هەر هەورێك برووسکەی هەبوو، هەورە تریشقەی هەبوو، مانای وایە موتوربە بووەو بارانی پێوەیە، یاخود بەفرو تەرزەی پێوەیە.

دیارە (**خَوْفاً وَطَمَعاً**) هەردووکیان (**مَفْعولٌ لِأَجْلِهِ**)یە یانی: (**إرادَة أَنْ تَخافُوا خَوْفاً وَتَطْمَعُوا طَمَعاً**)، واتە: بۆ ئەوەی کە بترسن بە ترسان و، ئومێدەوار بن بە ئومێدەوار بوون.

١٤)- ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾، لە سەرێوەش ئاو دادەبەزێنێ، هەمیشە گوتوومانە: خوا ﷻ بە زۆریی دەفەرموێ: ئاو دادەبەزێنێ، نەك باسی باران (**مَطَر**) بکات، چونکە کە فەرمووی: ئاو، باران، بەفر، تەرزە شێ (**بُخار**)و، ئاونگیش دەگرێتەوە، هەموو ئەو تەڕاییەی کە لە ئاسمان، لە سەرێوە دێ، بەرەو زەوی، هەمووی دەگرێتەوە.

کە ئەمە نیشانەی نۆیەمی خوای پەروەردگار بوو.

١٥)- ﴿ فَيُحْيِۦ بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ﴾، ئنجا زەوی پێ زیندوو دەكاتەوە، دوای مردنی، دوای ئەوەی كە زەوی وشك و برینگ و دێمەكارو قاقڕ بووە، نیشانەكانی ژیانی لەسەر نەماون، ڕووەكەكان هیچیان لەسەری نەماون، بە هۆی ئەو ئاوەوە كە بۆی دادەبەزێنێ لە سەرێوە، پێی زیندوو دەكاتەوە.

ئەمیش نیشانەو بەڵگەی دەیەمی خواناسییی.

١٦)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوْمٖ يَعْقِلُونَ ﴾، لەوەش دا نیشانە هەن، بۆ كۆمەڵێك عەقڵیان هەبێ، هۆشیان هەبێ، بیر بكەنەوە، بۆیە وایفەرمووە، چونكە ئەو شتانە بە عەقڵی سەلیم دەزانرێن، ئەگەر مرۆڤ عەقڵی هەبێ و هۆشی هەبێ، دەزانێ كە برووسكەو، ئاو دابەزین لە سەرێ و، زیندوو بوونەوەی زەوی پێی، ئەوانە هەر سێكیان نیشانەی تەنیا بەدیهێنەرایەتیی و تەنیا پەروەردگارێتیی و تەنیا خاوەندارێتیی خوان، بۆیە دەبێ تەنیا ئەویش پەرستراو بێ.

١٧)- ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ ﴾، هەروەها لە نیشانەكانی خوا ئەوەیە كە ئاسمانەكان و زەوی، بە فەرمانی خوا ڕادەوەستن، (**القِيَامُ: البَقَاءُ الكَامِلُ الَّذِي يُشْبِهُ بَقَاءَ القَائِمِ غَيْرِ المُضْطَجِعِ وَالقاعِدِ**)، بۆیە دەفەرموێ: لە نیشانەكانی ئەوەیە كە ئاسمانەكان و زەوی ڕابوەستن، ڕاوەستان لێرەدا، واتە: مانەوەی بە تەواویی كە بشوبهێتە مانەوەی كەسێك كە بە پێوە دەوەستێ، نەك دادەنیشێ، یاخود پاڵدەكەوێ، واتە: بە تێرو تەواویی ئەو ئاسمان و زەوییە دەمێننەوە.

لێرەدا مەبەست لە فەرمان (**أَمْر**)، دیارە كە فەرمانی پەیداكردن (**أَمر التَّكْوين**)ە، كە بریتیە لەو سیستەم (**نظام**)ە كە خوا داینـاوە تاكو ئاسمان و زەوی، گەردوون بمێننەوەو بەردەوام بن.

ئەمیش نیشانەی یازدەیەمە.

**١٨)- ﴿ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ الْأَرْضِ إِذَا أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴾**، دوایی هەر کاتێك بانگی کردن، ئێوە کت وپڕ لە زەوی دێنەدەرێ.

ئەمیش نیشانەی دوازدەیەم و کۆتاییە کە لەم ئایەتانەدا خراونەڕوو.

ئنجا با قسەو سەرنجی سێ لە ڕوونکەرەوانی قورئان بدەین، لەبارەی ئەو ڕستەی کۆتاییەوە:

١- **(الطبري)** لە بارەی ﴿ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ الْأَرْضِ ﴾ەوە، گوتوویەتی: **(إِذَا أَنْتُمْ تَخْرُجُونَ مِنَ الْأَرْضِ، إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةَ مُسْتَجِيبِينَ لِدَعْوَتِهِ إِيَّاكُمْ)**[١]، واتە: ئێوە لە زەوی دێنە دەرێ، کاتێك کە خوا بانگتان دەکات، ئێوە وەڵامی بانگکردنەکەی دەدەنەوەو، لە زەوی دێنە دەرێ.

٢- **(فخر الدين الرازي)** گوتوویەتی: **(فَالْمَدْعُوُّ يُدْعَى مِنَ الْأَرْضِ، يَعْنِي أَنْتُمْ تَكُونُونَ فِي الْأَرْضِ فَيَدْعُوكُمْ مِنْهَا فَتَخْرُجُونَ)**[٢]، ﴿ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ الْأَرْضِ ﴾، بانگکردنەکە لە زەوییەوە نیە، بەڵام ئێوە لە زەوییدان کە بانگتان دەکەن، ڕازی دەڵێ: بانگکراوەکە لە زەوییەوە بانگ دەکرێ، واتە: ئێوە لەو کاتەدا لە زەوییدا دەبن، کە خوا بانگتان دەکات و، لە زەوی دێنە دەرێ.

٣- **(محمد الطاهر بن عاشور)**، دەڵێ: **(مِنَ الْأَرْض مُتَعَلِّقٌ بِتَخْرُجُون قُدِّمَ عَلَيْهِ)**[٣] واتە: کە دەفەرموێ: ﴿ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ الْأَرْضِ إِذَا أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴾، یانی: **(إذا أَنتُم تَخْرُجونَ مِنَ الْأَرْض)** بەڵام پێشی خراوە.

هەموویان هەر یەك واتایان هەیە، گرنگ ئەوەیە بانگکردنەکە لە زەوییەوە نیە، بەڵکو بانگکردنەکە لەلایەن خواوەیە، بەڵام مرۆڤەکان لە زەوی دێنە دەرێ.

﴿ إِذَا أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴾، ئێوە لە زەوییەوە دێنە دەرێ، **(إِذَا)** بۆ کت وپڕیی **(مُفَاجَئَة)**یە، یانی: زۆر بەخێرایی و کت وپڕ دێنە دەرێ، کاتێك خوا بانگی کردن.

---

(١) جامع البيان، ج ٢١، ص (٤-٥).

(٢) التفسير الكبير، ج ٢٥، ص ١٠١.

(٣) التحرير والتنوير، ج٢١، ص٨١ .

## کورتە باسێک دەربارەی
## بیست وردەکاریی جەستەی مرۆڤ لەبەر تیشکی ئەم ئایەتەدا

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴾

واتە: لە نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە ئێوەی لە خاك دروست کردوە، دوایی ئێوە دەبنە مرۆڤانێك و بڵاو دەبنەوە، **(النابلسي)**[1] لە تەفسیرەکەی خۆی دا هەندێك شتی جوان دەڵێ، هەڵبەتە ئێمە ستایش بۆ خوا لە سەرەتای تەفسیری سووڕەتی **(المؤمنون)**دا باسێکی سەربەخۆمان لە بارەی چۆنیەتی دروستبوونی مرۆڤەوە کردوە، هەروەها لە مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد)دا، زیاتر لە سەد (١٠٠) لاپەڕمان تەرخانکردوە بۆ باسکردنی جەستەی مرۆڤ، وەك پێکهاتەکانی و کۆئەندامەکانی، هەر کەسێك بیەوێ دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ ئەو مەوسووعەیە، وردەکاریی زۆرمان لە بارەی مرۆڤ وجەستەی مرۆڤ و، کۆئەندامەکانی ئەو هەموو کارە سەرسوڕهێنەرانەی کە ئەنجامیان دەدەن، باسکردوە، بەڵام لێرەدا لە قەدەر سروشتی ئەم تەفسیرە، پێم خۆش بوو هەندێك شت باس بکەین: کە گڵ و خاك لە کوێ و، ئەو مرۆڤە لە کوێ، کە دەبێتە مرۆڤێکی تێرو تەواوو، ئەو هەموو مرۆڤانە کە دوایی بە زەوییدا بڵاودەبنەوە؟

### چەند زانیارییەك دەربارەی جەستەی مرۆڤ لە بیست بڕگەدا:

**١-** لە مێشکی مرۆڤدا سەد ملیار (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) خانەی ژێرخانیی**(إستنادي)**ی، هەن، لێناون، تاکو ئێستا وەك پێویست ئەرکەکەیان نەزاندراوە، بەڵام لە توێکڵی مێشکدا

---

(١ ) تفسير النابلسي، ج ٧، ص ١٠٢-١٠٦

چوارده ملیار (١٤,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) خانه هەن، ڕەنگیان خۆڵەمێشییە، کە ژیانی عەقڵیی مرۆڤ پەیوەستە بەو چوارده ملیار (١٤,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) خانه خۆڵەمێشییەوە، یانی: کاتێك مرۆڤ، کەسێك دادوەریی دەکات، یان شتێك دێنێتەوە یاد خۆی، کە دەبیستێ، دەبینێ، خەیاڵێك دەکات، شتێك وێنا دەکات، هەروەها هەموو جموجۆڵەکانی کە بە ئەندامەکانی ئەنجامیان دەدات و، هەستکردنەکانی و، هەموو ئەوانە پەیوەندییان هەیە، بەو خانه خۆڵەمێشیانەوە کە لە توێژاڵی سەرەوەی مێشکدا هەن.

جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە خانەکانی مێشك، گەشە ناکەن، شێرپەنجە (**سرطان**)یشیان تووش نابێ، لەبەر حیکمەتێك -یان چەندان حیکمەت- کە خوای پەروەردگار دەیزانێ، دیارە ئەرکدار بوونی مرۆڤ بەو مێشکەوە بەستراوە، یانی: عەقڵ مایەی ئەرکداریی (**مناط التكليف**)ە، چونکە هەر کەسێك عەقڵی سەلیم نەبێ وەك شێت، یاخود عەقڵەکەی پێنەگەیشتبێ وەك منداڵ، تەکلیفی شەرعیی ڕووی تێ ناکات.

٢- لە خوار مێشکەوە لوو (**غُدّة**)یەك هەیە، پێی دەگوترێ: لووی (**نُخامي**)، کە زۆر گچکەیەو، کێشەکەی نیو گرامە، پێی دەگوترێ: پادشای کۆئەندامی هۆڕمۆنیی، بەڵکو پێی دەگوترێ: شاژنی لووەکان (غوددەکان) کە هەموویان فەرمان لەو لووی نوخامییەوە وەردەگرن، کە دوازده فەرمانی هۆڕمۆنیی دەکات، یەکێك لەو هۆڕمۆنانە بریتیە لە هۆڕمۆنی گەشەکردن، کە هۆڕمۆنی گەشەکردن لە (١٨٨) ترشەڵۆکی ئەمینیی پێك دێ، کە پێویستە لە خوێندا دە (١٠) میکرۆگرام لە هەر لیترێکدا هەبن، ئەگەر ئەو ئەندازەیە کەمتر بێ، ئەوە مرۆڤ گەشە ناکات و، دەبێتە قەزەم (کورتە باڵا)و، ئەگەر زیاد بێ، مرۆڤ زۆر بەرزو بە کەلەش و کەڵەگەت دەبێ، زیاتر لە ئەندازەی مرۆڤی ئاسایی، ئەوانەی باڵایان دوو مەترو چەندان سانتیم دەبێ، لە ئەنجامی ئەوەدایە کە ئەو هۆڕمۆنەی گەشەکردنیان زۆرە.

٣- هەروەك چۆن مێشك و غوددەی نوخامیی هەر لە گڵ دروست دەبێ، ئێسقانەکانیش هەر لە گڵ دروست دەبن، بۆ وێنە: ئێسقانی ڕان، بە شێوەیەکی وا دروستکراوە کە

سەرێکی دەچێتەوە نێو کلێنجە، یان قوڵقوڵەو، سەرێکی دەچێتە نێو جومگەی ئەژنۆ، هەر کامێکیان بەو شێوەیە دروستکراوە، کە بۆ ئەو شوێنەی دەچێتە نێوی، بگونجێ، بۆ ئەوەی لەوێدا بتوانێ جووڵە بکات، جاری وا هەیە کە مرۆڤ دەتوانێ پێنجسەد (٥٠٠) کیلۆگرام هەڵبگرێ لەسەر ئەو ئێسقانەی ڕانی و، لەسەر ئەو ئێسقانانە کە خوای پەروەردگار لێیان پێکیهێناوە، ئەو هەموو قورساییەش دەکەوێتە سەر گەردنی ڕان، مانای وایە هەر کامێکیان دەتوانێ فشاری دوو سەدو پەنجا (٢٥٠) کیلۆ هەڵبگرێ، ئەو گڵە کە خۆی زۆر نەرم و بێهێزە، بەڵام ئەو ئێسقانە بە قوەتەی لێ دروست بووە!

ئنجا لە نێو ئێسقانەکانداو، لە نێو جومگەکانیاندا جۆرە ماددەیەکی شل هەیە، ناهێڵێ ئەو ئێسقانانە لێکبخشێن و بخورێن و، هەندێك ژێ و هەندێك ڕیشاڵ هەن، کە بە یەکیانەوە دەبەستنەوە.

ئنجا هەر کامێك لە ئێسقانەکان جۆرێك سروشتیان هەیە، بۆ وێنە: ئێسقانی کەللەی سەر مەیلەو تەختن، بەڵام ئێسقانی ڕان و ئەژنۆو دەست و پێیەکان، جۆرێکی دیکەن، هەر کامێکیان بە شێوەیەك هەڵخراوەو سروشتەکەی وایە، کە لەگەڵ ئەو ئەرکەدا کە دەبێ ئەنجامی بدات، بگونجێ.

٤- کاتێك ئێسقان دەشکێ، دووبارە گەشە دەکاتەوە، کە ئەمە زۆر شتێکی سەرسوڕهێنەرە، یانی: کەسێك کە لاقی دەشکێ، دەستی دەشکێ، یان هەر شوێنێکی دەشکێ، پزیشك هەر ئەوەندەی لەسەرە کە هەڵیبەستێتەوەو، ئێسقانەکان لە پەنای یەك دابنێتەوە، بەڵام دوایی خۆیان ئەو ئێسقانانە پێکەوە دەنووسێنەوەو، گەشە دەکەن و دروست دەبنەوەو، سەرسوڕهێنەرتریش ئەوەیە کە خانەکانی ئێسقان، تاکو ئەو ئەندازەیەی پێشێ گەشە دەکەن، نەك درێژتر بێ، یان گەورەتر بێ، بەڵکو تەنیا تاکو ئەو ئەندازەیەی پێشتر خوا ﷻ لەسەری سروشتاندوویەتی، گەشە دەکات و لەوە زیاتر تێناپەڕێ.

ئنجا لە نێو ئێسقانەکاندا کارگەی دروست کردنی خڕۆکە سوورەکان هەیەو، ئەو کارگەیەش بە تایبەت لە نێو ئێسقانە درێژەکان دا هەیە، وەك: ئێسقانی

ڕان و باسك و لاق، كە لە هەر چركەیەكدا: دوو ملیۆن و نیو (٢،٥٠٠،٠٠٠) خڕۆكەی سوور دروست دەكەن، نەخۆشییەك هەیە پێی دەگوترێ: (هەژاریی خوێنی دروستكەر)، ئەویش ئەوەیە كە ئەو كارگە خوێنانەی نێو ئێسقانەكان، لە دروستكردنی خڕۆكە سوورەكان دەوەستن، كە تاكو ئێستا نازانرێ هۆكاری چییە، بەڵام لە ئەنجامی ئەو نەخۆشییەدا، ئێسقانەكان دەپووكێنەوەو، مرۆڤ پەیكەرە ئێسكییەكەی بەرەو كۆتایی دەچێ.

٥- ئێسقانی ددان، تەنیا شتێك لە ماددەكاندا لە ئێسقانی ددان بەهێزترو پتەوترو ڕەقتر بێ، بریتیە لە ئەڵماس، لە دوای ئەڵماس ئێسقانی ددان لە هەموو جۆرە ماددەیەك بەهێزترن، هەربۆیەش خوا ﷻ ددانەكانی بە شێوەیەك داناون، كە ئەو هەموو شتەیان پێ دەخورێ و، پێ دەكرۆژرێ و، پێ دەهاڕدرێ، هەیە تەمەنی هەشتا نەوەد ساڵە، ددانێكی لە شوێنی خۆی ناجووڵێ، هەڵبەتە بە ئەندازەی ئەوە كە مرۆڤ زیاتر ئاگاداری دەم و ددانی خۆی ببێ، ئەوانیش سەلامەتتر دەمێننەوە، هەندێك كەسیش هەر بە سروشت ددانەكانی بێهێزن، بەڵام بە زۆریی وایە خزمەتكردنی ددانەكان و پاك ڕاگرتنیان، هۆكار دەبێ بۆ سەلامەت و ساغیيان و ساغ مانەوەیان.

٦- ئنجا ماسوولكەكان: ئایا ئەگەر ماسوولكەكان نەبن، پەیكەری ئێسكیی چی لە دەست دەهات؟ یانی: هەرچی ئەندام هەیە، كە پەیكەری ئێسكییان لێ پێك دێ، چ سەر، چ قۆڵ و دەست و پێ و، پەنجەكان، هەموویان بە هۆی ماسولكەكانەوە دەجووڵێن، بۆوێنە: ئەگەر هاتباو ماسوولكەكانی گەردن نەبوونایە، كەللەی سەر جووڵەی نەدەكرد، هەروەها بڕگەكانی پشت، بە هۆی ماسوولكەكانەوە دەتوانن بجووڵێن، هەروەها دەست و پەنجەكان، لاقەكان، شان و پیل، هەموویان بە هۆی ماسوولكەكانەوە دەجووڵێن.

دیارە ماسوولكەكانیش هەموویان لە ڕێی كۆئەندامی دەمارەوەو لە مێشكەوە فەرمانیان بۆ دێ و، بە پێی فەرمانی مێشك ماسوولكەكان ئێسقانەكان دەجووڵێنن، یانی: من ئەگەر بمەوێ شتێك بگرم، دەستم لە مێشكەوە فەرمانی بۆ دێ، یاخود ئەگەر بمەوێ بەرهەڵدای بكەم، یان دەست بكەمەوە، تەنانەت

پێڵووی چاو، لە مێشکەوە فەرمانی بۆ دێ، کە چاو بکەیەوە، یان چاو دابخەی، هەموو جووڵەکانی جەستە، هەر لە سەرەوە تاکو ماسوولکەکانی دەم و چاوو، هەروەها سك و پشت، و دەست و پێ و، هەموو ئەوانە لە مێشکەوەو لە ڕێی کۆئەندامی دەمارەوە، فەرمانیان بۆ دێ.

٧- لە نێو هەموو ماسوولکەکاندا، ماسوولکەیەکی زۆر تایبەت هەیە، کە بریتیە لە دڵ، دڵیش ماسوولکەیەکی ناوازەو تایبەتە لە جەستەداو ماسوولکەیەکی سەربەخۆیە، چونکە بە درێژایی تەمەنی ئەو مرۆڤە، پەنجا ساڵ بێ، شەست بێ، حەفتا بێ، سەد یان سەدو بیست بێ، تاکو چەند دەڕوا، ئەو ماسوولکەی دڵە، بۆ خۆی کار دەکات، لە خولەکێك دا حەفتاو ئەوەندە جار لێ دەدات، لە نێوان هەردوو لێداندا، ئیسڕاحەتێك دەکات و ئەوەندە ئیسڕاحەتە، بایی ئەوە دەکات کە پاشەرۆکی خۆی فڕێ بدات و، پشوویەك بدات و وزەی تازە وەربگرێتەوە.

ماسوولکەی دڵ لە ڕۆژدا هەشت مەتر سێجا خوێن فڕێ دەدات، ئەگەر بێت و یەکێك لە کۆشکە هەور ڕووشێنەکان بێنین، کە پانتاییەکەی بریتی بێ لە هەزار مەتر دووجا (١٠٠٠ م٢) و، تیرەکەی بریتی بێ لە سی وسێ (٣٣) مەتر، دڵی مرۆڤێکی تەمەن مام ناوەندیی، بە قەدەر ئەو بینایە بە درێژایی تەمەنی خوێن فڕێ دەدات.

ئێمە پێشتر باسی ئەو ماسوولکەیەی دڵمان کردوە، کە دڵ دوو گوێچکۆڵەی هەن و، دوو سکۆڵەی هەن و، گوێچکۆڵەو سکۆڵەی چەپ، هەردووکیان مامەڵەیان لەگەڵ خوێنی پاکە، بەڵام گوێچکۆڵەو سکۆڵەی ڕاست، مامەڵەیان لەگەڵ خوێنی پیسە، هەڵبەتە ئەوەش وردەکاریی زۆری هەیە کە لە حەوسەڵەی ئێرەدا نیە.

٨- ئەو بۆڕیی و دەمارانەی کە لە جەستەی مرۆڤدا هەن، کە خوێنیان پێدا دێ و دەچێ، درێژییەکەیان پەنجا کیلۆمەتر (٥٠کلم) دەبێ، ئەگەر بخرێنەوە سەر یەك و، خوا ﷻ ئەو بۆڕیی و دەمارانەی وا خوڵقاندوون کە لە لایەکەوە پتەو بن، لە لایەکیشەوە نەرم بن، فراوان دەبن و وێك دێنەوە، پشوو بە دڵ دەدەن و، لە کاتێکدا لە دڵەوە لێدانێکیان

پێ دەگات، لەبەر ئەوەی نەرمن، فراوان دەبن بۆ ئەوەی لە دڵەوە خوێنیان بۆ بێ، دوایی کە جارێکی دیکە فشاریان لێ دەکرێ، دێنەوە یەك بۆ ئەوەی ئەمجار خوێن لەو سەرەوە بێننەوە، خوێنی پیس بۆ دڵ بێننەوەو، دڵ بیپاڵێوێ، دیارە مرۆڤ تاکو تەمەنی کەمترە، دەمارەکانی چ شادەمار، چ وردە دەمارەکانی، چ خوێنبەرەکان (**شرايين**)، چ خوێن هێنەرەکان (**أَوْرِدَة**)، نەرمترن، کاتێك کە دەمارەکانی دڵ و خوێن بردن و هێنانەوەی دڵ ڕەق دەبن، دڵ زیاتر ماندوو دەبێ، هەتا نەرمتر بن، زیاتر لەگەڵ دڵدا دەتوانن بگونجێن.

ئنجا ئەو بۆڕیی و دەمارانە، بەهۆی هەبوونی ماسوولکەوە تێیاندا، تەسك دەبن و فراوان دەبن، بۆیە لە ئەنجامی دەستنوێژ گرتندا، دەم و چاوی مرۆڤ گەش دەبێتەوە، چونکە ئاوی سارد دەمارەکانی خوێن ئاگادار دەکاتەوە، ئەوانیش فراوان دەبن، ئەو کاتە خوێنی زیاتریان تێدەچێ و، دەم و چاوی مرۆڤ گەش دەبێتەوە.

٩- جگەر:

أ- جگەر پێنج هەزار (٥٠٠٠) ئەرك ئەنجام دەدات بێ ئەوەی ئێمە هەستی پێ بکەین، واتە: وەك ئەوەیە کە پێنج هەزار (٥٠٠٠) کارگەی تێدا بن.

ب- هەروەها جگەر دەتوانێ لە ماوەی شازدە هەفتەدا، بە تەواویی خۆی دووبارە بکاتەوە، خۆی دروست بکاتەوە، یانی: ئەگەر پزیشکێکی نەشتەرگەریی چوار لەسەر پێنجی جگەر ببڕێ و یەك لەسەر پێنجی بهێڵێتەوە، ئەو یەك لەسەر پێنجە لە ماوەی شازدە هەفتەدا، دەتوانێ ئەو چوار لەسەر پێنجەی دیکەی خۆی، دروست بکاتەوە، دیارە لە میانی گەشەکردنی خانەکانی جگەردا.

جـ- مرۆڤ لە سێ سەعات زیاتر ناتوانێ بەبێ جگەر بژی.

د- نەخۆشییەکی زۆر کوشندەو مەترسیداری جگەر بریتیە لە مێوداربوونی جگەر (**تَشَمُّعُ الكَبد**)، کە جگەر ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ ناکات، بۆیەش پێی دەگوترێ:

(تَشَمُّع) لە (شَمْع)ەوە هاتوە کە بە مانای (مێو) دێ، شایانی باسیشە خواردنەوەی مەی (شراب) هۆکارێکی سەرەکیی ئەو نەخۆشییەیە.

**١٠- سـپڵ (طِحَـال):**

أ- لە ڕاستییدا (سپڵ) بریتیە لە گۆڕستانێك و شوێنی هەڵگرتنی خڕۆکە سوورەکان.

ب- وێڕای ئەوەش (سپڵ) بریتیە لە کارگەیەکی خوێنی ئیحتیات، بۆیە ئەگەر کارگەکانی خوێن لە جەستەدا نەمێنن، ئەوە لە سپڵدا کارگەی خوێن هەیە، بۆ دروستکردنی خوێن.

**١١- پەنکریاس:** پەنکریاس ئەرکێکی زۆر مەترسییداری هەیە، لە جەستەی مرۆڤدا، ئەویش ئەوەیە کە جەستەی مرۆڤ بەهۆی پەنکریاسەوە شەکر بە پلەی گەرمیی (٣٧) لە جەستەدا دەسووتێنێ، بەڵام تۆ بێنە شەکرێك لەسەر دەستت دابنێ، ئەگەر گەرمییەکەی نەگاتە پلەی سەد، ناسووتێ، بەڵام لەو پلە نزمەی جەستەدا کە (٣٧)ە، شەکر بە هۆی پەنکریاسەوە دەسووتێ، چونکە پەنکریاس ماددەیەك دەردەدات بە ناوی ئەنسۆلین، ئەو ئەنسۆلینە دەبێتە هۆی سووتاندنی شەکر، بۆیەش کەسێك پەنکریاسی بێهێز بێ، تووشی نەخۆشیی شەکرە دێ، نەخۆشیی شەکرەش بریتیە لە کەڵەکە بوونی شەکری نەسووتێنراو لە خوێندا، لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئەنسۆلین لە پەنکریاسەوە باش دەرنادرێ، تاکو ئەو شەکرە بسووتێنێ بەو پلە گەرمییە نزمە کە بریتیە لە (٣٧) پلە، ئنجا هەر کەس بیەوێ ئەو شەکرە کەڵەکە بووە لە جەستەیدا بسووتێنێ، دەبێ دەرزی ئەنسۆلین لە خۆی بدات.

**١٢- زەرداو (صَفراء):** (زەرداو) لە نیزیك جگەرەوەیەو، ئەویش ئەرکێکی گرنگی خۆی هەیە، ئەرکەکەشی بریتیە لەوەی ئەو ماددە زەرداوەی کە دەریدەدات و زۆر تاڵە، چەوریی هەزم دەکات و لە جەستەدا دەیتوێنێتەوە، بۆیە ئەو کەسەی کیسەی زەرداوی هاتبێتە دەر، ناتوانێ شتی چەور بخوات، ئەگەر بیخوات دەبێ جۆرێك لە دەرمان بەکاربێنێ، کە چەوریی لە جەستەی دا بتوێنێتەوە، بۆ ئەوەی تێیدا کۆنەبێتەوەو کەڵەکە نەبێ.

**١٣- لووی دەرەقیی:** لووی دەرەقیی **(الغدة الدرقية)** لە پێشەوەی گەردنەو، لە شێوەی پەپوولەیەکدایە، ئەو غوددەیە ماددەیەك دەردەدات بە ناوی دەرەقین، کە یارمەتیی هەرسکردنی نێو خانەکان (میتاپۆلیسم) دەدات، ئەو هەرسکردنەی کە لە خانەکاندا ڕوودەدات پێی دەگوترێ: **(أيض)** هەروەها **(إستِقلاب)**، ئەویش ئەوەیە خۆراك کە لە خانەکاندا هەیە، دەگۆڕدرێ بۆ وزە، ئنجا ئەگەر غوددەی دەرەقیی چالاك بێ، جەستەی مرۆڤ زۆر چالاك دەبێ و، هەر شتێك دەیخوات زوو دەبێتە وزە، بەڵام لەکاتێك دا ئەو غوددەیە بێهێز دەبێ، جەستەی مرۆڤ تەنبەڵ دەبێ و، زیاتر ئارەزووی خەوو پشوودان دەکات، ئەو خواردنەش کە دەیخوات، پەزمەندە دەبێ لە جەستەداو، دەبێتە هۆی قەڵەویی.

ئنجا یەکێك لە دەردراوەکانی غوددەی نوخامیی **(نُخامي)** ئەوەیە کە غوددەی دەرەقیی چالاك دەکات، یەکێك لە دەردراوەکانی غوددەی دەرەقییش، ئەوەیە کە غوددەی نوخامیی سست دەکات، ئنجا لە نێوان ئەو دووەدا، هاوسەنگییەکی زۆر ورد هەیە، کە بەس خوا ﷻ بەتەواویی دەزانێ چۆنەو، هەر کامێکیان ئەوی دیکە لە سنووری خۆیدا ڕادەگرێ، بۆ ئەوەی تێنەپەڕێنێ.

**١٤- پرۆستات:** پرۆستاتیش غوددەیەکە لەسەر ڕێی میزو، لەسەر ڕێی تۆو **(مني)**، خوای پەروەردگار دروستیکردوە، کاتێك مرۆڤ پێویستی بەوە بێ، میز فڕێ بدات، ئەو غوددەیە ڕێی مەنیی (ئەو ڕێیەی کە تۆوی لێوە دێ) دەیبەستێ و، ڕێی میز کردن دەکاتەوە، بۆچی؟ چونکە میز ماددەیەکی ترشەڵۆکەو، ئەو غوددەیەش ماددەیەکی قەلەویی دەردەکات، کە هاوسەنگ دەبێتەوە لەگەڵ ئەو ماددە ترشەڵۆکەی کە لە میزدا هەیە، بۆ ئەوەی ئەو شوێنەی میزی پێدا دەڕوات، بە هۆی ئەو ماددە ترشەڵۆکییەوە، شوێنی پێداڕۆیشتنی تۆو **(مني)** بریندار نەکات و خراپی نەکات، ئنجا ئەو غوددەیەی پرۆستات ماددەیەك دەردەکات، ئەو شوێنە چەور دەکات، تاکو ئەگەر میزەکە پێیدا ڕۆیی، ئەو میزەڕۆیە **(الجاري البولي)** بریندار نەبێ و نەیرووشێنێ، بەڵام کاتێك مرۆڤ تۆوی دێتە دەر، ئەگەر ئەو میزەڕۆیە شوێنەواری میزی پێوە بێ، ئەو پرۆستاتە ماددەیەکی

پاككەرەوە دەردەدات، دوایی ماددەیەكی بۆنخۆشكەر دەردەكات، دوایی ماددەیەكی شیرینی دەردەدات، بێ ئەوەی ئێمە پێی بزانین، كە یەكێك لەوانە مەزیی (**مَذي**)یە و ئاوێكی ڕوونی مەیلەو خەستە، كە لە یەك كاتدا:

أ- هەم ماددەیەكی پاككەرەوەیەو.

ب- هەم بۆنخۆشكەرە

جـ- هەم خۆراك بەخش (**مُغَذّي**)یشە كە پرۆستات دەریدەكات، ئنجا لەو كاتەدا كە مەنیی دێ، پرۆستات شوێنی میز لێوە هاتن دەگرێ، ئەو دەرچەیە دەگرێ، بەڕاستیی جێی سەرسوڕمانە! مرۆڤ ئەگەر تەمەنی هەشتا ساڵە، یان نەوەدە، یان چەندە، ئەو ئەندامانە كاری خۆیان دەكەن، بێ ئەوەی ئەو ئاگای لە هیچ شتێك بێ!

١٥- **گورچیلەكان و دوو ومیزڵدان (الكليات والحالوبان والمثانة)**: ئەو سێ ئەندامە كە بەهەرسێكیان كۆئەندامی میز (**الجهاز البولي**) پێك دێنن، زۆر جێی سەرنجن، وەك هەموو ئەندام وكۆئەندامەكانی جەستە:

گورچیلەكان شلەمەنییەكان دەپاڵێون و، ڕێژەی ئاو لەخوێن دا بەئەندازەیەكی دیارییكراو ڕادەگرن، كاركردنیشیان ناویستەنیی (**غير إرادي**)یە.

دوو بۆڕییەكان (**الحالوبان**)یش میزیان پێدا دێ، پاش هاتنی لە گورچیلەكانەوەو، ئەمانیش بەشێوەی ناویستەنیی كاردەكەن.

بەڵام میزڵدان (**المثانة**) كە شوێنی تێدا كۆكرانەوەی میز (**خزن البول**)ە بەشێوەی ویستەنیی (**إرادي**) كاردەكات و، ئەندامێكی ماسوولكەیی (**عضو عضلي**) یە ئەگەر هاتباو ناویستیی (**غير إرادي**) بووایە، مرۆڤ تووشی گرفتێكی گەورە دەبوو، بەبێ ئەوەی خۆی بیەوێ، میز دەهات، بەڵام تاكو ڕاددەیەكی زۆر میزڵدان ماسولكەییەكی ویستییەو لە ژێر كۆنترۆڵی ویستی مرۆڤدایە، بەڵام ئەگەر هات و ئەو میزە زۆر بوو، میزڵدانی پڕ كردو گەڕایەوە بۆ گورچیلەكان، لەبەر

ئـەوەی تووشــی نەخۆشـیی دەبـێ، ئـەو کاتـە مـرۆڤ بیـەوێ نەیـەوێ، میزەکـەی دێتـە خـوارو زۆری بـۆ دێنـێ.

**١٦- سامناکیی دیمەنی کۆئەندامەکان:** ئەگەر مرۆڤ کۆئەندامەکانی نێو جەستەی دیتبایە، دیمەنێکی وای دەبینی کە لە ترسان ڕابکات، بەڵام خوا ﷻ ئەو کۆئەندامانەی جەستەی مرۆڤی بە پێست داپۆشیون، کە کیفێکی زۆر جوانە، هەم قایمەو هەم نەرمەو، چین چینە، وەك لە مەوسووعەی (ئیمان و ئیلحاد)دا باسمانکردوە، لە بابەتی جەستەی مرۆڤدا، کە پێست (**جلد**) بە لای کەمەوە سێ چینە، ئنجا مووی تێدا هەن کە جوانیی پێ دەبەخشن و دەیپارێزن، هەروەها غوددە ئارەقە ڕژێنەکانی تێدا هەن، پاشان هەر لەو پێستەدا دەمارەکانی هەستکردن بە سەرماو گەرماو، دەست لێ کوتان و نەرمیی و زبریی و...هتدی تێدا هەن، هەروەها خانە چەورییەکانی تێدا هەن، کە پێست نەرم و تەڕو تازە ڕادەگرن.

دیـارە پێسـت هەمـوو ئـەو کارانـە دەکات، لـە هەمـان کاتیشـدا کۆئەندامەکانـی دیکـە، کـە لـە جەسـتەدا هـەن، دەیانشـارێتەوەو پەنهانیـان دەکات، بـۆ ئـەوەی دیمەنێـك نەکەوێتـە بەرچـاوی مـرۆڤ کـە ڕەنگـە بـە هۆیـەوە ترسـی ڕێبنیشـێ.

**١٧- سەرەپەنجەکان:** پێشتر وادەزانرا کە مرۆڤ تەنها بە مۆری سەرە پەنجەی گەورەی (**بَصمة**) دەناسرێتەوە، بەڵام ئێستا دەرکەوتوە کە هەموو مرۆڤێك هەر کام لە پەنجەکانی (سەرە پەنجەی دەستی و پەنجەی پێیەکانی) تایبەتە بە خۆیەوە، هەروەها گلێنەی چاوی، دیسان ئەویش جیاکەرەوەیەتی، دەنگیشی و بەڵکو بۆنی پێستیشی جیاکەرەوەیەتی، بەڵکو پلازماو جۆری خوێنی، خوا ﷻ بۆ هەر مرۆڤێك لە هەموو ئەوانە، شتی تایبەتیی پێداوە، کە جیای دەکاتەوە لەوانی دیکە.

**١٨- دیاردەی نێرو مێ:** ئەگەر سەرنجێکی نێرو مێ (پیاوو ئافرەت) بدەین، هەر لە سەرەتاوە کچێکی گچکە کە وردە وردە هۆش و هەستی پەیدادەبێ، دەبینین سروشتێکی ئافرەتانەی هەیە، ئەگەر هیچی دەست نەکەوێ سەرینێکیش بێ وەك منداڵێك، وەك

مەلۆتکەیەك مامەڵەی لەگەڵدا دەكات، یاریی لەگەڵ دەكات و بێدەنگی دەكات و بە حیساب خواردنی پێدەدات، بەڵام كوڕ هەر لە سەرەتاوە پیاوانە ڕەفتار دەكات، ئەگەر شتێكی دەستكەوێ، ئەگەر دارێكیش بێ وەك تفەنگ مامەڵەی لەگەڵدا دەكات، دوایی كە دەگەنە تەمەنی باڵغ بوون، تەماشا دەكەی كوڕەكە دەنگی زبر دەبێ، وردە وردە ماسوولكەكانی و، ئەو شوێنانەی كە شوێنی پیاوانەی تایبەتن، وەك سمێڵ وڕیش، موویان لێ دێ، كچەكەش بە پێچەوانەوە دەنگی و پێستی نەرم و ناسك و، نیشانەكانی مێینایەتیی و كچایەتیی زیاتر لێ دەردەكەون، بە تەئكید خوا ﷻ هەر كام لە نێرو مێی بە جۆرێك خوڵقاندوە، كە ئامادەی بكات بۆ جێبەجێ كردنی ئەو ئەركە سروشتییانەی بەوی جێبەجێ دەكرێن، بۆیە مل بە ملە كردن لە نێوان نێرو مێداو، بە گژ یەكدیدا كردنیان و، نێر سالاریی و مێ سالاریی، لە ڕاستییدا هەڵەو ئەفسانەیەو، پێچەوانەی زگماك و پێچەوانەی واقیعی ژیانیشە.

١٩- **لەڕووی دەروونییەوە:** ئینسان ئەگەر لە ڕووی دەروونییەوە تەماشای خۆی بكات، چەندان حاڵەتی دەروونیی هەن، بۆ وێنە: ترس، تووڕەیی، ڕازیبوون، ڕەشبینیی، گەشبینیی، هەڵچوون، جاری وایە مرۆڤ ئارام و ئومێدەوارو گەشبین دەبێ، جاری واشە بێزارو نائومێدو ڕەشبین دەبێ، مرۆڤ حاڵەتە دەروونییەكانی، لە حاڵەتە جەستەییەكانی كەمتر نین.

پسپۆڕانی بواری دەروونزانیی دەڵێن: زیاتر لە سێسەد (٣٠٠) نەخۆشیی دەروونیی هەیە، تاكو ئێستا، ئنجا ئێستا ئەو زانیارییانەی زۆر لق و پۆپیان لێبوونەوە، ئەو زانیارییانەن كە لە پیران و لە منداڵان و لە هەرزەكاران و كەسانێك كە كەم ئەندامن، هەروەها زانیاریی كۆرپەلە ناسیی، بەكورتیی: حاڵەتە دەروونییەكانی مرۆڤ زۆر زۆرو جۆراو جۆرن، كە بەس خوا ﷻ كە مرۆڤی خوڵقاندوە، هەموویان دەزانێ.

٢٠- **كۆتا هەڵوەستەمان لەبەرانبەر عەقڵی مرۆڤ دایە:** عەقڵ شت زانینی هەیە، وێناكردنی هەیە، وەبیر هێنانەوەی هەیە، شت هەڵگرتنی هەیە لە (**حَافِظَة**)دا، خەیاڵ

کردنی هەیە، عەقڵی مرۆڤ جاری وا هەیە لە هەندێك شتدا دوو دڵە، لە هەندێك شتدا بە گومانە، لە هەندێك شتدا یەقینی هەیە، لە هەندێك شتدا وەهمی هەیە، ئنجا ئەگەر تەماشای مرۆڤەکان بکەی، هەیە توانای ئیقناع کردنی زۆر بەهێزە، هەیە توانای کارتێکردن لەوانی دیکەدا هەیەو، توانای سەرنجڕاکێشان و پەلکێش کردنی ئەوانی دیکەی هەیە، هەیە هۆشدان (**ذاكِرة**)ی بەهێزترە، شتی وەبیر دێتەوە، هەیە پارێزەر (**حَافِظة**)ی بەهێزترە، کە شت لە مێشکی خۆیدا هەڵبگرێ، هەیە لە ڕووی ناسینەوەی مرۆڤەکاندا بەهێزترەو، هەیە لە ڕووی ناسینەوەی دەنگەکانداو، هەیە لە ڕووی ناسینەوەی بۆنەکاندا بەهێزترە، ئەوانەش هەموویان لە مێشك دا هەڵدەگیرێن.

ئنجا مرۆڤەکان هەیانە دەبێتە ئەندازیار، هەیانە دەبێتە پزیشك، هەیانە دەبێتە پارێزەر، هەیانە دەبێتە وانەبێژ، هەیانە دەبێتە وەستا، هەیانە دەبێتە بازرگان، دەبێتە کاسبکار، دەبێتە دارتاش، خۆشنووس، وێنەکێش، هەموو ئەوانەش پەیوەندییان بە عەقڵ و هۆشی مرۆڤەوە هەیە.

ئەو عەقڵەی خوا بە مرۆڤی داوە، زانست ئێستا دەڵێ: دەگونجێ بە ملیۆنان وێنە لە مێشکدا هەڵبگیرێن، مێشك دەتوانێ نەوەد ملیۆن (٩٠،٠٠٠،٠٠٠)، یاخود سەد ملیۆن (١٠٠،٠٠٠،٠٠٠) بەرگ کتێب وەك زانیاریی لە خۆیدا هەڵبگرێ، ئەگەر هێندە کاتی هەبێ، بەڵێ ئا ئەو عەقڵەیە کە مرۆڤ و غەیری مرۆڤ، لێك جیادەکاتەوە، بۆیەش خوا ﷻ هەمیشە ئایەتەکانی خۆی دەبەستێتەوە بە عاقڵانەوە: (**لِقَوْمٍ يَعْقِلُون**)، (**لِقَوْمٍ يَعْلَمُون**)، (**لِقَوْمٍ يَفْقَهُون**)، (**لِقَوْمٍ يَتَذَكَّرُون**).

## مەسەلەی چوارەم:

**هەر کەس کە لە ئاسمانەکان و زەوی دایە، بۆ خوا ملکەچەو، خوا دروستکراوان دێنێتە دی و پاش فەوتانیان دەیانگێڕێتەوەو، سیفەتی هەرە بەرز لە ئاسمانەکان و زەوییدا تەنیا هی ویە (خوایە):**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿٢٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، هەر کەسێك کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هی ئەوە.

باس هەر باسی یەکتایی خوایەو، باسی بێ وێنەیی خوایە، باسی بەرزیی و مەزنیی خوایە ﷻ، لەو سیاقەدا کە دەبێ ئەو خوایەی خاوەنی ئەو هەموو نیشانەو بەڵگەو، ئەو هەموو نیعمەت و چاکانەیە، لە ژیانی مرۆڤداو، خاوەنی ئەو هەموو سیفەتە بەرزانەیەو، خاوەنی ئەو هەموو کردەوە ناوازانەیە، دەبێ بەس ئەو خوایە بپەرسترێ و بەندایەتیی بۆ بکرێ، بە مانای فراوانی پەرستن و بەندایەتیی، هەروەها دەبێ مرۆڤ خوای ﷻ لە لا لەهەموو کەسێك و هەموو شتێك خۆشەویستتر بێ، بەرزتر بێ، مەزنتر بێ و، سام لێکراوتر بێ، بۆی ملکەچتر بێ و، زیاتر پشتی پێ ببەستێ، ئەو سیفەتانەی باسمان کرد ئەوپەڕەکەیان تەنیا بۆ خوای پەروەردگار دابنێ، ئەگەرنا جاری وایە مرۆڤ جگە لە خواشی خۆش دەوێ و، جاری وا هەیە لە شتێکی دیکەش دەترسێ و، جاری وا هەیە پشت بە شتێکی دیکەش دەبەستێ، بەڵام ئەوپەڕی خۆشویستن و لێترسان و پشت پێ بەستن و بە گەورە گرتن و مل بۆ کەچ کردنی، دەبێ تەنیا بۆ خوا ﷻ بێ.

ئـەوەش هەمـووی بـۆ ئەوەیـە، کـە ئـەی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان! ئـەی ئەوانـەی بـڕوا بـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ ناهێنـن! بزانـن کـە خوایـەك ئـەوە سیفەتەکانی بـن، شایسـتەی ئەوەیـە کـە تەنیا ئەویـش بپەرسـترێ و بەندایەتیـی بـۆ بکـرێ و، پێغەمبەرەکـەی وی ﷺ بکرێتـە سـەر مەشـق لـە ژیانـداو، کتێبەکـەی وی بکرێتـە بەرنامـە لـە ژیانـداو، ژیانـی تاکیـی و، خێزانیـی و، کۆمەڵایەتیـی و، سیاسـیی، چونکـە خوایـەك ﷻ خاوەنـی ئەوپـەڕی زانیاریـی بـێ، ئەوپـەڕی میهرەبانیـی، ئەوپەڕی کاربەجێیـی، ئەوپەڕیـی توانایـی، دیـارە بەرنامەیەکیـش کـە ناردوویەتـی لـە قـەدەر خۆیەتـی، بەرنامـەو کتێبێکیـش کـە ناردوویەتـی بـۆ ئـەوەی ژیانـی مـرۆڤ ڕێـك بخـات، هـەم تـاك هیدایـەت بـدات و، هـەم کۆمەڵـگا ڕێـك بخـات: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ ﴿٢٨﴾ ﴾**الفتح**، ئـەو پەیـام وکتێبـەی ناردوویەتـی، دەبـێ هیچ شـتێك لـە ژیانـی تاکیـی و، خێزانیـی و، کۆمەڵایەتیـی و، سیاسـیی مـرۆڤ، فەرامـۆش نـەکات، هەمـووی بەرنامـەی بـۆ دابنـێ، ئنجـا ئـەوەی کـە هێڵـی گشـتیی بـۆ دادەنـێ، هێڵـی گشـتیی بـۆ دابنـێ و، ئـەوەی دەچێتە نێـو وردەکارییـەکان، بچێتـە نێـو وردەکارییەکانی.

**٢)-** ﴿ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴾، هەموویان بۆی ملکەچن، ئەمە هەر تەواوکردنی ئەو ڕستانەی پێشەوەیە، کە لە هەموویان دا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ ﴾، کە کۆتاییان ئەوە بوو کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ بِأَمۡرِهِۦۚ ﴾، لە نیشانەکانی خوایە کە ئاسمان و زەوی بە فەرمانی ئەو ڕابوەستن، واتە: بە فەرمانی تەکوینیی ئەو بەڕێوە بچن، ئنجا وێڕای ئەوە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویشدا هەیە، کە بە فەرمانی خوا ڕاوەستاون، هەر کەسێك کە تێیاندا هەیە، لە خاوەن ویست و عەقڵ و شعوورەکان، هەموویان بۆ ئەو ملکەچن.

**(قنـوت)** چییـە؟ یەکێـك لەزانایـان گوتوویەتـی: **(وَالمُـرَادُ بِالقُنُـوتِ الإِنْقِيـاد لِأَمْـرِهِ التَّكْوِينِـي، أَو الشَّـهادة للـه بِالوَحْدانِيَّـة بِدَلالَـةِ الحـال)**، **(قُنُـوت)** کـە دەفەرمـوێ: ﴿ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴾، بریتیـە لـە ملکەچیـی بـۆ فەرمانـی تەکوینیـی خـواو، فەرمانـی قەدەریـی خـوا، یـان: شـایەدیی دان بـە یەکتایـی خـوا بەبەڵگـەی حـاڵ.

ئەو نووسەرە بۆیە وا دەڵێ، چونکە ئەوانەی کە لە ئاسماندان کە فریشتەکانن، ئەوان ملکەچن بە مانای وشە، بەڵام مرۆڤ و جند لەسەر زەوی، جاری وایە، سەرپێچیی دەکەن لە فەرمانی خواو، بۆی ملکەچ نین، کەواتە: لێرەدا مەبەست لە ملکەچیی، ملکەچییە بۆ فەرمانی تەکوینیی و قەدەریی خوا، یانی: خوا وای خوڵقاندوون کە بەو شێوەیە بژین، لەو شوێنە هەبن، بەو شێوەیە بن و ناتوانن لە فەرمانی خوا دەربچن.

یاخود مەبەست لە: ﴿ كُلٌّ لَّهُۥ قَـٰنِتُونَ ﴾، بریتیە لە شایەدیی دانیان بە یەکتایی خوا بە زمانی حاڵ، یانی: بە زمانی حاڵیان شایەدیی دەدەن، کە خوا یەکتایە، ملکەچییەکەیان مەبەست پێی ئەوەیە کە تەنیا خوا پەرستراوە، وەك چۆن بەس خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنە.

هەروەها ئەم ڕستەیە: ﴿ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَـٰنِتُونَ ﴾، دەشگونجێ مەبەست پێی قیامەت بێ، کە ئەو کاتە دەبێتە تەواوکەری ئەو ڕستەیەی پێشوو، کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴾، یانی: هەر کەسێك لە ئاسمانەکان و زەویدا بووەو هەیە، هەمووی هی خوایەو، بەندەی خوایەو، هەموویان بۆ خوا ملکەچن لە ڕۆژی قیامەتدا، لە ڕۆژی زیندوو کرانەوەدا، فریشتەکان ئەوە دیارەو جندو مرۆڤیش هەموویان بە کافرو مسوڵمانەوە بۆ خوا ملکەچن، لەوێ کەس ناتوانێ بێ فەرمانیی خوا بکات.

٣)- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ﴾، ئەو (خوا ﷻ) ئەو کەسەیە کە دروستکراو دەست پێ دەکاو دوایی دەیگێڕێتەوە، دەستی پێ دەکات دەیهێنێتە دی، ئنجا دوای ئەوەی لە بەینی دەبات، دەیگێڕێتەوەو دەیهێنێتەوە بۆ بوون، کە مەبەست پێی زیندوو کرانەوەی مرۆڤەکانە، بەڵام خوا ﷻ بە گشتیی دەیفەرموێ، واتە: خوا بە گشتیی شتەکان دێنێتە دی و، دوای ئەوەی لە بەینیان دەبات، دووبارە جارێکی دی دەیانهێنێتەوە دی.

٤)- ﴿وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِ﴾، ئەوە لە لای ئاسانترەو، ئەوە بۆ خوا ﷻ سێناترە، کە شتێك لە سەرەتاوە دروست بکات، دوای ئەوەی کە لە بەین چوو، بیگێڕێتەوە، گێڕانەوەکەی بۆ بوون، ئاسانترە لە لەسەرەتاوە دروستکردنی، (**أَهْوَن: إِسْمُ التَّفْضِيلِ وَالكَلَامُ عَلَى سَبِيلِ مُخاطَبَة عُقُول البَشَر، بِأَنَّ الإِعَادَةَ أَسْهَل**)، وشەی (**أَهوَن**): ناوی هەڵبژاردن (**إِسْمُ التَّفْضِيل**)ە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی دواندنی عەقڵی مرۆڤەکانە، عەقڵی مرۆڤەکان، وای دەخوێنێتەوە کە هەمیشە گێڕانەوەی شتێك دوای ئەوەی دروستکراوە، ئەگەر لە بەین چوو بگێڕدرێتەوە، ئاسانترە لەوە کە لە سەرەتاوە دروستی بکات، یانی: گۆزەکەرێك کە گۆزە دروست دەکات، کاتێك گۆزەکەی لێ دەشکێ، دەتوانێ لە سواڵەتەکان یان لە قوڕی دیکە، گۆزەیەکی جوانترو چاکتر دروست بکات، کەسێك کە ئامێرێك دروست دەکات، کاتێك ئەو ئامێرە تێکدەچێ، دەتوانێ چاکی بکاتەوە، یاخود دەتوانێ ئامێرێکی دیکەی لەوە چاکتر دروست بکات، بۆ مرۆڤ هەمیشە گێڕانەوە ئاسانترە، لە دەستپێکردن و لە سەرەتاوە دروستکردن، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِ﴾، ئەگەرنا بە نسبەت خوای پەروەردگارەوە، ئاسان و ئاسانتر نیە، قورس و ئاسان لە ئارادا نیە، چونکە ویستی خوا ﷻو، دەستەڵاتی خواو، زانیاریی خوا ڕەهاو بێ سنوورن، وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٨٢﴾يس، فەرمانی خوا کاتێك کە ویستی شتێك دروست بکات، هەر ئەوەیە کە پێی بفەرموێ: ببە، دەبێ، دیسان کە دەفەرموێ: ببە، یەکسەر دەبێ ئەوەش مەبەست پێی ئەوە نیە، کە خوا بە شتەکە بفەرموێ: ببە، چونکە شتێك کە نەبێ خوا فەرمانی خۆی ئاڕاستە ناکات، نا! مەسەلەکە ئەوەیە کە ئێوە کاتێك بە شتێك بڵێن: ببە، یەکسەر ببێ، چەند ئاسانە، بۆ خوای پەروەردگاریش ئاوایە، یانی: خوا ﷻ دەیەوێ لە عەقڵی ئێمە نیزیکی بخاتەوە، بۆ وێنە: کەسێك دانیشتوە پێی دەڵێی: هەڵسە، ئەویش یەکسەر هەڵسێ، یاخود ڕاوەستاوە بڵێی: دانیشە، یەکسەر دابنیشێ، ئەوە چەند ئاسانە، ئەو هەڵساندن و دانیشتاندنە، بۆ خوای پەروەردگاریش هێنانە دی شتەکان، هێندە ئاسانە.

٥)- ﴿وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، سیفەتی هەرە بەرزیش لە ئاسمانەکان و زەوییدا، تەنیا هی خوایە ﷻ، (**مَثَل**) لێرەدا بە مانای سیفەت دێ، هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان مانای ئەو ئایەتە موبارەکەیان ئاوا لێکداوەتەوە: (**أَي: ثَبَتَ لَهُ وَاسْتَحَقَّ الشَّأْنَ الأَتَمَّ**

**الَّذِي لا يُقاسُ بِشُؤُونِ النَّاسِ المُتعارفَة، أَي: الوَصْفُ الأَعْظَمُ البَالِغُ نِهَايَةَ العَظْمَة**)، واتە: بۆ خوا ﷻ چەسپیوە حاڵی هەرە تەواو، کە بەراورد ناکرێ لەگەڵ حاڵی زانراوی خەڵکدا، واتە: وەسفی هەرە مەزن کە گەیشتۆتە ئەوپەڕی مەزنیی، تەنیا هی خوایە لە ئاسمانەکان و زەوییدا.

کەواتە: ئەو شتانەی کە لە جیاتی خوا دەپەرسترێن، لەگەڵ خوادا هاوبەش دەکرێن لە پەرستراندا، ئەوە شتێکی زۆر نالۆژیکییە، چونکە سیفەتی هەرە بەرزو، حاڵی هەرە تەواو، تەنیا هی خوای پەروەردگارە، چونکە تەنیا خوا بەدیهێنەرەو، ئەوانی دیکە هەموویان بەدیهێنراوی خوان، نابێ لەگەڵ خوادا بخرێنە تەرازووەوەو، نابێ یەکێك لەو شتانەی کە تایبەتمەندیی خوایە، ئەوانی تێدا بەشدار بکرێن، وەك لە سوورەتی (**الشعراء**)دا، هاوبەشدانەرەکان، کافرەکان لە قیامەتدا، دان بە هەڵەی خۆیان دادێنن و، دەڵێن: ﴿ تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذۡ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾، واتە: بە خوا ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکراو ڕووندا بووین، کاتێك ئێوەمان یەکسان دەکرد، لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییاندا.

وەك زۆرجار گوتوومانە: بناغەی شیرك، بریتیە: لە یەکسان کردنی دروستکراوەکان لەگەڵ خوادا لە شتێك لە شتەکانیدا: لە بەدیهێنەرایەتییدا، لە پەروەردگارێتییدا، لە خاوەندارێتییدا، لە مشوورخۆرێتییدا، یاخود لە یەکێك لە سیفەتەکانی خوادا، یان لە یەکێك لە ناوەکانیدا، یەکێك لەو شتانەی کە تایبەتمەندیی خوان، تۆ بێنی یەکێك لە دروستکراوەکان، ئەو تایبەتمەندییە کە هی خوایە، ئەویشی تێدا بەشدار بکەی، ئەوە شیرکە، بۆ وێنە: پێشکەشکردنی دروشمەکان و، وەرگرتنی بەرنامەکان (**تَقْدِيمُ الشَّعائِر و أَخْذُ الشَّرائِع**) ئەوانەش هەر تایبەتمەندیی خوان، خوا ﷻ بۆی هەیە دروشمەکان دابنێ بۆ بەندایەتیی کردن بۆی، کە نیشانەو دروشمی ئەوەن، ئەو خەڵکە بەندەی خوایە: ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمۡ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقۡوَى ٱلۡقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ ﴾**الحج**، هەروەها بەرنامەکانی ژیان دەبێ، تەنیا لە خواوە وەربگیرێن و، خوا دایانبنێ، ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە، ئەوە چاکەو ئەوە خراپە، وا بکەن و وا مەکەن، بۆیە هەم پێشکەشکردنی دروشمەکان، هەم

وەرگرتنی بەرنامەکان، ئەگەر لە جگە لە خواوە ﷻ بن، دروشمەکان هەندێکیان، یان هەموویان، پێشکەشی جگەلە خوا بکرێن و، بەرنامەکان هەموو یان بەشێك لە جگەلە خوا وەربگیرێن، ئەوەش هەر شیركە.

ئێمە لە کۆتایی سوورەتی (**یوسف**)دا، لە بارەی شیرك و هۆکارەکانی شیرك و، دەرەنجامە شوومەکانی شیرك و، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و، جۆرەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانەوە، باسێکی خەست و خۆڵمان کردوە، هەر کەسێك بیەوێ لەوبارەوە وردتر بزانێ، دەبێ بگەڕێتەوە بۆ ئەوێ، کە ئەو باسەشمان لە کتێبی دوازدەیەمی مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلى في كتاب الله**) وەرگرتووەو، لە تەفسیری سوورەتی (**یوسف**)دا، پوختەو گوشراوەکەیمان هێناوە.

٦)- ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾، هەر ئەویش زاڵی کارزانە، واتە: خاوەنی ئەوپەڕی عیززەت و باڵادەستییەو، خاوەنی ئەوپەڕی حیکمەت و دانایی و کارزانییە، کەواتە: هەر ئەو شایستەی ئەوەیە بەندایەتیی بۆ بکرێ، بە مانای فراوانی بەندایەتیی و، بەس ئەو بپەرسترێ، بە مانای فراوان و ڕاستەقینەی پەرستن.

## قسەیەکی نەستەقی غەززالیی:

کۆتایی ئەم دەرسەمان بە قسەیەکی (**أبو حامد الغزالي**) دێنین، بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر ئایەتی کۆتایی ئەم دەرسەمان، کە گوتوویەتی:

(**لَا طَاقَةَ لِلْبَشَرِ أَنْ يَنْفُذُوا غَوْرَ الْحِكْمَةِ، كَمَا لَا طَاقَةَ لَهُمْ أَنْ يَنْفُذُوا بِأَبْصَارِهِمْ ضَوْءَ الشَّمْسِ، وَلَكِنَّهُمْ يَنَالُونَ مِنْهَا مَا تَحْيَا بِهِ أَبْصَارُهُمْ.. فَإِنَّ النَّاسَ إِذَا أَرَادُوا أَنْ يُفْهِمُوا الدَّوَابَّ مَا يُرِيدُونَ مِنْ تَقْدِيمِهَا وَتَأْخِيرِهَا وَنَحْوِهِ، وَرَأَوْهَا تَقْصُرُ عَنْ فَهْمِ الْكَلَامِ الصَّادِرِ عَنِ الْعُقُولِ مَعَ حُسْنِهِ وَتَرْتِيبِهِ، نَزَلُوا إِلَى دَرَجَةِ تَمْيِيزِ الْبَهَائِمِ، وَأَوْصَلُوا مَقَاصِدَهُمْ إِلَيْهَا بِأَصْوَاتٍ يَضَعُونَهَا لَائِقَةً بِهَا، مِنَ الصَّفِيرِ وَنَحْوِهِ مِنَ الْأَصْوَاتِ الْقَرِيبَةِ مِنْ أَصْوَاتِهَا**)[1].

---

(١) إحياء علوم الدين: ج٢، ص٤٥.

بەڕاستیی ئەم عیبارەتەی ئەبوو حامیدی غەززالیی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) زۆر جوانە، بۆ بەراورد کردنی ئەوە کە خوا ﷻ باسی خۆی دەکات و، خۆی بۆ ئێمە پێناسە دەکات، ئایا ئەوە هەر لە قەدەر عەقڵی ئێمەیە، یان خوای پەروەردگار سیفەتەکانی و ناوەکانی هەر ئەوەندەن؟ بە تەئکید سیفەت و ناوەکانی خوا بێ سنوورن، وەك لە فەرمایشتێکی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە لە پاڕانەوەیەکدا دەفەرموێ: {**أَللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ، ابْنُ عَبْدِكَ، ابْنُ أَمَتِكَ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ، عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ، أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ، سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ، أَوْ أَعْلَمْتَهُ أَحَدًا مَنْ خَلْقِكَ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ، أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي، وَنُورَ صَدْرِي، وَجِلَاءَ حُزْنِي، وَذَهَابَ هَمِّي**}، (**أخرجه ابن حبان: ٩٧٣، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح**).

واتە: ئەی خوایە! من بەندەی تۆم، کوڕی بەندە نێرینەکەی تۆم (کە بابمە) و، کوڕی بەندە مێینەکەی تۆم (کە دایکمە)، بڕیاری تۆ لە مندا جێبەجێ دەبێ، بڕیاری تۆ لە مندا دادگەرانەیە، نێوچەوانی من (واتە: کاری من) بە دەست تۆیە، لە تۆ دەپاڕێمەوە بە هەر ناوێك کە تۆ هەتە، کە خۆت پێ ناو ناوە، یان لە کتێبی خۆت (لە قورئان)دا داتبەزاندوە، یاخود (لە کتێبدا داتنەبەزاندوە بەڵام) فێری یەکێك لە دروستکراوەکانت کردوە (فریشتە زۆر لە خوا نیزیکەکان)، یاخود هێشتووتەتەوە لە زانیاریی پەنهاندا لە لای خۆت، داوات لێ دەکەم کە قورئانی مەزن بکەیە بەهاری دڵم و، بیکەیە ڕووناکیی سینەم و، بیکەیە مایەی لاچوونی خەم و خەفەت و پەژارەو دڵتەنگییم.

کەواتە: ناوەکانی خوا تەنیا ئەوانە نین کە لە کتێبەکەیدا دایبەزاندوون، هەروەها سیفەتەکانی خوا تەنیا ئەوەندە نین کە باسیکردوون، بەڵام ئێمە بەس ئەوەندەمان بۆ ئیستیعاب دەکرێ، ئێمە هەر لەوەندە حاڵیی دەبین، ئێمە هەر زەرفییەتی ئەوەندەمان هەیە.

مانای قسەکەی ئەبوو حامیدی غەززالي:

واتە: مرۆڤەکان توانایان نیە کە بگەنە قووڵایی حیکمەتی خوا، هەروەك ناتوانن بە چاوەکانیان بچنە نێو قووڵایی تیشکی خۆرەوە (ئەگەر زۆر چاو لە خۆر بکەن، کوێر دەبن)، بەڵام بایی ئەوەندە لە تیشکی خۆر بەهرەمەند دەبن، کە چاویانی پێ بژیەت (شتی پێ ببینن،ئەبوو حامیدی غەززالي زۆر پەنای بردۆتە بەر وێنە هێنانەوە، کە وێنە هێنانەوە عادەتی خوای پەروەردگارە لە قورئانداو، پێغەمبەریش ﷺ زۆرجار وێنەی هێناونەوە، وێنە هێنانەوە، مانا مەعنەوییەکان لە قاڵبی بەرجەستەکراودا دەخاتە بەرچاو، ئەو کاتە مرۆڤ دەتوانێ باشتر تێیانەوە ڕابمێنێ، هەم بە عەقڵی، هەم بە هەستەکانی، هەم بە خەیاڵی، ئنجا وێنەیەك دێنێتەوەو دەڵێ:) ئەگەر خەڵك بیانەوێ ئاژەڵان حاڵیی بکەن لەوەی دەیانەوێ، کە بڕۆن، یاخود دوا بکەون، (ئاو بخۆنەوەو نەخۆنەوەو، لەوەڕ بخۆن و نەیخۆن) کاتێك دەیانبینن ئەو ئاژەڵانە لەو قسەیە تێ ناگەن کە لە خاوەن عەقڵەکانەوە دەردەچێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو قسەیە زۆر ڕێك و پێکە و زۆر چاکە، (ئەو مرۆڤانە چی دەکەن بۆ تێگەیاندنی ئەو ئاژەڵانە؟) لەگەڵیان دادەبەزن بۆ پلەیەك کە ئاژەڵەکان دەتوانن دەرکی بکەن، ئامانجەکانی خۆیان دەگەیەننە ئەو ئاژەڵانە، بە هەندێك دەنگ کە شایستە بێ، بەو ئاژەڵانە.

وەك: فیکە کێشان و شێوەی ئەوە، کە لەدەنگی وانەوە نیزیك بێ و وێی بچێ، بۆ وێنە: کەسێك بیەوێ وڵاخێك ئاو بدات، فیکەی بۆ لێ دەدات، وەك کوردەواریی دەڵێن: (وڵاخ ئەگەر تینووی بێ، پێویستیی بە فیکە نیە)، یان شوان کە مەڕ دەردەکات، یان گاوان کە ڕەشەوڵاخان دێنێتەوە، یان حوشترەوان کە حوشترەکان دەنگ دەدات، جۆرە دەنگێك بەکاردێنێ، کە ئەوان لێی تێبگەن، هەروەها کەسێك سەگێك دەنگ دەدات، دیارە بە شێوەیەك دەنگی دەدات، کە لە دەنگی سەگەکە نیزیك بێ، یان پشیلەیەك پشی پشی بۆ دەکات، یان ختەی لێ دەکات و هتد.

ئەبـوو حامیدیـش دەڵـێ: خـوای پـەروەردگار کـە ئێمـە دەدوێنـێ، لـە قـەدەر عەقڵـی ئێمـە ئێمـەی دوانـدوە، ئێمـە هـەر ئەوەندەمـان بـۆ ئیسـتیعاب دەکـرێ، ئەگەرنـا کار (شَـأن)ی، خـوا زۆر زۆر لـەوە بەرزتـرە کـە هـەر ئەوەندە بێ، ئایـا زانیاریی خـوا هـەر ئەوەندەیـە کـە لـەو قورئانـەدا، یـان لـە هەمـوو کتێبەکانـدا دایبەزانـدوە؟ نەخێـر، بـە تەئکیـد زانیاریـی خـوا بێسـنوورە، وەك خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِي ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ﴿٢٧﴾ ﴾لقمـان، واتـە: بڵـێ: ئەگـەر هەرچـی درەختـە لەسـەر زەوی، بکرێتـە قەڵـەم و، هەرچـی ئـاوی دەریایەکانـەو حـەوت هێنـدەی دیکەشـیان بخرێتـە سـەر، بکرێتـە مەڕەکـەب، وشـەکانی خـوای پـێ بنووسـرێن، وشـەکانی خـوا تـەواو نابـن.

بـەڵام ئـەوەی کـە خـوا ﷻ ناردوویەتـی لـە قـەدەر ئێمەیـەو لـە قـەدەر پێویسـتیی ئێمەیـە، ئەگەرنـا کار (شَـأن)و حاڵـی خـوا ﷻ، زۆر لـەوە بەرزتـرە کـە ئێمـە بتوانیـن دەرکـی بکەیـن، بـەڵام توانـای ئێمـە هـەر ئەوەندەیـە.

خـوا بـە لوتـف و کەڕەمـی خـۆی، ئێمـە لـەو کەسـانە بگێـڕێ، کـە هەرچـی زیاتـر خـوا بناسـن و، بـەو شـێوەیە کـە شایسـتەی خوایـە، مامەڵـەی لەگەڵـدا بکەیـن، یارمەتییمـان بـدات، زیاتـر لـە قووڵایـی قورئـان تێبگەیـن، بـۆ ئـەوەی لـە میانـی قورئانـدا، زیاتـر دەرکـی مەزنیـی و پایـە بەرزیـی خـوا ﷻ بکەیـن و، سـەرەنجام بتوانیـن بـەو شـێوەیەی بـۆ خـوا شایسـتەیە، مامەڵـەی لەگەڵـدا بکەیـن و، بەندایەتیـی بـۆ بکەیـن و بیپەرسـتین.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرســەمان لـە دوازدە (١٢) ئایـەت پێـك دێ، ئایەتەكانـی: (٢٨ - ٣٩)، كـە تـەوەری سـەرەكییان باسـی یەكتایـی خوایـە ﷻ لـە پەرسـتران و بەندایەتیـی بـۆ كرانی داو، بـۆ ئیسـپاتی ئـەو ڕاسـتییە مەزنـەش: عەقـڵ و زگمـاك و مێـژووی ڕابـردوو و واقیعـی ژیانـی مرۆڤـەكان، بـە بەڵگـە هێنراونـەوە.

لـە كۆتاییشـدا بـە بۆنـەی فراوانكـردن و تەنگكردنـەوەی بژیـوی مرۆڤەكانـەوە، بـە ویسـتی خـوای كاربەجـێ فەرمـان كـراوە بـە هاوكاریـی كردنـی خزمـان و نـەدارو ڕێبـوارو، سەرزەنشـتی سـوود خۆریـی و، ستایشـی زەكاتـدان كـراوە.

﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِى
مَا رَزَقْنَٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ
ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍۖ فَمَن يَهْدِى
مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًاۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ
ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَاۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ
ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ
ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًاۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ
فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾ وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْا۟ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً إِذَا
فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْۚ فَتَمَتَّعُوا۟ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ
أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُوا۟ بِهِۦ يُشْرِكُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُوا۟

بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ ﴿٣٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ
لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣٧﴾ فَآتِ ذَا الْقُرْبَىٰ حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ
وَابْنَ السَّبِيلِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا آتَيْتُم
مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَ فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلَا يَرْبُو عِندَ اللَّهِ ۖ وَمَا آتَيْتُم مِّن زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ
فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ ﴿٣٩﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(خـوا) وێنەیەکـی لـە خۆتـان بـۆ هێناونـەوە (لەسـەر ڕاسـتیی خـوا پەرسـتیی و پووچەڵیـی شـیرك)، ئایـا ئێـوە هیـچ هاوبەشـتان هـەن لـەوەدا کـە پێمـان بەخشـیون، لـە نێـو بەردەسـتەکانتاندا، کـە ئێـوە (و ئـەوان) تێیـدا یەکسـان بـن، مەترسـییتان لێیـان هەبـێ (کـە هاوبەشـتان بـن) وەك چـۆن مەترسـیی خۆتانتـان هەیـە؟ بـەو شـێوەیە ئایەتـەکان شـیدەکەینەوە بـۆ کۆمەڵێـك بفامـن ﴿٢٨﴾ بەڵکـو ئەوانـەی سـتەمیان کـردوە، بەبـێ زانیاریـی دوای ئارەزووەکانیـان دەکـەون، ئنجـا ئایـا کەسـێك خـوا گومـڕای کردبـێ، کـێ بـۆی ڕاسـتە ڕێ دەکـرێ؟ بێگومـان هیـچ یارییـدەدەرو سەرخەریشـیان نیـن ﴿٢٩﴾ دەجـا (مـادام حـاڵ وایـە) بـە پاکیـی و سـاغیی ڕووی (دڵی) خـۆت لەگـەڵ ئاییـن (ی خـوا)دا ڕاسـت بکـە، (ئاییـنێـك کـە هەمـان) زگماکـی خوایـە خەڵکـی لەسـەر سروشـتاندوە، دروسـتکراوی خـوا (لـە ئاییـنی ڕاسـتی خـوادا) گـۆڕانـی بـۆ نیـە، ئـا ئـەوە ئاییـنی ڕێـك و ڕاسـتە، بـەڵام زۆربـەی خەڵکـی نازانـن ﴿٣٠﴾ (ئـەی خەڵکینـە!) لـە ناخـەوە بـۆ لای (خـوا) بگەڕێنـەوەو پارێـزی لێبکـەن و، نوێـژ بەرپـا بکـەن و لـە هاوبەشـدانەران مەبـن ﴿٣١﴾ لەوانـەی ئایینەکەیانیـان بـەش بەشـکردو، بوونـە دەسـتە دەسـتە، هـەر کۆمەڵێـك بـەوەی کـە لـە لایانـە شـادمانن (بـەڵام ئـەوەی لـە لای ئەوانـی دیکەیـە، بـە هیـچ دەزانـن!) ﴿٣٢﴾ کاتێکیـش خەڵـك زیـان و

گرفتارییەکیان تووش دێ، لە ناخەوە لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، دواییش کاتێك بەزەییەکی لە لایەن خۆیەوە پێچێژتن (و لە گرفتاریی قوتاری کردن) کت و پڕ کۆمەڵێکیان هاوبەش بۆ پەروەردگاریان دادەنێن ﴿٣٣﴾ تاکو سەرەنجام ناسوپاسیی بکەن بەرانبەر بەوەی پێمانداون، دەجا (ئەی بێبڕواینە! کەمێك لە ژیانی دنیادا) بەهرەمەند بن، بێگومان لەمەودوا دەزانن (چیتان بەسەر دێ!) ﴿٣٤﴾ یان ئایا (بۆیە بێبڕوان چونکە) بەڵگەیەکمان دابەزاندۆتە سەریان لەوە دەدوێ (و دان بەوەدا دێنێ) کە دەیکەنە هاوبەش(ی خوا لە پەرستن دا)؟! ﴿٣٥﴾ کاتێکیش بەزەییەك بە خەڵکی بچێژین، پێی شادمان دەبن و، ئەگەر بە هۆی ئەوەشەوە کە دەستەکانیان (لە خراپە) پێشیخستوە (و ئەنجامیان داوە) زیان و خراپەیەکیان تووش بێ، کت و پڕ نائومێدو تەمابڕاو دەبن ﴿٣٦﴾ ئایا نەیاندیوە (بە چاوی عەقڵ و دڵ) کە خوا بۆ هەر کەسێك بیەوێ بژیو (زۆرو) فراوان دەکات و (کەم دەکات و) وە تەنگ دێنێ! بە دڵنیایی لەوەدا نیشانە هەن (لەسەر کارزانیی و باڵا دەستیی خوا) بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنن (و لە ڕوانگەی ئیمانەوە بڕوانن) ﴿٣٧﴾ دەجا (مادام خوا لە بەزەیی خۆی بەهرەمەندی کردووی، تۆش بەزەیی بنوێنەو) مافی خۆی ببەخشە بە خزم و نەدارو ڕێبوار (وهاوکارییان بکە)، ئا ئەوە باشترین شتە بۆ کەسانێك کە دیداری ڕووی خوایان دەوێ (وڕازییکردنی دەخوازن)و، تەنیا ئەوانەش سەرفرازو بە ئامانج گەیشتوون ﴿٣٨﴾ ئەو (ماڵ و سامان)ەش، کە بە سوود دەیدەن، تاکو بە هۆی (وەرگرتنی) ماڵ و سامانەکانی خەڵکەوە زیاد بکات، بێگومان لە لای خوا زیاد ناکات، بەڵام زەکاتێك بۆیە دەیدەن، مەبەستتان پێی ڕووی خوا و (ڕەزامەندیی خوا)یە، ئا ئەوانە پاداشتیان بۆ چەند قات دەکرێتەوە ﴿٣٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(حَنِيفًا): بە پاكیی، بە پوختیی (الحَنَفُ: هُوَ مَيْلٌ مِنَ الضَّلَالِ إِلى الإِسْتِقامَةِ وَالجَنَفُ عَكْسُهُ)، وشەی (حَنَف): چاوگە، بریتیە لە لادان لە گومڕاییەوە بەرەو ڕێك وەستان، بە پێچەوانەی (جَنَف)ەوە، (جَنَف): بریتیە لە لادان لە ڕاستە ڕێوە بەرەو گومڕایی.

(فِطْرَتَ ٱللَّهِ): یانی: زگماكێك كە خوا مرۆڤی لەسەر دروستكردوە، زگماك یان خوارسك، (فِطْرَة الله: هِيَ ما رَكَزَ فِيْهِ مِنْ قُوَّتِهِ عَلى مَعْرِفَةِ الإِيْمان، وَفَطْرُ اللهِ الخَلْقَ: إِيْجادُهُ الشَّيءَ، وَإِبْداعُهُ عَلى هَيْئَةٍ مُتَرَشِّحَة لِفِعْلٍ مِنَ الأَفْعال)، (فِطْرَة الله): ئەوەیە كە خوا لە هێزی ئیمان لە سروشتی مرۆڤدا داینـاوە كە خواناس بێ و، كە دەگوترێ: خوا ئەو شتەی (فَطْر) كردوە، واتە: هێناویەتە دی، دایهێناوە بە شێوەیەك كە ئامادەكراوەو دەتوانێ كارێك ئەنجام بدات.

(ٱلْقَيِّمُ): (الثَّابِت، وَالمُقَوِّمُ لِمَعاشِهِم وَمَعَادِهِم)، چەسپاو ڕاگری ژیانی دنیاو دواڕۆژیان.

(مُنِيبِينَ إِلَيْهِ): لە ناخەوە بۆ لای بگەڕێنەوە، (النَّوْب: رُجُوعُ الشَّيءِ مَرَّةً بَعْدَ أُخْرى)، (نَوْب): بریتیە لە گەڕانەوەی شتێك بۆ لایەك، جار لە دوای جار، (وَالإِنَابَةُ إِلى اللهِ: الرُّجُوعُ إِلَيْهِ بِتَوْبَةٍ وَإِخْلَاص)، (إِنابَة إِلى اللهِ): بریتیە لە گەڕانەوە بۆ لای خوا، بە گەڕانەوەیەكی كردەوەیی و بە دڵسۆزیی.

(ضُرٌّ): زیان، (الضُّرُّ: سُوءُ الحَالِ فِي النَّفْسِ وَالبَدَنِ، وَالمالِ وَالجَاهِ)، وشەی (ضر): بریتیە لە حاڵ خراپیی لە نەفس و جەستەدا، لە ماڵ و ساماندا، لە جاهو سومعەدا.

(سُلۡطَٰنٗا): بەڵگـە، (**السُّـلْطَانُ: الحُجَّـةُ لِمَـا لَـهُ هُجُـومٌ عَلَـى القَلْبِ**)، بەڵگە بە (**سُـلْطان**) ناونـراوە لەبـەر ئـەوەی هێـرش دەكاتـە سـەر دڵ و عەقڵـی مـرۆڤ، (**والسَّـلاَطَةُ: التَّمَكُّنُ مِـنَ القَهْـرِ**)، (**سَـلاطَة**) بریتیـە لە چەسـپانی شـتێك لە ڕووی باڵادەسـتییەوە.

(يَقۡنَطُونَ): (**القُنُـوطُ: اليَـأْسُ مِـنَ الخَيْـرِ**)، (**قُنُـوط**) واتـە: نائومێـد بـوون لـە چاكـەو خێـر.

(رِّبٗا): (**الرِّبـا: الزِّيَـادَةُ عَلَـى رَأْسِ المَـال**)، سـوود، ئـەوەی لـە سـەرمایەكە زیـاد دەبـێ، (**رَبَـا الشَّـيءُ: زَادَ وَعَـلا**)، شـتەكە زیـادی كـردو بـەرز بـۆوە.

(ٱلۡمُضۡعِفُونَ): (**الَّذِيـنَ حَصَـلَ لَهُـمُ الأَضْعَـافُ، وَهُـوَ إِضْعَـافُ الثَّـواب**)، ئەوانـەی كـە چەنـد قاتیـان بـۆ زیـاد بـووە، چەنـد بەرانبـەر بوونـەوەی پاداشـت.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

خـوا ﷻ دوای ئـەوەی لـە ئایەتەكانـی ڕابـردوودا، باسـی یـازدە لـە نیشـانەو بەڵگەكانـی بەدیهێنەرایەتیـی و پەروەردگارێتیـی و، خاوەندارێتیـی و مشـوورخۆریەتیی خـۆی، بـۆ مـرۆڤ و ژیـان و گـەردوون خستەڕوو، ئـەوەش دووبـارە كرایـەوە كـە بـەس خـوا دروسـتكراوەكان دەسـت پێـدەكات، دواییـش تەنیـا ئـەو دەیانگێڕێتـەوەو، ئـەوەش خرایـە ڕوو كـە خـوا خاوەنـی بەرزتریـن حـاڵ و سـیفەتە لـە ئاسـمانەكان و زەوییـدا، واتـە: ئـەو حاڵـەت و وەسـف و كـردەوە ناوازانـەی كـە خـوا ﷻ هەیەنـی، هیـچ كەسـی دیكـە نینـی و هیـچ شـتێكی دیكـە نینـی، چونكـە هـەر كەسێكی دیكـەو هـەر شـتێكی دیكـە، كـە هەیـە، هەمـووی دروسـتكراوی خوایـەو، هەركـەس هەیـە بەنـدەی خوایـە.

دوای ئـەوە جارێكـی دیكـە خـوا ﷻ دێتـەوە سـەر باسـی ئـەوە، كـە دەبـێ تەنیـا خـوا بپەرسـترێ، خوایـەك كـە ئـەوە حـاڵ و سـیفەتیەتی، شایسـتەی ئەوەیـە، كـە تەنیـا

ئـەو بەندایەتیـی بـۆ بکـرێ، ئنجـا وێنەیـەك دێنێتـەوە دەفەرمـوێ: ﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ﴾، لـە خۆتـان وێنەیەکـی بـۆ هێناونـەوە، ﴿ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِى مَا رَزَقْنَٰكُمْ ﴾، ئایـا لـەوەدا کـە پێمـان بەخشـیون، لـە نێـو بەردەسـتەکانتاندا، ﴿ مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم ﴾، واتـە: ئەوانـەی کـە لەبـەر دەسـتی ئێوەن، ئنجا ئەگـەر کۆیلـەو کەنیـزەك بـوون، کاتـی خـۆی، ئەگـەر ئێسـتا خزمەتـکارو شـاگردو هاوکارێکـەو کارمەندێکـە کـە لەبـەر دەسـتی مرۆڤدایـە، ئایا لەوانـەی کـە لەبـەر دەسـتتاندان، هیـچ هاوبەشـتان هـەن، لـەوەدا کـە پێمانـداون؟ ﴿ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ ﴾، ئێـوەو ئـەوان تێیـدا وەك یـەك بـن، ئایـا بەرپرسـی فەرمانگەیـەك، یـان سـەرۆکی وڵاتێـك، لەگـەڵ کەسـانێك کـە لەبـەر دەسـتیدان، دەسـتەڵاتیان وەك یەکـە؟ دەسترۆیشـتنیان وەك یەکـە؟ یاخـود کەسـێك کـە لـەماڵێکدایـەو، هەندێـك خەڵـك هەیـە هاوکاریـی دەکات، ئنجـا ئافرەتـە یـان پیـاوە، هاوکاریـی دەکات، خزمەتـی ماڵـی دەکات، ئایـا ئـەو کەسـە کـە خزمەتـکارە، یـان هـاوکارەو، بـەر دەسـتێکە، لەگەڵیـدا دەبێتـە هاوبـەش لـە هەمـوو ئـەو شـتانەدا کـە هەیتـی؟ ﴿ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ﴾، وەك چـۆن مەترسـییتان لـە خۆتـان هەیـە، مەترسـییتان لەوانیـش هەبـێ، ئایـا شـتی وا هەیـە؟ ﴿ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾، بـەو شـێوەیە ئایەتـەکان ڕوون و ڕۆشـن دەکەینـەوە، بـۆ کۆمەڵێـك بفامـن؟

ئـەم وێنەیـە ئـەوە دەگەیەنـێ وەك چـۆن ئێـوە ڕازی نیـن بەردەسـتەکانتان لەگەڵتانـدا یەکسـان بـن، ئایـا خـواش ﷻ چـۆن ڕازی دەبـێ دروسـتکراوەکانی لەگەڵیـدا یەکسـان بـن؟ ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٦٠﴾ ﴾**النحل**، وێنـەی هـەرە بـەرز بـۆ خوایـە، بـەڵام خـوا دەیـەوێ ئێمـە تێبگەیەنـێ، تـۆ ڕازی نـی خزمەتکارێـك، شـاگردێك، کەسـێك کـە لەبـەر دەسـتتە، لەگەڵتـدا یەکسـان بـێ لـەو دەسـتەڵاتە، لـەو مـاڵ و سـامانە، کـە لـە دەسـتی تـۆدا هەیـە، ئـەدی چـۆن دەگونجـێ، چـۆن عەقڵتـان ڕێتـان پـێ دەدات دروسـتکراوەکانی خـوا، لەگـەڵ خـوادا یەکسـان بکـەن لـە پەرسـتران و، بەندایەتیـی بـۆ کـران و، بـە مەزنگرتنـدا؟ بۆیـە دەفەرمـوێ: ئـاوا ئایەتـەکان ڕۆشـن

دەكەیـن، بـۆ كەسـانێك بفامـن، یانـی: كەسـێك عەقـڵ و لۆژیـك بەكاربێنـێ، ڕێـزی عەقڵـی خـۆی بگـرێ، ڕێـز لـە مەنتیـق بگـرێ، نابـێ هاوبـەش بـۆ خـوا دابنـێ، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَهۡوَآءَهُم بِغَيۡرِ عِلۡمٖ﴾، ئەوانـەی هاوبـەش بـۆ خـوا دادەنێـن نافامـن و، عەقـڵ بەكارناهێنـن، بەڵكـو ئەوانـە سـتەمكارن و سـتەمیان كـردوە، هاوبـەش بـۆ خـوا دادەنێـن و شـوێن ئارەزووەكانیـان كەوتـوون، بەبـێ زانیاریـی، نەزانانـە بـە دوای ئارەزووەكانیـان كەوتـوون، ﴿فَمَن يَهۡدِي مَنۡ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ﴾، ئنجـا ئایـا كەسـێك خـوا گومـڕای كردبـێ، كـێ ڕاسـتە ڕێـی دەكات؟ خـوا گومـڕای كردبـێ، واتـە: بـە پێـی سیسـتمی خـوا گومـڕا بووبـێ، بـە پێـی سیسـتمی خـوا هـەر كەسـێك بـە دوای ئـارەزوو بكـەوێ، گومـڕا دەبـێ، هـەر كەسـێ بـە نەزانیـی بـە دوای شـتێك بكـەوێ، گومـڕا دەبـێ، ئـەوە سیسـتمی خوایـە، بۆیـە دەفەرمـوێ: خـوا گومـڕای كـردوە، یانـی: بـە هـۆی سیسـتم و یاسایەك كـە خـوا دایناوە، گومـڕا بـووە، ئنجـا كـێ كەسـی وا ڕاسـتە ڕێ دەكات؟ ﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾، ئەوانـە هیـچ هـاوكارو یارمەتییـدەرو پشتیوانیشـیان نیـن.

ئنجـا ڕوو دەكاتـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ، لـە پشـت ئەویشـەوە ڕوو دەكاتـە هـەر كامێـك لەوانـەی كـە بـە دوای پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەكـەون و دەفەرمـوێ: ﴿فَأَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفٗاۚ﴾، مـادام حـاڵ وایـە، هاوبـەش بـۆ خـوا دانـان هیـچ لۆژیكـی تێـدا نیـە، هیـچ عەقڵێـك قبووڵـی نـاكات و، لەگـەڵ سروشـتی بوونـدا ناگونجـێ، لەگـەڵ پایـەو مەقامـی بـەرزو نـاوازەی خـوادا ناگونجـێ، كەواتـە: ﴿فَأَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفٗاۚ﴾، ڕووی خـۆت لەگـەڵ ئایینـی خـوادا ڕێـك بكـە، هەڵبەتـە لێـرەدا مەبەسـت پێـی ڕووی ڕواڵەتیـی نیـە، یانـی: ڕووی دڵ و نیـازو مەبەسـتت، (لِلدّیـن)، (أل) كـە لەسـەر (دیـن)ە، بـۆ پێناسـەیە، بـەڵام بـۆ (عهـد) ە، واتـە: ڕووی دڵـی خـۆت لەگـەڵ ئایینەكـەدا، بەرنامەكـەی خـوادا ڕاسـت بكـە، (حَنِیْفاً)، كـە گەڕاویـەوە لـە گومڕایـی، بـا هیـچ گومڕایـی و لاریـی، لـەو دینداریـی و خواپەرسـتییەتدا نەبـێ، ﴿فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَاۚ﴾، ئـەو ئایینـە،

هەمان ئەو زگماکەیە کە خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوە، ﴿لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ﴾، لە ئایینی ڕاستی خوادا، زگماکێك کە خوا مرۆڤی لەسەر خوڵقاندوە، گۆڕانی بەسەردا نایەت، یاخود ﴿لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ﴾، دروستکراوانی خوا نابێ بگۆڕدرێن، نابێ دەستکاریی بکرێن، ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾، ئا ئەوە ئایینی ڕێك و ڕاستە، ئایینێکە، بەرنامەیەکە، کە خوا ﷻ ناردوویەتی تاکو مرۆڤەکان ڕێك و ڕاست بکات، ژیانیان ڕێك و ڕاست بێ، چونکە (قَيِّمُ) هەم بە مانای چەسپاوو ڕاست دێ و، هەم بە مانای ڕاستکەرو ڕاگر (مُقَوِّم)یش، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، واتە: ئا ئەوە ئایین و بەرنامەی ڕاست و ڕاستکەرە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن بۆیە شوێنی ناکەون، لەبەر نەزانییە کە قەدری نازانن، وەك گوتراوە: (قەدری زێڕ لەلای زێڕنگەرە).

﴿مُنِيبِينَ إِلَيْهِ﴾، خوا دەفەرموێ: ئەی خەڵکینە! لە ناخەوە بەرەو لای بگەڕێنەوە، واتە: بەرەو لای خوا، ﴿وَٱتَّقُوهُ﴾، هەروەها پارێزی لێبکەن، ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، نوێژیش بەرپا بکەن، ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾، لە هاوبەش بۆ خوا دانەرانیش مەبن.

ئنجا وەسف وپێناسەی ئەو هاوبەشدانەرانە دەکات:

﴿مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ﴾، لەوانەی کە ئایینەکەیانیان بەش بەش کرد، ﴿وَكَانُوا۟ شِيَعًا﴾، پەرتەوازەش بوون، هەمیشە بەش بەش کردنی ئایین، دابڕ دابڕکردنی ئایینی ڕاستی خوا، دەبێتە هۆی پەرتەوازە بوونی شوێنکەوتووانی، چونکە هەر کامێکیان لایەکی دەگرێ و، بەشێکی دەگرێ و، هەر کەسە بە یاری خۆی هەڵا دەڵێ، وەك پێشینان دەڵێن: (کەس بە ڕەبەی کەس ناپێوێ) و (کەس لە مەڕی کەس ناخێوێ)، سەرەنجام چییان لێ دێ؟ ﴿كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾، هەر کۆمەڵە بەوەی بۆ خۆی لەسەریەتی پێی شادمانە، پێی

دڵخۆشـە، بـەڵام ئـەوەی ئەوانـی دیکـەی لەسـەرنی بـە هیچـی دەزانـێ و، هیـچ حیسـابی بـۆ نـاکات، لـە حاڵێکـدا کـە ئاییـن بـە هەمـوو بەشـەکانیەوە، ئـەو بەرنامـە ڕێـك و تـەواو تێـرەی خـوا پێـك دێنـێ، بـەڵام کاتێـك بـەش بـەش دەکـرێ، بـڕ بـڕ دەکـرێ، هـەر تاقمـەو بـە دوای بڕێکـی و بـە دوای بەشـێکی دەکـەوێ، لـە ڕاسـتییدا ئـەوە پێچەوانـەی سروشـتی ئاییـنی خـوای پـەروەردگارە، ئـەو کاتـەش ئاییـنی خـوا، ناڕێـك کـرچ و کاڵ دێتـە بەرچاو، نـەك لەبـەر ئـەوەی لـە زاتـی خۆیـدا وایـە، بەڵکـو لەبـەر ئـەوەی شـوێنکەوتووانی ئـاوا بـەش بەشـیان کـردوەو، هـەر کامێکیـان لایەنێکی لێگرتـوە.

ئنجـا ئەمـە خـوا موشـریکەکانی پـێ وەسـف دەکات کـە ئـاوان و ئامۆژگاریـی ئیمانـداران و مسـوڵمانان دەکات کـە ئێـوەش وەك وان مەکـەن، بـەڵام بـە داخـەوە، زۆربـەی ئـەو شـتانەی خوا ﷻ فەرموویەتـی: وەك وان مەکەن، مسـوڵمانان وایانکردوە، فەرموویەتـی: وەك هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان مەکـەن هاوبـەش بـۆ خـوا دابنێـن، مسـوڵمانان زۆریـان وایانکـردوە! فەرموویەتـی: وەك جوولـەکان مەکـەن، کـە فەرمـان بـە خەڵکـی دەکـەن بـە چاکـە، خۆشـیان چاکـە ناکـەن، مسـوڵمانان وایانکـردوە! فەرموویەتـی: وەك مونافیقـەکان مەکـەن، لەڕەوشـت وخـووی خراپیـان دا، بـەڵام مسـوڵمانان زۆرجـار وەك وان دەکـەن، وەك لـەم فەرمایشـتەدا هاتـوە:

**{عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ مَنْ قَبْلَكُمْ شِبْرًا بِشِبْرٍ، وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ، حَتَّى لَوْ سَلَكُوا جُحْرَ ضَبٍّ لَسَلَكْتُمُوهُ، قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: فَمَنْ؟}، (أخرجه أحمد: ١١٨١٧، والبخاري: ٣٢٦٩، ومسلم: ٢٦٦٩، وابن حبان: ٦٧٠٣).**

واتـە: ئەبـوو سـەعید رضي الله عنه، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: بـە دوای ئەوانـەی پێـش خۆتـان دەکـەون، ڕێبـازی ئەوانـەی پێـش خۆتـان دەگـرن، بسـت بـە بسـت و باسـك بـە باسـك ، هەتـا ئەگـەر چووبنـە کونـی بـزن مژەیەکـەوە، ئێـوەش دەچنـە نێـوی، گوتمـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا مەبەسـتت پـێ جوولەکـەو نەصڕانییەکانـە؟ فەرمـووی: ئـەدی کـێ؟!

ئنجا هەر لە بارەی خوا بەیەکگرتنەوە، کە تەنیا دەبێ خوا بپەرسترێ، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ ﴾، خەڵك كاتێك زیانێکیان تووش بوو، (ضُرٌّ) هەر ناڕەحەتیی و حاڵ خراپییەك لە ڕووح داو، لە جەستەداو، لە ماڵ و سامان داو، لە سومعەداو، لە دەوروبەرداو، خەڵك كاتێك ناڕەحەتیی و ناگوزەرییەکیان تووش دێ، ﴿ دَعَوْا۟ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ﴾، لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، لە ناخەوە بۆ لای دەگەڕێنەوە، بە دڵسۆزیی لە قووڵایی دڵیانەوە بۆ لای دەگەڕێنەوەو لێی دەپاڕێنەوە، ﴿ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً ﴾، ئنجا دوایی كاتێك خوا لە لایەن خۆیەوە بەزەییەکی پێ چێژتن، واتە: ئەو ناڕەحەتییەی لێ لابردن و، بەزەیی لەگەڵ نواندن، بەڵام لێرەدا بەزەییەکە وەك خواردنێکە دەرخواردی داون، پێیچێژتوون، ﴿ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴾، كت و پڕ كۆمەڵێك لەوان هاوبەش بۆ پەروەردگاریان پەیدا دەکەن، نەیفەرمووە هەموویان، چونکە هەیانە وەك چۆن لە تەنگانەدا پەنا دەباتە بەر خوا، دوایی لە فەڕحانییانیشدا هەر بەندەی خوا دەمێنێتەوە، بەڵام هەندێکیان لە تەنگاناندا پەنا بۆ خوا دەبەن و، لە فەڕحانییاندا بە پشت لە خوا دەکەن و، هاوبەشی بۆ دادەنێن، بۆیە خوا ﷻ وەك هەڕەشە لێکردن دەفەرموێ: ﴿ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ ﴾، با سپڵەیی و بێ وەفایی بکەن بەرانبەر بەوەی پێمان بەخشیون، ئەو هەموو چاکەو نیعمەتانەی پێمانداون، كاتێك هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، مانای وایە بەرانبەر بە چاکەکانی خوا، سپڵەو بێ نمەك و بێوەفا بوون، با وابکەن، دوایی خوا ﷻ لە شێوەی دواندنی نادیارەوە دەیگۆڕێ بۆ شێوەی دواندنی ڕووبەڕوو، ﴿ فَتَمَتَّعُوا۟ ﴾، ئنجا کەمێك بەهرە وەربگرن و ڕابوێرن، ﴿ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾، لەمەودوا دەزانن، دەزانن چۆن سزا دەدرێن و، چیتان بەسەر دێ، لەسەر ئەو سپڵەییە بەرانبەر چاکەکانی خواو، لەسەر ئەو هاوبەش بۆ خوا دانانە؟!

﴿ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُوا۟ بِهِۦ يُشْرِكُونَ ﴾، یان ئایا بۆیە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، کە ئێمە بەڵگەیەکمان دابەزاندۆتە سەریان، ئەو

بەڵگەیـە لـەو بـارەوە کـە ئـەوان دەیکەنـە هاوبـەش بـۆ خـوا دەدوێ؟ واتـە: ئایـا بەڵگەیەکیـان بـە دەسـتەوە هەیـە کـە شـیرکەکەیان، هابـەش بـۆ خـوا دانانەکەیـان پێـی پشـت ئەسـتوور بـێ و، پاڵپشـتیی هاوبـەش بـۆ خـوا دانانیـان بـکات؟ بـە تەئکیـد نەخێـر، ئەمـە پرسـیار کردنـی نکووڵییلێکەرانەیـە.

﴿ وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ فَرِحُواْ بِهَاۖ ﴾، جارێکـی دیکـە خـوا ﷻ هەمـان مەسـەلەی پێشـوو بـاس دەکات و، دەفەرمـوێ: ئەگـەر ئێمـە بەزەییـەك بـە خەڵـك بچێژیـن، زۆر پێـی شـادمان و دڵخـۆش دەبـن (الفَـرَحُ: أَشَـدُّ السُّـرُورِ)، ﴿ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ﴾، بـەڵام ئەگـەر خراپەیەکیـان تـووش بـێ، بـە هـۆی ئـەو کردەوەیـەی کـە دەسـتەکانیان پێشیخسـتوەو، ئەنجامیـان داوە، ﴿ إِذَا هُمۡ يَقۡنَطُونَ ﴾، کـت و پـڕ نائومێدو تەمـا بـڕاو دەبـن، واتـە: لـە هاتـدا، زۆر بەکەیـف و دڵخۆشـن و، لـە نەهاتـدا، زۆر نائومێـدو بـێ هیـوان، لـە حاڵێکـدا کـە ئیمانـداران لـە کاتـی هـات و خۆشـییدا، دەبـێ سوپاسـگوزاریی بکـەن و، لـە کاتـی گرفتاریـی و ناڕەحەتییـدا، دەبـێ خۆڕاگریـی بکـەن.

﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ ﴾، ئایـا نەیانبینیـوە، [لێـرەدا مەبەسـت لـە بینیـن، بینینـی عەقـڵ و دڵـە (**الرُّؤيَـةُ عِلمِيَّـةٌ وَلَيْـسَ بَصَرِيَّـة**)، چونکـە بـە چـاو نابینـرێ کـە خـوا بژیـو بـۆ خەڵـك فـراوان و زۆر دەکات، یاخـود وەتەنـگ دێنـێ، ئـەوە بـە عەقـڵ و دڵ دەرك دەکـرێ]، ئایـا نازانـن کـە خـوا بژیـو بـۆ هـەر کەسـێك بیـەوێ فـراوان دەکات و، تەنگیـش دەکاتـەوە، واتـە: زۆر دەکات و کـەم دەکات، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾، بێگومـان لـەوەدا نیشـانە هـەن بـۆ کۆمەڵێـك بـڕوا بێنـن، نیشـانە هـەن لەسـەر ئـەوە کـە خـوا ﷻ هەمـەکارەی ئـەم گەردوونەیـەو، ڕێشـمەو سـەرە داوەکانـی هەمـوو کاروبـارەکان بـە دەسـتی خـوای پـەروەردگارەوەن، چونکـە هەیـە زۆریـش خـۆی مانـدوو دەکات، ڕزقەکەشـی هـەر کەمـە، هەشـە زۆریـش خـۆی مانـدوو نـاکات، بـەڵام بەسـەریدا دەڕژێنـرێ، هەڵبەتـە بـە پێـی یاسـا گەردوونییـەکان کـە خـوا داینـاون، بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە ئینسـان ئەگـەر دیقـەت بـدات و، تێـوە ڕابمێنـێ، دەزانـێ کـە مەسـەلەی بژیـوو ڕزق، هـۆکارەکان

دەوری تێدا دەبینن، بەڵام لە پشت هۆکارەکانەوە، هۆکارساز دەوری سەرەکیی تێدایەو، ئەو (خوا ﷻ) هۆکارەکان دەڕەخسێنێ، جاری وایە هۆکارەکان هەن، بەڵام پەرچێك دێتە ڕێیان و کاریگەرییان نابێت.

﴿ فَـَٔاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ ﴾، مادام دەزانی: کاتێك بژیوت بۆ فراوان و زۆر دەبێ، ئەوە بە دەست خوایەو، کاتێك وەتەنگیش دێنێ، دیسان هەر بە دەست خوایە، کەواتە: لەوەی کە خوا پێت دەدات، خاوەن نزیکایەتیی، مافی خۆی پێ بدە، زۆربەی زانایان و توێژەرەوانی قورئان، خاوەن نزیکیی (ذي القربى)یان هەر بە خزمان لێکداوەتەوە، ئەوەی کە لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە لێت نزیکە، بەڵام پێم وایە: جگە لەوەش هەر خاوەن نزیکییەکی دیکە دەگرێتەوە، چونکە (ذَا ٱلْقُرْبَىٰ)، یانی: (**صاحِبَ القُرْبَى**)، (**ذا**) یانی: (**صاحِب**)، (**قُرْبَى**) یانی: نزیکیی، پێموایە دراوسێی نزیکیش دەگرێتەوەو، هاوەڵ و دۆستی نزیکیش دەگرێتەوەو، هەموو ئەوانەی کە لە مرۆڤەوە نزیکن دەیانگرێتەوە، بەڵام بە پلەی یەکەم خزمەکان کە بە خوێن و گۆشت و ڕەچەڵەك، دەچنەوە سەر یەکدی، دەگرێتەوە، ﴿ وَٱلْمِسْكِينَ ﴾، هەروەها مافی خۆی بدە بە نەدار، ﴿ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ﴾، کوڕی ڕێگا، ڕێبوار، ﴿ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ ﴾، ئەوە زۆر باشترە بۆ ئەوانەی ڕووی خوای پەروەردگاریان دەوێ، واتە: دیداری خوایان دەوێ، یاخود ڕەزامەندیی خوایان دەوێ، ﴿ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾، هەر ئەوانەش سەرفرازو، بەختەوەرن، بە مراد گەیشتوون.

﴿ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَا۟ فِىٓ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ ﴾، بەڵام سوودێك کە دەیدەن، ماڵێك کە دەیدەن بە سوود بۆ ئەوەی لە سامانەکانی خەڵکیدا زیاد بکات، ﴿ فَلَا يَرْبُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، لە لای خوا زیاد ناکات، واتە: ماڵێك کە دەیدەی بە کەسێك بە قەرز، بەڵام دوایی لەگەڵ وەرگرتنەوەی قەرزەکەدا سوودێکیشی لێ وەردەگری، بە هۆی ماڵ و سامانی خەڵکیەوە، ماڵ و سامانەکەی خۆت زیاد دەکەی، ئەوە لە لای خوا زیاد نابێ، بێ بەرەکەتەو بێ پیزە، ﴿ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن زَكَوٰةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ ﴾، بەڵام زەکاتێك کە دەیدەن و، مەبەستتان پێی ڕووی خواو ڕەزامەندیی

خوایە، ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُضۡعِفُونَ ﴾، ئا ئەوانە پاداشتیان بۆ چەند بەرانبەرو چەند قات دەکرێتەوە، واتە: ئەوانە کەسانێکن کە بۆ چەند بەرانبەر کراون، بۆ چەند قات کراون، واتە: پاداشتیان بۆ چەند قات و چەند بەرانبەر دەکرێتەوە.

خوا بەراوردێك دەکات لە نێوان ئەو کەسانەدا کە ماڵ و سامانی خۆیان دەدەن بە خەڵك بە قەرز، بەڵام لەو سەرەوە سوودیان لێ وەردەگرن، ئنجا ئەگەر یەك بە دەیە، یەك بە دوازدەیە، کەمترە، زیاترە، سوودیان لێ وەردەگرن، کەواتە: ماڵ و سامانی خۆیان زیاد دەکەن، بە هۆی ماڵ و سامانی خەڵکیەوە، هی خۆیان هەر لە جێی خۆیەتی و، هی خەڵکیشی دەکەوێتە سەر.

هەروەها جۆرە کەسانێکی دیکە کە ماڵ و سامانی خۆیان دەبەخشن، نەك بەس ئەوەندە کە سوود لە خەڵکەکە وەرنەگرنەوە، بەڵکو دەسمایەکەشیان لێ وەرناگرنەوە، بە تەئکید ئەو دووە زۆر لێك جیان، ئەوانەی کە ماڵ و سامانی خۆیان دەدەن بە خەڵك، بۆ ئەوەی ماڵ و سامانی ئەوان بخەنە گەڵ هی خۆیان، هی خۆشیان هەر لە جێی خۆی بێ، کە ئەوە سوودو (ربا)ی پێ دەڵێن، لەگەڵ کەسانێك دا کە ماڵ و سامانی خۆشیان کە هەیانە، دەیدەن بە خەڵك، نەك چاویان لەوە نیە کە سوود وەربگرن، چاویان لەوە نیە کە دەستمایەکەشیان لێ وەربگرنەوە، ئەو دووانە زۆر لێك جیان.

هەڵبەتە هەندێك لە زانایانیش ئەم ئایەتەیان وا تەفسیر کردوە: کە ئەوانەی دیارییەك دەدەن بە کەسێك، بۆ ئەوەی لەو سەرەوە دیارییەکی زیاتر وەربگرنەوە، هەندێك کەس دیارییەکی بچووك بۆ کەسێك دەبات، بەڵام چاوەڕوانیی ئەوە دەکات کە دوایی چەند قات دیاریی بداتەوە، هەندێك دەڵێن: ئایەتەکە مەبەستی پێ ئەوەیە، کە بێگومان ئەوەش دەگرێتەوە، وەك لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، بەڵام بە پلەی یەکەم، ئەمە یەکەمین ئاماژەیە لە قورئاندا بۆ ڕیباو سوود لە قورئانی مەککەییدا، هەڵبەتە دوایی لە قۆناغی مەدینەدا، ڕیباو سوود یەکجاریی و بەڕوونیی قەدەغە کراوە.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**وێنە هێنانەوەیەكی واقیعیی لەسەر ڕاستیی خوا بە یەكگرتن و پووچەڵیی شیرك، كە عاقڵمەندان لێی بەهرەمەند دەبن، بەڵام ئەوانەی نەزانانە شوێن ئارەزوویان دەكەون، هیچ چارەو دەرەتانیان نیەو، هیچ پشتیوان و هاوكاریان چنگ ناكەون:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِى مَا رَزَقْنَٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ﴾، واتە: خوا ﷻ وێنەیەكی لە خۆتان بۆ هێناونەوە، وێنە هێنانەوەكە بۆ پووچەڵكردنەوەی شیركەو، بۆ دەرخستنی ڕاستیی خوا بە یەكگرتن و تەنیا خوا پەرستنە، لێرەدا (مَثَلاً) دەبێتە بەركار (**مفعول به**)، یاخود دەبێتە بەركاری ڕەها (**مفعول مطلق**)، وەك بڵێی: (ضَرَبَ ضَرْبَاً)، كە دەفەرمووێ: ﴿ مِّنْ أَنفُسِكُمْ ﴾، ئەو (مِنْ)ە، لە ڕێزمانی عەرەبیی دا (مِنْ)ی دەستپێكردنی پێ دەڵێن، واتە: ئەو وێنەیەی دارێنیوە لە واقیعی خۆتان.

وێنەكە چییە؟

٢)- ﴿هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِي مَا رَزَقْنَٰكُمْ﴾، ئایا لەو کەسانەی کە لەبەر دەستتاندان، هیچ هاوبەشتان هەن، لەوەدا کە پێمان بەخشیون؟ (مِّنْ)ی ﴿هَل لَّكُم مِّن مَّا﴾، بۆ هەندێك (للتَبْعِيض)ە، بەڵام (مِنْ)ەکەی دواتر لە: ﴿مِّن شُرَكَآءَ﴾دا، پێی دەگوترێ: (مِنْ الزَّائِدَة)، زێدەکراوە بۆ جەختکردنەوەو زیاتر چەسپاندنی واتایەکە، پرسیارکردنەکەش: ﴿هَل لَّكُم﴾ ئایا هەتانە؟ بۆ نکووڵییلێکردنە، یانی: ئێوە لە نێو بەردەستەکانتاندا هیچ هاوبەشتان نین، لەو ڕزق و ڕۆزیی و ماڵ و سامانەی کە هەتانە، ﴿شُرَكَآءَ﴾، کۆی (شَرِيك)ە، واتە: هاوبەش لە ماڵ و ساماندا.

٣)- ﴿فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ﴾، کە ئێوە تێیدا یەکسان بن.

٤)- ﴿تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾، ترستان لێیان هەبێ وەك لەخۆتان، (**أَي: كَما تَتَوَقَّونَ أَنفُسَكُم مِنْ إِضاعَةِ حُقُوقِكُم**)، کە ئێوە لێیان بترسن لەو بەردەستانەتان، ماڵ و سامانەکەتان زایە بکەن، وەك چۆن مەترسییتان لە خۆتان هەیە، کە ماڵ و سامانی خۆتان ببەخشن، ئایا ئەوان دەتوانن ئەو هەموو ماڵ و سامانەتان خەرج بکەن، وەك چۆن ئێوە خەرجی دەکەن؟

٥)- ﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾، ئاوا ئایەتەکان شیدەکەینەوە بۆ کۆمەڵێك بفامن، کۆمەڵێك بفامن ئەوانەن کە خۆیان دوور دەگرن لە کەللە ڕەقیی و، لە نەسەلماندن و عینادیی، کەسانێك بفامن لەو وێنەیە چاك تێدەگەن، کە مرۆڤ شتێك لە خۆی نەوەشێنێتەوە، لە خوای ناوەشێنێتەوە، هیچ کەسێك قبووڵ ناکات، کەسێك کە لەبەر دەستیەتی، ئنجا ئەگەر کاتی خۆی کۆیلەو کەنیزەك بووە، ئێستا هاوکارو، خزمەتکارێکە، کەسێکە لە ماڵدا خزمەت دەکات، قبووڵ ناکات بڵێ: منیش وەك تۆ خاوەنی هەموو شتێکم، ئەو مەترسییەی کە لە خۆتت هەیە، کە ماڵەکەت خەرج بکەی، ئەو مەترسییەت بەرانبەر ئەو نیە، ئەویش خەرجی بکات، وەك تۆ خۆی بە خاوەن پشك و بەش بزانێ، کەواتە: ئەوە کە لە خۆتی ناوەشێنیەوە، ئەدی چۆن لە خوای دەوەشێنیەوە، کە هەندێك لە دروستکراوەکانی خوا، ببنە هاوبەشی خوا لە پەرستراوێتیی و، لە بەندایەتیی بۆ کراندا؟

٦)- ﴿بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾، بەڵكو ئەوانەی ستەمیان كردووە نەزانانە (كە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن)، بە دوای ئارەزووەكانی خۆیان دەكەون.

نەك هەر نافامن و بە حوكمی لۆژیك و عەقڵ ناجووڵێنەوەو مامەڵە ناكەن لەگەڵ خوادا، بەڵكو نەزانانە بە دوای ئارەزووی خۆیان دەكەون، بۆیە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، ئەم بەڵام (بَل)ە، بۆ گواستنەوە (**إِضْراب**)ە، (**لِلإِضْرابِ الإِبْطالي لِما يَتَضَمَّنُهُ**): ﴿لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾، بۆ گواستنەوەی هەڵوەشاندنەوەی ئەوەیە كە ڕستەی: (بۆ كۆمەڵێك بفامن) دەیگرێتە خۆی، یانی: ئەوانە نەك هەر نافامن، بگرە نەزانانە شوێن ئارەزووەكانیان كەوتوون.

﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾، بەبێ زانیاریی و، نەزانانە دوای ئارەزووی خۆیان دەكەون، (**بِغَيْرِ عِلْمٍ: للتشْنِيعِ**)، بەبێ زانیاریی، هەر بۆ ناشیرین كردن و دزێو پێشاندانە، ئەگەرنا شوێن ئارەزوو كەوتن هەر نەزانانەیە، بەڵام خوای پەروەردگار دەیەوێ زیاتر شوێن ئارەزوو كەوتنەكەی ئەوان، بە نەزانانە، بەرجەستە بكات و دەریخات.

٧)- ﴿فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ﴾، ئنجا ئایا كەسێك خوا گومڕای كرد بێ، كێ ڕاستە ڕێی دەكات، (**مَنْ**): بۆ پرسیاركردنی نكووڵیلێكردن (**لِلإِسْتِفهامِ الإنكاري**)ە، بە مانای لابردن (**نَفِي**)ە، واتە: كەسێك خوا گومڕای بكات، كەس ناتوانێ ڕاستە ڕێی بكات، (**يَهْدِي**)، لێرەدا بە مانای ڕێ پێشاندان نیە، چونكە خوا ڕێی پێشانداون، بەڵكو بە مانای ڕاستەڕێ كردن و خستنە سەر ڕاستە ڕێیە.

كە دەفەرموێ: ﴿مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ﴾، ئەمە پاڵدانی گومڕاكردنە بۆ لای خوا، بە پێی ویستی تەكوینیی خوای پەروەردگار، نەك بە پێی ویستی تەشریعیی، واتە: خوا ﷻ سیستمی گەردوونی واداناوە كە مرۆڤ دەتوانێ بە دوای هیدایەتی خوا بكەوێ، دەشتوانێ گومڕا بێ و سەر لە خۆی بشێوێنێ، كەواتە: كە سەر لە خۆی دەشێوێنێ و گومڕا دەبێ، ئەوە هەر بە ویستی خوایە، بە ویستی تەكوینیی و بە پێی سیستمی خوایە، بۆیە خوا پاڵیداوەتە لای خۆی، ئەگەرنا بە

تەئكید خوا ملی كەس ناگرێ لە ڕێی لا بدات، هەروەك ملی كەسیش ناگرێ بیهێنێتە سەر ڕاستە ڕێ، چونكە ئەگەر خوا زۆر لە خەڵك بكات بۆ ڕێی ڕاست گرتن، یاخود لادان لە ڕێی ڕاست، ئەو كاتە واتایەك بۆ تاقیكردنەوەی خوا بۆ مرۆڤەكان نامێنێتەوە.

٨)- ﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾، ئەوان هیچ یارمەتییدەریان نین، هیچ پشتیوانیان نین، ئەمە بۆ بە درۆخستنەوەی گومانی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانە، كە پێیان وابوو بت و صەنەمەكانیان و، پەرستراوەكانیان تكایان لە لای خوا بۆ دەكەن و، هاوكاریان دەبن و پشتگیریان دەبن.

**مەسەلەی دووەم:**

**فەرمان کردنی خوا بە ڕووی خۆکردنە بەرنامەی پاکی خوا، کە هەمان زگماکە خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوەو، فەرمانکردن بە گەڕانەوەی بەردەوام بۆ لای خواو، پارێز لێکردنی و نوێژ بەرپاکردن و، خۆ پاراستن لە عادەتی پەرتەوازەبوونی هاوبەشدانەران و، هەر کەسەو بە یاری خۆ هەڵا گوتنیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ ﴾، ڕووی خۆت ڕێك بكەو، ڕاست بكە لە دیندا بە ساغیی وپاكیی، وشەی (الدِّيْنِ) (أل)ی ناساندنی لەسەرەو مەبەست لە ناساندنەكە، لێرەدا (عهد)ە، ڕووی خۆت بەرانبەر بە ئایینەكە، بە بەرنامەكە كە زاندراو و ناسراوە، كە ئیسلامە ڕاست بكەو، ڕووی خۆ ڕاستكردن، یانی: ڕووی دڵی خۆت ڕاستبكەو، لە ڕووی مەعنەوییەوە، ئیرادەی خۆت ئاڕاستەی پابەندیی بەو ئایینەوە بكە، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سووڕەتی: (**آل عمران**)ە، كە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ حَاجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ اتَّبَعَنِ ﴿٢٠﴾ ﴾، واتە: ئەگەر (كافرەكان) مشتومڕیان لەگەڵ كردی بڵێ: خۆم و ئەوانەی شوێنم كەوتوون، ملی خۆم بۆ خوا كەچ كردوەو تەسلیمی خوا بووم و، (ف)ی سەر (فَأَقِمْ) پێی دەگوترێ: (**فاءٌ فصيحة**)، واتە: مادام حاڵی ئەوانەی كە لە بەرنامەی خوا لایانداوە زانیت، تۆش بە پێچەوانەی ئەوانەوە، ڕووی خۆت لەگەڵ ئایینی ڕاستی خوادا ڕاست بكە، ڕووی تێبكەو، ویستی خۆتی بە تەواویی بۆ بخە كارو بە عەزیمەتەوە بیگرە، ﴿ حَنِيفًا ﴾ لە حاڵێكدا كە تۆ پاك و پوختی و، خەوشیی و، گومڕاییت لە خۆتدا نەهێشتوە، لارییت لە خۆتدا نەهێشتوە.

﴿ حَنِيفًا ﴾، (صِيغَةُ مُبالَغَةٍ فِي الإتِّصافِ بِالحَنَف)، (حَنِيف): سیغەیەکە بۆ زێدەڕۆییکردن لە وەسفدار بوون بە (حَنَف)دا، کە بریتیە لە گەڕانەوە لە ڕێی پووچ و لار، بەرەو ڕاستە شەقام، بە پێچەوانەی (جَنَف)ەوە کە لادانە لە هەق و ڕاستیی بەرەو پووچیی ولاریی.

**٢)**- ﴿ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ﴾، زگماکی خوا کە خەڵکی لەسەر سروشتاندوە.

﴿ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ﴾، کە (منصوب)ە، (زجّاج) دەڵێ: (منصوب)ە، بە کار (فعل) ێك کە لە پێشیەوە مەزەنندە (تقدير) دەکرێ (إتَّبِعْ فِطْرَةَ الله)، بکەوە شوێن فیترەتی خوا ﷻ کە خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوە.

(الطبري)، دەڵێ: (فِطْرَةَ الله مَصْدَرٌ مِن مَعْنى فَأَقِم وَجْهَكَ لِلدِّينِ)[1]، (فِطْرَةَ الله) چاوگە لە مانای ڕستەی پێشوو کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ ﴾، کەواتە: ڕووی خۆت بەرانبەر بە ئایینی خوا ڕاست بکە، یانی: هەمان ئەو زگماکە کە خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوە.

بەڵام (محمد الطاهر بن عاشور)، دەڵێ: (فِطْرَةَ الله بَدَلٌ مِنْ حَنِيفاً بَدَلَ اشْتِمالٍ، فَهُوَ فِي مَعْنى الحالِ)[2]، واتە: کە دەفەرموێ: (حَنِيفاً)، یانی: بە پاکیی و بێ خەوشیی، کە دوایی دەفەرموێ: ﴿ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ﴾، ئەمە جێدار (بَدَل)ە، لە حاڵێکدا لەسەر ئەو زگماکەی کە خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوە.

**٣)**- ﴿ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ﴾، گۆڕان نیە، بۆ دروستکراوی خوا.

ئەوەش چەند واتایەکیان بۆ لێکداونەوە:

**أ**- دینی هەقی خوا، دروستکراوی، خوا ناگۆڕێ، واتە: ئەگەر تۆ شوێن ئایینە ڕاست و تێرو تەواوەکەی خوا بکەوی، ئەو ئایینە ڕاست و تێرو تەواوە، زگماك و سروشتی مرۆڤەکان ناگۆڕێ.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٤، ص٢٤.

(٢) التحرير والتنوير: ج٢١، ص٨٩.

ب- یاخود زگماکێك و خواڕسکێك کە خوا خەڵکی لەسەر سروشتاندوە، ناگۆڕێ.

ج- یاخود ئەو شێوە دروستکردنەی کە خوا خەڵکی لەسەر دروستکردوە، ئێوە مەیگۆڕن و دەستکاریی مەکەن.

٤)- ﴿ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ﴾، ئا ئەوە ئایینی ڕێك و ڕاستە، ئا ئەوە دینداریی ڕێك و ڕاستە کە شەریعەت و فیترەت وەك یەك بە جووتە بن، وەك هەندێك لە زانایان گوتوویانە: شەریعەت فیترەتێکی دەرەکییەو، فیترەتیش شەریعەتێکی نێوخۆییە، لە ڕاستییدا خوا ئەوەی لە شەریعەتەکەیدا داناوە، کە لە فیترەتی مرۆڤیش دا دایناوە، زگماکی مرۆڤ، خواڕسکی مرۆڤ چی دەخوازێ، شەریعەتیش ئەوە دەفەرموێ.

٥)- ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، ئەمە وەڵامی پرسیارێکی ئەگەر بۆ دانراوە: مادام ئەو ئایینەی خوا ڕێك و ڕاستە، ئەدی بۆچی خەڵکێك پشتی تێدەکات؟ بۆیە دەفەرموێ: زۆربەی خەڵکی نازانن، لەبەر نەزانییە کە پشتی تێدەکەن و بڕوای پێناهێنن.

٦)- ﴿ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ ﴾، خوا دەفەرموێ: لە ناخەوە بۆ لای بگەڕێنەوە، (**المُنِيبُ: المُلَازِمُ لِلطَّاعَةِ، أَوِ التَّائِبُ قَلْباً**)، (**مُنِيب**) بە مانای بەردەوام بوو لەسەر تاعەت و فەرمانبەریی و، بە مانای گەڕاوە بۆ لای خوا لە ناخ و دڵ و دەروونەوە دێ، هەندێکیش دەڵێن: (**مُنِيب**) ئەوەیە کە جار لە دوای جار، مرۆڤ بۆ لای خوا بگەڕێتەوە.

٧)- ﴿ وَٱتَّقُوهُ ﴾، هەروەها پارێزی لێ بکەن.

٨)- ﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، نوێژیش بەرپا بکەن.

٩)- ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، هەروەها لە هاوبەش بۆ خوا دانەران مەبن، ئەی مرۆڤەکان!

ئنجا یەکێك لە سیفەتە هەرە خراپەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەران، دەخاتە ڕوو، کە دەبێ مسوڵمانان خۆیانی لێ بپارێزن، کە بریتییە لە پەرتەوازەیی.

١٠)- ﴿ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ ﴾، لەوانەی ئایینەکەی خۆیانیان بەش بەش کرد، (**فَرَّقُواْ**) خوێندراویشەتەوە: (**فارَقُوا دِينَهُم**)، واتە: وازیان لە ئایینەکەیان هێنا، بەڵام (**فَرَّقُواْ**) یانی: بەش بەشیانکرد.

١١)- ﴿وَكَانُواْ شِيَعًا ﴾، بوونە دەستە دەستەو تاقم تاقم، چونکە (**شِيَع**) کۆی (**شِيعَة**) یە (**هِيَ الجَماعَةُ الَّتي يُتَشَايَع**)، ئەو کۆمەڵە خەڵکەیە کە دوایی پەیڕەویی لێ دەکرێ و، خەڵکی هۆگری دەبێ.

١٢)- ﴿كُلُّ حِزْبِۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴾، هەر کۆمەڵە بەوەی کە خۆی لە لایەتی پێ دڵخۆشە، زۆر شادمانە، واتە: هەر کامێکیان بە یاری خۆی هەڵا دەڵێ و هەر کامێکیان هی خۆی پێ دیندارییە.

## کورتە باسێک
## چوار هەڵوەستە لەبەردەم ئایەتەکانی (٣٠-٣٢)دا

خـوا عـز وجـل فەرموویەتـی: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾.

### هەڵوەستەی یەکەم:

لـەو بـارەوە کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ﴾، کـۆی ئـەو ڕسـتە موبارەکانـە ئـەوە دەگەیەنـن، کـە ئـەو زگماکـەی خـوا خەڵکـی لەسـەر دروسـتکردوە، ڕێـك پێکەڵپێـك وگونجـاو وتەبایـە لەگـەڵ ئـەو ئایینـە ڕێـك و ڕاسـتەدا کـە خـوا دایبەزانـدوە، بۆیـە ئەگـەر مـرۆڤ لـە زگمـاك و خواڕسـکێك، کـە خـوا لەسـەری سروشـتاندوە، لانـەدات، لەگـەڵ ئـەو ئایینـە پـاك و بـێ هەڵـەو پەڵەیـەی کـە بـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد دا ﷺ دوا نوسـخەی ناردوە، ئەگەرنـا ئایینـی خـوا هەمـووی هـەر پـاك و چـاك بـووە، کـە لـە هەمـوو قۆناغـەکان دا نوسـخەکانی بـۆ پێغەمبەرانـی دیکـەی ناردوون، ئەگـەر مـرۆڤ لـە حوکمـی عەقڵـی سـەلیم و، لـە خواڕسـکێك کـە خـوا لەسـەری خوڵقانـدوە، لانـەدات، لەگـەڵ ئـەو ئایینـەدا کـە ناردوویەتـی، ڕێـك دەبـێ و خـۆی ڕاسـت دەکات.

زگمـاك و شـەریعەت دوو ڕووی ڕاستییەکن، لـەو بـارەوە ئـەم دوو فەرمایشـتەی پێغەمبـەر ﷺ دێنیـن:

**أ)-** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ، أَو يُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ؟**}، (**أخرجه البخاري: ١٢٩٢، ومسلم: ٢٦٥٨، وأبو داود: ٤٧١٤**).

واتە: هیچ منداڵێك نیە، مەگەر لەسەر زگماك لە دایك دەبێ، (لە ڕیوایەتێکدا هاتوە: لەسەر ئەم ئایین و ڕێبازە لە دایك دەبێ)، باب و دایکنی کە دەیکەنە جوولەکە، یان دەیکەنە نەصرانیی، یان دەیکەنە مەجووسیی، هەروەك چۆن ئاژەڵ کە بەچکەی دەبێ، خڕو پڕو ڕێك و پێکە، ئایا دەبینن هیچی لووت وگوێی بڕا بێ؟ (بە تەئکید نەخێر).

واتە: مرۆڤیش کە لە دایك دەبێ، وا لە دایك دەبێ کە خوای خۆی بناسێ و، لەگەڵ هەق بێ و دژی ناهەق بێ، بەڵام دوایی ژینگەو دەوروبەر، کە لێرەدا وێنە: بە باب و دایك هێنراوەتەوە، دەیگۆڕن و بەملاو لادا، لایدەدەن.

**ب)-** فەرمایشتی دووەم لەو بارەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**أَلَا أُحَدِّثُكُمْ بِمَا حَدَّثَنِي اللَّهُ فِي كِتَابِهِ، أَنَّ اللَّهَ خَلَقَ آدَمَ وَبَنِيهِ حُنَفَاءَ مُسْلِمِينَ، وَأَعْطَاهُمُ الْمَالَ حَلَالًا، لَا حَرَامَ فِيهِ، فَجَعَلُوا مِمَّا أَعْطَاهُمُ اللَّهُ حَلَالًا وَحَرَامًا**}، (**أخرجه مسلم: ٢٨٦٥**).

واتە: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی بەڕێزی (خوا لێیان ڕازی بێ)، فەرمووی: ئایا قسەیەکتان بۆ بکەم کە خوا ﷻ لە کتێبەکەی خۆیدا بۆی باسکردووم؟ (ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لێرەدا دەفەرموێ: لە کتێبی خوا هەڵیهێنجاوەو وەریگرتوە)، ئەویش ئەوەیە کە خوا ئادەم و ڕۆڵەکانی پاك و چاك و، ملکەچ بۆ خۆی دروستکردوون و، ماڵ و سامانی حەڵاڵیشی پێداون، کە هیچ حەرامی تێدانیە، (هۆکاری وای بۆ ڕەخساندوون کاسبیی حەڵاڵی پێ بکەن)، بەڵام ئەوان لەوەی کە خوا پێیداون، هەندێکیان بە حەڵاڵ داناو هەندێکیان بە حەرام دانا.

واتە: هەر لە خۆوە گوتیان: ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە، بە تایبەتی لە مەسەلەی ئاژەڵەکان دا، کە لە سوورەتی (المائدة)دا، خوای پەروەردگار

دەفەرمـوێ: ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٖ وَلَا سَآئِبَةٖ وَلَا وَصِيلَةٖ وَلَا حَامٖ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَأَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ١٠٣﴾ المائـدة، ئـەو چـوار جـۆرە ئاژەڵـە لـە نێـو هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانـدا هەبـوون، هەریەکـەی بـە بیانوویـەك جۆرێـك لـە قەدەغەیـان خسـتبوونە سـەر.

شـایانی باسـە: ئێمـە باسـێکی فراوانمـان لـە بـارەی پێکـەوە جووتیـی و، پێکـەوە تەبـا بوونـی زگمـاك و ئاییـن کـردوە، لـە:

١- مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی) دا، بەرگی دووەم.

٢- مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد)، لە بەشی یەکەمدا: (زگماك شایەدیی بۆ بوونی خوا دەدات).

## هەڵوەستەی دووەم:

لـە تەفسـیری ئایەتـی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍۚ إِنَّمَآ أَمۡرُهُمۡ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ١٥٩﴾ الأنعـام دا، باسـێکی سـەربەخۆمان لـەو بـارەوە کـردوە، کـە ئـەم ئایەتـە موبارەکـەش دەیگەیەنـێ، کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٣١ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ٣٢﴾، باسـمان کـردوە کـە هۆکارەکانـی لادان لـە ڕاسـتە شـەقامی خـوا بەیەکگرتـن و، ڕوو کردنـە شـیرك و لادان و تـاوان چییـەو، چارەسـەر چۆنـە؟ لـەو بـارەوە هـەم ئایەتمـان هێنـاون، هـەم فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەر ﷺ، هـەم قسـەی زانایانیشـمان لـەو بـارەوە هێنـاوە.

## هەڵوەستەی سێیەم:

ئـەم دوو ئایەتـە کـە خـوا تێیـان دا دەفەرمـوێ: ﴿ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾، ئـەوە دەگەیەنـن کـە پـەر تـەوازە بـوون لە دینداریـیدا، عادەتـی کافـران و هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانـە، هەروەهـا دەمارگیریـی حیزبییـش، ﴿ كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴾، ئەویـش هـەر عادەتـی کافـران و هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانـە، بۆیـە پێویسـتە مسـوڵمانان خۆیـان بپارێـزن، هـەم لـە پـەر تەوازەیـی لـە دینـدا، کـە هـەر کەسـە بـە یـاری خـۆی هـەڵا بڵـێ و، هـەر کەسـە بـە ڕبـەی خـۆی بپێـوێ و، هـەر کەسـە بـە ڕێیەکـدا بـڕوات، کـەس سـڵاو لـەوی دیکـە نـەکات، هـەر کەسـە تەنیـا خـۆی پـێ هەق بـێ! ئـەوە عادەتی کافـر و موشـریکەکانە، هەروەهـا دەمارگیریـی حیزبیـی، ئنجـا حیـزب مـەرج نیـە، تەنیـا حیزبـی سیاسـیی بێ، ئـەوەی کـە ڕێبازێکـی ئەهلـی تەصەووفـی گرتـوە، ئـەوەی کـە مەشـڕەب سـەلەفییەو ناوێکـی لـە خـۆی نـاوە، ئـەوەی کـە ڕێکخراوێکـی مەدەنیـی دروسـتکردوە، ئـەوە کـە شـێخێکەو مەلایەکـەو، هەندێـك خەڵکـی لـێ ئـاڵاوە، بانگەوازکارێکـەو هەندێـك خەڵکـی لـە خـۆی ئاڵانـدوە، ئنجـا بێنـێ ئـەو خەڵکـە وا تێبگەیەنـێ کـە: تەنیـا ئـەو لەسـەر هەقـەو، هـەر ئـەو لـە ئیسـلام تێگەیشـتوەو خەڵکـی دیکـە هەمـووی گومڕایـەو سەرلێشـێواوەو، هیچـی بـە کەڵکـی هیـچ نایـەت! ئـا ئـەوە چ حیزبێکـی سیاسـیی بیـکات، بـە نـاوی دینـەوە، چ گرووپێـك بیـکات، چ مەشـڕەبێك بیـکات، چ تەریقەتێکـی تەصـەووف، یـان ڕێچکەیەکـی بـە نـاوی سـەلەفیی، چ شـێخێك، چ مەلایـەك، چ کەسـایەتییەك، چ ڕێکخراوێکـی مەدەنیـی، لـە ڕاسـتییدا هـەر کەسـێك بیـکات، پێچەوانـەی ئەوەیـە کـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام) هێناویانـەو، پێچەوانـەی ئاییـن و بەرنامـەی تێـرو تـەواوو گشـتگیرو هەمەلایەنـەی خوایـە، کـە مسـوڵمانان دەبێـت هەموویـان یەکدییـان خـۆش بـوێ، بەڵـێ بـا ئیشـەکان لـە بەینـی خۆیانـدا دابـەش بکـەن، بـا ڕۆڵـەکان دابـەش بکـەن (**توزيـع الأدوار**)، بـەڵام دەبـێ

هەموویان یەکدییان خۆش بوێ، هەموویان بۆ یەك بە سۆزو، بە پەرۆش بن و، هەموویان پشتگیریی یەکدی بکەن لەسەر هەق، ئەگەر تێبینیی و ڕەخنەشیان لە یەکدی هەبێ، هەوڵبدەن بە شێوازی چاك و پاك و ڕێك و ڕاست و دڵسۆزانە، یەکدی ڕاستبکەنەوە، نەك شیرو تیر لە یەکدی بسوون، لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای یەکدی بکەن، هەر کامێکیان شوێنکەوتووانی خۆی لەسەر دەمارگیریی و خۆپەسندیی و، لەسەر تەنیا هەق لە خۆدا کورتهەڵێنان ڕابێنێ و باربێنێ و پەروەردە بکات، کە ئەوە دەبێتە هۆی لێك دابڕانی مسوڵمانان و، ئەوەش عادەتی کافرەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، ناڵێین: هەر کەس وایکرد، بۆتە کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەر، بەڵام دەڵێین: سیفەتێکی کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرانی تێدا هاتۆتە دی، جاری واش هەیە ئینسان مسوڵمانە، بەڵام سیفەتی مونافیقانی تێدایە، سیفەتی کافرانی تێدایە، سیفەتی موشریکانی تێدایە، هەروەك جاری وایە مرۆڤ بابایەکی موشریك وکافرە، بەڵام سیفەتی مسوڵمانانیشی تێدایە.

## هەڵوەستەی چوارەم:

هەروەها ئەم ئایەتە لێی وەردەگیرێ، کە هەمیشە تاقم تاقم بوون و پەرتەوازە بوونی مسوڵمانان، بەرهەمی لەت و پەتکردن و دابڕ دابڕکردنی ئایینە، کاتێك یەکێکیان تەنیا لایەنی سیاسیی لێ دەگرێ، ئەوی دی تەنیا لایەنی پەروەردەیی، ئەوی دیکە تەنیا لایەنی فیکریی، یەکی دیکە تەنیا لایەنی ڕووحیی، یەکێك تەنیا لایەنی عەقیدەیی،...هتد، لە ئەنجامی ئەوەدا لێك دادەبڕێن، لە ئەنجامی ئەوەدا، کە دینەکەیان دابەش کردوە، خۆشیان تاقم تاقم و دەستە دەستە دەبن، هەریەکەی بە شێوێکدا دەڕوات، سەرەنجامیش دەمارگیرییان بۆ شتەکەی خۆیان پەیدادەبێ و، خۆ پەسندییان بۆ پەیدادەبێ.

**مەسەلەی سێیەم:**

**خەڵك بە گشتیی لە كاتی تەنگانەو گرفتارییدا، لە خوا دەپاڕێنەوە، بەڵام لە خۆشییدا بەشێكیان تووشی شیرك دێن، هەڵبەتە شیركیش پشت ئەستوور نیە، بە هیچ بەڵگەیەك و، خەڵكیش بە هات زۆر دڵخۆش و، بە نەهاتیش بێ هیواو تەمابڕاو دەبن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْا۟ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ ۚ فَتَمَتَّعُوا۟ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُوا۟ بِهِۦ يُشْرِكُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُوا۟ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ ﴿٣٦﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

**١)-** ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْا۟ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ﴾، هەر كاتێك بە ئاستەم زیانێك تووشی خەڵك بوو، لەپەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، لەحاڵێكدا لەناخەوە بۆ لای گەڕاونەوە، (مَسّ: **مُسْتَعارٌ لِلإصابَة وَالمَقْصُودُ بِهِ خِفَّةُ الإِصَابَة**)، واتە: بە ئاستەم، هەر تۆزێ ئازارو زیانێكیان تووش بێ، ئەو ئازارو زیانە، ئنجا گرانییە، ناڕەحەتییە، نەخۆشییە، بەڵایە، چونكە (ضُرّ) بریتیە لە حاڵ خراپیی لە جەستەدا، لە ڕووحدا، لە ژیاندا، لە ماڵ و ساماندا، لە دەوروبەردا، هەمووی دەگرێتەوە.

﴿دَعَوْا۟ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ﴾، لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە لە حاڵێكدا كە لە ناخەوە بۆ لای گەڕاونەوە، یاخود بە هەموو شێوەیەك ڕوویان لە خوا كردوە، یانی: (**مُلْتَجِئِينَ إِلَيْهِ لا يُعَوِّلُونَ على غَيْرِهِ**)، پەنایان بۆ خوا بردوە، پشت بە هیچ شتێكی دیكە نابەستن.

**٢)-** ﴿ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً﴾، دوایی ئەگەر (خوا) لە خۆیەوە بەزەییەكی پێ چێژتن، بەوە كە پاڕانەوەكەی گیرا كردن، ئازارەكەی لێ لابردن، خۆشییەكی تووشكردن،

(**الإِذَاقَةُ: مُسْتَعَارَةٌ لِلإِصَابَةِ، وَحَقِيقَتُهُ إِصَابَةُ المَطْعُومِ بَطَرَفِ اللِّسَانِ**)، (**إِذاقَة**): خوازراوەتەوە بۆ شت بەسەرهاتن، بەڵام حەقیقەتەکەی بریتیە لەوە کە ئینسان بە سەری زمان (یان بە لایەکی زمان) تامی خواردنێك بکات.

٣)- ﴿إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ﴾، یەکسەر کت وپڕ کۆمەڵێکیان هاوبەش بۆ پەروەردگاریان دادەنێن، (**إِذَا**) بۆ (**مُفاجأة**)یە، یانی: کت و پڕ هەندێکیان هاوبەش بۆ پەروەردگاریان دادەنێن، بە پێچەوانەی حاڵی بڕوادارانەوە، کە لە کاتی بەڵاو گرفتارییدا، خۆڕاگر دەبن و، لە کاتی هات و خۆشییدا، سوپاسگوزار دەبن، (**يَصْبِرُونَ عِنْدَ البَلاء، وَيَشْكُرُونَ عِندَ الرَّخَاء**)، بەڵام ئەوان بە پێچەوانەوە: کە تینیان بۆ دێ، پەنا بۆ خوا دەبەن و، کە خۆشییەکیان تووش دێ، هاوبەش بۆ خوا دادەنێن! بۆیە خوا بە هەڕەشەوە دەفەرموێ:

٤)- ﴿لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ﴾، ئەم (ل)ی (**لِيَكْفُرُوا**) دەگونجێ بۆ فەرمان بێ، یانی: با سپڵەیی بکەن، بەوەی کە پێمان بەخشیون، دەشگونجێ ئەم (ل)ە بۆ هۆکاردۆزیی (**تعلیل**) بێ، واتە: بۆیە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، تاکو سپڵەیی بکەن، بەرانبەر بەو چاکەو نیعمەتانەی پێمان داون.

٥)- ﴿فَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾، ئنجا ڕابوێرن وبەهرەمەند بن، لەمەودوا دەزانن.

ئەمە ئاوڕدانەوەیە لە نادیارەوە بۆ ڕووبەڕوو، کە لە ڕاستییدا مەبەست پێی سەرزەنشتکردن و ترساندن و هۆشیارکردنەوەیە، پێشتریش گوتوومانە: (**التَّمَتُّعُ: الإِنْتِفَاعُ بِالمُلائِمِ وَبِالنِّعمِ مُؤَقَّتاً**)، بەهرەمەند بوونە لە شتێك کە لەگەڵت دا دەگونجێ و، بەهرەمەند بوون لە نیعمەت بە شێوەیەکی کاتیی.

دوایی خوا ﷻ لەوبارەوە کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، ڕوونی دەکاتەوە کە هاوبەشدانەرەکان، هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نیەو پشت ئەستوور نین بە هیچ بەڵگەیەك:

٦)- ﴿ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَانًا ﴾، یان ئایا ئێمە بەڵگەیەكمان بۆ سەر دابەزاندوون، (**سُلْطان**) بەڵگە، چونكە بەڵگە دەسەڵاتی هەیە لەسەر عەقڵ و دڵی مرۆڤ، كە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ ﴾، یانی: (**بَلْ أَأَنْزَلْنَا عَلَيْهِم**) بەڵكو ئایا ئێمە دامانبەزاندۆتە سەریان بەڵگەیەك؟ دەشگونجێ وا لێك بدرێتەوە: ئەگەر بۆ نكووڵیلێكردن بێ، یانی: (**ما أَنْزَلْنَا عَلَيْهِم سُلْطَانًا**)، واتە: ئێمە هیچ بەڵگەیەكمان نەناردۆتە سەریان، چونكە پرسیارلێكردنی نكووڵییلێكەرانە، مانای لابردن (**نَفِي**) دەگەیەنێ، ئەگەر گوتم: ئەمە دەفتەر نیە؟ یانی: نكووڵیی دەكەم لەوەی ئەمە دەفتەر نەبێ.

٧)- ﴿ فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُوا۟ بِهِۦ يُشْرِكُونَ ﴾، كە ئەو بەڵگەیە قسە دەكات، لەو بارەوە كە ئەوان دەیكەنە هاوبەش بۆ خوا، واتە: پشتگیرییان دەكات، مەبەست لە قسە دەكات: (**يَتَكَلَّمُ**)، یانی: دەلالەت دەكات (ئەوە دەگەیەنێ)، وەك لە سوورەتی (**الجاثية**) دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ ﴿٢٩﴾ ﴾، كە بێگومان كتێبەكە قسە ناكات، بەڵام یانی: ئەوە نووسینەكەی ئێمەیە دەلالەت دەكات، شایەدییتان لەسەر دەدات بە هەق.

٨)- ﴿ وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُوا۟ بِهَا ﴾، كاتێك ئێمە بەزەیی بە خەڵك بچێژین، زۆر پێی دڵخۆش دەبن، (**النَّاسَ**) (أل)ی ناساندن (**تعريف**)ی لەسەرە، بەڵام مەبەست پێی هەمووگیریی (**إستغراق**) و تێكڕا (**جنس**) نیە، چونكە وەنەبێ كۆی خەڵك بەو شێوەیە بن كە بە خۆشییان دڵخۆش بن و، بە ناڕەحەتییانیش بێ هیواو تەمابڕاو بن، بۆیە زانایان گوتوویانە: (**النَّاسَ**) لێرەدا (أل)ەكەی بۆ (**عهد**)ە، واتە: خەڵكێكی دیارییكراو (خەڵكەكە) كە مەبەست خەڵكی هاوبەش بۆ خوا دانەرە، ﴿ فَرِحُوا۟ بِهَا ﴾، واتە: زۆر دڵخۆش دەبن، شادمان دەبن.

٩)- ﴿ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ﴾، ئەگەر خراپەیەكیان تووش بێ، بە هۆی ئەوەوە كە دەستەكانیان پێشیخستوە، واتە: بە هۆی كردەوە خراپەكانی خۆیانەوە، تووشی بەڵایەك و خراپەیەك بێن.

**١٠)-** ﴿إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ﴾، ئەوانە یەکسەر بێ هیواو تەمابڕاو دەبن، (**يَقْنَطُون**)، خوێندراویشەتەوە: (**يَقْنِطُون**) هەردووکیان بە یەك واتایان، کە (**قُنُوط**) چاوگەکەیەتی.

وەك لە سوورەتی (**فصلت**)یشدا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَـٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ ﴿٤٩﴾﴾، واتە: مرۆڤ هەرگیز لە پاڕانەوەی بۆ چاکە ماندوو نابێ، بەڵام ئەگەر ناڕەحەتییەکی تووش بوو، بێ هیواو تەمابڕاو دەبێ.

هەڵبەتە کە لێرەدا خوا ﷻ ئاوا باسی حاڵی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەکات: کە لە تەنگاناندا لە خوا دەپاڕێنەوەو، کاتێ کە دەربازیان دەکات، هەندێکیان هاوبەش بۆ خوا دادەنێن و، سەرەنجام سپڵەیی دەکەن بەرانبەر بە چاکەکانی خواو، پاشان خوا ﷻ دەفەرموێ: خەڵك (واتە: خەڵکی هاوبەش بۆ خوا دانەر)، کاتێك کە خۆشییەکیان پێ دەچێژین، زۆری پێ دڵخۆش دەبن و، کاتێك ناڕەحەتییەکیان بەسەر دێ، زۆر تەمابڕاو دەبن، مەبەست پێی ئەوەیە کە مسوڵمانینە! ئێوە وریابن، وەك ئەوان مەکەن، وێڕای ئەوەی کە سەرزەنشتکردنە بۆ کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، هۆشداریی پێدان و ئاگادار کردنەوەشە بۆ مسوڵمانان، کە وەك ئەوان نەکەن.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**خستنە ڕووی ئەو ڕاستییە کە خوا بژیو فراوان و تەنگ دەکات و، فەرمانکردن بە هاوکاریی کردنی خزم و نەدارو ڕێبوار لەبەر خواو، خۆپاراستن لە سوودخۆریی و، هاندان بۆ بەخشین و خێرو چاکە بە مەبەستی دەستەبەرکردنی ڕەزامەندیی خوا:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣٧﴾ فَآتِ ذَا الْقُرْبَىٰ حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا آتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَ فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلَا يَرْبُو عِندَ اللَّهِ ۖ وَمَا آتَيْتُم مِّن زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ ﴿٣٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ﴾، ئایا نەیانبینیوە (بە چاوی عەقڵ و دڵ)، کە خوا بژیو فراوان دەکات بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ وتەنگیشی دەکات! فراوانکردن و تەنگکردن، واتە: زۆرکردن و کەمکردن، چونکە شتێك کە فراوان بکرێ و ڕابخرێ، جێی شتی زۆری لەسەر دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر تەسك بکرێتەوەو تەنگ بکرێتەوە، جێی شتی کەمی لەسەر دەبێتەوە، کەواتە: (بَسْط وقَدْر) یان (بَسْط وَضِيق)، لێرەدا مەبەست پێیان زۆرکردن و فراوان کردنە، لەگەڵ کەمکردنەوەو لێگرتنەوە.

پرسیارکردنەکەش: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا﴾، پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە: ئایا نایبینن؟ بە مانای لابردن (نفي)یە، واتە: نابینن، چونکە ئەگەر بە چاوی عەقڵ و دڵ ببینن، کە بژیو لەلایەن خواوە زۆر (فراوان) دەکرێ و، کەم (تەنگ) دەکرێ، ئەو کاتە ناچن ئەو بژیوەی کە خوا پێیان دەدات، تەنیا لە خۆیانیدا کورت هەڵێنن، بەڵکو بە ئەمانەتێکی دەزانن کە لە دەستیاندایەو، بەو شێوەیە مامەڵەی پێدەکەن کە خوا ﷻ دەفەرموێ.

٢)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوۡمٍ يُؤۡمِنُونَ ﴾، بە ڕاستیی لەوەدا نیشانە هەن، بۆ كۆمەڵێك بڕوا بێنن، چونكە ئەهلی ئیمان، بە ڕووناكیی ئیمان تەماشا دەكەن و، شتانێكیان بۆ دەردەكەون كە خەڵكی ئاسایی بۆیان دەرناكەون، ئەوە لە كوێ كەسێك بە میكرۆسكۆپێك تەماشای دڵۆپێك ئاو بكات، تەماشای گەڵای درەختێك بكات، تەماشای دڵۆپێك خوێن بكات، ئەوەش لە كوێ بە چاوی سادە تەماشایان بكات؟ ئەوەی كە بە میكرۆسكۆپ، بە زەڕەبین تەماشا دەكات، زۆر شتی دیكە دەبینێ، كە بە چاوی ڕووت نایبینێ، لە ڕاستییدا ئیمانیش وا لە مرۆڤ دەكات، چاوی عەقڵ و دڵی دەكاتەوەو زۆر شت دەبینێ، كە خەڵكی ئاسایی نایبینێ، بۆیە دەفەرموێ: لەوەدا نیشانە هەن، بۆ كۆمەڵێك بڕوا بێنن.

٣)- ﴿ فَـَٔاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ ﴾، مادام خوا بژیو فراوان دەكات و تەسك دەكات، كەواتە: مافەكەیان ببەخشە بە خاوەن نیزیكیی، هەروەها بە نەدارو ڕێبوار، ﴿ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ ﴾، خاوەن نیزیكیی، كە بە پلەی یەكەم خزمان دەگرێتەوە، كە خاوەن نیزیكیی ڕەچەڵەك و وەجاخن، بەڵام بە تەئكید هەر خاوەن نیزیكییەكی دیكەش دەگرێتەوە، كە دراوسێیە، دۆستە، نیزیكە، ناسیاوەو چاوەڕوانیی لێت هەیە.

(**مسكِيْن**)یش كەسێكە شتێكی هەبێ، بەڵام بەشی نەكات، هەروەك (**فَقِير**) ئەوەیە هیچی نەبێ، پێشتریش لە تەفسیری سوورەتی (**التوبة**)دا، باسمان كردوە، هەندێكیش دەڵێن: بە پێچەوانەوە، فەقیر ئەوەیە كە هەندێكی هەبێ و بەشی نەكات، (**مِسْكِين**) ئەوەیە كە هیچی نەبێ، بەڵام مانای یەكەمیان ڕاسترە، هەندێكیش گوتوویانە: هاوواتان، كە من پێم وایە هیچ دوو وشەیەك لە قورئاندا، هاوواتا (**مُتَرادِف**) نین، هەر كامێكیان مانایەكی تایبەتیی خۆی هەیە، با جیاوازییەكی كەمیش بێ، هەر هەیانە.

﴿ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ ﴾، یانی: كوڕی ڕێگا، كە مەبەست پێی ڕێبوارە، زۆر بە ڕێدا دەڕواو بۆتە كوڕی ئەو ڕێگایە، ئنجا دەفەرموێ: مافی خۆیان بەو سێیانە ببەخشە: بە خاوەن نیزیكیی و، نەدارو، ڕێبوار.

هەڵبەتە کە لێرەدا دەفەرموێ: (**حَقَّهُ**)، مافەکەی خۆی، مافەکە کورت (**مُجْمَل**)ە، نازانین چەندە، بەڵام ئایەتەکانی دیکەی قورئان و، فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕوونیان کردۆتەوە، ئەو هەقە چۆنەو چەندەو دەبێ چۆن بدرێ و کەی بدرێ؟ بەڵام لێرەدا بە کورتیی هاتوە، کەواتە: ئەوانەی کە لێرەدا باسی (**نَسْخ**)یان کردوەو گوایە: ئەوە بە زەکات (**نَسْخ**) بۆتەوە! قسەکەیان قسەیەکی بێ جێیە، چونکە زەکات دان لەگەڵ ئەوەدا کە یارمەتیی خزمان دەدەی، یارمەتیی نەدار دەدەی و، یارمەتیی ڕێبوار دەدەی، بێ ئەوەی لە ماڵی زەکاتیش بێ، تێك ناگیرێ، تاکو بڵێی: زەکات کە واجبە هەموو ئەو خێرو چاکانەی (**نَسْخ**) کردوونەوە! کە بەداخەوە لە هەندێ لە تەفسیرەکاندا ئەو جۆرە قسانە هاتوون، هەندێکیان زۆر داڵغەیان بەوەوە لێداوە، با ئایەتێکی دیکەش (**نَسْخ**) بکەنەوە! کە لە ڕاستییدا قورئانی مەککەیی (**نَسْخ**)ی هەر تێدانیە، ئەگەر گریمان (**نَسْخ**) هەشبێ لە ئایەتە مەدەنییەکاندا هەیە، چونکە قورئانی مەککەیی هەمووی هێڵە گشتییەکانە، چ لە ڕووی بووناسیی و، چ لە ڕووی ئیمان و عەقیدەو، لە ڕووی خواپەرستییەکان و، لە ڕووی هەڵسوکەوتەکانەوە، هێڵە گشتییەکان و، بەها سەرەکیی و بنەڕەتییەکانیان، کە ئەوانە (**نَسْخ**)یان تێدا نابێ، هەرچەندە ئێمە پێمان وایە: (**نَسْخ**) لە قورئاندا نیەو هیچ ئایەتێك نیە، ئێستا هەبێ، ئەم موصحەفە ئایەتێکی تێدا نیە، بگوترێ: لەفزەکەی دەخوێندرێتەوە، بەڵام حوکمی پێ ناکرێ، پێشتر لەو بارەوە قسەمان کردوەو، تا ئێستاش کە ئێمە لە جوزئی بیست و یەك (٢١)ی تەفسیرکردنی قورئان داین، ئایەتێکمان نەهاتۆتە پێش ناچار بین بڵێین: کاری پێ ناکرێ و (**نَسْخ**) کراوەتەوە، بەو واتایە کە زانایانی دوایی دەڵێن، ئەگەر نا وشەی (**نَسْخ**) هەندێ لە زانایانی پێشین، بە مانای: (**تخصيص العام**) و (**تقييد المُطلق**) و (**تبيين المجمل**) و (**تَدَرُّج**)یان بەکارهێناوە، کە ئەوانە هیچ پەیوەندییان بەو (**نَسْخ**)ەوە نیە، کە ئێستا هەندێك لە زانایان باسی دەکەن، لە کتێبەکانیاندا، گوایە هەندێك ئایەت لە قورئاندا هەن، کە لەفزەکەیان دەخوێنرێ، بەڵام کاریان پێناکرێ، شتی وا لە قورئاندا نیە.

٤)- ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ﴾، ئا ئەوە باشترە بۆ ئەوانەی ڕووی خوای پەروەردگاریان دەوێ، واتە: حەز بە دیداری خوا دەکەن، یان ڕەزامەندیی خوای پەروەردگاریان دەوێ، (خَيْرٌ) دەگونجێ بڵێین: باش، بەرانبەرەکەی (شَرٌ)، واتە: خراپ، دەشگونجێ بڵێین: (خَيْر) لە ئەصڵدا لە (أَخْيَر)ەوە هاتوە، هەروەها (شَرّ) لە (أَشَرّ)ەوە هاتوە، کەواتە: (خَيْر)، یانی: چاکترو (شَرّ) یانی: خراپتر.

٥)- ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

٦)- ﴿وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَاْ فِىٓ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ﴾، ئەو سوودە کە دەیدەن تاکو لە سامانەکانی خەڵك دا زیادبکات، (ئەو ماڵە کە بە سوود دەیدەن چونکە ڕیبایەکە نادرێ، یانی: ئەو ماڵ و سامانە کە بە قەرز دەیدەن، بەڵام دوایی بە سوود وەریدەگرنەوە)، تاکو لە ماڵی خەڵکدا زیاد بکات (**أَي: لِتَزِيدوا أَمْوالًا إِلى أَمْوالِكُم، أَي: لِتَنالُوا زِيادَةً وَأَرْباحاً تَحصُلَ لَكُم مِن أَمْوالِ النَّاس**)، بۆ ئەوەی ماڵ و سامانەکانتان زیاد بکەن زیادەو سوودێك بە دەست بێنن، لە ماڵ و سامانی خەڵکی.

٧)- ﴿فَلَا يَرْبُواْ عِندَ ٱللَّهِ﴾، ئەوە لەلای خوا زیاد ناکات، هیچ بەرەکەت و پێزی نیە.

هەردوو وشەی: (**يَرْبُوا**)، لە: ﴿فَلَا يَرْبُواْ عِندَ ٱللَّهِ﴾، و (**لِّيَرْبُوا**)، لە: ﴿لِّيَرْبُوَاْ فِىٓ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ﴾، بە (**تَرْبُوا**)ش دەخوێندرێنەوە، واتە: بەهەردووك شێوەی نادیار (**غائب**) و دواندن (**خطاب**).

زۆربەی زانایان وایانلێکداوەتەوە کە مەبەست ڕیباو سوودەو، بەو پێیەش بێ: ئەمە یەکەمین ئایەتە لە قورئاندا، لە سووڕەتە مەککەییەکاندا بە پێی ئاگاداری ئێستای من، لە بارەی سوود خۆرییەوە هاتبێ، ئنجا ئەمە زەمینە سازییەکە بۆ ئەوەی دوایی لە قۆناغی مەدینەدا، سوود خۆریی قەدەغە بکرێ، ئەمە هۆشدارییەکە کە سوودخۆریی لەلای خوا پەسەند نیە، بەڵام قەدەغەشی تێدا نیە.

هەندێك لە زانایانیش مانایەکی دیکەیان بۆ ئەم ڕستەیە لێکداوەتەوە:

**(الطبري)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ: **(وَمَا أَعْطَيْتُمْ أَيُّهَا النَّاسُ! بَعْضُكُمْ بَعْضًا مِنْ عَطِيَّةٍ لِتَزْدَادَ فِي أَمْوَالِ النَّاسِ بِرُجُوعِ ثَوَابِهَا إِلَيْهِ، مِمَّنْ أَعْطَاهُ ذَلِكَ، يَقُولُ: فَلَا يَزْدَادُ ذَلِكَ عِنْدَ اللَّهِ)**.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئەوەی کە هەندێکتان دیاریی دەدەن بە هەندێکتان، تاکو لە ماڵ و سامانی خەڵکدا زیاد بکات، بەوە کە دوایی لە بەرانبەردا، ئەو کەسەی شتەکەت پێداوە، شتێکی زیاترت بداتێ، ئەوە لەلای خوا زیاد ناکات.

واتە: شتێکی باش نیەو وا مەکەن، هەڵبەتە ئەوەش دەگرێتەوە، بەڵام وەك گوتم: زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی زەمینە سازیی بێ بۆ قەدەغە کردنی سوودخۆریی، کە ئەو ماڵەی بە سوودەوە دەیدەن بە خەڵك، تاکو لە ماڵی خەڵکیدا زیاد بکات، لەلای خوا بەرەکەتی نیەو زیاد ناکات.

**٨)-** ﴿وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن زَكَوٰةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ﴾، بەڵام ئەو زەکاتەی دەیدەن، مەبەستتان پێی ڕووی خوایە، ڕەزامەندیی خواودیداری خوایە.

**٩)-** ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُضْعِفُونَ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن کە چەند بەرانبەر بۆیان زیاد دەکرێ، **(أَي: حَصَلَ لَهُمُ الإِضْعَافُ وَهُوَ إِضْعَافُ الثَّواب)**، واتە: ئا ئەوانەن کە چەند بەرانبەریان بۆ زیاد دەکرێ، واتە: چەند بەرانبەر پاداشتیان بۆ زیاد دەکرێ.

**(إبن العربي)** لە **(أحكام القرآن)**دا، کە **(القرطبي)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا لێی خواستۆتەوە، دەڵێ: **(صَرِيحُ الْآيَةِ فِيمَنْ يَهَبُ يَطْلُبُ الزِّيَادَةَ مِنْ أَمْوَالِ النَّاسِ فِي الْمُكَافَأَةِ)**[2]، واتە: ئایەتەکە ڕوون و ڕاشکاوە لە بارەی کەسێکەوە، کە شتێك

---

(١) جامع البيان: ج٢١، ص٥٦.

(٢) الجامع لأحكام القرآن، ج١٤، ص٣١.

دەبەخشێ، بەڵام بۆیە دەیبەخشێ کە لە بەرانبەردا زیادە وەربگرێتەوە لە ماڵ و سامانی خەڵکی، وەك پاداشتدانەوە، (کە ئەوە شتێکی خراپەو ناپەسندە).

ئنجا هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەوە شتێکی ناپەسەندەو، هەندێك گوتوویانە: شتێکی باش نیە، بەڵام مەرج نیە حەڕام بێ و، هەندێکیشیان بە حەڕام و قەدەغەیان داناوە، بەڵام وەك گوتم: ئایەتەکە زیاتر سوود خۆریی دەگرێتەوە، هەرچەندە ئەوەش دەگرێتەوە کەسێك دیارییەك دەدات، بە کەسێك بەڵام چاوەڕوانیی ئەوە دەکات کە دوو قات و سێ قاتی ئەوە یان زیاتریش وەربگرێتەوە، ئەوە بەڕاستیی کاسبییەکی باش نیە، ئەو جۆرە کەسانە ئەو بەرانبەرانەیان کە شتیان پێ دەدەن، سەغڵەتیان دەکەن، بە حیساب ئەو دیاریی بۆ هێناوە، بەڵام چاوەڕێ دەکات، سێ چوار بەرانبەری دیارییەکەی، دیاریی بدرێتەوە!

کە ئەوەش زۆر دەشوبهێتە ڕیباو سوودەوەو، وەك ئەوە وایە کەسێك سەد (١٠٠) دینار بدات بە کەسێك، دوایی سەدو دە (١١٠) دینار وەربگرێتەوە، یان سەدو پەنجا یان زیاتریش وەربگرێتەوە، کە ئەوە خراپتریشە.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان ئایەتەکانـی: (٤٠ - ٥٣) دەگرێتـە خۆی، واتە: چـوارده (١٤) ئایەت، کۆمەڵێـك بابەتـی جـۆراو جـۆر لـەو چـوارده ئایەتـەدا خراونـە ڕوو، بـەڵام تـەوەری سـەرەکییان باسـی یەکتایـی خـواو باسـی ڕۆژی دواییـە، وێـڕای خسـتنە ڕووی چەنـد چاکـەو نیعمەتێکـی خـوا لـە ژیانـی بەشـەردا، بـە تایبـەت مەسـەلەی ناردنـی بایـەکان و، دابەزاندنـی ئـاوو، شـادمان بوونـی خەڵـك پێـی، بـە پێچەوانەشـەوە: سـپڵەیی و ناشـوکریی کردنیـان، لـە کاتـی ناردنـی بایەکـی بـە زەڕدا بـۆ کشـتوکاڵەکەیان و، زەرد هەڵگەڕانـی.

لـە کۆتاییشـدا خـوای زانـا بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ ڕادەگەیەنـێ کـە ناتوانـێ ببێتـە هـۆکاری لـە گومڕایـی دەرهێنانـی کەسـانێك، کـە هەسـتەوەرەکانی خۆیانیـان پەکخسـتوون بـە تایبـەت بیسـتن و دیتـن.

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم
مَّن يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَىْءٍ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٠﴾ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى
ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾
قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلُ كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ
﴿٤٢﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ ٱلْقَيِّمِ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ
﴿٤٣﴾ مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ ﴿٤٤﴾ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن فَضْلِهِۦٓ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ
وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَلِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَقَدْ

أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ ۖ وَكَانَ حَقًّا
عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ
يَشَآءُ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ ۖ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ إِذَا
هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ لَمُبْلِسِينَ ﴿٤٩﴾ فَٱنظُرْ
إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ
شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ يَكْفُرُونَ ﴿٥١﴾ فَإِنَّكَ
لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِ ٱلْعُمْىِ عَن
ضَلَٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{خوا ئەو کەسەیە دروستیکردوون دوایی بژیوی داون، دوایی دەتانمرێنێ، دوایی زیندووتان دەکاتەوە، ئایا هیچ کام لە هاوبەشەکانتان (کە پێتان وایە هاوبەشی خوان) هیچ شتێك لەوە (کە گوترا) دەکەن؟ پاکیی و بەرزیی بۆ وی، لەوەی دەیکەنە هاوبەشی ﴿٤٠﴾ بە هۆی ئەوەوە کە دەستەکانی خەڵك (ی خراپەکار) دەیکەن، خراپەو تێکدان لە وشکانیی و دەریادا ئاشکرا بوو، تاکو (سەرەنجام خوا سزای) هەندێك لەوەی کردوویانە پێیان بچێژێ، بەڵکو بگەڕێنەوە (سەر ڕاستە ڕێ) ﴿٤١﴾ بڵێ: بە زەمیندا بڕۆن ئنجا سەرنج بدەن سەرەنجامی ئەوانەی پێشێ چۆن بوو! (ئاکامێکی شوومیان هەبوو، چونکە) زۆربەیان هاوبەشدانەر بوون (بۆ خوا) ﴿٤٢﴾ دەجا ڕووی خۆت بەرەو ئایینی چەسپاو ڕێك ڕاست بکە (بە تەواویی پێوەی پابەند بە) بەر لەوەی ڕۆژێك بێ کە لە پەروەردگارتەوە،

گێڕانەوەو بەرپەرچدانەوەی نیە، لەو ڕۆژەدا (خەڵك) پەرتەوازە دەبن (و لەیەك جیا دەبنەوە) ﴿٤٣﴾ هەر كەسێك بێبڕوابێ، بێبڕواییەكەی بە زیانی خۆیەتی و، هەر كەسیش كردەوەی باش بكات، ئەوە بە سوودی خۆیان ئامادەسازیی (جێگاو ڕێگای بەختەوەرانە) دەكەن ﴿٤٤﴾ تاكو (سەرەنجام خوا) لە بەخششی خۆی، پاداشتی ئەوانە بداتەوە كە بڕوایان هێناوەو كردەوە چاكەكان دەكەن، بە دڵنیایی ئەو بێبڕوایانی خۆشناوێن ﴿٤٥﴾ هەروەها لە نیشانەكانی وی (خوای پەروەردگار) ئەوەیە كە بایەكان موژدەدەرانە دەنێرێ و، تاكو لە بەزەیی خۆی پێتان بچێژێ و، تاكو كەشتییەكان بە فەرمانی وی (لەسەر ئاوێ) بڕۆن و، تاكو لە بەخششی وی بخوازن (كاسبیی بكەن و) بەڵكو سوپاسگوزارییش بكەن ﴿٤٦﴾ بێگومانیش لە پێش تۆدا پێغەمبەرانێكمان بۆ لای خەڵكەكەیان ناردن، بەڵگە ڕوونەكانیان بۆ هێنان (كەچی بێبڕوا بوون) ئێمەش تۆڵەمان لەوانەی تاوانیان دەكرد ستاندو، سەرخستنی بڕوادارانیشمان لەسەر پێویستە ﴿٤٧﴾ خوا كەسێكە بایەكان دەنێرێ، هەور پەیدا دەكەن، ئنجا چۆنی بوێ لە ئاسمان دا بڵاوی دەكاتەوەو كەڵەكەی دەكات، یەكسەر باران دەبینی لە كەلێنەكانی دێتە دەرێ، ئنجا هەر كات تووشی هەر كەسێك لە بەندەكانی كرد كە بیەوێ (بەسەریدا باراندن) زۆر دڵخۆش دەبن ﴿٤٨﴾ هەرچەندە پێشتر بەر لەوەی ئەو (باران)ە، بەسەریاندا بێتە خوار، لە نائومێدان بووبن ﴿٤٩﴾ ئنجا سەرنج بدە! شوێنەوارەكانی بەزەیی خوا، چۆن زەمین دوای مردنی دەژێنێتەوە، هەر ئەو (خوایە)ش ژێنەرەوەی مردووانەو، ئەو لەسەر هەموو شتێك بە توانایە ﴿٥٠﴾ بەڵام ئەگەر بایەك (ی زیانبەخش بۆ كشتوكاڵیان) بنێرین و بە زەرد هەڵگەڕاویی ببینن، بەردەوام دوای ئەوە هەر سپڵەیی و نا سوپاسیی دەكەن (بەرانبەر بە خوا) ﴿٥١﴾ بە دڵنیایی تۆ (پەیامی خوا) بە مردووان نابیستێنی و بانگكردن بە كەڕان نابیستێنی، كاتێك بە پشتهەڵكردوویی ڕووو وەردەگێڕن ﴿٥٢﴾ هەروەها تۆ ڕێنماییكار(و دەرهێنەری) كوێران نی لە گومڕاییاندا، تۆ تەنیا (پەیامی خوا) بەو كەسانە دەبیستێنی كە بڕوا بە ئایەتەكانمان دێنن و ملكەچن (بۆ خوا) ﴿٥٣﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێک لە وشەكان

(لَا مَرَدَّ لَهُۥ): گێڕانـەوەی بـۆ نیـە، (المَـرَدُّ مَصْـدَرُ مِيمِـيٌّ مِـنَ الرَّدِّ وَهُـوَ الدَّفْـعُ)، (مَرَدّ)، چاوگێكـی میمییـە لـە وشـەی (رَدّ) كـە بە مانـای پـاڵ پێوەنـان و بەرپەرچدانەوەیە.

(يَصَّدَّعُونَ): (التَّصَـدُّعُ: الكَسْـرُ وَالشَّـقُّ، وَالمُـرَادُ بِـهِ هُنَا: التَّمايُـزُ وَالتَّفَـرُّق)، (تَصَـدُّع) بـە مانـای شـكان و لـەت بوونـە، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت پێـی لێـك دەركەوتـن و لێـك جیابوونەوەیە.

(يَمْهَدُونَ): (مَهَّـدتُ لَـكَ كَـذا: هيَّأتُـهُ وَسَـوَّيْتُهُ)، ئـەو شـتەم بـۆ تەختكـردی و، بـۆم ئامـادە كـردی، بـۆم سـاز كـردی.

(فَتُثِيرُ): پەیـدا دەكات، (ثَـارَ الغُبَـارُ وَالسَّـحَابُ وَنَحوهُمـا يَثُـورُ ثَـوْراً وَثَوَرانـاً: انتَشَـرَ سَـاطِعَاً)، تـۆزو خـۆڵ و هـەورو وێنـەی ئـەوان ئەگـەر پەیـدا ببێ: (ثـارَ)ی بۆ بـەكاردێ، (ثـارَ يَثُـورُ ثَـوْراً وَثَوَرانـاً)، پەیـدا بـوو وردە وردە، (انتَشَـرَ سـاطِعاً) كاتێـك بڵاودەبێتـەوەو بەزەقیـی دیـار دەبێ.

(كِسَفًا): (جَمْـعُ كِسْـفَة: قِطْعَـة) بــەش بــەش، پارچــە پارچــە، (كِسَــف) كۆیــەو (كِسْــفَة) یەكێكــە.

(ٱلْوَدْقَ): (مـا يَكُـونُ مِـنْ خِـلالِ المَطَـرِ كَأَنَّـهُ غُبـارٌ، وَقَـدْ يُعَبَّـرُ بِـهِ عَـنِ المَطَـرِ)، ئـەوەی كـە بارانـی لـێ پێـك دێ، یانـی: هەڵمـی ئـاو، هەندێكیـش گوتوویانـە: هـەر بـە خـودی بـاران دەگوتـرێ و، هەندێكیـش گوتوویانـە: بـەو ئـاوە دەگوتـرێ كـە لـە ئاسـمان دادەبـەزێ ئنجـا بـاران بـێ، بەفـر بـێ، تـەرزە بـێ.

(خِلَٰلِهِۦ): (خِـلال: جَمْـعُ خَلَـل، وَالخَلَـلُ فُرْجَـةٌ بَيْـنَ الشَـيْئَيْن)، (خِـلال) كـۆی (خَلَـل) ە، (خَلَـلْ) واتـە: كەلێـن و درزی نێـوان دوو شـتان.

(لَمُبْلِسِينَ): (الإبْـلاسُ: الحُـزْنُ المُعْتَـرِضُ مِـنْ شِـدَّةِ اليَـأسِ، وَالمُبْلِـسُ: السَّـاكِتُ)، (إبْلاس) بریتیـە لـە دڵتەنگییەکـی پەیدابـوو لـە ئەنجامـی زۆر نائومێدیـی دا، کەواتـە: (مُبْلِـس) بـە مانـای زۆر خەفەتبـار، بـە مانـای بـێ دەنگیـش دێ، مـرۆڤ کـە زۆر خەفەتبـار بـوو، بـێ دەنگیـش دەبـێ.

(مُصْفَرًّا): زەرد هەڵگـەڕاو، (صَفْـراء: لَـوْنٌ مِـنَ الأَلْـوان)، (صَفْـراء) زەرد، وەك خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا ﴿٦٩﴾﴾ البقـرة، زەردێـك كـە ڕەنگەكـەی زۆر زەقـە، بـەڵام ﴿فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا﴾، واتـە: زەرد هەڵگـەڕاوی دەبینـن، یانـی: كشـتوكاڵەكەیان زەرد هەڵگـەڕاو دەبینـن.

(لَّظَلُّواْ): بـەردەوام دەبـن، دەگوتـرێ: (ظَلْـتُ وَظِلْـتُ بِحَـذْفِ إحـدى اللامَيْـنِ)، دەشـگونجێ بڵێـی: (ظَلَلْـتُ وَظَلِلْـتُ، يُعَبَّـرُ بِـهِ عَمَّـا يُعْمَـلُ بِالنَّهـار)، وشـەی (ظَـلَّ) تەعبیـری پـێ دەكـرێ لـەوەی بـە ڕۆژێ ئەنجـام دەدرێ، هــەروەك (بــاتَ) بــۆ كردەوەیەكــە بــە شــەوێ ئەنجــام دەدرێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

لـەم چـواردە ئایەتـەدا، دوو جـاران: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى﴾، دووبـارە بۆتـەوە، لـەو چـوار جـارەی كـە لـەم سـووڕەتەدا هاتـوون، لێـرە لـە ئایەتەكانـی: (٤٠)و (٤٨)دایـە، شـایانی باسـە: لـەم چـواردە ئایەتـەدا، هەشـت بابـەت خراونـە ڕوو، كـە سـوڕگەی سـەرەكییان باسـی خـوا بـە یەككرتـن و باسـی ڕۆژی دواییـە، ئنجـا وەك لـە پێناسـەی ئـەم سـووڕەتەدا گوتمـان: دوو تـەوەری سـەرەكیی دەگرێتـە خـۆی:

**تـەوەری یەكـەم:** باسـی یەكتایـی خـواو، هەرچـی كـە بـاس دەكـرێ، لـەم سـووڕەتەدا بـۆ دەرخسـتنی یەكتایـی خوایـە، كـە نیشـانەكانی خـواو، نیعمەتەكانـی خـواو، چاكەكانـی خـوا لـە ژیانـی بەشـەردا، بـاس دەكرێـن، مەبەسـت ئەوەیـە: مـادام

خـوا ئـەو هەمـوو چاکـەو نیعمەتانـەی هـەن، ئـەو بەڵگـەو نیشـانانەی هـەن، کەواتە: بـەس بەندایەتیـی بـۆ وی بکـەن.

**تـەوەری دووەم:** ڕۆژی دوایـی و ئـەوەی تێیـدا دەگـوزەرێ، بـۆ بڕوادارانـی چاکـەکارو بێبڕوایانـی خراپـەکار.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ ﴾، خـوا ئـەو زاتەیـە کـە ئێـوەی هێناوەتـە دی، لـە نەبـوون، ﴿ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ﴾، دوایـی بژیوتـان دەدات، ﴿ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ﴾، دوایـی دەتانمرێنـێ و دواتریـش دەتانژیێنێتـەوە، ﴿ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَيْءٍ ﴾، ئایا لـە هاوبەشـەکانتان، ئەوانـەی کـە لـە وەهـم و خەیاڵـی ئێـوە هاوبەشـی خـوان، ئەگەرنا خـوا هاوبەشـی نیـن، ئایا لـە هاوبەشـەکانتاندا هـی وا هەیـە، کەسـی وا هەیـە، هیـچ کام لـەم کارانەتـان بـکات؟ هیـچ شـتێك لـەو کارانەتـان ئەنجام بـدات؟ هیـچ شـتێك وەدی بێنـێ و بژیـو بـدات، بژیەنـێ و بمرێنـێ؟ ﴿ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾، پاکیـی و بەرزیـی بـۆ وی لـەوەی دەیکەنـە هاوبەشـی، کەواتـە: مـادام بـەس خـوا ﷻ بەدیهێنـەرو ژیێنـەرو مرێنـەرو بژیـودەرەو، هەمـەکارەی ژیـان و مـرۆڤ و گەردوونـە: دەبـێ تەنیا ئەویـش بپەرسـترێ و بەندایەتیـی بـۆ بکـرێ.

﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ ﴾، خراپـەو تێکـدان وشـکانیی و دەریـای گرتـەوە، بـە هـۆی کـردەوەی دەسـتی خەڵکـەوە، بـە زەڕترین کردەوەشـیان ئـەو شـیرك و هاوبـەش بـۆ خـوا دانانەیـە، لـە ئەنجامـی شـیرك و لادان و خراپـەدا، ئاشـووب و تێکـدان، تـەڕو وشـکی گرتـەوە، وشـکانیی و دەریـای گرتـەوە، ﴿ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾، تاکـو سـزای بەشـێك لـەوەی کردوویانـە، پێیـان بچێـژێ، بەڵکـو بگەڕێنـەوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ لِيُذِيقَهُم ﴾، ئـەم (ل)ە هەندێـك دەڵێـن: (**لام العاقِبَة**)یـە، یانـی: سـەرەنجام خـوا پێیـان بچێـژێ، وەك خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ﴿٨﴾ ﴾**القصص**،

نیزیكانی فیرعەون هەڵیانگرتەوە، تاكو سەرەنجام بۆیان ببێتە دوژمن ودڵتەنگیی، ئنجا ئالی فیرعەون مەبەستیان ئەوە نەبووە ئەو مەلۆتكەیە بۆیان ببێتە دوژمن ومایەی خەفەت، كەواتە: (ل)ی سەر (**لیكون**) بۆ سەرەنجامە، نەك هۆكار.

دەشگونجێ بڵێین: (ل)ەكە بۆ هۆكارە (**علة**)ە، یانی: خراپە وشكانیی و دەریای گرتەوە، بە هۆی كردەوەی (گوناهەكانی) خەڵكەوە، تاكو بە پێی سیستمی خۆی بەشێك لە سزای ئەوەی دەیكەن، پێیان بچێژێ، بەڵكو بگەڕێنەوە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلُ ﴾، بفەرموو: بە زەوییدا بڕۆن و سەرنج بدەن! سەرەنجامی ئەوانەی پێشێ چۆن بووە؟ ﴿ كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ ﴾، ئەوان زۆربەیان هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون، ئنجا كە زۆربەیان هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون، یانی: زۆربەشیان تووشی سزاو جەزرەبەی خوا بوون.

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ الْقَيِّمِ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُ مِنَ اللَّهِ ﴾، ئنجا تۆ ڕووی خۆت ڕاست بكە، بۆ ئەو ئایینە ڕێك و ڕاستەی خوا دایبەزاندوە، بەر لەوەی ڕۆژێك بێ كە لە لایەن خواوە گێڕانەوەی بۆ نیە، ﴿ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ ﴾، لەو ڕۆژەدا خەڵكەكە لێك پەرتەوازە دەبن و بڵاو دەبن، پۆلێن دەبن، ﴿ مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ ﴾، هەركەس بێبڕوا بێ، زیانی بێبڕواییەكەی بۆ خۆیەتی، یاخود: هەركەس سپڵە بێ، زیانی سپڵەییەكەی بۆ خۆیەتی، ﴿ وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا ﴾، هەر كەسێكیش كردەوەی باش بكات، ﴿ فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ ﴾، ئەوانە جێگاو ڕێگا بۆ خۆیان خۆش دەكەن، زەمینە سازیی بۆ خۆیان دەكەن، ﴿ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِن فَضْلِهِ ﴾، تاكو سەرەنجام (خوا) ئەوانەی بڕوایان هێناوەو كردەوە باشەكان دەكەن، لە بەخششی خۆی پاداشتیان بداتەوە، نەك تەنیا بە ئەندازەی كردەوەكانی خۆیان، بەڵكو لە بەخششی خۆی، ﴿ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ ﴾، بە دڵنیایی خوا بێبڕوایان، یاخود سپڵەكانی خۆشناوێن، كەواتە: ئێوە خۆتان لە بێبڕوایی و سپڵەیی بپارێزن.

ئنجا دێتەوە سەر باسی خستنەڕووی نیشانەکانی خوا: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ ﴾، یەکێك لە نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە بایەکان دەنێرێ موژدەدەرانە، موژدەی دابەزینی ئاویان پێیە، ﴿ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ ﴾، بۆ ئەوەش کە لە بەزەیی خۆی بە ئێوە بچێژێ، ﴿ وَلِتَجْرِيَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ ﴾، تاکو کەشتییەکانیش بە فەرمانی تەکوینیی خوا بڕۆن بە دەریایەکاندا، ﴿ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ ﴾، هەروەها تاکو لەمیانی ئەوەدا لە بەخششی خوا داوا بکەن، کاسبیی بکەن بە هۆی کەشتییەکانەوە، ﴿ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، ئنجا سەرەنجام: بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن (بۆ خوای خاوەن سەرجەم نیعمەتەکان).

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ ﴾، بە دڵنیایی لە پێش تۆش دا (ئەی موحەممەد!) پێغەمبەرانێکمان بۆ لای گەلەکانی خۆیان ڕەوانەکردن، ﴿ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾، ئنجا بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هێنان، ﴿ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ ﴾، (ئەوان بڕوایان بەو بەڵگە ڕۆشنانە نەکرد و، بێبڕوا بوون، بۆیە) ئێمەش لەوانەی تاوانیان دەکرد، تۆڵەمان لێ ستاندن، ﴿ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، لەسەر ئێمەش پێویستە، یارمەتییدان و پشتگرتنی بڕواداران.

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا ﴾، خوا ئەو زاتەیە کە بایەکان دەنێرێ، هەور پەیدا دەکەن، ﴿ فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ ﴾، ئنجا ئەو هەورە لەسەرێ (لە ئاسمان دا) پان ڕادەخات و بڵاودەکاتەوە، بەو شێوەیەی بیەوێ، ﴿ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا ﴾، هەروەها ئەو هەورە بەش بەش دەکات و لەسەر یەکی کەڵەکە دەکات، ﴿ فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ ﴾، ئنجا باران و ئاو دەبینی لە میانەکانی ئەو هەورە، دێتە خوار، لە کەلێنەکانی، ﴿ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾، ئنجا هەر کاتێك ئەو ئاوە (کە دایبەزاندوە) تووشی هەر کەسێك بوو لە بەندەکانی، کت وپڕ دڵخۆش دەبن، بەوەی ئەو ئاوو ڕەحمەتە دابەزی.

﴿ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ لَمُبْلِسِينَ ﴾، هەر چەندە پێشتر بەر لەوەی ئەو ئاوە دابەزێتە سەریان، نا ئومێدو تەمابڕاو بووبن، ﴿ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ ﴾، ئنجا سەرنج بدە! شوێنەواری بەزەیی خوا (کە ئاوو بارانەکەیەتی)، ﴿ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ﴾، چۆن (خوا) زەوی دوای ئەوەی مردووە، زیندووی دەکاتەوە، ﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، بەدڵنیایی ئا ئەوە (ئەو خوایەی کە وەسف ناکرێ مەگەر بەناوی ئاماژە (**اسم الإشارة**)ی دوور، کە زەوییەکی مردوو زیندوو دەکاتەوە، بە هۆی دابەزاندنی ئاو بۆ سەری)، هەر ئەویش زیندووکەرەوەو ژیێنەرەوەی مردووانە، ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾، ئەویش لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا ﴾، ئەگەر بایەك بنێرین.

(**رِيح**) بە زۆریی لە قورئاندا بۆ سزاو بۆ زیان هاتوە، بەڵام (**رِياح**) بۆ نیعمەت و چاکە هاتوە، ئەگەر بایەکی زیانبەخش بنێرین، ﴿ فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا ﴾، کشتوکاڵەکەی خۆیان بە زەرد هەڵگەڕایی ببینن، یان: بایەکە زەردهەڵگەڕاو ببینن، یان: هەورەکە زەردباو ببینن، ﴿ لَّظَلُّوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ يَكْفُرُونَ ﴾، بەدڵنیایی بەردەوام دوای هاتنی ئەو بایە سپڵەیی دەکەن، یان: بێبڕوایی دەکەن بەرانبەر بە خوا.

لە کۆتاییدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، بە دڵنیایی تۆ ناتوانی بە مردووان ببیستێنی، ﴿ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴾، هەروەها ناتوانی بانگەواز بە کەڕان ببیستێنی، لە کاتێکدا کە پشت هەڵدەکەن و، ڕوو وەردەگێڕن، ﴿ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِ ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ ﴾، هەروەها تۆ ناتوانی ڕێنماییکاری کوێران بی لە گومڕایی، ڕێنماییکاریان بی و، لە گومڕایی دەریان بێنی، ﴿ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴾، تۆ تەنیا بە کەسێك دەتوانی ببیستێنی، کە بڕوای بە ئایەتەکانمان هەیە، بە نیشانەکانمان هەیەو، بۆ خوا

ملکەچـن، واتـە: کەسێك خـۆی ئامادەیـی لـە خۆیـدا پەیـدا نـەکات، تـۆ ناتوانـی بـە زۆر ڕێنمایـی بکـەی و بیخەیـە سـەر ڕاسـتە ڕێ، دەبـێ خۆشـی هیممـەت بـکات و، ئامادەیـی هەبـێ و، ئامادەسـازیی لـە خـۆدا بێنێتـە دی، ئـەو کاتـە تـۆش دەتوانـی دەسـتی بگـری بـە تەوفیقـی خـوای پـەروەردگار، ڕاسـتەڕێی بکـەی.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**درەوشانەوەی یەکتایی خوا ﷻ لە ئاوێنەی چوار کاری بێ وێنەی دا: هێنانە دی و، بژیودان و، مراندن و، زیندووکردنەوە، کە هیچ کام لە هاوبەشە وەهمییەکان، هیچ کامیانیان پێناکرێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَىْءٍ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ﴾، خوا ﷻ ئەو کەسەیە کە ئێوەی هێناوەتە دی، دوێنراو **(مخاطب)** لێرەدا دەگونجێ هەموو مرۆڤەکان بن، دەشگونجێ تەنیا هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بن، بەڵام بە پێی سیاق مانای دووەمیان زیاتر پێدەچێ، چونکە دوایی دەفەرموێ: ﴿ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَىْءٍ ﴾، ئایا هیچ کام لە هاوبەشەکانتان، هیچ کام لەو چوار کارەی بۆ دەکرێ؟ کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ﴾، خوا ئەو کەسەیە کە ئێوەی هێناوەتە دی، ئەی ئەو کەسانەی هاوبەش بۆ خوا دادەنێن!

٢)- ﴿ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ﴾، دوایی بژیویشتان دەداتێ، **(ثُمَّ)** لێرەدا لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە **(لِلتَّراخِي الزَّمَنِي وَالرُّتْبِي)**، واتە: بۆ پلە بەندیی و بە دوا داهاتنی کاتیی و پلەییشە، چونکە دروستکراوەکان دروست دەکرێن و دەهێنرێنە دی، دوایی بژیویان بۆ دابین دەکرێ.

٣)- ﴿ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ﴾، دوایی دەتانمرێنێ، ئەمیش **(ثُمَّ)** دیسان: بە دوا داهاتن و ڕیزبەندیی کاتیی و پلەییش دەگەیەنێ.

٤)- ﴿ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ﴾، دواییش زیندووتان دەکاتەوە، دیسان وشەی (ثُمَّ) لێرەدا هەم بۆ بە دوا داهاتنی کاتییەو، هەم بۆ بە دوا داهاتنی پلەییشە.

وەك گوتمان: لەم سوورەتەدا خوا ﷻ چوار جار بە وشەی (أللە) بڕگەیەك دەست پێدەکات، ئنجا ئەمە بڕگەی دووەمە، کە دیارە کاتێك ڕستەیەك دەست پێدەکات، بێ ئەوەی (و) یان (ثُمَّ)ی لە پێش بێ، پێی دەگوترێ: (الإِسْتِئناف)، لە نوێوە دەستپێکردن، ئنجا ئەمە لە نوێ دەست پێکردنی دووەمە، کە خوا ﷻ چەند نیشانەیەك دەخاتەڕوو کە تاکیەتیی خۆی لە تەصەڕڕوف و کارکردن لە دروستکراوەکانیدا بۆ خۆی، بەرجەستە دەکەن، ئنجا لێرەدا چواریان باس دەکات: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمۡ ثُمَّ رَزَقَكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ﴾، خوا ئەو کەسەیە کە ئێوەی هێناوەتە دی، کێی دیکە دەتوانێ لافی ئەوە لێ بدات شتێکی هێناوەتە دی؟ ﴿ ثُمَّ رَزَقَكُمۡ ﴾، دوایی بژیوی ئێوەی داوە، ئەو بژیوەش لە زەوییەوە، لە ئاسمانەوە، لە ژێر زەوی، لە ئەستێرەو کەهکەشانە دوورەکانەوە، تیشکە جۆراو جۆرەکانیان، لە بەرگە هەوای دەوری زەوی، لە بەرگی ئاویی کە دەوری زەوی داوە، لەو هەموو بژیوانەی خوا لە زەوی دا دایناون و...هتد، ﴿ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ﴾، دوایی دەتانمرێنێ، هیچ کەس ناتوانێ بەرگریی لە خۆی بکات لە بەرانبەر بڕیاری خوادا کە دەبێ بمرێ، لە کاتێکی دیارییکراو و لە شوێنێکی دیارییکراودا و بە شێوەیەك کە خوا دیاریی کردوە، ﴿ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ﴾، دوایی زیندووتان دەکاتەوە، دیارە سێ قۆناغی یەکەم لە دنیادان، لەم قۆناغی یەکەمی ژیانەدا، (الخَلْق وَالرِّزْق وَالإماتَة) پەیدا کردن و بژیودان و مراندن، بەڵام ئەویدیکەیان: ﴿ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ﴾، دوایی دتانژیەنێتەوە، لە قۆناغێکی دیکەدا دێ کە قۆناغی دوای مەرگە.

٥)- ﴿ هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفۡعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَىۡءٖ ﴾، ئایا هیچ کام لە هاوبەشەکانتان هەن، هیچ شتێك لەو کارانە بکات؟ (مِن شُرَكَآئِكُم ) (مِنْ) لێرەدا (لە)ی ڕوونکردنەوە (مِن البَيانِيَّة)یە، بۆیەش دەفەرموێ: (شُرَكَائِكُم) چونکە دوێنراوەکان ئەوانە بوون کە بتەکانیان

بە هاوبەشی خوا، ناوزەد کردوون، بۆیە خوای پەروەردگار هاوبەشەکان پاڵدەداتە لای ئەوان، ئەگەرنا لە ڕاستییدا هاوبەش نین، بەڵام لە گومان و خەیاڵی ئەواندا هاوبەشی خوان.

﴿مِن ذَٰلِكُم مِّن شَيْءٍ﴾، هیچ شتێك لەو کارانە بکات، لە (مِنْ)، لە وشەی: (مِن ذَٰلِكُم )دا بۆ هەندێك (تبْعِيض)ە.

ئایا هیچ کام لە هاوبەشەکانتاندا هەیە، کە هیچ شتێك لەو چوارانە ئەنجام بدات؟

٦)- ﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾، پاك و بەرزە (خوا ﷻ) لەوەی ئێوە دەیکەنە هاوبەشی، ﴿عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾، خوێندراویشەتەوە: (عَمَّا تُشْرِكُون) بە دواندنی ڕاستەوخۆ، هەروەك ﴿عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾، بە دواندنی ناڕاستەوخۆ (غِيابِي)یە، کە ئەو کاتە پێی دەگوترێ: (إلتِفَات) ئاوڕدانەوە، چونکە پێشێ خوا دەیاندوێنێ، دوایی ڕوویان لێ وەردەگێڕێ و دەفەرموێ: پاکیی و بەرزیی بۆ خوا، لەوەی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، نەفامانە دەیکەنە هاوبەشی خوا.

ئنجا لێرەدا ئەم ڕستەیە: (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ) یان (عَمَّا تُشْرِكُون) ئەگەر ئەو ئایەتە موبارەکە هەمووی وەك (قیاس) تەماشا بکەین، ئەم ڕستەی دوایی وەك ئەنجامە، چونکە:

پێشەکیی یەکەم کە لە ڕووی قیاسەوە پێی دەگوترێ:

أ- (المُقَدِّمَةُ الصُّغْرَى) پێشەکیی گچکە، ئەوەیە: (الإِلَهُ الحَقّ: ألله هُوَ الَّذي خَلَقَ وَرَزَقَ وَأَمَاتَ وَأَحْيَا)، پەرستراوی هەق کە خوایە، تەنیا ئەوە کە پەیدا دەکات و، بژیو دەدات و، دەمرێنێ و، زیندوو دەکاتەوە.

ب- (المُقَدِّمَةُ الكُبرَى) پێشەکیی گەورە، ئەوەیە: (لَا أَحَدٌ مِنَ الأَصْنَامِ بِفَاعِلٍ ذَلِكَ)، هیچ کام لە پەیکەرو بتەکان (پەرستراوەکان) ئەوەی لە توانادا نیە.

کەواتە: سەرەنجام: (تَنْزِيهُ اللهِ عَنِ الشَّرِيك) بە پاككرتنی خوا لە هاوبەش.

لەوانەیە هەندێك كەس ئێستا كە تەماشای قورئان دەكات و ئەو ئایەتە موبارەكانەو ئایەتەكانی دیكە كە لە بارەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانەوە دەدوێن ببینێ، بڵێ: ئەوە بۆ كاتی خۆی بووە، كە خەڵك دارو بەردی پەرستوە، بەڵام ئێستا كوا پاساوی ئەوە ماوە؟

دەڵێین: لە ڕاستییدا ئێستاش بەس شێوەی پەرستراوەكان گۆڕاوە، ئەگەرنا شتپەرستیی و بتپەرستیی، هەر هەیە، هەرچەندە ئێستاش لەگەڵدا بێ لە زۆرێك لە وڵاتانی دنیا پەیكەرەكان دەپەرسترێن، لەوانەیە ملیارێك بەشەر زیاتر پەیكەری بووزا بپەرستن، بەڵكو هیندۆسییەكان گا دەپەرستن، هەیانە لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ماری كوبرا دەپەرستن، من خۆم چووم بۆ مالیزیاو بۆ كەمبۆدیا، هەیانە جرج دەپەرستێ، هەیانە درەخت دەپەرستێ، ئەو پەرستراوانەش هەر هەن.

لەو سەفەرەم بۆ مالیزیا و كەمبۆدیا لە ساڵی (٢٠١٠ ز) بینیم لەبەر پەیكەری بووذا دەپاڕانەوە، بخووریان بۆ دەسووتاندو لێی دەپاڕانەوەو لە بەرانبەریدا بە چۆكدا هاتبوون، لە ڕێی وەرگێڕێكەوە قسەم لەگەڵدا كردن، گوتم: ئەوە هیچ نابیستێ و پەیكەرە! نە چاوی هەیەو، نە گوێی هەیە، بەڵێ چاوو گوێی بە ڕواڵەت هەیە، بەڵام نە بە چاوی دەبینی، نە بە گوێی دەبیستێ؟! كەچی ئەوان قسەكەی منیان پێ سەیر بوو، دەیانگوت: ئاخر ئەوە ڕووحێكی تێدایە، كە داوایەكەی ئێمە بە خوا دەگەیەنێ!! بەڵام وێڕای ئەو پەرستنە ڕواڵەتییە، ئێستاش لەگەڵدابێ زۆر كەس پارەو سامان دەپەرستێ، هەواو ئارەزوو دەپەرستێ، مۆدێل و مۆدێلكاریی دەپەرستێ، سەیارە دەپەرستێ، كۆشك دەپەرستێ، حیزب دەپەرستێ، ڕژێم دەپەرستێ، شەخص دەپەرستێ (شەخصی زیندوو و شەخصی مردوو)!

لە ڕاستییدا ئەو شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانانە، دەردێكی لەمێژینەی بەشەرەو، ئێستاش بەردەوامەو، لەمەودواش هەر بەردەوام دەبێ، بۆیە خوا ﷻ

لـە قورئانـدا ئەوەنـدە جەختـی کردۆتـەوە لەسـەر پووچەڵکردنـەوەی شـیرك، چونکـە دەردی کوشـندەی بەشـەر زیاتـر لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانانـدا، بەرجەسـتە بـووە، ئەگەرنـا ئەصڵـی دان بـە بوونـی خـوا داهێنـان، خاڵـی هاوبەشـی نێـوان زۆربـەی هـەرە زۆری مرۆڤـەکان بـووە، هەڵبەتـە لـە ڕابردووشـداو ئێسـتاش، خەڵکـی مولحیـد هـەن و، هەبـوون، وەك لـە مەوسـووعەی: (درەوشـاوەیی ئیمـان و پووچەڵـی ئیلحـاد، لەبـەر تیشـکی زگمـاك و عەقـڵ و زانسـت و وەحیـی دا)، باسـم کـردوە، بـەڵام حاڵەتـی گشـتیی مـرۆڤ، دان بـە بوونـی خـوا داهێنانـە، بـەڵام لـە مامەڵـە کـردن لەگـەڵ خـوادا، لادان و خلیسـکان بـەرەو زەلـکاوی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـان هەبـووەو هەیـە، ئنجـا ئـەو هاوبەشـانەی کـە بـۆ خـوا دادەنرێـن و، ئـەو شـتانەی کـە وەك خـوا مامەڵەیـان لەگـەڵ دەکـرێ و، بـە پیـرۆز دەگیرێـن و، بـە مـەزن دەگیرێـن وەك خـوا، یـان سـیفەتەکانی خوایـان بـۆ دادەنـرێ، لـە ڕۆژگارێکـەوە بـۆ ڕۆژگارێـك، لـە کۆمەڵگایەکـەوە بـۆ کۆمەڵگایـەك، لـە قۆناغێکـەوە بـۆ قۆناغێـك شـێوەکەیان دەگـۆڕێ، چۆنیەتییەکەیـان دەگـۆڕێ، بـەڵام نێوەڕۆکەکەیـان هـەر هەمـان نێوەڕۆکـە.

مەسەلەی دووەم:

**بە هۆی لادان و تاوانی مرۆڤانەوە وشكانیی و دەریا تێكچوون، بە سەرنجدانی مێژووش، سەرەنجامی شوومی گەلانی لادەری پێشوو دیارە، بۆیە پێویستە بەرنامەی تێرو تەواوی خوا بە ڕێك و ڕاستیی پیادە بكرێ، بەر لەوەی ڕۆژی پڕژانی خەڵك بێ، كە هەر كەسە لە بێبڕواو بڕواداران بەرهەمی خۆیان دەچننەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلُ ۚ كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ ﴿٤٢﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ ٱلْقَيِّمِ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۖ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ ﴿٤٣﴾ مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ ﴿٤٤﴾ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٥﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾، تێكچوون و، خراپەكاریی دەركەوت لە وشكانیی و دەریادا، ئایا ئەمە مەبەست پێی چییە؟

أ- هەندێك لە زانایان گوتوویانە: مەبەست پێی سەرهەڵدانی كوفرو شیركە، كە چاوگی هەموو تێكچوون و خراپەكارییەكە.

ب- هەندێك گوتوویانە: مەبەست لە تێكچوون و خراپەكاریی لە وشكانیی و دەریادا، بریتیە لە گوناهو تاوانەكانی خەڵك.

جـ- هەندێكیش گوتوویانە: بریتیە لە تێكچوونی باری ئاسایی و سروشتیی دروستكراوەكانی خوا ﷻ، كە دروستكراوەكان ئەگەر لەسەر حاڵەتی زگماك و خوارسك و بەو شێوەیەی

کە خوا دروستیکردوون، بمێنن، باشتر بەرهەم بە دەستەوە دەدەن، کاتێك کە حاڵەتی سروشتیی و ئاساییان بە هۆی دەستکارییکردنی مرۆڤەوە تێکدەچێ، زۆر جار لە جیاتی سوود، زیان دەگەیەنن، هەر شتێك کە مرۆڤ دەستکاریی بکات بە زۆریی وایە، کە لەسەری قەرزار دەبێتەوە.

د- هەندێکیش لە زانایان بەمجۆرە تەعبیریان کردوە لەو تێکچوون (**فساد**)ەی لە وشکانیی و دەریادا دەردەکەوێ: (**انْقَطَعَت مَنافِعُ البَرِّ وَالبَحْرِ بِسَبَبِ تَعَطُّلِ الأَسْفارِ مِنْ جَرَّاءِ الحُرُوبِ**)، سوودەکانی وشکانیی و دەریا بڕاون، بە هۆی ئەوەوە کە سەفەرو هاموشۆ ناکرێ، لە ئەنجامی جەنگ و ئاشووب و ئاڵۆزییدا.

منیش دەڵێم: لەم ڕۆژگاری ئێستاماندا، کە ساڵی (٢٠١٩)ی زایینییەو، ئێمە لە نیوەی دووەمی ئەو ساڵەداین، ئەمڕۆ (١٢ / ٧/ ٢٠١٩)ی زایینییە و ٩/**ذي القعدة**/١٤٤٠ ی کۆچییە، ئێستا ئێمە باشتر لە چەمك و واتای ئەم ئایەتە موبارەکە تێدەگەین، کە کاتێك بەشەر دەستکاریی دروستکراوەکانی خوا دەکات، لادان وخراپە دەکات و تەماع بەسەریدا زاڵ دەبێ، چۆن ژینگە تێکدەچێ، هاوسەنگیی ژینگە تێکدەچێ، ئێستا کێشەیەکی زۆر گەورەی بەشەر بریتیە لە تێکچوونی هاوسەنگیی ژینگەیی (**التَّوازُنُ البِيئي**)کە ئەویش لە ئەنجامی ئەوەدا کارگەو فابریکەخانەکانی زلهێزەکان کە چەکی قورس بەرهەم دەهێنن، یان چەکە کۆکوژەکان، یان ئەو چەکانەی کە مرۆڤیان پێ قڕ دەکەن، لە ئەنجامی ئەوەدا، دووکەڵ و زبڵ و زاڵێکی زۆری ئەو کارگانە دەچێتە نێو هەواوەو، بەرگە هەوا پیس دەبێ، کە ئێستا لە ئەنجامی پیس بوونی بەرگە هەوادا، چینی ئۆزۆن تەنك بووەو کونی تێبووە، زیاد لەوەی کە ژیان پێویستیی پێیەتی دانیشتووانی سەر زەوی بە مرۆڤ و بە ژیاندارانەوە، زیاد لەوە، تیشکی ژێر سوورو تیشکی سەروو وەنەوشەیی دێتە نێو زەوییەوەو، لە ئەنجامی ئەوەدا بەستەڵەکەکانی باکووری زەوی دەتوێنەوەو، سەرەنجام: حاڵەتی ئاسایی و سروشتیی کە خوا ئەم خڕۆکەی زەوییەی لەسەر سروشتاندوە، بە بەرگە هەواکەیەوە، بە بەرگە

ئاوییەکەیـەوە، تێکدەچێ و، حـاڵ و وەزعـی بەشـەرو ئـاژەڵ و ژیاندارانیـش تێـك دەچێ.

ئێسـتا ئێمـە باشـتر لـەوە تێدەگەیـن و، خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (**الأعراف**)یـش دا، کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا ٥٦﴾ **الأعـراف**، واتـە: زەوی دوای ئـەوەی خـوا چاکـی کـردوە، تێکـی مـەدەن، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا کـە دەسـتکاریی شـتەکان دەکـەن، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا کـە تەمـاع بەسـەرتاندا زاڵ دەبـێ، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا کـە زیـاد لـە پێویسـتیی خۆتـان، ئـەو نیعمەتانـەی خـوا بەکاردێنـن، بـۆ زیاتـر سـەروەت بەسـەریەکەوەنان و، بەشـی خەڵکـی دیکـە دەخـۆن و، لـە ئەنجامی ئـەوەدا کـە شـەڕو شۆڕ بەرپا دەکـەن، کوشـتار دەبێ، لە ئەنجامـی هەمـوو ئەوانـەدا، خراپـە و ئاشـووب و تێکچـوون زیاتـر وشـکانیی و دەریـا دەگرێتـەوە.

٢)- ﴿بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە دەستەکانی خەڵك بەدەستیان هێناوە، بۆیە خراپەو تێکچوون لە وشکانیی و لە دەریادا دەرکەوتوە.

٣)- ﴿لِيُذِيقَهُم بَعۡضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ﴾، بۆ ئەوەی خوا پێیان بچێژێ (سزای) هەندێك لەوەی کردوویانە، بەرهەمی شوومی هەندێك لە کردەوە خراپەکان کە کردوویانن، پێیان بچێژێ، (**لِيُذِيقَهُم**) خوێندراویشەتەوە: (**لِنُذِيقَهُم**)، پێشتریش گوتمان: (ل)ی سەر (**لِيُذِيقَهُم**) پێی دەگوترێ: (**لامُ العاقِبَة**)، واتە: تاکو لە سەرەنجامدا خوا پێیان بچێژێ، ﴿بَعۡضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ﴾، یانی: (**عِقابَ بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا**)، سزای هەندێك لەوەی کردوویانە، هەندێك لە سزایەکەیان کە بریتیە لە دەرهاویشتە خراپەکانی، لەژیانی دنیایان دا، پێیان بچێژێ.

٤)- ﴿لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾، بەڵکو بگەڕێنەوەو، واز بێنن لە زیاتر تێکدانی باری ئاسایی و سروشتیی خڕۆکەی زەوی، ئەو گۆی زەوییەی کە بێجگە لەوی، نشینگەیەکی دیکەیان نیە، ژیانی تێدا بگوزەرێنن.

دواتر خوا ﷻ هەر پەیوەست بەو بابەتەوە، بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ:

٥)- ﴿قُلْ سِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلُ﴾، ئەی موحەممەد ﷺ! بفەرموو: بە زەوییدا بڕۆن و، سەرنج بدەن سەرەنجامی ئەوانەی پێشێ چۆن بوو؟ ئەمە وەك شەعراویی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لە چەند شوێنێك دا، ئەوە دووبارە دەكاتەوە، دەڵێ: كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُلْ سِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾، نافەرموێ (**سِيرُوا عَلَى الأَرْضِ**)، دەفەرموێ: بە زەوییدا بڕۆن، لەبەر ئەوەی زەوی بە بەرگە هەواكەشیەوە زەوییەو، بە ئەستووریی هەزار كیلۆمەتر (١٠٠٠ كم) بەرگە هەوا دەوری زەوی داوە، وەك چۆن بەرگە ئاوییەكەشی بە پانتایی چوار لەسەر پێنج (٥/٤) دەوری گۆی زەوی داوە، ئنجا كەسێك كە سەفەر دەكات لەسەر زەوی، بەڵێ لەسەر زەوی دەڕوات بە ڕواڵەت، بەڵام لە ڕاستییدا لە نێو زەویدا دەڕوات، چونكە بەرگە هەواكەش لە سەرووییەوەیەتی.

﴿قُلْ سِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلُ﴾، بڵێ: بە نێو زەویدا بڕۆن، ئنجا سەفەر بكەن! سەرنج بدەن سەرەنجامی ئەوانەی پێشوو چۆن بوو؟ واتە: ئەوانیش ئاوا تێكدان و ئاشووب و خراپەیان كرد لە زەوییداو، سەرەنجام حاڵەتی ئاسایی ژیانیان لەسەر زەوی تێكچوو.

٦)- ﴿كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ﴾، زۆربەیان هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا كە هاوبەشیان بۆ خوا داناو، خراپەو تاوانیان كرد، ژیانی خۆیان تەنگ و تاڵ كرد، لە ڕووی سیاسیی، لە ڕووی ئابووریی، لە ڕووی كۆمەڵایەتیی، لە ڕووی ئاسایش، لە ڕووی ڕەوشت و ئاكارەوە، كەواتە: ئێوە پەند لەوان وەربگرن و خۆتان بە مەرەدی ئەوان مەبەن.

دوایی بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ:

٧)- ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ ٱلْقَيِّمِ﴾، ئنجا ڕووی خۆت ڕاست بكە لەگەڵ ئایینی ڕێك و ڕاستدا، (**القَيِّم: شَدِيدُ القِيَام**)، ئایینێك كە زۆر ڕاستە، یاخود زۆر مشوورخۆرەو، زۆر ڕاستكەرو ڕێككەرە بۆ مرۆڤ.

هەڵبەتە ئەم دواندنەو ئەوەی پێشووش، مەبەستی یەكەم پێی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، لە هەندێك شوێن، ناگونجێ جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەست

بـێ، بـەڵام لێـرەدا دەگونجـێ هـەر کەسـێك مەبەسـت بـێ و، هـەر کەسـێك کـە قورئـان دەخوێنێتـەوە، بڵـێ: بـە زەوییـدا بـڕۆن خەڵکینـە! سـەرنج بـدەن سـەرەنجامی ئەوانـەی پێشـوو چـۆن بـوو، زۆربەیـان هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەر بـوون.

٨)- ﴿ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۖ ﴾، بەر لەوەی ڕۆژێك بێ، بەرپەرچدانەوەی بۆ نیە لەلایەن خواوە، مەبەست لە (**يَوْم**): ڕۆژی ئاخیر زەمان (**يَوْمُ السَّاعَة**)، یاخود: ڕۆژی قیامەتە (**يَوْمُ القِيامَة**)یە، هەرچەندە وشەی (**ساعَة**) لە هەندێك سیاقدا بە مانای قیامەتیش دێ، بەڵام بە زۆریی (**ساعَة**) بە مانای ئەو کاتە دێ، کە ژیانی دنیای مرۆڤ کۆتایی دێ، هەندێك جاریش (**ساعَة**)، یانی: کاتێکی دیاریکراو، ئنجا چ بۆ ئاخیر زەمان، چ بۆ زیندوو بوونەوەو هەڵسانەوە.

﴿ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۖ ﴾، کـە گێڕانـەوەی نیـە لەلایـەن خـواوە، (**المَـرَدُّ: مَصْـدَرٌ مِيمِـيٌّ مِـنَ الـرَّدِّ وَهُـوَ الدَّفْـعُ**)، (**مَـرَدّ**): چاوگێکـی میمییـە، واتـە: گێڕانـەوەی بـۆ نیـە لـە خواوە، ئـەو ڕۆژە کـە دێ لـە بەرانبـەر خـوادا، کـەس ناتوانـێ بیگێڕێتـەوە، یاخـود خـوا ﷻ کـە هێنـای بـە پێـی سیسـتمێك کـە داینـاوە، نایگێڕێتـەوە بـۆ دواوە،و ئـەو ڕۆژە دێ.

٩)- ﴿ يَوۡمَئِذٖ يَصَّدَّعُونَ ﴾، لەو ڕۆژەدا دەپرژێن، وشەی (**صَدْع**): بە مانای شکانی شتێکە کە دەنگی لێ بێ، (**أَي: يَتَفَرَّقُون وَيَتَمَايَزُون**) پەرتەوازە دەبن و دەپرژێن، لێك بڵاودەبن و پۆلێن دەبن، ئنجا باسی پۆلێنەکانیان دەکات.

١٠)- ﴿ مَن كَفَرَ فَعَلَيۡهِ كُفۡرُهُۥۖ ﴾، هەرکەس بێبڕوا بێ، زیانی بێبڕواییەکەی بۆ خۆیەتی، یاخود (**كَفَرَ**): بە مانای سپڵەیی و ناسپاسیی کرد، دێ، هەرکەس نادیدەگر بێ، بۆ چاکەکانی خوا، سەرەنجامی خراپی ئەو سپڵەیی و ناسپاسییە بۆ خۆیەتی، یەخەی خۆی دەگرێ و، بە زیانی خۆی تەواو دەبێ.

(**كُفْر**)یـش هەمـوو جۆرەکانـی خراپـە دەگرێتـە نێـو خـۆی، کەسـێك کافـر بـێ سـتەمیش دەکات، فیسـق و لادانیـش دەکات، گوناهـو تاوانیـش دەکات، هەروەهـا کەسـێك بێبـڕوا بـێ بـە خـوا، سـپڵەش دەبـێ، ئەگـەر کوفـر لێـرە بـە مانـای بێبڕوایـی

بێ، هەروەها کەسێکیش ناسپاس بێ بەرانبەر بە خوا، بەرانبەر بە مرۆڤەکانیش ناسپاس دەبێ، خەڵك لە دەستی تووشی ناڕەحەتیی دێن، بۆ خۆشی بە دەست خۆیەوە گرفتار دەبێ و، ژینگەش بە دەستیەوە گرفتار دەبێ.

١١)- ﴿ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ ﴾، هەر کەسێك کردەوەی باش بکات، ئەوانە بۆخۆیان زەمینەسازیی دەکەن، کردەوەی باش، خوا بە گشتیی فەرموویەتی، بۆیە:

أ- هەم کردەوەکانی نێو دڵ و دەروون دەگرێتەوە،

ب- هەم بیرو خولیاکانی نێو عەقڵ و مێشك دەگرێتەوە،

جـ- هەم نیازو مەبەستەکانی نێو دڵ،

د- هەم دەربڕینەکانی زمان،

هـ- هەم کردەوەی ئەندامەکان هەموویان دەگرێتەوە، هەر کەسێك کردەوەی باش بکات، چ کردەوەی پەنهان، چ کردەوەی ئاشکرا، چ کردەوەی دڵ و دەروون و عەقڵ و هۆش، چ کردەوەی زمان و، چ کردەوەی ئەندامەکانی دیکەی:

﴿ فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ ﴾، ئەوانە بۆ خۆیان زەمینە سازیی دەکەن، (**يَمْهَدُون: يَجْعَلُونَ مِهَاداً وَهُوَ الفِراشُ شُبِّهَ المُؤمِنُ في عَمَلِهِ الصَّالِح بِمَنْ يُسَوِّي فِرَاشَهُ**)، لێرەدا بابای بڕوادار کە کردەوەی باش دەکات، تەشبیهکراوەو، چوێنراوە بە کەسێکەوە شوێنێك بۆ خۆی خۆش دەکات کە تێیدا پشوو بدات و ئیسراحەت بکات، زەمینەسازیی بۆ خۆی دەکات و، جێی خۆی خۆش دەکات لە ڕۆژی دواییدا.

١٢)- ﴿ لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن فَضْلِهِۦٓ ﴾، تاکو سەرەنجام (خوا ﷻ) لە بەخششی خۆی و لە چاکەی خۆی، پاداشتی ئەوانە بداتەوە کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجامداون.

(ل)ی (**لِيَجزي**) دەگونجێ (**لامُ العَاقِبَة**) بێ، واتە: سەرەنجام، پاداشتیان بداتەوە، دەشگونجێ (لام العلة) بێ، یانی: ئەوە ببێتە هۆکاری پاداشتدرانەوەیان.

لێرەدا خوا چاکەکارانی بە دوو شتان پێناسە کردوون:

أ- ﴿ءَامَنُواْ﴾، بڕوایان هێناوە، بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ.

ب- ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، هەموو کردەوە چاکەکانیش کە توانایان بەسەریاندا شکاوە، ئەنجامیان داون.

﴿مِن فَضۡلِهِۦٓ﴾، لە چاکەو بەخششی خۆی، خوا پاداشتیان بداتەوە، واتە: تەنیا لە قەدەر کردەوەکانیان پاداشتیان نەداتەوە، چونکە بەڵێ ئیمان و کردەوەی باش هۆکارە بۆ ئەوەی خوا ئیمانداران بخاتە بەهەشتەوە، پاداشتیان بداتەوە، بەڵام لە ڕاستییدا بەهەشت هاوکوف و بارتەقای ئەو ئیمان و کردەوە باشانە نیە، کە مرۆڤ ئەنجامیان دەدات، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: {**لَنْ يُدْخِلَ أَحَدًا مِنْكُمْ عَمَلُهُ الْجَنَّةَ، قَالُوا: وَلَا أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: وَلَا أَنَا، إِلَّا أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللَّهُ مِنْهُ بِفَضْلٍ وَرَحْمَةٍ مِنْهُ وَفَضْلٍ**} (**أخرجه أحمد: ٢٦٣٨٦، والبخاري: ٦١٠٢، ومسلم: ٢٨١٨، وابن ماجه: ٤٢٠١، وابن حبان: ٣٤٨**).

واتە: هیچ کام لە ئێوە کردەوەکەی نایخاتە بەهەشت، (کردەوەکەی بایی ئەوە نیە، پێی بچێتە بەهەشت)، گوتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: منیش، مەگەر خوا بە بەزەیی و بەخششی خۆی دامپۆشێ، واتە: ئەگەر بە بەزەیی و بەخششی خۆی دەوری من بدات و مامەڵەم لەگەڵدا بکات، ئەگەرنا کردەوەی منیش بایی پێ چوونە بەهەشت نیە، واتە: هۆکارە، بەڵام بارتەقای ئەوە نیە، بەهەشت زۆر لەوە گەورەترە کە نرخەکەی تەنیا ئەوەندە ئیمان و کردەوە باشانەی ئێمە بن، ژیانێکی هەمیشەیی نەبڕاوەی پڕ لە خۆشیی و، پڕ لە شادمانیی و، پڕ لە جێبەجێ کردنی هەموو هیواو ئاواتەکان، زۆر لەوە گەورەترەو گرنگترە کە لە بەرانبەر ئەوەندە کردەوانەی ئێمەدا بێ.

١٣)- ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، بە دڵنیایی ئەو بێبڕوایانی خۆشناوێن، واتە: خوا تەنیا ئیماندارانی کردەوە چاکی خۆش دەوێن و، بێبڕوایانی خراپەکارو تێکدەری خۆشناوێن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**یەكی دیكە لە نیشانەكانی خواو تاكییەتیی لە هەموو ڕوویێكەوە، ناردنی بایەكانە وەك مۆژدەدەری دابارینی ئاو، كە سەرەنجام خەڵك بەرهەمی بەزەیی خوا دەچێژن و، كەشتییەكان دەڕۆن و لە بەخششی خوا دەخوازن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَلِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ ﴾، لە نیشانەكانی پەروەردگارێتیی خواو، خاوەنداریێتیی خواو، مشوورخۆریەتیی خواو، بەزەیی و میهرەبانیی خوا لەگەڵ ئێوەدا، ئەوەیە كە بایەكان دەنێرێ، موژدەدەرانەو دڵخۆشكەرانە.

ئەمە گەڕانەوەیە بۆ سەر ئەو ڕستانەی پێشێ، كە فەرمووی: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴾، دواتریش ئایەتەكانی دیكە.

بە زۆریی لە قورئاندا وشەی (رِیاح) بەكارهاتبێ، مەگەر چۆن، ئەگەرنا هەر مەبەست پێی ئەو بایانەن كە هەورەكان لەگەڵ خۆیان دێنن و، لە پێش دەستی باران و بەفرو تەرزەوە دێن، بەڵام وشەی (رِیح) ئەگەر تاكیی (**مُفرَد**) بێ، بە زۆریی مەبەست پێی ئەو بایە بووە كە خوا بە سزا ناردوویەتی، وەك ئەو بایەی كە ناردوویەتی بۆ سزادانی گەلی عاد.

﴿ مُبَشِّرَٰتٍ ﴾، موژدەدەرانە، (**البَشَارَةُ: الخَبَرُ السَّارُّ**)، (**بَشَارة**): بریتە لە هەواڵێكی دڵخۆشكەر، لەبەر ئەوەی ئینسان كە هەواڵێكی خۆشی پێ دەگات، دەم وچاوی گەش دەبێتەوە، (**شُبِّهِ الرِّيَاحُ بِرُسُلٍ مُوَجَّهَةٍ بِأَخْبَارِ المَسَرَّة**)، بایەكانیش چوێنراون بە نێردراوانێك، كە دەنێردرێن بە هەواڵی دڵخۆشكەرەوە.

٢)- ﴿ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ ﴾، هەروەها تاكو (خوا) لەبەزەیی خۆیتان پێ بچێژێ، ئەمە هۆكاری ناردنەكەیە، بۆچی خوا بایەكان دەنێرێ بە موژدەوە (موژدەی هاتن و داباریني ئاو لە ئاسمانەوە، بە شێوەی باران و بەفرو تەرزە)؟ تاكو لە بەزەیی خۆی پێتان بچێژێ، وشەی: ﴿ مِّن رَّحْمَتِهِۦ ﴾، سیفەتی وەسفێكی قرتێنراوە، (**صِفَةٌ لِمَوْصُوفٍ مَحْذُوفٍ أَي: مَذُوقاً**)، یانی: (**لِيُذِيقَكُم مَذُوقاً مِنْ رَحْمَتِهِ**) بۆ ئەوەی پێتان بچێژێ، چێژراوێك لە بەزەیی خۆیەوە، كە مەبەست پێی ئەو ئاوە موبارەكەیە كە لە ئاسمانەوە دادەبەزێ، لە شێوەی باران و بەفرو تەرزەدا.

٣)- ﴿ وَلِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی بە پێی یاسا گەردوونییەكان، كەشتییەكان بە فەرمانی خواو، بە مۆڵەتی خوا، -بەدەریادا- بڕۆن.

٤)- ﴿ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ ﴾، بۆ ئەوەش كە لە بەخششی خوا داوا بكەن، واتە: بە هۆی كەشتییەكانەوە سەفەرو هاتوچۆ بكەن، بازرگانیی و مامەڵە بكەن وبژیوو پارەو سامان پەیدابكەن، كە ئەوەش بەخششی خوایە.

٥)- ﴿ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، ئەمەش وەك دەرەنجامە: بۆ ئەوەی سەرەنجام سوپاسگوزاریی بكەن (بۆ خوا)، لە بەرانبەر ئەو چاكەو نیعمەتانەی خوادا ﷻ، كە بێجگە لە خوا بە هیچ كەسی دیكە، نە ئەو بایە دابین دەكرێ، نە ئەو دەریایە دەبێ، ئەو كەشتییانە لەسەری بڕۆن و، نە ئەو ڕزق و بژیوانە، كە ئێوە دوایی پەیدایان دەكەن، دەبن، كە لە ئەسڵ دا خوای پەروەردگار دروستیكردوون، بەڵام ئێوە بە هۆی كردەوەو كۆشش و خۆ ماندوو كردنتانەوە، وەدەستیان دێنن، ئەوانە تەنیا بە خوا دەكرێن، بۆیە دەبێ تەنیا سوپاسگوزاریی بۆ خوا ﷻ بكەن، ئنجا سوپاسگوزاریی خواش لەسەر نیعمەتەكانی، دەبێتە هۆی:

**یەكەم:** پاراستنی نیعمەتەكان، وەك گوتراوە: (**الشُّكْرُ سِياجُ النِّعَم**) سوپاسگوزاریی پەرژینی نیعمەتەكانە.

**دووەم:** هۆكاری زیادبوونی نیعمەتەكانە، وەك لە سوورەتی (ئیبراهیم)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۝٧ ﴾، یاد بكەوە!

کاتێك پەروەردگارت ڕایگەیاند، (وەك یاسایەكی گەردوونیی خۆی) ئەگەر سوپاسگوزارییم بۆ بكەن، بۆتان زیاد دەكەم، هەر نیعمەتێك سوپاسگوزاریی خوای لەسەر بكرێ، ئەو نیعمەتە زیاد دەكات.

## سوپاسگوزاریی یانی چی؟

(شكر) سوپاسگوزاریی بە سێ شتان دەكرێ:

١- بە دڵ ئەو نیعمەت و چاكەیە لە خوا بزانێ.

٢- بە زمان دانی پێدا بێنێ.

٣- بە كردەوەش ئەو نیعمەت و چاكەیە لە ڕەزامەندیی خوادا بە كاربێنی.

ئنجا با سەرنج بدەین چۆن سوپاسگوزاریی نیعمەتەكان زیاد دەكات؟

أ- زانیارییەك كە خوا پێیداوی، لە ڕەزامەندیی خوادا بە كاری بێنەو بڵاوی بكەوە، زیاد دەكات.

ب- عەقڵی خۆت بەكار بێنە لە خزمەتی كۆمەڵگادا، لە خزمەتی خەڵكیدا زیاد دەكات.

جـ- ماڵ و سامان بە كاری بێنە، دایمەنێ و پەزمەندەی مەكە، بە كاری بێنەو بیجووڵێنە، زیاد دەكات.

د- هەروەها ئەو ئەندامانەی خوا پێی داوی، ئەو ئەندامانە بە كاربێنە، هەر كامیان لە كاری خۆیدا زیاد دەكات و، بەهێز دەبێ: چاوو، گوێ، ڕووح، عەقڵ، ماسوولكەكانت بەكاریان بێنە، هەڵبەتە بە باری خێرو چاكەدا، ئەگەرنا بە باری شەڕو خراپەدا، كەسێك كە ئەندامەكانی خۆی و وزەو هێزەكانی خۆی لە خراپەدا بە كار بێنێ، تووشی دەردو نەخۆشیی و بەڵا دەبێ و، لە جیاتی ئەوەی زیاد بكەن، كەم دەبن.

## مەسەلەی چوارەم:

**ڕەوانەكردنـــی پێغەمبەرانـــی دیكــە، لــە پێــش موحەممـــەددا ﷺ بــە بەڵگــە ڕۆشــنەكانەوەو، بێبــڕوا بوونــی گەلەكانیــان و، تۆڵــە لــێ ســتێنرانیان و ســەرفرازیی بــڕواداران، وەك یاســایەكی گشــتیی خــوا ﷻ:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَاءُوهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَانتَقَمْنَا مِنَ الَّذِينَ أَجْرَمُوا ۖ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ ﴾، خوا ﷻ دەفەرموێ: بە جەختكردنەوە، یان سوێند بە خوا، لە پێش تۆدا پێغەمبەرانمان بۆ لای گەلەكانیان ڕەوانكرد، (و)ی (وَلَقَدْ) بۆ بادانەوەو گێڕانەوەی ئەم ڕستەیە، بۆ سەر ئەوەی پێش خۆی واتە: وەك چۆن بایەكان دەنێرین بە موژدەوەو، پاشان ئەو هەموو چاكەو نیعمەتانەی خوایان لێ پەیدادەبن، بە هەمان شێوەش پێغەمبەرانیشمان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام)، لە پێش تۆدا بۆ لای گەلەكانیان، ناردوون.

٢)- ﴿ فَجَاءُوهُم بِالْبَيِّنَاتِ ﴾، بەڵگە ڕۆشنەكانیان بۆ بردن، بە بەڵگە ڕۆشنەكانەوە چوونە لای گەلەكانیان، هیچ پێغەمبەرێك نەبووە بەڵگەو موعجیزەیەكی پێ نەبێ، بەرانبەرەكانی دەستەوسان بكات، بەرانبەرەكانی ئەگەر لە قەناعەت هێنان بگەڕێن، ئیقناع بكات، كە ئەو كەسە پێغەمبەری خوایەو، ڕەوانەكراوی خوایە.

دیـارە ئـەوە پێچراوەتـەوە كـە لـەدوای: ﴿ فَجَاءُوهُم بِالْبَيِّنَاتِ ﴾ دێ و بـە سـیاق وسـەلیقە دیـارە: پێغەمبـەران بـە بەڵگـە ڕۆشـنەكانەوە هاتنـە لایـان، بـەڵام ئـەوان بـە درۆیـان دانـان، دژایەتییـان كـردن، سـەرپێچییان لـێ كـردن، ئـەوە هەمـووی پێچراوەتـەوەو بـاس نەكـراوە، بـەڵام بـە سـیاق و سـەلیقە دیـارە، بۆیـە یەكسـەر هاتۆتـە سـەر دەرئەنجامەكـەی دەفەرمـوێ:

٣)- ﴿ فَٱنتَقَمۡنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ ﴾، تۆڵەمان ستاند لەوانەی تاوانیان کرد، (**الإنْتِقامُ: مِنَ النَّقْمِ وَهُوَ الكَراهَةُ وَالغَضَب**)، وشەی (نَقْم): بە مانای ڕق لێ هەڵسان و تووڕەییە، ﴿ وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ ﴿٨﴾ ﴾**البروج**، واتە: هیچ شتێکیان لێ بە ڕەخنە نەگرتن، هیچ شتێکیان لێ بە ناپەسند نەگرتن، هیچ شتێکیان لێ بە عەیب نەگرتن، لێرەش دەفەرموێ: ﴿ فَٱنتَقَمۡنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ ﴾، تۆڵەمان ستاندەوە لەوانەی کە تاوانیان کردبوو، کە تاوانەکەیان بریتی بوو لە بە درۆ دانانی پێغەمبەران و، سەرپێچیی لێ کردنیان.

٤)- ﴿ وَكَانَ حَقًّا عَلَيۡنَا نَصۡرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، سەرخستن و یارمەتییدانی بڕوادارانیش لەسەر ئێمە پێویستبوو، ﴿ حَقًّا عَلَيۡنَا ﴾ پێویستبوو لەسەرمان، لێرەدا هەندێك لە زانایان لێیان بۆتە مشتومڕو کێشە، کە چۆن شتێك لەسەر خوا پێویست دەبێ؟ لەبەر ئەوەی (**معتزلة**) گوتوویانە: لەسەر خوا پێویستە بەرانبەر بە بەندەکانی وا بکات، ئەوانی دیکە ئەشعەرییەکان و جەبرییەکان، گوتوویانە: نەخێر، هیچ شتێك لەسەر خوا پێویست نیە، بەڵام بە بۆچوونی من پێویست بەو هەموو کێشەو مشتومڕە ناکات، هیچ کەسێك ناتوانێ هیچ شتێك لەسەر خوا پێویست بکات، بەڵام خوا ﷻ بۆ خۆی ئەگەر شتێکی لەسەر خۆی پێویست کرد، وەك بەخششی خۆی، وەك چاکەکاریی خۆی، ئەگەر خوا ﷻ فەرمووی: ئەی مرۆڤ! ئەوە مافی تۆیە لەسەر من، ئەگەر بۆ خۆی وایفەرموو، مانای وانیە کە مرۆڤەکان، یاخود بەرانبەرەکان، شتێکیان لەسەر خوا پێویستکردووەو، خوا ﷻ بۆ خۆی شتێك لەسەر خۆی پێویست بکات، جیایە لەوەی خەڵك لەسەری پێویست بکات، بۆیە هیچ ئیشکالێکی تێدانیە.

لەو بارەوە جگە لەو ئایەتە موبارەکە، ئەم فەرمایشتەش هەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ، كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يَرُدَّ عَنْهُ نَارَ جَهَنَّمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**} (**أخرجه أحمد: ٢٧٥٧٦، تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره والترمذي: ١٩٣١، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ**).

واتە: هیچ مسوڵمانێك نیە، کە بەرگریی بکات لە سومعەو کەسایەتیی برای مسوڵمانی، (هەڵبەتە لێرەدا کوڕەکە کوڕی پیاوان بووە، ئەگەرنا لە سومعەی

خوشکەکەشت بەرگریی بکەی هەر وایە)، مەگەر لەسەر خوای زاڵی پایەدار پێویستە، کە لە ڕۆژی دوایی دا ئاگری دۆزەخی لە دەم و چاو دوور بخاتەوە.

لە ڕیوایەتی دیکە هاتوە: دوایی پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، یارمەتییدان و سەرخستنی مسوڵمانان لەسەر ئێمە پێویستەو، هەقێکی ئەوانە لە لای ئێمە، خوا ﷻ بۆ خۆی ئەوەی کردوە، بە هەقێك لەسەر خۆی.

هەروەك خوا ﷻ لەسەر زمانی هوود ﵇ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٦﴾ ﴾ **هود**، واتە: پەروەردگارم لەسەر ڕێیەکی ڕاستە، واتە: بە ڕێیەکی ڕاستدا مامەڵە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات، هەروەها خوا ﷻ خۆی بە سوپاسگوزار (**شاكِر**) ناوبردوە: ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾ ﴾ **النساء**، یانی: ئەگەر بەندەکانی سوپاسی بکەن و، چاکە بکەن، خواش سوپاسی دەکات و چاکەیان دەداتەوەو، چاکەکانیان نادیدە ناگرێ.

هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان بۆ ئەوەی نەڵێن، شتێك لەسەر خوا پێویستە، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ حَقًّا ﴾، وەستاون لەسەری، ئنجا گوتوویانە: ﴿ عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، لەسەرمانە ئێمە یارمەتیی بڕواداران بدەین، واتە: (**حَقّاً**) بۆ پێشەوە دەچێتەوە: ﴿ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ وَكَانَ حَقًّا ﴾، واتە: تۆڵەمان لە تاوانباران ستاندەوە، ئەوانەی تاوانیان کردبوو، ئەوەش هەق بوو، دوایی: ﴿ عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، لەسەرمانە یارمەتیی بڕواداران بدەین.

بەڵام بە بۆچوونی من، لێك پچڕاندن و لێك دابڕینی ئەو ڕستەیە، بۆ ئەوەی بە حیساب خۆ بپارێزرێ، لەو مانایەی دەچێتەوە سەر ڕێچکەو ڕێبازی (**معتزلة**) شتێکی بێجێیە، چونکە ﴿ عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، دیسان ئەویش واتای ئەوەیە لەسەرمان پێویستە یارمەتیی بڕواداران بدەین، ئەو چەمکە هەر دەگەیەنێ!

کەواتە: نەخێر، ﴿ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئەمە لە سووڕەتی (**یونس**)یشدا، هەر بەو چەمك و واتایە هاتوە، کە خوا ﷻ ئاوا دەفەرموێ:

﴿ثُمَّ نُنَجِّي رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا كَذَلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾﴾، واتە: دوایی ئێمە پێغەمبەرانمان (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمْ**) و ئەوانەی بڕوایان هێناوە، دەرباز دەکەین، هەر بەو شێوەیەشە، (وەك لە ڕابردوودا خوا ﷻ پێغەمبەران و بڕوادارانی شوێنکەوتوویانی قوتار کردوون)، لەسەرمان پێویستە ئێمە بڕواداران دەرباز دەکەین، خوا بۆ خۆی لەسەر خۆی پێویستکردوە، کەواتە: پێویست بەو مشتومڕەی نێوان موعتەزیلەو ئەشعەرییەکان ناکات و، مەرج نیە هەرچی (**مُعتزلة**) گوتبیان، بە کەڵك نەیەت، لە ڕاستییدا وەك لە مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیعدا) باسمان کردوە، بە هەموو قوتابخانەو تەوژم و کۆمەڵەکانی کە لە مێژوودا بوون، بە هەموویان ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ پێك دێنن و، جاری وا هەیە (**مُعتزلة**) لە شتێکدا چاکتریان پێکاوە لە ئەشعەرییەکان، جاری واش هەیە ئەشعەرییەکان لە شتێکدا باشتریان پێکاوە لە جەبرییەکان، جەبرییەکانیش لە شتێکی دیکەدا، بەڵام هەقی تەواو تەنیا لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، ئەوی دیکە هەمووی ڕێژەییەو، هیچ کەسێکیش نیە، لەو تاقم و کۆمەڵانەی مێژوو کە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ پێك دێنن، بە مەرجێك مسوڵمان و بڕوادار بن، هیچ کەسێك نیە ئەندازەیەك لە هەقی لە لا نەبێ.

## مەسەلەی پێنجەم:

**باسی پرۆسەی ئاو دابارین و دڵخۆش بوونی مرۆڤان پێی، پاش نائومێدیی بە هۆی وشکە ساڵیی و بێ بارانییەوەو، سەرنجڕاکێشانی خوا بۆ شوێنەواری دابەزێنرانی ئاوی ئاسمان و، ئاماژەیەك بە بای نەزۆك كە مایەی زەرد هەڵگەڕانی كشتوكاڵیانەو، مایەی سپڵەیی وبێبڕوایی هەندێ لە مرۆڤانە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَـٰلِهِۦ ۖ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ لَمُبْلِسِينَ ﴿٤٩﴾ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَـٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ يَكْفُرُونَ ﴿٥١﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ ﴾، ئەمە جاری چوارەمە كە وشەی (**ألله**) لەم سوورەتە موبارەكەدا دێ، وەك دەستپێكرد (**إِسْتِئْناف**)ی ڕستەیەكی سەربەخۆ: خوا ﷻ ئەو زاتەیە، كە بایەكان دەنێرێ، وەك پێشتریش گوتمان: هەمیشە وشەی (**رِیَاح**) بۆ خێرو خۆشیی بەكارهاتوە، لە قورئانداو، (**رِیح**)یش بۆ سزاو ئازار.

٢)- ﴿ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ ﴾، ئەو بایانەی خوا دەیاننێرێ، هەوران دەورووژێنن و پەیدا دەكەن، یەكسەر بەئاسمان دا پانی ڕادەخات وبڵاوی دەكاتەوە، لەسەر ڕووی دەریایەكان هەیە، كە بە هۆی تیشكی خۆرەوە، كە لە ئاوی ئۆقیانووسەكان دەدات، ئەو هەڵمە پەیدادەبێ و بایەكانیش بەهۆی فشاری هەواوەو، بەهۆی شەپۆلەكانەوە كە بە هۆی هەڵكشان و داكشانی دەریایەكانەوە، كە لە ئەنجامی هێزی كێشندەی مانگ و زەویدا دروست دەبێ، ئەو بایانە پەیدادەبن، ئەو بایانەش ئەو

هەڵمانە دێنن، دوایی هەڵمەکە دەبێتە هەور، ئنجا خوا ﷻ ئەو هەورە بڵاودەکاتەوە بە ئاسماندا، (یانی: لە سەرێ) چۆنی بوێ بەو شێوەیە.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَتُثِيرُ سَحَابًا ﴾، (أَي تُنْشِئُ) پەیدای دەکات و، دەیورووژێنێ، لە شوێنی خۆیەوە ئەو هەڵمە دێنێ و سەرەنجام دەبێتە هەور.

٣)- ﴿ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا ﴾، دەیکاتە بەش بەشی کەڵەکە بوو لەسەریەك، (كِسَفاً) خوێندراویشەتەوە: (كِسْفاً)، ئەگەر (كِسَفاً) بێ، کۆی (كِسْفَة)یەو بەمانای (قِطْعَة)یە، (كِسْفاً)یش بە مانای (قطْعة)یە، یانی: پارچە، بەش. واتە: هەورەکە دەکاتە بەش بەشی کەڵەکە بوو و کۆبووەوە لەسەریەك.

٤)- ﴿ فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ ﴾، ئنجا ئاوو باران دەبینی لە میانی ئەو هەورە، لە کەلێنەکانی ئەو هەورە دێتە دەرێ، وشەی (خِلَال: جَمْعُ خَلَلْ أَي: الفُرْجَةُ بَيْنَ شَيْئَيْنِ)، (خِلَال) کۆی (خَلَلْ)ە، (خَلَلْ)یش، یانی: کەلێن، درز، لە نێوان دوو شتان دا، یانی: هەورەکان ئاویان لێ دێتە خوارێ، هەڵبەتە وشەی (وَدْق) بە مانای باران هاتوە، بەڵام بە مانای ئاویش هاتوە، ئنجا بارانە، بەفرە، تەرزەیە، هەمووی دەگرێتەوە، هەندێکیش گوتوویانە: (وَدْق)، بریتیە لەو پارچە بچووك بچووکانەی کە هەڵم پێك دێنن، دوایی هەڵمەکە باران و بەفرو تەرزە پێك دێنێ.

٥)- ﴿ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ ﴾، هەر کاتێك (خوا ئەو ئاوە، کە دایبەزاندوە لە ئاسمانەوە) تووشی هەندێك لە بەندەکانی کرد، بەسەریدا باراندن، ئنجا بارانە، بەفرە، تەرزەیە.

٦)- ﴿ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾، کت وپڕ دڵخۆش وگەش دەبن، ئەم (إِذَا)یە پێی دەڵێن: (إِذَا الفُجَائِيَّة)، یانی: کت و پڕ، ئەوەش ئاماژەیە، بۆ ئەوە کە پێشێ نائومێدو ناڕەحەت بوون، دوایی بە خێرایی دڵخۆش دەبن.

٧)- ﴿ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ لَمُبْلِسِينَ ﴾، هەرچەندە ئەو مرۆڤانە پێشتر بەر لەوەی کە ئەو ئاوەیان بەسەردا بباریێ، نائومێدو کش ومات بووبن.

(الإِبْلَاسُ: الإِيَاس)، واتە: نائومێدیی و بێ هیوایی و بێ دەنگیی.

٨)- ﴿ فَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحۡمَتِ ٱللَّهِ ﴾، ئنجا سەرنج بدە شوێنەوارەكانی بەزەیی خوا، واتە: ئەوەی لە بەزەیی خوا پەیدابووە، لێرەدا (رَحۡمَتِ ٱللَّهِ)، مەبەست پێی ئاوی دابەزێنراوەكەیەو كە لە ڕاستییدا باران و، بەفرو تەرزە، ئاوێك كە دادەبەزێ لە ئاسمانەوە، بەرجەستەكەری بەزەیی خوایە، یاخود: ﴿ ءَاثَٰرِ رَحۡمَتِ ٱللَّهِ ﴾، یانی: ئاوەكە كە دێتە خوار، بەرهەمی بەزەیی خوایە بەرانبەر بە مرۆڤەكان، نەك ﴿ رَحۡمَتِ ٱللَّهِ ﴾، مەبەست پێی بەفرو تەرزەو بارانەكە بێ، بەڵكو یانی: ئاوەكە كە دێتە خوار لە شێوەی باران و بەفرو تەرزەدا، ئەوە بەرهەم و شوێنەواری بەزەیی خوایە ﷻ.

٩)- ﴿ كَيۡفَ يُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآ ﴾، سەرنج بدە! چۆن خوا زەوی دوای مردنی، زیندوو دەكاتەوە، دەیژیەنێتەوە، مردنی زەوی مەبەست ئەوەیە كە كشتوكاڵی لەسەر نەماوە، ڕووەكی لەسەر نەماوەو قاقڕ بووە، نیشانەی ژیانی لەسەر نەماوە.

١٠)- ﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ ﴾، بەدڵنیایی ئەوە ژیێنەرەوەی مردووانە، ئەو خوایە ﷻ، ئەو پەروەردگارە، زیندوو كەرەوەی مردووانیشە، وەك چۆن زەوییەكی قاقڕو دێمەكار زیندوو دەكاتەوە بە هۆی ئاوەوە، ئێوەش زیندوو دەكاتەوە لە ڕۆژی دواییدا.

١١)- ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾، ئەویش لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

دوایی خوا ﷻ دیمەنێكی دیكە دەخاتە بەرچاو:

١٢)- ﴿ وَلَئِنۡ أَرۡسَلۡنَا رِيحٗا فَرَأَوۡهُ مُصۡفَرّٗا لَّظَلُّواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ يَكۡفُرُونَ ﴾، ئەگەر بایەك بنێرین، ئنجا بەزەرد هەڵگەڕاویی ببینن، دوای وی سپڵەیی (یان بێبڕوایی) دەكەن، وشەی (رِیح) زیاتر بۆ سزادانە، بایەكی بە زەڕ بنێرین.

﴿ فَرَأَوۡهُ مُصۡفَرّٗا ﴾، بایەكە ببینن زەرد هەڵگەڕاوە، یان كشتوكاڵەكەیان ببینن زەرد هەڵگەڕاوەو، یان هەورەكان ببینن زەرد هەڵگەڕاون، هەموویان دەگرێتەوە، بەڵام زیاتر مەبەست پێی كشتوكاڵەكەیە، هەرچەندە لێرەدا باسی كشتوكاڵیش

نەکرابێ، بەڵام بە سیاق ئاماژەی پێدراوە کە بریتیە لە زیندوو بوونەوەی زەوی دوایی مردنی، زیندوو بوونەوەکەی بە کشتوکاڵە، ئنجا ئەوەی بە زەرد هەڵگەڕاویی دەیبینن، چوار واتایان بۆ لێکداوەتەوە:

١- کشتوکاڵەکە بە زەرد هەڵگەڕاویی دەبینن.

٢- هەورەکە بە زەرد هەڵگەڕاویی دەبینن.

٣- بایەکە کە تۆزو غوباری بیابان لەگەڵ خۆی دێنێ، بە زەرد هەڵگەڕاویی دەیبینن.

٤- یاخود (**صُفْر**)، واتە: خاڵیی، بایەکە بە بەتاڵیی و بۆشیی دەبینن، هیچ خێرێکی پێوە نیە.

﴿ مُصۡفَرّٗا ﴾، زەرد هەڵگەڕاو، چونکە (**أَصْفَر**)، یانی: زەرد، بەڵام (**مُصْفَرّ**) شتێکە ڕەنگی زەردی لێ نیشتبێ (زەرد هەڵگەڕاو)، کشتوکاڵ وەختێك بایەکی بە زەر لێی دەدات دەڵێن: با بردوویەتی و، هەتاو بردوویەتی، زەرد هەڵدەگەڕێ، (**المُصْفَرُّ: اسْمُ فاعِلٍ مُقْتَضٍ للوَصْفِ بِمَعْناهُ في الحالِ، أَي: فَرَأَوهُ يَصِيرُ أَصْفَرَ وَ«مُصْفَرًّا»، لِتَصْوِيرِ حَدَثانِ الإصْفِرارِ عَلَيْه**)، (**مُصْفَر**): ناوی بکەر (**اسم فاعل**)ە، لە زمانی عەرەبییدا کە خوازیاری ئەوەیە شتێك پێی وەسف بکرێ، لەو حاڵەدا کە ئێستا هەیە، دەیبینن کە زەرد هەڵدەگەڕێ و، وشەی (**مُصْفَرّ**) بۆ ئەوەیە کاتی زەرد هەڵگەڕانەکە، وێنا بکرێ.

﴿ لَّظَلُّواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ يَكۡفُرُونَ ﴾، بەردەوام دەبن، دوای ئەو بایە کە کشتوکاڵەکەی لێ زەردو سیس و نەخۆش کردوون، سپڵەیی و ناسپاسیی دەکەن، یاخود بێبڕوا دەبن، وشەی (**ظَلَّ**) بریتیە لە ئەنجامدانی کردەوەیەك لە ڕۆژدا، بەڵام (**باتَ**) بۆ ئەنجامدانی کردەوەیەکە لە شەودا، (**باتَ يَفْعَلُ كَذا**)، یانی: بە شەوێ وایکرد، (**ظَلَّ يَفْعَلُ كَذا**)، یانی: بە ڕۆژێ وایکرد، بۆیە لێرە (**لَّظَلُّوا**) بەکارهاتوە، چونکە بە ڕۆژێ دەیبینن کشتوکاڵەکەیان سیس بووەو زەرد هەڵگەڕاوە، ناسپاسیی دەکەن، یاخود بێبڕوایی پیشان دەدەن.

هەر سێ کرداری: ﴿وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا﴾، ﴿فَرَأَوْهُ﴾، ﴿لَّظَلُّوا﴾، بەڕابردوو، هێناون، لەبەر ئەوەی کردەوەی ڕابردوو (**ماض**) کاتێك لە سیاقێك دا دێ، کە مەرج (**شَرْط**)ی تێدایە، دەچێتەوە بۆ ئێستاو بۆ داهاتوو، ئەگەر بڵێی: (**لَئِنْ جِئْتَنِي لأُكْرِمَنَّكَ**)، واتە: ئەگەر بێی بۆ لام، ڕێزت دەگرم، مادام (**إِنْ**)ی چۆتە سەرێ، واتە: بۆ داهاتووەو، لە داهاتوودا ئەگەر بێی بۆ لام ڕێزت دەگرم.

مانای ئایەتەکەش ئاوایە: ئەگەر لەداهاتوودا بایەکیان بنێرینە سەر و بەزەرد هەڵگەڕاویی ببینن، سپڵەیی و بێبڕوایی دەکەن.

## مەسەلەی شەشەم و کۆتایی:

**جەختکردنەوە لەسەر نەبوونی توانای پێ بیستێنرانی مردووان و کەڕان و، دەربازکردنی کوێران لە گومڕایی و، گونجانی پێ بیستێنرانی بڕوادارانی ملکەچ بۆ خوا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَا أَنتَ بِهَادِ الْعُمْيِ عَن ضَلَالَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ:

**١)-** ﴿ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ ﴾، بە دڵنیایی تۆ ناتوانی بە مردووان ببیستێنی، واتە: وا بکەی مردوو قسەی تۆ ببیستن.

**٢)-** ﴿ وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ ﴾، هەروەها تۆ پێ بیستێنەری کەڕان نی، بە بانگکردنی خۆت، لەکاتێك دا پشتهەڵکردووانە ڕوو وەردەگێڕن، خوێندراویشەتەوە: (**وَلا يَسْمَعُ الصُّمُّ الدُّعَاءَ**)، واتە: کەڕان بانگکردن نابیستن.

(**القرطبي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، لێرەدا شتێکی جوان دەڵێ: (**وَضَحَتْ الْحُجَجُ يَا مُحَمَّدُ، لَكِنَّهُمْ لِإِلْفِهِمْ تَقْلِيدَ الْأَسْلَافِ فِي الْكُفْرِ، مَاتَتْ عُقُولُهُمْ، وَعَمِيَتْ بَصَائِرُهُمْ، فَلَا يَتَهَيَّأُ لَكَ إِسْمَاعُهُمْ وَهِدَايَتُهُمْ**).

کە لێرەدا خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: تۆ ناتوانی بە مردووان ببیستێنی و، ناتوانی بە کەڕان بانگردنەکە ببیستێنی، کاتێك پشت دەکەن، دواییش دەفەرموێ: ﴿ وَمَا أَنتَ بِهَادِ الْعُمْيِ عَن ضَلَالَتِهِمْ ﴾، تۆ ناتوانی ڕێنماییکەری کوێران بی، لە گومڕاییەکەیان (دەریانبێنی).

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٤، ص ٣٨

واتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺ! بەڵگـەکان ڕۆشـن بوونـەوە، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی ئەوانـە خوویـان گرتـوە بـە لاسـاییکردنەوەی پێشـینانیان لـە کوفـردا، عەقڵەکانیـان مـردوون و دڵەکانیـان کوێـر بـوون، بۆیـە تـۆ بـۆت ناکـرێ پێیـان ببیسـتێنی و، ڕێنماییـان بکـەی و بیانخەیـە سـەر ڕاسـتە ڕێ.

﴿ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ ﴾، کاتێـك ڕوو وەردەگێـڕن و پشـت هەڵدەکـەن، واتـە: بـە پشـتتێکردنەوە دەڕۆن.

٣)- ﴿ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِ ٱلْعُمْيِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ ﴾، هەروەها ناتوانی ڕێنماییکەری کوێران بی، لەگومڕاییەکەیان دەریان بهێنی، لێرە وشەی: (**بِهادِي**)، کە بە (**عَنْ**) بۆ بەرکار تێپەڕی پێکراوە (**ضُمِّنَ «بِهادِي» مَعْنى «مُخْرِج» لِذا عُدِّيَ بِـ «عَنْ»**)، وشەی (**هادِي**) مانای دەرهێنەر (**مُخْرِج**)ی، خراوەتە نێو، بۆیە بە (**عَنْ**) بەرکاری پێخوازراوە، ئەگەرنا دەیتوانی بفەرموێ: (**وَما أَنْتَ بِهادِ العُمْيِ فِي ضَلَالَتِهِم**)، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ ﴾، یانی: (**وَما أَنْتَ بِهادِ العُمْيِ وَمُخْرِجهم عَنْ ضَلالَتِهِم**)، تۆ ناتوانی کوێران ڕێنمایی بکەی و دەربێنی لەو گومڕاییەی تێیدان.

هەڵبەتـە لێـرەدا وشـەی (**هـادِي**) بـە مانـای ڕاسـتەڕێکەر دێ، نـەك ڕێنماییـکار، چونکـە پێغەمبـەر ﷺ ڕێنمایـی خەڵکـی کـردوەو ڕێـی پیشـانداون، بـەڵام (**هداية**) وەك چـۆن بـە مانـای ڕێنمایـی دێ، بـە مانـای خسـتنە سـەر ڕێـش دێ، ئنجـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆی کـراوەو توانیویەتـی ڕێنمایـی خەڵـك بـكات و بۆیـان ڕوون بکاتـەوە، بـەڵام دیـارە تەنیـا خـوا ﷻ دەتوانـێ خەڵـك بخاتـە سـەر ڕاسـتە ڕێ، خەڵـك ئـەو ڕێنماییـەی پێغەمبـەر ﷺ پێیـان ڕادەگەیەنـێ، وەریبگـرن و، لێـی بەهرەمەنـد بـن و ڕێـی ڕاسـت بگـرن، ئـەوە تەنیـا بـە خـوا دەکـرێ، خـواش ﷻ لـە گۆتـرە کـەس ناخاتـە سـەر ڕاسـتە ڕێ، مـرۆڤ دەبـێ خـۆی هەوڵبـدات، لـە تـۆ حەڕەکـەت و لـە خـوا بەرەکـەت.

## ڕوونکردنەوەیەکی گرنگ:

لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَنتَ بِهَـٰدِ ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَـٰلَتِهِمْ ﴾، تۆ ناتوانی ڕاستەڕێکاری کوێران بی و لە گومڕاییەکەیان دەریان بێنی، بەڵام لە سوورەتی (**الشورى**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی تۆ بەرەو ڕاستە شەقام هیدایەت دەکەی، هەروەها لە سوورەتی (**القصص**)دا، جارێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ ﴿٥٦﴾ ﴾، بەدڵنیایی تۆ ئەو کەسەی خۆشتبوێ، هیدایەتی نادەی.

دەبێ بزانین کە ئەو هیدایەتەی لابراو (**منفِيّ**)ە، جیایە لە هی چەسپاو (**مُثْبَتْ**)، ئەو هیدایەتەی لا دەبرێ، بریتیە لە خستنە سەر ڕێ، بەڵام هیدایەتێك کە دەچەسپێنرێ بۆ پێغەمبەر ﷺ، ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ ﴾**الشورى**، بریتیە لە ڕێنماییکردن و ڕێ پیشاندان و، ڕێ پیشاندان پێغەمبەر ﷺ بە باشترین شێوە کردوویەتی، بەڵام خستنە سەر ڕێ، ئەوە دیارە لە توانای پێغەمبەردا ﷺ نەبووە، بۆیە خوا ﷻ ئەوەی لایدەبات، بریتیە لە خستنە سەر ڕێ و ئەوەی دەیچەسپێنێ، بریتیە لە ڕێ پیشاندان.

٤)- ﴿ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴾، تۆ تەنیا دەتوانی بە کەسانێك ببیستێنی، کە بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە هەیەو، ئەوان ملکەچیشن (بۆخوا).

یانی: کەسێك بە ڕاستیی ڕوو لە خوا بکات و دڵی خۆی بەرەو خوا وەرچەرخێنێ، بە ڕاستیی عەوداڵ بێ، خوا بناسێ و خوا بپەرستێ و، شەیدا بێ کە ئایەتەکانی خوا پەی پێ بەرێ و، پێیان ئاشنا بێ، بە تەئکید ئەو کەسانە لە بەرانبەر خوادا ملکەچن، کەسانی ئاواش هەق قبووڵ دەکەن، بانگەوازی پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، جێنشینەکانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە بانگیان دەکەن، وەردەگرن و قبووڵ دەکەن، بەڵام کەسێك بۆ خوا ملکەچ نەبێ و، ڕقی لە پێغەمبەران بێ و، دانووی لەگەڵ هەق دا نەکوڵن، دڵ و دەروونەکەی ڕەش بێ،

بەڵكو هەیانە، ڕقیشی لە خوای پەروەردگارە، كەسی وا چۆن ئایەتەكانی خوای دەچنە نێو دڵ و دەروونەوەو، چۆن هەق دەبیستێ، بابای وا هەستەوەرەكانی خۆی لە دەستداون و، دڵ و دەروونی خۆی تێكداوەو وێرانكردوە، وەك چۆن تەونی جاڵجاڵۆكە شوێنێك دەتەنێ، ئەویش بە تاوان و گوناهو خراپە دڵ و دەروونی خۆی تەنیوەو، ڕێ نیە، هیدایەتی خوای بچێتە نێو.

شایانی باسە: لە سوورەتی (النمل)یش دا، ئەم دوو ئایەتە هاتوون، بەڵام لەگەڵ تۆزێ جیاوازییدا، لێرە دەفەرمویّ: ﴿ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَـٰدِ ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَـٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾،

لە سوورەتی (النمل)دا، جیاوازییەكە ئەوەندەیە دەفەرمویّ: ﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٨٠﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَـٰدِى ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَـٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ ﴾، لێرەدا كە پیتی (ف) خراوەتە سەر (إِنَّكَ)، ئەوە پەیوەستە بە ڕابردووەوە، واتە: تۆ هەموو شتێكت لێ حاڵیی كردوون، بەڵام تۆ ناتوانی بە مردووان ببیستێنی و، ناتوانی ئەو بانگكردنەی خۆت كاتێك كە پشتت تێ دەكەن بە كەڕان ببیستێنی.

ئنجا ئەو ڕاستییە لێرەدا خوا ﷻ دەیفەرمویّ و لە ئایەتەكانی: (٨٠ - ٨١)ی سوورەتی (النمل)یشدا، فەرموویەتی، كەواتە: دەهێنێ ئەو ڕاستییە دوو جاران بخرێتە بەرچاوی پێغەمبەری خاتەم ﷺ و شوێنكەوتووانی كە كاتێك كەسانێك بە دەنگیانەوە نایەن و، گوێیان بۆ ناگرن و، هیدایەت و پەیامی خوایان لێ وەرناگرن، با بزانن: ئەوە لە توانای ئەواندا نیە، كە هیدایەتیان بدەن و پێیان ببیستێنن و، بیانخەنە سەر ڕاستە ڕێ، ئەركی ئەوان هەر ئەوەیە كە پێیان ڕابگەیەنن و بەرچاویان ڕوون بكەنەوە، دوایی دەكەوێتەوە سەر خۆیان، ئایا ئەو هیدایەتە قبووڵ دەكەن، یان نایكەن؟

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان حەوت (٧) ئایەتی کۆتایی سووڕەتی (**الروم**) دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٥٤ - ٦٠)، کە لە ئایەتی یەکەمیان (٥٤)دا، باسی دروستکردنی مرۆڤ و، پاشان بەهێز بوونی و، دوایی بێهێزبوونی و پیر بوونی کراوە.

لە ئایەتەکانی: (٥٥و ٥٦و ٥٧)یشدا، باسی ڕۆژی دوایی کراوە، کە لە نێوان بێبڕوایان و بڕوادارانی زاناو شارەزادا، لەسەر ئەندازەی مانەوەیان مشتومڕ دەبێ و، پۆزش و بیانوو هێنانەوەی کافرانیش لەو ڕۆژەدا بێ سوودە.

لە دوو ئایەتی: (٥٨ - ٥٩)شدا، باسی وێنە هێنانەوەکانی قورئان کراوە.

لە ئایەتی کۆتاییش ئایەتی (٦٠)دا، ئامۆژگاریی پێغەمبەری خاتەم ﷺ کراوە، کە قسەو هەڵوێستی بێبڕوایان نەیلەخشێنێ و نەیهەژێنێ.

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ
قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ ﴿٥٤﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ
ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ كَذَٰلِكَ كَانُوا۟ يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ
لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ فَهَٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ
﴿٥٦﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا
لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ وَلَئِن جِئْتَهُم بِـَٔايَةٍ لَّيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ
أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٩﴾ فَٱصْبِرْ
إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{خوا ئەو کەسەیە کە لە بێهێزیی دروستیکردوون، ئنجا پاش بێهێزیی، هێزی (بۆتان) ڕەخساندوە، ئنجا دوای هێزو پێز، بێهێزیی و پیریی (یتان تووش دێ)، (خوا) هەرچی بیەوێ دروستی دەکات و، ئەوە زانای توانا ﴿٥٤﴾ ئەو ڕۆژەش کە کاتی دیارییکراو (ی ڕۆژی دوایی) دێ، تاوانبارەکان سوێند دەخۆن: تەنیا کاتێکی کەم (لە ژیانی دنیادا) ماونەوە، (کاتی خۆیشی) هەر بەو جۆرە (لە هەق) لادەدران ﴿٥٥﴾ بەڵام ئەوانەی زانیاریی و بڕوایان پێدراوە، گوتیان: بە دڵنیایی لە کتێبی خوادا (بە پێی کتێبی خوا) هەتا ڕۆژی زیندوو کرانەوە (لە ژیانی دنیادا) ماونەوە، ئنجا ئەمە ڕۆژی زیندوو کرانەوەیە، بەڵام ئێوە نەتاندەزانی (کە ئەم ڕۆژەتان لە پێشە)، ﴿٥٦﴾ ئنجا لەو ڕۆژەدا پۆزش هێنانەوەی ئەوانەی (لە دنیادا) ستەمیان کردوە، سوودیان پێ ناگەیەنێ و، داواشیان لێناکرێ داوای نەهێشتنی گلەیی (خوا) بکەن (ورازی بکەن) ﴿٥٧﴾ بێگومانیش لەم قورئانەدا، لە هەموو وێنەیەکمان بۆ خەڵکی هێناوەتەوەو، هەر کات ئایەتێکیشیان بۆ بێنی، ئەوانەی بێبڕوا بوون دەڵێن: ئێوە تەنیا لەسەر ناهەقن ﴿٥٨﴾ بەو شێوەیەش خوا مۆر (ی کوفر) بەسەر دڵی ئەوانەوە دەنێ کە نازانن ﴿٥٩﴾ خۆڕاگر بە (ئەی موحەممەد ﷺ!)، بە دڵنیایی بەڵێنی خوا ڕاستەو، با (قسەو ڕەفتاری) ئەوانەی دڵنیا نین (لەو ڕاستییانەی کە دوو دڵیی هەڵناگرن) نەتلەخشێنن ﴿٦٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(شَيْبَةً): (مَصْدَرٌ كالشَّيبِ، تَمامُ الضَّعْفِ ونِهايَةُ الكِبَرِ)، وشەی (شَيبَة) چاوگە، وەك (شَيب) كە بریتیە لە تەواو بێهێز بوون و كۆتایی بە ساڵدا چوون.

(مَعْذِرَتُهُمْ): (المَعْذِرَة: اسمُ مَصْدَرِ اعْتَذَرَ، أَي: إِذَا أَبْدَى عِلَّةً، أَوْ حُجَّةً لِيَدْفَعَ عَنْ نَفْسِهِ مُؤاخَذَةً عَلى ذَنْبٍ، أَو تَقْصِير)، (مَعْذِرَة) چاوگی (اعْتَذَرَ)یە، ئەویش بریتیە لەوەی كەسێك هۆكارێك یان بەڵگەیەك بخاتە ڕوو، تاكو ئەو سزادانەی لەسەر گوناهێك لە پێشیەتی، لە خۆی دووریخاتەوە.

(وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ): (لا يُطْلَبُ مِنْهُم أَنْ يَطْلُبُوا إِزالَةَ العِتابِ عَنْهُم)، داوایان لێ ناكرێ كە داوا بكەن، گلەییان لەسەر نەمێنێ، یاخود داوای لێبوردن لە خوا بكەن، بۆ ئەوەی گلەیی لەسەریان نەمێنێ، یاخود: (لا يُطْلَبُ مِنْهُمُ اسْتِرْضاءُ اللهِ تَعالى) لێیان داوا ناكرێ، خوا لە خۆیان ڕازی بكەن.

(وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ): با تۆ نەلەخشێنێ، تۆ سووك نەكات، كە لە شوێنی خۆت لات بدات، (الإِسْتِخْفافُ: مُبالَغَةٌ فِي جَعْلِهِ خَفِيفاً والمَعْنَى: لا يَحْمِلَنَّكَ عَلَى تَرْكِ الصَّبْرِ)، (إِسْتِخْفَاف): بریتیە لە زێدەڕۆییكردن لە شتێك دا كە سووكی بكەی، یانی: كێشی كەم بكەیەوە، لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە: با هەڵوێست و ڕەفتاری ئەوان تۆ وا لێ نەكات خۆڕانەگر بی.

(لَا يُوقِنُونَ): دڵنیا نین لەو شتانەی بەڵگە ڕوونەكان چەسپاندوویانن، ئەگەرنا ئەگەر ئینسان لە شتێك دڵنیا نەبێ، كە جێی دڵنیایی نەبێ، ئەوە زەم ناكرێ، بەڵام لەسەر ئەوە مرۆڤ زەم دەكرێ لە شتێك دڵنیا نەبێ، كە بەڵگەی دڵنیاكەری لەسەرە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ بـۆ جـاری چـوارەم لـەم سـوورەتەدا، دەفەرمـوێ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم﴾، خـوا ﷻ ئـەو کەسـەیە، ئـەو زاتەیـە کـە ئێـوەی هێناوەتـە دی، لە چـی؟ ﴿مِّن ضَعْفٍ﴾، لـە بێهێزیـی، ئینسـان ئەگـەر بزانـێ لـە چییـەوە هاتـوە، هەرگیـز بوغـڕا نابـێ! مـرۆڤ لـە نوتفەیەکـەوە دێ، وەك پێشـتر لـە سـەرەتای تەفسـیری سـوورەتی (**المؤمنـون**)دا باسـێکمان لـە بـارەی چۆنیەتـی دروسـتبوونی مرۆڤـەوە کـردوە، مـرۆڤ دروسـت دەبـێ لـە حەیمەنێـك کـە لـە ئـاوی پیاودایـەو، لەگـەڵ هێلکۆڵەیـەك کـە لـە ئـاوی ئافرەتدایـە، یـەك دەگـرن و تۆویلکـە (**نُطْفَـة**) پێـك دێنـن، کـە زیندەوەرێکـی زۆر بچووکە، بە ئاسـتەم ئەگـەر ببینـرێ بـە چـاو، مـرۆڤ لـەوە دروسـت دەبـێ، بۆیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ئێوەی لـە بێهێزیـی دروسـتکردوە، ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً﴾، دوایـی لـە دوای بێهێزیـی، هێـزی پێـداون، گەشـە دەکـەن و گـەورە دەبـن، هێـزو پێزتـان پەیدادەبـێ، ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً﴾، دوایـی لـە دوای بەهێـزو پێـز بوونیـش، جارێکـی دیکـە بێهێزیـی و پیرییتـان بـۆ دەڕەخسـێنێ، ﴿يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ﴾، خـوا ﷻ هەرچـی بیـەوێ دروسـتی دەکات، ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ﴾، خـوا زانـای توانایـە.

ئنجـا دوای ئـەوەی خـوا ﷻ سـەرنجی ڕاکێشـاین بۆ ئـەوەی لە کوێـوە هاتوویـن و، ئەو قۆناغانـەی پێیانـدا تێدەپەڕیـن؟ دەفەرمـوێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ﴾، ئـەو ڕۆژەش کـە کاتەکـە (**السَّـاعَة**) دێ، کـە لێـرەدا مەبەسـت پێـی قیامەتـە، ئـەو ڕۆژەی کاتـی هاتنـی قیامـەت و زینـدوو کرانـەوە دێ، ﴿يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ﴾، تاوانبـارەکان سـوێند دەخـۆن، دەڵێـن: تەنیـا سـەعاتێك ماوینـەوە، واتـە: لـە ژیانـی دنیـاداو بـە قۆناغـی بەرزەخیشـەوە، ﴿كَذَٰلِكَ كَانُوا۟ يُؤْفَكُونَ﴾، ئـاوا بـەو شـێوەیە کاتـی خۆشـیی لادەدران لـە هـەق، ئێسـتاش ئایـا بـە سـەهوو بـراون، ئـەو هەمـوو ژیانـی دنیایـەو، ئـەو قۆناغـی بەرزەخەیـان لـێ بۆتـە سـەعاتێك؟!

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ ﴾، بەڵام ئەوانەی زانیاریی و بڕوایان پێدراوە، گوتیان: ﴿ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ ﴾، بە پێی کتێبی خوا هەتا ڕۆژی زیندوو کرانەوە، ماونەوە، واتە: ماوەیەك لە ژیانی دنیادا، دواییش لە قۆناغی بەرزەخدا، ﴿ فَهَٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ ﴾، ئەمڕۆش ڕۆژی زیندوو کرانەوەیە، ﴿ وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام ئێوە نەتاندەزانی، یانی: نەتاندەزانی کە ئەمڕۆتان لە پێشە، بۆیە هیچ خۆتان بۆی ئامادە نەکردبوو.

﴿ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَعْذِرَتُهُمْ ﴾، لەو ڕۆژەدا ئەوانەی ستەمیان کردوە (بە هۆی شیرك و کوفرەوە، بە هۆی تاوان و سەرپێچیی و لادانەوە)، پۆزش هێنانەوەیان سوودیان پێ ناگەیەنێ، ﴿ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴾، داواشیان لێ ناکرێ گلەیی خوا لەسەر خۆیان لابەرن، یاخود: داواشیان لێ ناکرێ، خوا لە خۆیان ڕازیی بکەن، یاخود: داواشیان لێ ناکرێ داوای نەهێشتنی گلەیی خوا بکەن.

﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾، بە دڵنیایی لەم قورئانەدا، لە هەموو وێنەیەکمان بۆ خەڵکی هێناوەتەوە، واتە: لە هەموو وێنەیەك کە ئەوان پێویستیان پێی بێ بۆ ڕوون کردنەوەی ڕاستییەکان، لە قاڵبی وێنە هێنانەوەدا، کە مانا مەعنەوییەکان تەنیا عەقڵ تێیانەوە ڕادەمێنێ، بەڵام وەختێك دەخرێنە قاڵبی وێنەیەکەوە، بە هەستەوەرەکانیش و بە خەیاڵ و ئەندێشەش تێیان دەفکرن، ﴿ وَلَئِن جِئْتَهُم بِـَٔايَةٍ ﴾، ئەگەر نیشانەیەکیان بۆ بێنی، یاخود: ئایەتێکیان بۆ بێنی، ئایەتێکی زیاد، کە ئایەتەکان بۆت دادەبەزن، ﴿ لَّيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴾، بە جەختکردنەوە ئەوانەی بێبڕوان، دەڵێن: ئێوە تەنیا لەسەر ناهەقن (مُبْطِل) کەسێکە ملی پووچیی و ناهەقیی گرتوە، ﴿ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، ئاوا خوا ﷻ مۆر بەسەر دڵی ئەوانەوە دەنێ، کە نازانن، کەواتە: ئەوانە بڕوا بە وێنە هێنانەوەکانی قورئان دەکەن، کە زانا بن، بەڵام ئەوانەی نەزان بن، ئەوە مۆریان بەسەر

دڵـەوە دەنـرێ، ﴿فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ﴾، کەواتـە: تـۆ خۆڕاگـر بـە، مسـۆگەر بەڵێنـی خـوا ڕاسـتە، چەسـپاوە، ئـەو بەڵێنـەی خـوا کـە: ڕۆژی دوایـی دێ و سـزاو پاداشـت هەیـە، ﴿وَلَا يَسۡتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ﴾، بـا ئەوانـەی دڵنیانیـن (لـەو شـتانەی کـە بەڵگـەی دڵنیاکەریـان لەسـەرە، یـان دڵنیـا نیـن لـەو شـتانەی کـە جێـی دوو دڵیـی نیـن)، قسـەی ئەوانـە، ڕەفتـاری ئەوانـە، تـۆ نەلەخشـێنێ و، نەتجووڵێنـێ و، لـە شـوێنی خـۆت لات نـەدات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خۆ ناساندنی خوا ﷻ لە میانی دروستکردنی مرۆڤ لە بێهێزیی و، پاشان بەهێزو پێزکردنی و، دوایی گێڕانەوەی بۆ حاڵەتی بێهێزیی و پیریی:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ ﴿٥٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ﴾، خوا ﷻ ئەو کەسەیە ئێوەی لە بێهێزیی دروستکردوە، (مِّن ضَعْفٍ) خوێندراویشەتەوە: (مِنْ ضُعْفٍ)، ئنجا هەندێك لە زانایان دەڵێن: **(ضَعْف)** و **(ضُعْف)** یەك واتایان هەیە، هەندێکیش دەڵێن: **(ضَعْف)** بریتیە لە ناوو **(ضُعْف)** بریتیە لە چاوگ، یان بە پێچەوانەوە، ئنجا **(ضَعْف، ضُعْف: هُوَ اللِّينُ وَالوَهْنُ)**، بریتیە لە نەرمیی و بێهێزیی و بێتوانایی، کە دەفەرمووێ: (مِّن ضَعْفٍ) یان **(مِنْ ضُعْفٍ)**: **(مِنْ: إِبْتِدائِيَّةٌ أَي: مُبْتَدَأُ خَلْقِهِ مِنْ حَالَةِ ضُعْفٍ)**، **(مِنْ)** بۆ دەستپێکردنە، واتە: سەرەتای هاتن و دروستبوونی مرۆڤ، لە بێهێزییەوەیە، وەك لە سەرەتای تەفسیری سووڕەتی **(المؤمنون)**دا، باسێکی سەربەخۆمان لە بارەی دروستبوونی مرۆڤەوە کرد، کە لە کوێوە دێ و چۆن دروست دەبێ؟

٢)- ﴿ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ﴾، ئنجا خوا لە دوای بێهێزیی، هێزو پێزی ڕەخساندوە، کە بریتیە لەوەی مرۆڤ وردە وردە دەبێتە منداڵ و، دوایی دەبێتە هەرزەکارو، دوایی دەبێتە گەنج و، ئەویش بە چەند قۆناغێك، دوایی کامڵ دەبێ و بە هێزو تاقەت دەبێ، لە هەموو ڕوویێکەوە.

(**التَّنْكِيرُ فِي ضَعْفٍ وقُوَّة لِلنَّوْعِيَّةِ**)، وشەی (**ضَعْفٍ**) و (**قُوَّة**) هەردووکیان بە نەناسراو (**نَكِرَة**) هاتوون و، (أل)ی ناساندنیان لەسەر نیە، ئەوە بۆ جۆرە، واتە: لە بێهێزییەکی تایبەت و، دوایی هێزو پێزێکی تایبەت.

٣)- ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٖ ضَعۡفٗا وَشَيۡبَةٗۚ﴾، دوایی لە دوای هێزو پێزیش، جارێکی دیکە گێڕاونیەوە بۆ بێهێزیی و پیریی و بە ساڵدا چوون، هەڵبەتە لێرەش وشەی (**ضَعْفاً**) بە (**ضُعْفاً**)یش هاتوە، واتە: بێهێزیی و پیریی و بە ساڵدا چوون.

٤)- ﴿يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ﴾، خوا ﷻ هەرچی بیەوێ، دروستی دەکات.

٥)- ﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡقَدِيرُ﴾، هەر ئەو زانای توانایە.

# چوار كورته سەرنج

**١-** له تەفسیری سووڕەتی (**المؤمنون**)دا، باسی دروستكردنی مرۆڤ و قۆناغەكانی دروستكردنی مرۆڤمان كردوه به درێژیی و، وا باشه لەو بارەوه سەرنجی ئەوێ بدرێتەوه.

**٢-** له سێ سەد ملیۆن (٣٠٠،٠٠٠،٠٠٠) حەیمەن كه قەبارەی یەك سانتیمەتر سێجا (١سم٣) نابن به هەموویان، یەكێكیان دەبێته پێشەنگ لەگەڵ هێلكۆكه (**بُوَيْضَة**)ی ئافرەتدا یەك دەگرن، دوایی ئا ئەوەیه كه دەبێته مرۆڤ، كه پێی دەگوترێ: (**نُطْفَة مُلَقَّحَة**) نوتفەیەكی پیتێنراو، هەركات حەیمەنێك لەگەڵ هێلكۆڵەیەكدا یەكیگرت و ئەو حەیمەنه چووه نێو هێلكۆڵەوه، چونكه حەیمەنەكه زۆر زۆر بچووكتره له هێلكۆڵه، هێلكۆڵه به چاو دەبینرێ، بەڵام حەیمەن سێ سەد ملیۆن (٣٠٠،٠٠٠،٠٠٠)یان، ئنجا یەك سانتیمەتر سێجا (١سم٣) پێك دێنن و، زۆر زۆر بچووكه، ئنجا ئەگەر خوا ﷻ ئیزنی لەسەر بێ، ئەو زیندەوەره له منداڵدانی ئافرەت دا گەشه دەكات و دەبێته مرۆڤ.

**٣-** هێلكۆڵه (**بُوَيْضَة**) بێ ئەوەی قەبارەی زیاد بكات، پاش پیتێنرانی بۆ ده هەزار (١٠،٠٠٠) بەش دابەش دەبێ، واته: ئەو هێلكۆڵەیه دوای ئەوەی حەیمەن لەگەڵیدا یەك دەگرێ، دەپیتێنرێ و به بێ ئەوەی قەبارەكەی زیاد بكات، بۆ ده هەزار (١٠،٠٠٠) بەش دابەش دەبێ(١)، ئنجا ئەگەر له قەدەر ده هەزار بەشەكەش گەوره بێ، جێی نابێتەوه لەو شوێنەدا، پێش ئەوەی بچێته نێو منداڵدانەوه.

**٤-** ئێمه له مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد)دا، به درێژیی له بارەی جەستەی مرۆڤ و كۆئەندامەكانیەوه قسەمان كردوه، كه زیاتر له سەد (١٠٠) لاپەڕەمان بۆ تەرخان كردووەو، له سەرچاوه زانستییەكانەوه، زانیارییەكانمان هێناون، بۆیه دەگونجێ بۆ زانیاریی زیاتر له بارەی مرۆڤ و كۆئەندامەكانیەوه، سەرنجی ئەوێ بدرێ.

---

(١) تفسير النابلسي، ج٧، ص١٥٩.

## مەسەلەی دووەم:

**لە كاتی هاتنی ڕۆژی دواییدا، تاوانباران سوێند دەخۆن، كە تەنیا سەعاتێك لە دنیاو بەرزەخ دا ماونەوە، بەڵام بڕوادارانی زانا، بۆیان ڕاستدەكەنەوەو، لەو ڕۆژەشدا پۆزش و پەشێمانیی دادی كەس نادەن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُواْ غَيْرَ سَاعَةٍ كَذَٰلِكَ كَانُواْ يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ فَهَٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٥٦﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

**١)-** ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ﴾، ئەو ڕۆژە كە (السَّاعَة)، هەڵدەستێ، (السَّاعَة)، یانی: كاتێك كە كارێكی دیارییكراوی تێدا ئەنجام دەدرێ، ئنجا دەگونجێ مەبەست پێی، ئەو كاتە بێ كە ئاخیر زەمانی تێدا دێ و، دەشگونجێ ئەو كاتە بێ كە قیامەت و هەڵسانەوەو زیندوو كرانەوەی تێدا دێ، بەڵام لێرەدا بە پێی سیاق دەزانین كە مەبەست پێی ئەو كاتەیە، كە قیامەتی تێدا دێ. ئنجا ئایا ئەو ڕۆژە، ئەو سەعاتەو كاتە دیارییكراوە دێ، كە قیامەتی تێدا دێ، چی دەقەومێ؟

**٢)-** ﴿يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُواْ غَيْرَ سَاعَةٍ﴾، لەو ڕۆژەدا: تاوانبارەكان سوێند دەخۆن كە لە سەعاتێك زیاتر نەماونەوە.

لە كوێدا؟ ئایا لە دنیادا، یان لە قۆناغی بەرزەخدا، یان لە دوای فووی یەكەم، كە دنیا تێكچووە؟ هەرسێكیان دەگرێتەوەو، دەشگونجێ هەرسێكیان پێكەوە مەبەست بن، ئەوان پێیان وایە، هەم مانەوەیان لە ژیانی دنیادا، هەم لە قۆناغی بەرزەخدا، هەم لە دوای فووی یەكەم، كە ئاخیر زەمانی بەدوادا

هاتوە، هەمووی لەبەر چاوی ئەواندا دەبێتەوە بە سەعاتێك، لە چاو ئەو كاتە نەبڕاوەو نەپساوەیەی ڕۆژی دوایی.

٣)- ﴿ كَذَٰلِكَ كَانُواْ يُؤْفَكُونَ ﴾، هەر بەو شێوەیەش كاتی خۆی لادەدران (لە هەق)، واتە: ئاوا بەو شێوەیە كە گوێ بۆ وەحیی ناگرن، هەر بە مەزەنەو خەیاڵی خۆیان بیر دەكەنەوەو قسە دەكەن، كاتی خۆشی هەر وایان دەكرد لە دنیادا، كە لادەدران.

٤)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ ﴾، بەڵام ئەوانەی كە زانیاریی و بڕوایان پێدراوە، گوتیان: بەدڵنیایی لە كتێبی خوادا -بە پێی كتێبی خوا- تاكو ڕۆژی زیندووكرانەوە ماونەوە.

٥)- ﴿ فَهَٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ ﴾، ئەمڕۆش ڕۆژی زیندوو كرانەوەو هەڵسێنرانەوەیە.

٦)- ﴿ وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام ئێوە نەتاندەزانی، واتە: ئێوە گرنگییتان بەو زانیارییە نەدەدا، ئەو ڕاستییانەتان بۆ ڕوون بكاتەوە، كە ژیان تەنیا ژیانی دنیا نیە، بەڵكو قۆناغی بەرزەخیش هەیە، دوایی فووی یەكەمی كەڕەناش هەیە، دوایی قیامەت و هەڵسانەوەو زیندوو كرانەوەش هەیە.

با لێرەدا ئاماژە بە شتێك بكەین كە (**الشعراوي**) لە تەفسیرەكەی خۆیدا بە ناوی: (**خواطِرُ الشعراوي**)[1]، هێناویەتی، دەڵێ: كاتی خۆی مامۆستایەك دەرسی ڕەوانبێژیی (**بلاغة**)ی پێ دەگوتین: مامۆستایەكە، گوتی: لە هەموو قورئاندا (**جِناس**) ئەگەر هاتبێ (**الجِناسُ النَّاقِص**)ی پێدەگوترێ، تەنیا لەم ئایەتەدا (**الجِناسُ التَّام**)ە، كە دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُواْ غَيْرَ سَاعَةٍ ﴾، كە ئەو (**ساعَة**)ی یەكەم، واتە: قیامەت، (**ساعَة**)ی دووەمیش واتە: كاتێكی كەم، ئەوە (**الجِناسُ التَّام**)ی پێدەڵێن، ئەوانی دیكە كە هاتبن لە قورئاندا (**الجِناسُ النَّاقِص**)یان پێدەگوترێ لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە[2]، یەكێك لە قوتابییەكان گوتی:

---

(١) ج١٨، ص ١١٥٤٠.

(٢) بۆ وێنە: (همزة لمزة) (جناس)ی ناتەواو (ناقص)ە چونكە: (همزة) و (لمزة) پیتەكانیان

مامۆستا! حەزناکەم بگوترێ: هیچ شتێکی (**ناقص**) لە قورئاندا هەیە! (هەڵبەتە ئەوە بەس زاراوەیەکی ڕەوانبێژییە)، مامۆستایەکەش پێکەنیی و گوتی: ئاخر ڕەوانبێژان وا دەڵێن، ناڵێن: قورئان (**ناقِص**)ە، دەڵێن: لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە، ئەو جۆرە بێژەیە وای پێدەگوترێ! دواتر مامۆستایەکە ڕووی لە من کردو گوتی: تۆ چی دەڵێی؟ منیش گوتم: من وام پێ چاکە بگوترێ: (**جِناس کلّ**) و (**جِناس بعض**) یانی: ئەوە کە ئەو دوو وشەیە هەموو پیتەکانیان وەك یەك بن وەك (**السَّاعة**) و (**الساعة**)، یان تەنیا بەشێکیان وەك یەك بن، وەك (**همزة**) و (**لمزة**).

هەڵبەتە ئەوە کە لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە زانایان ئەو زاراوەیەیان بەکارهێناوە، مانای وانیە کە (**جِناس النَّاقِص**) شتێکی خراپ بێ، نا! قورئان شیعر نیە، بەڵام دەبینین (**سَجْع**)ی تێدا ڕەچاو کراوە، جاری وا هەیە کێش و سەروا (**وزن وقافية**)ی تێدا ڕەچاو کراوە، بەڵام بە تەواویی ڕەچاو نەکراون، ئەگەرنا دەبوو بە شیعر، ئنجا ئەو کاتە کە ببووایە بە شیعر، ئەوە نوقسانیی بوو بۆ قورئان، ئێستا کە سەرجەم پێکهێنەرەکانی شیعری تێدا نین، ئنجا ئەوە شەرەف و گەورەییە بۆ قورئان.

مەسەلەی (**جِناس**)یش کە دوو جۆرەو پێیان دەگوترێ: (**جِناس**)ی، تەواو (**تامّ**)و ناتەواو (**ناقِص**)، ئەوە زاراوەیەکی ڕەوانبێژییەو، مانای وا نیە کە قورئان ناتەواویی تێدا هەیە، ئەگەر یەکێك بڵێ: لە هەموو قورئاندا شیعرێکی تێدانیە، بەڵێ ڕاستە، چونکە قورئان شیعر نیەو فەرمایشتی بێ وێنەی خوایە، وەك شیعر دەچێ و شیعر نیە، وەك پەخشان دەچێ و پەخشان نیە، وەك وتار دەچێ و وتار نیە، بەڵکو فەرمایشتی خوایەو، لە ڕاستییدا وەك هیچ کام لەو جۆرە قسانە نیە، کە مرۆڤەکان کردوویانن لە شیعرو لە پەخشان و چی و چی.

٧)- ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَعْذِرَتُهُمْ﴾، لەو ڕۆژەدا ئەوانەی ستەمیان کردوە، پۆزش هێنانەوەو بیانوو هێنانەوەیان سوودیان پێ ناگەیەنێ، (**مَعْذِرَة: اسمُ مَصْدَرِ اعْتَذَرَ،**

---

هێندەی یەکن و وەك یەکیشن، جگە لە پیتی یەکەم کە یەکیان (هـ) و ئەوی دیکە (ل)ە، هەڵبەتە دەبێ ئەو دوو وشەیەی جیناسیان هەیە، ماناکانیان جیاوازبن.

أَي: إذا أَبْدى عِلَّةً أَوْ حُجَّةً لِيَدْفَعَ عَنْ نَفْسِهِ مُؤاخَذَةً عَلى ذَنْبٍ أَو تَقْصِير)، (مَعْذِرَة) چاوگی (اعْتَذَرَ)یە، ئەویش بریتیە لەوەی کەسێك هۆکارێك، یان بەڵگەیەك بخاتە ڕوو بۆ ئەوەی سزادران لە خۆی دوور بخاتەوە، بەهۆی گوناهێك یان کەمتەرخەمییەکەوە.

٨)- ﴿ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴾، هەروەها ئەوان داوای داوای لێبوردنکردنیان لێناکرێ، زانایان زۆر لەبارەی ئەم ڕستەیەوە قسەیان کردوەو، چەند واتایەکی هەن:

١- هەروەها لەو ڕۆژەدا داوایان لێ ناکرێ کە داوای لێبوردن لە خوا بکەن و، سزاو گلەیی خوا لەسەر خۆیان لابەرن.

٢- (لا يَطْلُبُونَ رَفْع العِتابِ عَنْهُم)، داوا ناکەن کە لۆمەیان لەسەر لابچێ.

٣- (لا يَجْرُؤُ شَفِيعٌ أَنْ يَقُولَ لَهُمْ: اسْتَعْتِبُوا رَبَّكُمْ وَاسْئَلُوهُ أَنْ يُعْتِبَكُم أَي: يُزِيلَ العِتَابَ عَنْكُم)، واتە: هیچ تکاکارێك ناوێرێ پێیان بڵێ: داوا لە پەروەردگارتان بکەن کە عیتاب و گلەیی خۆی لەسەر ئێوە لابەرێ، یانی: داوایان لێناکرێ داوا لە پەروەردگار بکەن، گلەییان لەسەر لابەرێ.

٤- (لا يَطْلُبُ مِنْهُم الإِعْتابُ، وَهُوَ إِزالَةُ العَتْبِ يعْني: التَّوْبَةُ الَّتِي تُزِيلُ آثَارَ الجَرِيمَةِ لا تُطْلَبُ مِنْهُمْ لأَنَّها لا تُقْبَلُ مِنْهُم)، داوای (إِعْتاب)یان لێناکرێ کە بریتیە لە لابردنی گلەیی، واتە: پەشێمان بوونەوەو گەڕانەوەیەك کە شوێنەواری تاوانەکە لادەبات، ئەوەیان لێ داوا ناکرێ، چونکە لەو ڕۆژەدا تۆبەو گەڕانەوە قبووڵ ناکرێ.

٥- (أَي: لا يُطْلَبُ مِنْهُمْ أَنْ يُزِيلُوا العِتَابَ عَنْ أَنْفُسِهِم)، واتە: داوایان لێناکرێ، لۆمە لەسەر خۆیان لابەرن.

شایانی باسە: ئەم ڕستەیە بە بکەر نادیار (**مجهول الفاعل**) لە سێ شوێن دا هاتوە لە قورئان:

أ- لە سوورەتی (**النحل**)دا هاتوە: ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا ثُمَّ لَا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾.

**ب-** لە سوورەتی (**الجاثية**)دا، دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ ٱتَّخَذْتُمْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٣٥﴾﴾.

**ج-** هەروەها لێرەش لە سوورەتی (**الروم**)دا، دەفەرموێ: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾﴾.

هەروەها یەکجاریش بە بکەر دیار (**مَعلوم الفاعل**) هاتووە: ﴿فَإِن يَصْبِرُوا۟ فَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ۖ وَإِن يَسْتَعْتِبُوا۟ فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾﴾**فصلت**، واتە: ئەگەر داوای لابردنی عیتاب بکەن، ئەوان لەو کەسانە نابن کە عیتاب و لۆمەیان لەسەر لادەچێ، یان لەوانە نابن کە ڕێگایان بدرێ عیتاب و لۆمە لەسەر خۆیان لابەرن، بە هۆی تۆبە کردنەوە، چونکە لە قیامەتدا تۆبە کردن نیە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**باسی وێنە هێنانەوەی زۆر بۆ خەڵكی و، تۆمەتباركردنی بەردەوامی كافرەكان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، بە هۆی مۆر بەسەر دڵەوە نرانیانەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ وَلَئِن جِئْتَهُم بِـَٔايَةٍ لَّيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾، بە دڵنیایی لەم قورئانەدا، لە هەموو وێنەیەكمان بۆ خەڵكی هێناوەتەوە، **(الضَّرْبُ: الوَضْعُ وَالإِلْصَاقُ، وَاسْتُعِيرَ هُنَا لِلذِّكْرِ وَالتَّبْيِين)**، (ضَرْب) بە مانای دانانی شتێك و بە مانای لكاندنی شتێك بە شتێكەوەیە، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ باسكردن و ڕوون كردنەوە، واتە: هەموو وێنەیەكمان بۆ خەڵكی ڕوونكردۆتەوە.

﴿ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾، لە هەموو وێنەیەك، یانی: **(مِنْ كُلِّ مَثَلٍ مِمَّا يَحْتاجُهُ البَشَرُ لِفَهْمِ الحَقائِقِ بِضَرْبِ الأَمْثال)**، لە هەر وێنەیەك كە مرۆڤ پێویستیی پێی هەیە، بۆ تێگەیشتن لە ڕاستییەكان بە هۆی وێنە هێنانەوەوە، ئەگەرنا وێنە زۆرن، نەهێنراونەوە، دوایی پێغەمبەر ﷺ وێنەی هێناونەوە كە لە قورئاندا نەهاتوون، دوایی زانایانی دیكە بەردەوام وێنە دێننەوە، عاقڵمەندەكان وێنە دێننەوە بۆ خەڵك بۆ تێگەیاندنیان، كەواتە: هەرچی وێنەیە لە قورئان دا نەهاتوە، بەڵكو هەرچی وێنەیەك كە بۆ ڕوونكردنەوەی ئەو ڕاستییانە كە قورئان دەیانخاتە ڕوو و مرۆڤ پێویستیی پێیانە، لەو وێنانە هەموویان هاتۆتەوە.

٢)- ﴿ وَلَئِن جِئْتَهُم بِـَٔايَةٍ ﴾، ئەگەر تۆ نیشانەیەكیان بۆ بێنی، یاخود ئایەتێكی قورئانیان بۆ بێنی، هەر ئایەتێكی تازەیان بۆ بێنی.

٣)- ﴿لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا مُبۡطِلُونَ﴾، زۆر بە جەختکردنەوە ئەوانەی بێبڕوان دەڵێن، ئێوە تەنیا لەسەر ناهەقن، (**المُبْطِلُ: أَهْلُ البَاطِلِ عَكْسُ المُحِقِّ: وَهُوَ أَهْلُ الحَقِّ**)، (**مُبْطِل**) کەسێکە کە خاوەنی باتیڵ و ناهەقیی بێ، پێچەوانەی (**مُحِق**) یانی: خاوەن هەق.

٤)- ﴿كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، هەر ئاوا، بەو شێوەیە خوا ﷻ مۆر بەسەر دڵی ئەوانەوە دەنێ کە نازانن، (**الطَّبْعُ عَلى القَلْبِ: تَصيِيرُهُ غَيْرَ قابِلٍ لِفَهمِ الأُمُورِ الدِّينِيَّة**)، مۆر بەسەر دڵەوەنران، یانی: ئەو دڵەو ئەو عەقڵە وای لێ بکرێ، لە کاروباری ئایینی تێنەگات، لە فەرمایشتی خوا تێنەگات.

لێرەدا خوا ﷻ بە دوو سیفەتان ئەوانەی وەسف کردوە:

١- ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون.

٢- ﴿ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، ئەوانەی نازانن.

ئەوانەی بێبڕوان و، نەزانن، لە ڕاستییدا نەزانییەکەیان بۆتە هۆی بێبڕواییان و، بێبڕواییەکەشیان بۆتە هۆی عینادیی و کەللەڕەقیی و، بەهرەمەند نەبوونیان لە ئایەتەکانی خواو لە وێنە هێنانەوەکانی خواو، لەو موعجیزەو نیشانەو بەڵگانە، کە خوا ﷻ بە پێغەمبەری خۆیدا ﷺ ناردوونی.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**فەرمانکردن بە پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆڕاگریی و نەلەخشان، بە هۆی قسەو ڕەفتاری نەفامانەی بێبڕوایانەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ وَلَا يَسۡتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ٦٠ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

**١)-** ﴿ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ ﴾، دەجا خۆڕاگر بە (ئەی موحەممەد!)، مادام حاڵ بەو شێوەیەیە، دامەزراوو نەلەخشاو بە، بە دڵنیایی بەڵێنی خوا ڕاستە، چەسپاوە.

ئایا بەڵێنی خوا، مەبەست پێی چیە؟

**أ-** دەگونجێ مەبەست هاتنی قیامەت بێ.

**ب-** دەگونجێ مەبەست بەڵێنی هاتنی یارمەتیی خوا ﷻ بێ بۆ پێغەمبەر ﷺ.

**جـ-** دەگونجێ مەبەست بەڵێنی تۆڵە ستاندنەوەی خوا بێ، لە دوژمنانی، ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە.

**٢)-** ﴿ وَلَا يَسۡتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴾، با ئەوانەی دڵنیا نین، تۆ نەلەخشێنن، واتە: بە قسەو ڕەفتاریان، تۆ لە حاڵەتی ویقاریی و سەنگینیی و سەقامگیریی خۆت لانەدەن، بتجووڵێنن و بتلەخشێنن.

پێشتر گوتمان: (**الإسْتِخْفافُ: مُبالَغَةٌ في جَعْلِ الشَّيء خَفِيفاً**)، (**إسْتِخْفاف**) واتە: شتێك سووك بكەی و، بێ كێشی بكەی، (**والخِفَّةُ مُسْتَعارَةٌ لِحالَةِ الجَزْعِ وَظُهُورِ آثارِ الغَضَبِ**)، (**خِفَّة**): سووكیی، خوازراوەتەوە بۆ حاڵەتی هەڵپەیی و دەركەوتنی شوێنەواری تووڕەیی، واتە: با تۆ نەلەخشێنێ و شلوێت نەكات.

لە (**مصنف ابن أبي شيبة**)یدا[1] هاتووە کە جارێك عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب (خوا لێی ڕازی بێ) پێش نوێژیی دەکات و، قورئان دەخوێنێ، یەکێك لە خەواریج ئەو ئایەتە دەخوێنێتەوە: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ ﴿٦٥﴾﴾ **الزمر**، واتە: ئەگەر تۆ هاوبەش بۆ خوا دابنێی، کردەوەکەت هەڵدەوەشێتەوە، کە دیارە خەواریج عەلییان بە ئەهلی کوفرو شیرك داناوە، عەلییش (خوا لێی ڕازی بێ) یەکسەر ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە: ﴿ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ ۖ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴾، خۆڕاگر بە بەڵێنی خوا ڕاستە، با ئەوانەی دڵنیا نین و دڵ دامەزراو نین، تۆ نەلەخشێنن و شلوێت نەکەن.

خوشکان و برایانی بەڕێز!

مرۆڤ بە ئەندازەی ئەوە کە لە خوا ﷻ نیزیك دەبێ، بە فەرمایشتەکەشی ئاشنا دەبێ، بەڵێ بە ئەندازەی ئەوە کە خوای پەروەردگاری زیاتر خۆش دەوێ و، لە لای بەرزترو مەزنترو گەورەتر دەبێ، هەروەها خوا لە لای بەڕێزتر دەبێ و لە لای سام لێکراوتر دەبێ و، بۆی ملکەچتر دەبێ: بە تەئکید لە فەرمایشتەکەشی نیزیکتر دەبێ وباشتر لێی حاڵیی دەبێ.

ئنجا خوا ﷻ بە لوتف و کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ و، هاوکارو یارمەتییدەرمان بێ، کە هەرچی زیاتر لێی نیزیك بین، بۆ ئەوەی لە فەرمایشتەکەشی بەهرەمەندتر بین، خوا یارمەتییمان بدات، بە هۆی شوێن پێ هەڵگرتنی موو بە مووی پێغەمبەرەوە ﷺو بە دواکەوتنی ڕێبازەکەیەوە، هەرچی زیاتر بزانین قورئان بۆچی هاتووەو، پێویستە چۆن لە قورئان تێبگەین و، چۆن کاری پێ بکەین و، چۆن لێی بەهرەمەند بین، لە ڕووی ژیانی تاکییمان و، ژیانی خێزانییمان و، ژیانی کۆمەڵایەتییمان و، ژیانی سیاسییمانەوە؟!

---

(١) ٣٩٠٤٦، وأيضا أخرجه إبن الجعد: ٢٣٧١، والبغوي في شرح السنة باب: تحريم الكلام في الصلاة.

ئـەم قورئانـە بـە تەئكیـد كەتەلـۆك و بەرنامـەی ژیانـە، هیدایەتـی تاكـەو، بەرنامەیـە بـۆ كۆمەڵـگا، وەك خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ﴿٢٨﴾ ﴾**الفتـح**، واتـە: خـوا ﷻ پێغەمبـەری خـۆی نـاردوە بـە ڕێنماییـەوەو، بـە ئاییـن و بەرنامەیەكـی هـەق و ڕاستیشـەوە، ڕێنماییـە بـۆ تـاك، بەرنامەیـە بـۆ كۆمەڵـگا.

خـوا ﷻ یارمەتییمـان بـدات، هـەم قورئـان وەك هیدایـەت لـە زاتـی خۆمانـدا بەرجەسـتە بكەیـن و، وەری بگریـن و، هـەم قورئانیـش لـە ژیانـی كۆمەڵـگای خۆمانـدا پیـادە بكەیـن، بەرجەسـتەی بكەیـن، واتـە: هـەم هیدایەتەكـەی كـە خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەری خاتەمـدا ﷺ ناردوویەتـی، هـەم دینـە هەقەكـە كـە هەردووكیـان لـە قورئانـدا هـەن و، پێغەمبـەری خـواش ﷺ لـە ڕێبـازی خۆیـدا، قورئانـی بەرجەسـتەو پراكتیـزە كـردوە، خـوا یارمەتییمـان بـدات: ئـەو ڕێنماییـە ڕاسـتەو ئـەو دینـە هەقە، لە ژیانـی تاكیـی و كۆمەڵیـی خۆمانـدا بچەسـپێنین، بـۆ ئەوەی هەم لـە دنیادا سـەربەرزو سـەرفرازو بەختـەوەر بیـن، هـەم لـە دواڕۆژیشـدا ڕوو سـوورو سـەربەرز بیـن، كاتێـك دەچینـەوە خزمـەت خـوای پـەروەردگارو، دەچینـەوە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا ﷺ.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ کە ڕۆژی (١٠)ی مانگی (**ذي القعدة**) ساڵی (١٤٤٠)ی کۆچیی، بەرانبەر: (١٣)ی تەمووزی (٢٠١٩)ی زایینییە، خوا ﷻ پشتیوان بێ دەست دەکەین، بە تەفسیر کردنی سوورەتی (**لقمان**)، وەك عادەتی خۆمان سەرەتا دێینە سەر پێناسەو خستنە ڕووی نێوەڕۆکی سوورەتی (**لقمان**)، لە حەوت (٧) بڕگەدا:

## پێناسەی سوورەتی (لقمان) و بابەتەکانی

### ١)- ناوی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە ناوی سوورەتی (**لقمان**)ە، تەنیا ئەو ناوەی هەیەو، ناوی (**لقمان**)یش تەنیا جارێك لە قورئاندا هاتووەو، ئەویش لەم سوورەتە موبارەکەدا.

### ٢)-ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنەخواردا:

ئەم سوورەتە لە ڕیزبەندیی دابەزیندا، ژمارەکەی پەنجاو حەوت (٥٧)ە، واتە: (٥٦) سوورەت لە پێش ئەم سوورەتە موبارەکەدا دابەزیون، پێش سوورەتی (**سبأ**) و دوای (**الصافات**) دابەزیوەو، لە موصحەفیشدا، ژمارەکەی سی و یەکە (٣١)ە.

### ٣)-شوێنی دابەزینی:

ئەم سوورەتە هەمووی مەککەییە، واتە: هەمووی لە شاری مەککەو لە قۆناغی مەککەدا دابەزیوە، پێش کۆچی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بۆ شاری (**یثرب**)، کە دواتر ناوی لێنرا مەدینە، هەرچەندە هەندێك لە زانایان دوو، یاخود

سێ ئایەتی لێ هەڵداوێرن، لەبەر ئەوەی باسی نوێژو زەکاتیان تێدا هاتوە، بەڵام ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر مەدینەیی بوونی ئەو دوو، یان سێ ئایەتە، چونکە نوێژو زەکات بە گشتیی هەر لە سەرەتاوە هەبوون، دوایی پێنج فەرزەی نوێژو، ئەندازەو شێوەی زەکاتدان، بە کێ بدرێ و چۆن بدرێ و.... هتد، دیارییکراون، لە قۆناغی مەدینەدا، بەڵام هەر لەقۆناغی مەککەشدا، ماڵ بەخشین و زەکاتدان بە ڕەهایی بووە، لەو بارەوەش ئەم دەقە هەیە: **(عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أُنْزِلَتْ سُورَة لُقْمَان بمَكَّةَ)**[1]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، گوتوویەتی: سووڕەتی لوقمان لە مەککە دابەزێنراوە.

## ٤)- ژمارەی ئایەتەكانی:

ئایەتەكانی ئەم سووڕەتە (٣٣) یان (٣٤)ن، زیاتریش ژمارەی (٣٤) تەبەنیی كراوەو كاری پێكراوە، پێشتریش باسمانكردوە: كە ژمارەی ئایەتەكان و، ڕاجیایی زانایان لە ژمارەی ئایەتەكاندا، ناگەڕێتەوە بۆ كەم و زیادیی لە قورئاندا، یەكێكیان بڵێ: ئەو ئایەتە زیادەو، یەكیان بڵێ: ئەو ئایەتە كەمە، نا، بەڵكو دەگەڕێتەوە بۆ كورتیی و درێژیی ڕستەكان، پێشتر قسەمان لێكردوەو دووبارەی ناكەینەوە.

## ٥)- نێوەڕۆكی:

ئەمیش هەمان نێوەڕۆكی سووڕەتە مەككەییەكانی هەیە، باسی خواناسیی و خواپەرستیی و نیشانەو بەڵگەكانی خوا ﷻ، هەروەها چاكەو نیعمەتەكانی لە ژیانی مرۆڤدا، پاشان ڕۆژی دوایی و، سزاو پاداشت (بە هەشت و دۆزەخ)و، باسی قورئان و پەیامی خوا ﷻ و، هەڵوێستی نەرێنییانەی بێبڕوایان لە بەرانبەرخوا ﷻ

---

(١ (الدار المنثور (٥٠٣/٦) للسيوطي ونسبه لابن ابن مردويه، والبيهقي في (الدلائل)، وينظر: الإستيعاب في بيان الأسباب، ج٣، ص٥٩.

و نیشانەکانی و دیداریدا، باسی ڕەوشت و خەسڵەتە بەرزەکانی بڕواداران و، خەسڵەتە خراپەکانی بێبڕوایان.

## ٦)- تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە:

دەگونجێ کۆمەڵێك تایبەتمەندیی تێدا ڕەچاو بکرێن، کە ئێمە پێنجیانمان هێناون:

١- باسی کڕینی قسەی خافڵێنەر، تەنیا لەم سووڕەتەدا ئەو مەسەلەیە هاتوە، کە پیشەی نەیارانی قورئان و ئیسلامە، ئەمە لە ئایەتی ژمارە شەشدا خراوەتەڕوو.

٢- بەسەرهاتی لوقمان و ئامۆژگارییکردنی بۆ کوڕەکەی، ئەویش تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە.

٣- باسی ئەوە کە هەرچی درەختی زەویی هەیە، بکرێنە قەڵەم (پێنووس)، ئاوی دەریاش هەمووی بکرێتە مەرەکەب و حەوت هێندەی دیکەشی بخرێتەسەرو، هەموو وشەکانی خوایان، هەموو پێ نانووسرێن، چونکە وشەکانی خوا بێ کۆتایین، بەڵام هەرچۆن بێت ئاوی دەریاکان کۆتایی دێ، ئەمەش تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە، دیارە لە سووڕەتی (**الكهف**)یشدا، شتێك باسکراوە، بەڵام نە باسی حەوت هێندە دەکات، حەوت هێندەی دیکە دەریای بخرێنە پاڵ و، نە باسی درەختکران بە قەڵەمیش دەکات، بەڵکو هەر دەفەرموێ: ﴿قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّى وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾﴾ **الكهف**.

لەوێدا دەفەرموێ: بڵێ: ئەگەر ئاوی دەریا هەمووی مەرەکەب بێت بۆ نووسینی وشەکانی پەروەردگارم، ئاوەکە تەواو دەبێت، بەرلەوەی وشەکانی پەروەردگار تەواو بن، ئەگەر وێنەی خۆشی بخرێتە گەڵ.

لەوێدا بەس باسی وێنەی خۆی دەکات، واتە: ئاوی دەریاکانی زەوی چەندە، هێندەی دیکەشی بخرێتە گەڵ، بەڵام لێرەدا باسی حەوت هێندەی دیکەو، پاشان باسی بەقەڵمکرانی درەختەکانی زەوییش دەکات.

٤- باسی ئەوە کە دروستکردن و زیندوو کردنەوەی تێکڕای مرۆڤان، وەك هی یەك کەس وایە بۆ خوا، کە ئەویش تەنیا لەم سووڕەتەدا، لە ئایەتی ژمارە (٢٨)دا، هاتوە.

٥ - باسی ئەوە کە: أ- خوا زانیاریی ئاخیر زەمان و، ب- توانای باراندنی باران و، ج- نهێنیی نێو منداڵدان و، د- کردەوەکانی مرۆڤ و، هـ- شوێنی مردنی، تەنیا لەلای خوایە، ئەویش تەنیا لێرەدا هاتوە، لە ئایەتی کۆتایی و ژمارە (٣٤)ی ئەم سووڕەتە موبارەکەدا.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــــــزان!

ئـەم دەرسـە یـازدە (١١) ئایەتـی سـەرەتای سـووڕەتی (**لقـمان**) دەگرێتـە خـۆی و، دەتوانیـن بڵێیـن: پێنـج بابەتـی سـەرەکیی بـاس دەکات:

١- پێناسەکردنی قورئان و بە ڕێنمایی و بەزەیی بۆ چاکەکاران لە قەڵەم درانی و، وەسفی چاکەکاران بە پێنج لە سیفەتە بنەڕەتییەکانیان.

٢- باسی جۆرە نەیارێکی قورئان، کە قسەی پووچ دەکڕێ، بۆ لە ڕێی خوا لادانی خەڵك و، خستنە ڕووی چەند سیفەت و کردەوەیەکی خراپی ئەو کەسە.

٣- باسی سەرەنجامی خێری بڕوادارانی کردەوە باش، کە بریتیە لە بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەی خوا، بەهەشتی پڕ نازو نیعمەتی خوا.

٤- باسی دروستکردنی خوا بۆ ئاسمانەکان، بەبێ کۆڵەکەکان ڕاگرتنی ئاسمانەکان و، چەسپاندنی چیایەکان لە زەوییدا، بۆ لەنگەرگرتنی و نەجووڵانی و، تێدا بڵاوکردنەوەی [واتە:لە زەوییدا] ژیانداران و، دابەزاندنی ئاو لە سەرێوەو، ڕوواندنی ڕووەکە بەرهەمدارو چاکەکان.

٥- تەحەدداکردنی[1] موشریکەکان، کە ئایا پەرستراوە ساختەکانیان، چ شتێکی وەك هی خوایان ﷻ دروستکردوە؟.

---

(١) التحدِّي: طَلَبُ النِّزال: داواکردنی هاتنەمەیدان.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾ هُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣﴾ ٱلَّذِينَ
يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ
وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٥﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ
ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ
مُسۡتَكۡبِرٗا كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا كَأَنَّ فِيٓ أُذُنَيۡهِ وَقۡرٗاۖ فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ
﴿٩﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ وَبَثَّ فِيهَا مِن
كُلِّ دَآبَّةٖۚ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ
فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿١١﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

[بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. ئەلیف لام میم ﴿١﴾ ئەوانە ئایەتەکانی کتێبێکی کارزانن ﴿٢﴾ ڕێنمایی و بەزەییە بۆ چاکەکاران ﴿٣﴾ ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن و زەکات دەدەن و، تەنیا ئەوانن بڕوای پتەویان بە مەنزڵگای کۆتایی هەیە ﴿٤﴾ ئەوانە لەسەر ڕێنماییەکن لە پەروەردگاریانەوەو، هەر ئەوانە سەرفرازن ﴿٥﴾ لە خەڵکیش بابای وا هەیە قسەی پووچ و خافڵێنەر دەکڕێ، تاکو بەبێ زانیاریی (خەڵك) پێی لە ڕێی خوا لابدات و (ڕێی خوا) بە گاڵتە پێکراو بگرێ، ئەوانە سزاو ئازارێکی ڕیسواکەریان هەیە ﴿٦﴾ کاتێکیش ئایەتەکانمانی بەسەردا بخوێنرێنەوە، خۆ بەزلگرانە پشت هەڵدەکات وەك هەر نەیبیستبن، وەك گوێیەکانی قورساییان تێدابێ، بۆیە موژدەی ئازارێکی بە ئێش و ژانی پێبدە

﴿٧﴾ بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکان دەکەن، بەهەشتە پڕ نازو نیعمەتەکانیان هەن (لە ڕۆژی دواییدا) ﴿٨﴾ تێیاندا هەمیشەیی دەبن (ئەوە) بەڵێنی خوایە، ڕاستەو، ئەو زاڵی کاربەجێیە ﴿٩﴾ (خوا) ئاسمانەکانی دروستکردوون بەو کۆڵەکانە کە نایانبینن (ڕایگرتوون) و (چیایە) چەسپاوەکانیشی فڕێداونە نێو زەوییەوە، تاکو نەتانجووڵێنێ و لەنگەر گرتووبێ و، هەموو جۆرە ژیانداریێکیشی تێدا (لە زەوییدا) بڵاوکردۆتەوەو، لەسەرەوەش ئاوێکی (بە پێز) مان دابەزاندوە کە لە هەر جۆرە جووتێك (ڕووەكێك)ی باش و بەرهەمدارمان پێ ڕواندوە ﴿١٠﴾ ئەمە (کە باسکرا) دروستکراوی خوایە (کە بانگدەکرێن بۆ پەرستنی)، دەجا پێشانم بدەن، ئەوانی دیکەی جیا لەوی (لە پەرستراوە ساختەکان) چییان دروستکردوە؟ بەڵکو (ڕاستییەکەی ئەوەیە کە) ستەمکاران (ێك کە جگە لە خوا دەپەرستن) لە گومڕاییەکی ئاشکرادان ﴿١١﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ): قسەی خافڵێنەر، (**اللَّهو: مَا يَشْغَلُ الإنْسَانَ عَمَّا يَعْنِيهِ، وَيُهِمُّهُ، وَيُعَبَّرُ باللَّهْوِ عَنْ كُلِّ مَا يُسْتَمْتَعُ بِهِ**)، (**لَهو**): هەر شتێکە کە مرۆڤ لەوەی کە پێویستە گرنگیی پێبداو، بەلایەوە بایەخدارە، بێ ئاگای بکات و بیخافڵێنێ، وشەی (**لَهو**) تەعبیری پێدەکرێ لە هەر شتێك کە بەهرەی پێ وەربگیرێ، جۆرێك لەززەتی لێ وەربگیرێ.

(هُزُوًا): واتە: گاڵتەپێکراو، (**الهُزْءُ: مَزْحٌ فِي خِفْيَةٍ**)، وشەی: (**هُزْء**): بریتییە لە گاڵتە پێکردنێکی پەنهان، (**هُزْوَاً**) چاوگە، یانی: (**مَهْزُواً بِهِ**)، گەڵتە پێکراو.

(مُّهِينٌ): واتە: ڕیسواکەرو زەبوونکەر، (**هَانَ الأَمْرُ سَهُلَ، مُهِين أي: مُذِلّ**)، (**هَانَ الأَمْرُ**)، واتە: کارەکە ئاسان بوو،(**مُهِين**) یانی: ڕیسواکەر (**وَالهَوَانُ عَلَى وَجْهَينِ:**

أ- تَذَلُّلُ الإِنسَانِ فِي نَفسِهِ، لِمَا لايُلْحِقُ بِهِ غَضَاضَةً، فَيُمْدَحُ.

ب- أَنْ يَكُونَ مِنْ جِهَةِ مُتَسَلِّطٍ مُسْتَخِفٍّ بِهِ، فَيُذَمُّ بِهِ).

**واتە:** (هــوان) دوو جۆرە:

**یەکەم:** ئەوەیە: مرۆڤ ملکەچ بێ لە زاتی خۆیدا، بۆ شتێك کە نەبێتە هۆی کەمیی بۆی، کە ئەوە حاڵەتێکی باشە، یانی: میهرەبانیی و نەرم و نیانیی.

**دووەم:** ئەوەیە کە مرۆڤ زەبوون بێ بۆ لایەنێك کە بەسەریدا زاڵ بێ و، بە کەمی بگرێ، کە بە تەئکید ئەو کاتە ئەو (**هَوَان**)ە، مرۆڤی لەسەر سەرزەنشت دەکرێ و، بۆی دەبێتە عەیبە.

(وَقْرًا ): (**أَي: ثِقَـلاً، وَصَممَـاً**)، (**وَقـر**) هـەم بـە مانـای قورسایی هاتـوە، هـەم بـە مانـای کەڕییـش هاتـوە، (**عَمَـد وعُمُـد، جَمْـعُ عَمُـود: خَشَـبٌ تَعْتَمِـدُ عَلَيْـهِ الخَيْمَـة**)، وشـەی (**عُمُـد**) و (**عَمَـد**) هەردووکیـان کـۆی (**عَمُـود**)ن، کـە ئەویـش بریتیـە لـە تەختەیـەك، دارێـك کـە چـادر هەڵـدەدرێ پشـتی پـێ دەبەسـتێت و، وەك دینگەیـەك دەدرێتـە بـەری، بـە کوردیـی (ئەسـتوندەگ)ی پێدەڵێـن، وەك هێمـن لـە شـیعرێکیدا دەڵـێ:

شکا ئەستوندەگی تاوڵی مرادم.

بــەڵام ئەوانــەی لەملاولایانــەوە دیــارن، بەرچیخــن[1] و دەدرێنەبــەر قەراغــی چادرەکـە، بـۆ ئـەوەی ئەملاولاکەشـی بەرزبـن و، بگونجـێ هامۆشـۆی تێـدا بکـرێ.

(رَوَاسِيَ ): کـۆی (**رَاسِي**)یە، یانـی: چەسپاوەکان، دەڵـێ: (**رَسَـى الشَّـيءُ يَرْسُـو رَسَّـاً: ثَبَـتَ وَأَرْسَـاهُ غَيْـرُهُ، وَرَواسِـيَ شـامِخاتٍ:جِبالٍ ثابِتـات**)، (**رَسَـى الشَّـيءُ يَرْسُـو رَسَّـاً**)، واتـە: چەسـپا، ئـەو شـتە دەچەسـپێ، چەسـپان، (**وَأَرْسَـاهُ غَيـرُهُ**)، واتـە: (**ثَبَّتَـهُ**) یـان (**أَثْبَتَـهُ**) واتـە: چەسـپاندی، (**رَواسِـيَ شـامِخاتٍ أَي: جِبـالاً ثَابِتَـات**)، واتـە: چیایـە سەرکەشـەکان، یاخـود چیایـە چەسـپاوەکان.

---

(١) بەرچیخ: دارێکە هێندەی کلکە بێڵ و پێمەڕە، دەدرێنە بەر قەراغەکانی ڕەشماڵ و چادر.

(أَن تَمِيدَ بِكُمْ): (**المَيْـدُ: الإضطِـرَابُ للشَـيء العَظِيـم**)، (**مَيْـد**) بریتیـە لـە جووڵـە جووڵـی شـتێکی مـەزن، کـە دەفەرمـوێ: ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾، یانـی: (**أَن لا تَمِيـدَ بِكُـم**)، بـۆ ئـەوەی نەتانجووڵێنـێ، یاخـود: (**كَرَاهَـةً أَن تَمِيـدَ بِكُـم**) کـە واتاکەیـان لێـك نزیکـە: لەگـەڵ پێناخۆشـبوونی ئـەوەی بتانجووڵێنـێ، بۆیـە خـوا چیایەکانـی لـە زەوییـدا کردوونـە گوڵمیـخ.

(وَبَثَّ): واتـە: بڵاویکردۆتـەوە، (**البَـثُّ: التَّفرِيـقُ وإثَـارَةُ الشَّـيءِ، كَبَـثِّ الرِّيـحِ التُّـرَابَ**)، (**بـثّ**): بریتیـە لـە بڵاوکردنـی شـتێك، وەك چـۆن بـا گڵ و خـۆڵ بـڵاو دەکاتـەوە.

(دَآبَّةٍ): (**الـدَّبُّ والدَّبِيـبُ: المَشِـيُ الخَفِيـفُ، وَيُسْـتَعْمَلُ ذَلِـكَ فِـي الحَيَـوَانِ، وَفِـي الحَشَـرَاتِ أَكثَـر**)، وشـەی (**دَبّ**) لەگـەڵ (**دَبِيـب**)دا واتـە: ڕۆیشـتنێکی سـووك و، بەکاریشـدەهێنرێ بـۆ ژیانـداران، هەروەهـا بـۆ زینـدەوەران، بـەڵام زیاتـر بـۆ زینـدەوەران بـەکاردێ، هـەر شـتێك کـە لەسـەر زەوی بـڕوات.

(زَوْجٍ كَرِيمٍ): (**كلِّ: صِنْـفٍ جَيِّـدٍ حَسَـن**)، (**زَوج**) لێـرەدا بـە مانـای (**صِنـف**) دێ، هـەر جـۆرە ڕووەکێکـی بـاش و بەرهەمدار.

## هۆی هاتنه خوارەوەی ئایەتەكان

هـۆی هاتنـه خـوارەوەی ئـەم ئایەتـه موبارەكـه: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِي لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا ۚ أُولَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾، لـەو بـارەوە چەنـد گێڕدراوەیـەك دەخەینـەڕوو:

**یەكەم:** **(عَنْ عَبْدِ للهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، نَزَلَتْ فِي النَّضْرِ بْنِ الْحَارِثِ، كَانَ يَخْرُجُ تَاجِرًا إِلَى فَارِسَ، فَيَشْتَرِي أَخْبَارَ الْأَعَاجِمِ فَيَرْوِيهَا، وَيُحَدِّثُ بِهَا قُرَيْشًا، وَيَقُولُ لَهُمْ: إِنَّ مُحَمَّدًا عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ يُحَدِّثُكُمْ بِحَدِيثِ عَادٍ وَثَمُودَ، وَأَنَا أُحَدِّثُكُمْ بِحَدِيثِ رُسْتُمَ وَإِسْفِنْدِيَارَ وَأَخْبَارِ الْأَكَاسِرَةِ)، (أسباب النزول للنيسابوري، ص٣٢٦).**

واتـه: عەبدوڵڵای كـوڕی عەبباس (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، دەڵـێ: ئـەم ئایەتـه لـه بـارەی **(نَّضْـرِ بْـنِ الْحَـارِثِ)**ەوە كـه یەكێـك بـوو لـه زلـه زلەكانـی قوڕەیـش لـه مەككـه، هاتوەتـه خـوارێ كـه بـۆ بازرگانیـی دەچـوو بـۆ وڵاتـی (فـارس)، لـەوێ هەواڵـی پادشـاكانی فارسـی دەكـڕی، دوایـی بـۆ قوڕەیشـییەكانی بـاس دەكـردو، پێـی دەگوتـن: موحەممـەد ﷺ باسـی عـاد و سـەموودتان بـۆ دەكات و، منیـش بەسـەرهاتی **(رُسْتُم)** و **(إِسْـفِنْدِيَار)**و هەواڵـی پادشـایەكانی فارسـتان بـۆ دەگێڕمـەوە.

بەڵام خاوەنی **(الإستيعاب فِي بيان الأسباب)**[1] كه بە سێ ڕیوایەت هێناویەتی:

**١-** دەربارەی یەكێكیان دەڵێ: **(مَوضوعٌ)** هەڵبەستراوە.

**٢-** بۆ دووەمیان دەڵێ: **(ضَعيف جدًّا)**، زۆر بێهێزە، له ڕووی **(سَنَد)**ەوە.

**٣-** بۆ ئەوی دیكەشیان دەڵێ: **(مَوضُوعٌ)** هەڵبەستراوە.

---

(١) قال مؤلِّفا: الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ٥٩ - ٦٠: ضَعيف جداً.

بۆیـەش هێنـام چونکـە زۆربـەی تەفسـیرەکان هێناویانـە و، تاکـو خوێنـەران بزانـن کـە لـە ڕووی (سَنَد)ەوە یـان زۆر بێهێـزەو پشـتی پێ نابەسـترێ، یاخود هەڵبەسـتراوەو هـەر دەبـێ فـڕێ بـدرێ، تەنیـا بـۆ ئاگادارکردنـەوەی بینـەران و بیسـەران و خوێنەرانی بەڕێـز هێنام.

**دووەم:** (**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: بَاطِلُ الحَدِيثِ، هُوَ الغِنَاءُ وَنَحوهُ**)[١]، واتە: کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ ﴾، دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی دەبێ) گوتوویەتی: مەبەست لە گۆرانیی و وێنەی گۆرانییە، بەڵام لە ڕووی (سَنَد)ەوە دیسان دەڵێ: زۆر بێهێزە پشتی پێ نابەسترێ[٢].

**سێیەم:** {**عَنْ أَبِي أُمامَةَ رضي الله عنه، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ:لا تَبِيعُوا القَيْنَاتِ، وَلا تَشْتَروهُنَّ، وَلا تُعَلِّمُوهُنَّ، وَلا خَيرَ فِي تِجارَةٍ فِيهِنَّ، وَثَمَنُهُنَّ حَرَامٌ، وَفِي مِثلِ ذَلِكَ أُنْزِلَت هَذِهِ الآيَة**} (**أخرجه الترمذي: ١٢٨٢، وابن ماجه: ٢١٦٨، وغيرهما، إسناده ضعيف جدًّا**).

واتـە: (گوایـە) ئەبـوو ئومامـە رضي الله عنه، گوتوویەتـی: پێغەمبـەر خـوا ﷺ فەرموویەتـی: (ئافرەتانـی گۆرانیـی بێـژ مەفرۆشـن و، مەیانکـڕن و، فێریـان مەکـەن و، هیـچ بازرگانییـەك لەوانـدا هیـچ خێـری تێدانیـەو، نرخەکەشیان حەڕامـە، لـەو بـارەوە ئـەم ئایەتـە هاتوەتـە خـوار[٣]، سـەنەدەکەی زۆر بـێ هێـزەو هـی پشـت پـێ بەسـتران نیـە.

ئـەوەی کـە لـەو بـارەوە هەبێـت و شـایەنی بایـەخ پێدان بێ لـە ڕووی سـەنەدەوە ئـەم دوو دەقەن:

**چوار:** [**عَنْ عَبدِاللهِ بنِ مَسْعودٍ رضي الله عنه، قَالَ: لَهُوَ الحَدِيثِ هُوَ الغِنَاءُ، وَالَّذِي لا إِلَهَ إلاَّ هُوَ، يُرَدِّدُهَا ثَلاثَ مَرَّاتٍ**][٤].

---

(١) ج٣، ص٥٩.

(٢( الإستيعاب في بيان الأسباب) ، ج٣، ص٥٩.

(٣( الإستيعاب في بيان الأسباب) ، ج٣ ص٦٠، سنده ضعيف جداً.

(٤) قال مؤلِّفا: الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٦٣، سنده حسن.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ، گوتوویەتی: (لَهْوَالحَديث) بریتیە لە گۆرانیی سوێند بەو خوایەی جگە لەو هیچ پەرستراو نین، سێ جاران سوێندەکەی دووبارە کردۆتەوە، (دیارە بۆچوونی وی وایە).

**پێنجەم:** [عَنِ عَبْدِاللهِ بنِ عَبَّاسٍ رَضيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: لهو الحَدِيثِ هُوَ الغِنَاء وَأشبَاهُهُ] [١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتوویەتی: (لَهُوَ الحَدِيث) بریتیە لە گۆرانیی و وێنەی گۆرانیی.

سێ ڕیوایەتی دیکە دێنین تەنیا بۆ ئاگادارکردنەوەی مسوڵمانان، کە ئەو جۆرە ڕیوایەتانە پشتیان پێ نابەسترێ:

**شەشەم:** [عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: أُنْزِلَت فِي رَجُلٍ مِنْ قُرَيشٍ اشتَرى جاريَةً مُغَنِّيَةً]،

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئەم ئایەتە لە بارەی پیاوێکی قوڕەیشییەوە، کە کەنیزەکێکی گۆرانیبێژی کڕیبوو، هاتۆتە خوار[٢].

٧- [عَنِ الحَسَن البَصري قَالَ: نَزَلَت فِي الغِناء وَالمَزَامِير][٣]، واتە: حەسەنی بەصڕایی دەڵێ: ئەم ئایەتە لە بارەی گۆرانیی و ئامێرەکانی گۆرانییەوە هاتۆتە خوار.

٨- [عَن عَطاء الخُراساني قَالَ: نَزَلَت فِي الغِنَاءِ وَالبَاطِلِ وَالمَزَامِير][٤]، عەتائی خوڕاسانییش کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین گوتوویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی گۆرانیی و قسەی پووچ و ئامێرەکانی مۆسیقاو گۆرانیی هاتۆتە خوار، بەڵام ئەویش دیسان سەنەدەکەی بێهێزەو شایانی پشت پێ بەستران نیە.

---

(١) الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٦٣، حسن لغيره.

(٢) الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٦٤: إسناده ضعيف جداً.

(٣) الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٦٤: ضعيف.

(٤) الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٦٤: ضعيف.

ئێمە دواتر لە بارەی ئەو ڕیوایەتانەوە كە باسمان كردن، قسە دەكەین كە ئایا دەگونجێ ئەوانەی گێڕدراونەوە، بۆ هەڵهێنجانی حوكمێك لەو ئایەتە موبارەكە بە تایبەتی ڕستەی:﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِى لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ ﴾، ئایا دەگونجێ پشت بەو ڕیوایەتانە ببەسترێ یان نا؟ لەو بارەوە قسەی خۆمان دەكەین، لە مەسەلە گرنگەكاندا.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

مانای گشتیی ئەم ئایەتە موبارەكانە بەم شێوەیە، خوا ﷻ دەفەرموێ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە،

واتە: دەست پێكردنم بە ناوی خوایە، مەبەستیش ئەوەیە:

١- ئەم كارە تەنیا بۆ خوا دەكەم.

٢- بە پێی شەرعی خوا دەیكەم.

٣- بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەیكەم.

٤- بۆ هێنانە دی ڕەزامەندیی خوا ئەنجامی دەدەم.

﴿ الٓمٓ ﴾: ئەمانە سێ پیتی پچڕ پچڕن، ئێمە پێشتر قسەمان كردوە لەو پیتە پچڕ پچڕانە، بە تایبەتیی لە سەرەتای سووڕەتی (**یونس**)دا، باسێكی تێرو تەسەلمان كردوە، ئەو پیتە پچڕ پچڕانە لە سەرەتای بیست و نۆ (٢٩) لە سووڕەتە قوڕئانییەكانەوە هاتوون، زۆربەیان سووڕەتە مەكەییەكانن و دووانیان سووڕەتە مەدینەییەكانن: (**البقرة**) و (**آل عمران**).

زۆرجاری دیکە ئەوەمان دووبارە کردۆتەوە، کە باشترین بۆ چوون لە بارەی ئەو پیتانەوە، ئەوەیە کە خوا ﷻ دەیەوێ بە مرۆڤەکان بفەرموێ: ئەو قورئانەی لەبەر دەستتاندایەو، ناتوانن وێنەی وی، وێنەی دە (١٠) سوورەتی، وێنەی سوورەتێکی بێنن، هەر لەو پیت و دەنگانە پێکهاتوە، کە ئێوە قسەیان پێدەکەن، ئنجا کە نەتانتوانی وەڵامی تەحەددایەکەی قورئان بدەنەوە، کەواتە: بزانن و دڵنیابن ئەوە فەرمایشتی خوایەو، ئەو لایەنەی ئەم قورئان و فەرمایشتەی لێوە هاتوە، لە سەرووی ئاستی بەشەرو مرۆڤەکانە، بۆیە ئێوە ناتوانن نەك وێنەی قورئان بەڵکو وێنەی دە (١٠) سوورەتی و، بگرە وێنەی سوورەتێکیشی بێنن، سوورەتێکی سێ ئایەتیی وەك سوورەتەکانی: ((**العصر**) و (**الكوثر**) و (**النصر**).

هەڵبەتە زانایان زۆر قسەی دیکەیان کردوون، بۆ نموونە: دەڵێن: تەنها بۆ ئاگادار کردنەوەی پێغەمبەر بووە ﷺ و، بۆ ئاگادارکردنەوەی هەر کەسێکە کە قورئان دەخوێنێ، خوا دەفەرموێ: تۆ ئاگاداربە! کە خوا فەرمایشت دەکات، بەڵام ئەو ڕایەی گوتمان، زۆربەی زانایان تەبەننییان کردوە.

﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، ئەوانە ئایەتەکانی کتێبێکی کاربەجێن، زانایان لێرەدا گوتوویانە: (تِلكَ)، ناوی ئاماژەیە بۆ دوور، لەبەر ئەوەی پایەو پێگەو مەقامی قورئان و ئایەتەکان زۆر دوورو بەرزە، بۆیە بە ناوی ئامازەی دوور (**إسم الإشارة البعيدة**) ئاماژەی بۆ کردوون، ﴿ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، وشەی (**حَكِيم**)، واتە: (**تِلْكَ آيَاتُ الكِتَابِ الرَّبِّ الحَكِيم**)، یاخود: (**تِلكَ آياتُ الكِتابِ الإلهِ الحَكِيم**)، ئەوانە ئایەتەکانی پەروەردگارێکی کارزان، یان: پەرستراوێکی کارزانن، یاخود: ﴿ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، (خاوەن حیکمەت بوون) هەر قورئانی پێ وەسفکراوە، واتە: قورئان خاوەن حیکمەتە، قسە لەجێیە، بڕیارەکانی لەجێن، حوکمەکانی لەجێن.

﴿ هُدًى وَرَحْمَةً لِّلْمُحْسِنِينَ ﴾، ڕێپێشاندەرەو بەزەییە بۆ چاکەکاران، هەڵبەتە قورئان بۆ هەموو کەس ڕێپێشاندەرە، بەڵام ئەوانەی لێی بەهرەمەند دەبن، چاکەکارانن، وەك لە سەرەتای سوورەتی (**البقرة**)شدا دەفەرموێ: ﴿ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ

﴿٢﴾، ڕێنماییکارەو ڕێپێشاندەرە بۆ پارێزکاران، چونکە ئەوەی ئەهلی تەقواو ئەهلی ئیحسان نەبێ، لە قورئان بەهرەمەند نابێ، ئەگەرنا قورئان لە ئەسڵدا ڕێنماییکارە بۆ جیهانییان (هُـدًى لِّلْعَالَمِيـنَ)، و بیر خەرەوەیە بۆ جیهانییان، ﴿ذِكْرَىٰ لِلْعَالَمِينَ﴾ە.

ئنجا خوا پێناسەی: ﴿مُحْسِنِينَ﴾مان بۆ دەکات، ئەوانەی کە لە قورئان بەهرەمەند دەبن و، قورئان دەبێتە مایەی ڕێنمایی کرانیان و، دەبێتە مایەی بەزەیی لەگەڵ نوێنرانیان، دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْأَخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن و، زەکات دەدەن و، هەر ئەوانن بڕوا پتەو و دڵنیان بە مەنزڵگای کۆتایی (ڕۆژی دوایی)، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ﴾، ئەوانە لەسەر ڕێنماییەکی گەورەو گرنگن لە پەروەردگاریانەوە، ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾، هەر ئەوانەش سەرفرازو بە مراد گەیشتوو و بەختەوەرن.

ئنجا خوا ﷻ باسی جۆرە کەسێکی دیکەمان بۆ دەکات، پێچەوانەی ئەو چاکەکارانەی کە لە قورئان و لە ئایەتەکانی قورئان بەهرەمەند دەبن، دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِي لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ﴾، هەروەها لە خەڵکی هەیە کەسانێك کە قسەی خافڵێنەر دەکڕن، ﴿لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، تاکو خەڵکی پێ لە ڕێی خوا لابدات.

﴿لِيُضِلَّ﴾ خوێنراویشەتەوە: (لِيَضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّه)، واتە: بۆ خۆی لە ڕێی خوا لا بدات، ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾، بەبێ زانیاریی، هەروا بە دوای نەزانیی و نەفامیی دەکەوێ، ﴿وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا﴾، ڕێی خواش دەکاتە گاڵتەجاڕ، گاڵتەو گەمەی پێ دەکات، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾، ئا ئەوانە سزایەکی ڕیسواکەرو زەبوونکەرو، سزایەکی ئابڕووبەریان بۆ هەیە.

﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا﴾، کاتێك ئایەتەکانی ئێمەشی بەسەردا بخوێندرێنەوە، خۆ بەزلگرانە پشت هەڵدەکات، ڕوو وەردەچەرخێنێ (دەڕوات)،

﴿كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا﴾، وەك ئەو ئایەتانەی هەر نەبیستبن و گوێ بیستیان نەبووبێ، ﴿كَأَنَّ فِيٓ أُذُنَيۡهِ وَقۡرٗاۖ﴾، وەك قورسایی لە گوێكانیدا بووبێ، یاخود گوێیەكانی كەڕ بووبن و هیچی نەبیستبێ، ئاوا ئەو ئایەتانە پشتگوێ دەخات، ﴿فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾، ئنجا تۆش موژدەی ئازارێكی بە ئێشی پێ بدە، هەڵبەتە موژدە بۆ شتی خۆش و چاكە، بەڵام لێرەدا ئەوە بە توانج و تەوسەوەیە، واتە: ئەگەر هەواڵێكی خۆش هەبێ بۆ وی، بۆ ئەو جۆرە كەسە، هەر ئەوەیە كە بگوترێ: تۆ ئازارێكی بەئێش چاوەڕێت دەكات.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، كردەوە باشەكان ئەنجام دەدەن، بەهەشتە پڕ نازو نیعمەتەكان بۆ ئەوانن، وەك گوتوومانە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، ﴿ءَامَنُواْ﴾، یانی: بڕوایان هێناوە، هەمیشە بەركار (**مَفعولٌ بِه**)ەكەی قرتێنراو (**مَحذوف**)ە، واتە: ئیمانیان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، ئیمانیان بە خوا ﷻ و بە فریشتەكانی و بە كتێبەكانی و بە پێغەمبەرانی (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) و بە ڕۆژی دوایی و، بە قەدەرو، بە هەموو ئەو شتانەی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداون، هێناوە.

﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، كردەوە باشەكانیش ئەنجام دەدەن، چ پەیوەندییان بە دڵ و دەروونەوە هەبێ (نیازو مەبەستەكانی نێو دڵ)، چ خولیایەكانی بیرو هۆش، چ دەربڕینەكانی زمان، یاخود نووسینەكانی دەست و پەنجە، چ پەیوەندییان بە ئەندامەكانی دیكەی جەستەوە هەبێ، ئا ئەوانە: ﴿لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ﴾، باخە پڕ نازو نیعمەتەكانیان، هەن.

(**جنَّات**)، كۆی (**جَنَّة**)یە، یانی: باخ و بێستان و گوڵ و گوڵزار، پاڵدراوەتە لای (**نَعِيم**)، یانی: نازو نیعمەت (خۆشیی و لەززەت)، ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ﴾، لەو باخە پڕ نازو نیعمەتانەدا، بە هەمیشەیی دەمێننەوە، ﴿وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ﴾، ئەمە بەڵێنی خوایەو ڕاستە، ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾، بەس خواش زاڵی كاربەجێیە.

ئنجا خوا ﷻ كە باسی خۆی دەكات كە ئەو بەهەشتانەی بۆ ئەو بڕوادارانە داناون، هەندێك لە كردەوەكانی خۆی و، هەندێك لە سیفەتەكانی خۆی دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ﴾، ئاسمانەكانی دروستكردوون بە بێ كۆڵەكانێك، كە بیانبینن، یاخود ئەوە ئاسمانەكان دەبینن بە بێ كۆڵەكەن، یاخود: دروستیكردوون و ڕایگرتوون بە چەند كۆڵەكەیەك، كە ئێوە كۆڵەكەكان نابینن، كە وەك دواتر باسی دەكەین، زانایانی هاوچەرخ دەڵێن: مەبەست پێی هێزی كێشندە (**قوة الجاذبية**)یە.

﴿ وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ ﴾، هەروەها (خوا) چیا قورسەكانیشی خستوونە نێو زەوییەوە، ﴿ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ ﴾، بۆ ئەوەی نەتانجووڵێنێ، بۆ ئەوەی لەنگەر بگرێ بەهۆی چیا سەخت و قورسەكانەوە، بۆی ببنە گوڵمیخ و سینگ و نەتانجووڵێنێ، توێكڵی زەوی لە بنتاندا نەیەت و نەچێ.

﴿ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٖۚ ﴾، هەروەها (خوا) لە هەموو جۆرە ژیاندارێكی لە زەوییدا بڵاوكردۆتەوە، هەر لە (ئەمیبا)و لە ژیانداری (یەك خانەیی) بچووكەوە هەتا هەموو ئەو ژیاندارانەی كە دەیانبینین كە گەورەترینیان (نەهەنگی شین)ە، لە دەریاداو (فیل)ە، لە وشكانییدا، ﴿ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ ﴾، لە سەرێوەش ئاومان دابەزاندوە، بە شێوەی باران و بەفرو تەرزە، ﴿ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ﴾، لەوێدا، لە زەوییدا ڕوواندوومانە لە هەر جۆرێكی بەرهەمدار، لە هەر جۆرە ڕووەك و درەخت و میوەیەكی بەرهەمدار كە مرۆڤەكان لێیان بەهرەمەند دەبن، (**زَوْجٍ**)، لێرەدا بە مانای جۆر (**صنف**) دێ، یاخود بە مانای ڕووەك دێ، چونكە ڕووەك هەمووی نێرو مێی هەیە، (**كَرِيمٍ**)یش (**الجَيِّدُ مِن نَوعِهِ**)، (**كَريم**) لە هەرشتێكدا یانی: باشترین جۆری.

لە كۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ ﴾، ئا ئەمە دروستكراوی خوایە، ئەوەی باسكرا:

أ- ئاسمانەکان بەبێ کۆڵەکە بینراوەکان ڕاگیراون، یاخود: بە کۆڵەکە نەبینراوەکان ڕاگیراون.

ب- زەویی کە چیایەکان تێیدا داندراون و، بوونە مایەی لەنگەرگرتنی.

ج- ئەو هەموو زیندەوەرانە کە بە زەوییدا بڵاوبوونەوە.

د- ئەو ئاوە کە لە ئاسمان دێتە خوار و، دەبێتە هۆی ڕووانی هەر جۆرە شیناوردو درەخت و ڕووەکێکی بەرهەمدار، ئا ئەوە: ﴿ هَٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ ﴾،

ئەمە دروستکراوی خوایە، ﴿ فَأَرُونِى مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ﴾، دەجا پێشانمبدەن ئەوانەی جگە لەو (جیا لە خوا) کە دەپەرسترێن (پەرستراوەکان) چییان دروستکردوە، کوا؟ ئەوە بەرهەمی خوایەو شوێنەواری خوایە، بەڵام پێشانمبدەن، پەرستراوەکانی دی، شتێکیان دروستکردبێ، بەرهەم و شوێنەوارێکیان هەبێ.

﴿ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، هیچکام لەو پەرستراوە ساختانە، شوێنەواریان نیە، هیچ شتێکیان دروست نەکردوە، بەڵکو ستەمکاران ئەوانەی هاوبەش بۆ خوا دادەنێن (جگە لە خوا دەپەرستن) ستەم لە خۆیان و لە پەیامەکانی خوا دەکەن، ئا ئەوانە لە گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکراو بێ پێچ و پەنادان.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**پێناسەکردنی قورئان و، پێناسەکردنی چاکەکاران بە پێنج لە سیفەتە بنەڕەتییەکانیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ الٓمٓ ١ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ٢ هُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّلۡمُحۡسِنِينَ ٣ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ٤ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

**١)**- ﴿ الٓمٓ ﴾، پێشتر قسەمان لە بارەوە کردوون، کە ئەوانە سێ پیتن، لە بیست و هەشت پیتەکانی زمانی عەرەبیی: ئەلیف، لام، میم، هەر ئاواش دەخوێندرێنەوە.

**٢)**- ﴿ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ﴾، ئەو ئایەتانە ئایەتەکانی کتێبێکی کارزان و کاربەجێن، (**تِلْكَ**)، ئاماژەیە بۆ ئەو ئایەتانەی لەم سوورەتەدا باس دەکرێن، واتە: ئەوەی ئاماژەی بۆ کراوەو لە زەیندا هەیە، (**تِلكَ**)، واتە: ئەو ئایەتانەی بەسەرتدا دەخوێندرێنەوە، ئایەتەکانی کتێبێکی کارزان و کاربەجێن.

﴿ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، گوزارە (**خَبَر**)یە، بۆ ناوی ئاماژە (**إسم إشارة**)ی (**تلكَ**)ە، ﴿ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ﴾، ئایا بۆچی بە (**تِلكَ**) کە ئاماژەیە بۆ دوورو بۆ مێینە (**مؤنث**) بەو شێوەیە هێناویەتی؟.

لەبەر ئەوەی پلەی ئەو ئایەتانە، زۆر بەرزو دوورە.

﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، (**الكِتـاب**) مەبەسـت پێـی قورئانـەو بـە (**حَكِيـم**) وەصفكراوە:

أ- هەندێكیان گوتوویانە: (**الحَكِيم وَصفٌ لِلكِتابِ بِمَعنى ذي الحِكمَة**)، واتە: ئەم قورئانە خاوەن حیكمەتە، وەك پێشتریش گوتمان.

ب- هەندێكی دیكە گوتوویانە: (**الكتاب الحَكِيم**)، لێرەدا قورئان چوێندراوە بە مرۆڤێكی حەكیم و كارزانەوە.

ج- هەندێكی دیكە گوتوویانە: (**الحَكِيم**) لێرەدا بە مانای (**مُحكَم**)ە، قایم و پتەو كە هیچ كەلێن و درزی تێدا نیە.

٣)- ﴿ هُدًى وَرَحْمَةً لِّلْمُحْسِنِينَ ﴾، ڕێنماییەو بەزەییە بۆ چاكەكاران.

وشـەی (**هُـدَىً**)، هـەر بـە (**هُـدَىً**) دەخوێندرێتـەوە، چونكـە (**مَبْنـي**)ە، بـەڵام (**وَرَحمَـةً**)، بـە (**وَرَحمَـةً**) خوێندراوەتـەوەو، بـە (**وَرَحمَةٌ**)یـش خوێندراوەتـەوە: (**هَـدَىً وَرَحمَـةٌ لِلمُحسِـنِينَ**)، ڕێنماییـەو بەزەییـە بـۆ چاكـەكاران.

هەڵبەتـە قورئـان ڕێنمایـی و بەزەییـە بـۆ تێكـڕای مرۆڤـەكان، بـەڵام كێـن ئەوانـەی لـە قورئـان بەهرەمەنـد دەبـن، وەك ڕێنمایـی ڕێـی پـێ دەدۆزنـەوەو، بەرچـاوی خۆیانیپـێ دەبینـن و شایسـتەی بەزەیـی لەگـەڵ نوێنـران دەبـن و پێـی دەگەنـە ئامانـج؟ بـە تەئكیـد تەنیـا چاكەكارانـن كـە دوایـی خـوا پێناسـەی چاكەكارانیشـمان بـۆ دەكات، بۆیـەش خـوا ﷻ لێـرەدا تایبەتـی دەكات بەوانـەوە، ئەگەرنـا لـە ئەسـڵدا قورئـان بـۆ هەمـوو مرۆڤـەكان نێـردراوە.

(**مُحسِـنِين**)،چاكەكاران ئەوانـەن كـە چاكـەكان ئەنجامـدەدەن (**الفاعِلونَ لِلحَسَـنَات**)، ئنجا پێناسـەی (**مُحسِـنِين**)مان بـۆ دەكات:

٤)- ﴿ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەكەن، ئێمە پێشتر باسی بەرپاكردنی نوێژمان كرد لە سوورەتی (**العنكبوت**)دا، لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا كە دەفەرموێ: ﴿ ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ

﴿وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ﴿٤٥﴾﴾، لەوێ باسێکی خەست و خۆڵمان کرد لە قەدەر قەبارەی ئەم تەفسیرە، لە بارەی چۆنیەتی بەرپاکردنی نوێژو، مانای بەرپاکردنی نوێژەوە کرد.

٥)- ﴿وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾، هەروەها زەکاتیش دەدەن، سیفەتێکی دیکەیان ئەوەیە کە زەکات دەدەن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، یانی: نوێژ بەرپا دەکەن بە ڕەهایی، کە دەشفەرموێ: **(ويؤتون الزكاة)** یانی: زەکات دەدەن بە ڕەهایی و لە ماڵی خۆیان دەبەخشن، بە گشتیی نەك لە شتێك و چەند شتێکی دیارییکراو.

٦)- ﴿وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ﴾، هەر ئەوانیشن بڕوای پتەویان هەیە بە مەنزڵگای کۆتایی، بە ژیانی کۆتایی کە ڕۆژی دواییە.

ئەمە توانج گرتنە لە وانەی دوو دڵ و بە گومانن بەرانبەر بە ڕۆژی دوایی و مەنزڵگای کۆتایی.

٧)- ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ﴾، ئا ئەوانە لەسەر ڕێنمایییەکی تایبەتن لە پەروەردگاریانەوە، واتە: تەواو پێ چەقیون لەسەر ئەو هیدایەتەو سەقامگیرن لەسەری.

٨)- ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾، هەر ئەوانەش سەرفرازن، کەواتە: خوا ﷻ، ئەوانەی قورئان بۆیان دەبێتە مایەی ڕێنمایی و ڕەحمەت، بە پێنج سیفەتی مەزن پێناسە دەکات:

**یەکەم:** چاکەکاریی:

**دووەم:** نوێژ بەرپاکردن.

**سێیەم:** زەکات دان.

**چوارەم:** بڕواداریی پتەوو نەلەخشاو بە مەنزڵگای ڕۆژی دوایی.

**پێنجەم:** لەسەر ڕێنمایی بوون لە پەروەردگاریانەوە.

سەرەنجامیش ئەوانە سەرفرازو بە مراد و بە ئامانج گەیشتوون.

مەسەلەی دووەم:

**باسی کەسانێك کە قسەی خافڵێنەر دەکڕن، تاکو خەڵکی پێ لە ڕێی خوا لابدەن و، بیکەنە هۆکاری گاڵتەپێکردنی ڕێبازی خواو، لە بەرانبەر بیستنی ئایەتەکانی خواشدا، خۆ بەزلگرو، نەبیستن و شایستەی سزای بە ئێشن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِي لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا ۚ أُولَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا كَأَنَّ فِىٓ أُذُنَيْهِ وَقْرًا ۖ فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٧﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

**١)-** ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِي لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ ﴾، هەروەها لە خەڵکی هەیە جۆرە کەسێك کە قسەی خافڵێنەر دەکڕێ، ﴿ لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ ﴾، یانی: (**الحَدِيثُ الْمُلهِي الشَّاغِل**) قسەیەکی خافڵێنەری سەرقاڵکەر، کە مرۆڤ بخافڵێنێ سەرقاڵیبکات و، لاییدات لەسەر گەرم بوون بە دەستبەکاربوون لە کارێکی گرنگترو بایەخدارتردا.

**٢)-** ﴿ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾، تاکو خەڵك لە ڕێی خوا لابدات، بەبێ زانیاریی و شارەزایی.

﴿ لِيُضِلَّ ﴾، خوێندراویشتەوە: (لِيَضِلَّ) یانی: بۆ خۆی لابدات لە ڕێی خوا، بەبێ شارەزایی.

**٣)-** ﴿ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا ﴾، هەروەها ڕێبازی خوا بکات بە گاڵتەپێکراو، (**هُزُوا: مَصْدَرُهَزأَ بِهِ أَي: مَهزواً بِهِ**)، (**هُزُوا**) چاوگ (**مَصْدَر**)ە، یانی: گاڵتەپێکراو، بەڵام بە مانای بەرکار (**مَفعُولٌ بِهِ**)ە، (**مَهزواً بِهِ**)، گاڵتەپێکراو، یانی: لە ئەنجامی ئەو قسە خافڵێنەرەدا کە دەیکڕێ و خەڵکی پێ لە ڕێی خوا لا دەدات، سەرەنجامیش خەڵك بە هۆی کارتێکراوییان بەو قسە خافڵێنەرەیە، گاڵتە بە ئایینی خوا ﷻ دەکەن.

٤)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴾، ئا ئەوانە ئازارێكی ڕیسواكەریان هەیە.

چونكە هەمیشە سزا بە گوێرەی كردارە (**الجَزاءُ مِنْ جِنْسِ العَمَل**)، ئەوانەش ئەو قسە خافڵێنەرەیە دەكڕن، بۆ ئەوەی خەڵك لە ڕێی خوا لابدەن و، خەڵك گاڵتە بە ئایینی خوا بكات، خوای پەروەردگاریش لە شێوەی كردەوەكەی خۆیان، سزایان دەدات و ئازارو سزایەكی ڕیسواكەرو زەبوونكەریان بۆ دادەنێ، چونكە (**مُهِين، أي: مُذِلّ أو مُخزٍ**) زەبوونكەرو سەرشۆڕكەر.

ئنجا لەسەر باسكردنی سیفەتەكانی ئەو جۆرە كەسە بەردەوام دەبێ:

٥)- ﴿ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسۡتَكۡبِرٗا كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا ﴾، كاتێك ئایەتەكانی ئێمەی بەسەردا بخوێنرێنەوە، خۆ بەزلگرانە پشت هەڵدەكات، وەك هەر نەیبیستبن، (**وَلَّى**): پشتی تێكرد، (**مُسْتَكْبِرَاً**)، لە حاڵێكدا كە خۆ بەزلگربوو، ﴿كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا ﴾، وەك ئەو ئایەتانەی هەر نەبیستبێ.

٦)- ﴿كَأَنَّ فِيٓ أُذُنَيۡهِ وَقۡرٗا ﴾، وەك لە دوو گوێیەكانیدا قورسایی هەبێ، یاخود: وەك دوو گوێیەكانی كەڕ بن، كەڕییان تێدا هەبێ، (**وَقراً أي: ثِقلاً أو صَمَماً**) وقر: قورسایی یان كەڕیی، (**أُذْنَيهِ**) خوێندراویشەتەوە: (**أُذْنَيهِ**).

كە پێشێ دەفەرموێ: ﴿كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا ﴾، وەك ئەو ئایەتانەی هەر نەبیستبن، دوایی دەفەرموێ: ﴿كَأَنَّ فِيٓ أُذُنَيۡهِ وَقۡرٗا ﴾، وەك لە دوو گوێچیەكانیدا قورسایی یاخود: كەڕیی هەبێ، ئەمە بۆیە دووبارە كراوەتەوە، یانی: زۆر زۆر نەبیست و كەمتەرخەمە، بەرانبەر بە ئایەتەكانی خوا.

٧)- ﴿فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾، ئنجا موژدەی پێبدە بە ئازارێكی بە ئێش و ژان، پێشێ فەرمووی: ئەوانە سزایەكی ڕیسواكەریان هەیە، دوایی دەفەرموێ: موژدەی پێبدە بە ئازارێكی بە ئێش، هی پێشێ سزای ڕیسواكەر بوو، سزا ڕیسواكەرەكە لە بەرانبەر ئەوەدایە كە خەڵك لە ڕێی خوا لادەدات و، قسەی خافڵێنەر دەكڕێ، بۆ ئەوەی گاڵتە بە ئایینی خوا

بکات، ئەم سزای ئازاری بە ئێشەش، لە بەرانبەر ئەوەدایە کە لە بەرانبەر ئایەتەکانی خوادا نەبیستە، خۆ بەزلگرە، بۆیە موژدەی پێبدە بە ئازارێکی بەئێش، موژدەش دیارە بۆ شتی باشە، بەڵام ئەمە لێرەدا بە توانج و تەوسەوەیە.

## کورتە باسێک لە بارەی چەمک و واتای: ﴿لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ﴾ەوە:

﴿لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ﴾، یانی: (**الحَدِيثُ المُلهِي**)، قسەیەکی خافڵێنەرو، سەرقاڵکەر.

ئێمە هەوڵدەدەین لە حەوت خاڵان دا ئەوەی کە بە ڕاستی دەزانین لە بارەی ئەم وشە قورئانییەوە، بیڵێین و بیخەینە ڕوو، لەبەر ئەوەی لە تەفسیرەکاندا مشتومڕی زۆر هەیە لە نێوان زانایان داو، زۆرێك لەوانەی گۆرانیی و مۆسیقا بە گشتیی بە قەدەغەو حەرام دادەنێن، پشتیان بەم وشە قورئانییە بەستوە، لەو ئایەتە قورئانییەدا، بۆیە ئێمە بە پێویستی دەزانین، تیشکێکی باشی بخەینە سەر:

**١-** لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکانی شەش و حەوتدا خستمانە ڕوو، کە هیچ کام لەو دەقانەی باسی (**النَّضْرُ بنُ الحَارِث**) و (**القَينَات**) و (**المُغَنِّيات**) دەکەن لە ڕووی سەنەدەوە ڕاست نین، یان: هەڵبەستراون، یان بێهێزن، یان زۆر بێهێزن، کە دیارە دەقێکیش بێهێز بێ، یان زۆر بێهێز بێ، یان هەڵبەستراوبێ، بە تەئکید شایستەی ئەوە نیە پشتی پێ ببەسترێ بۆ هەڵهێنجانی حوکمێك دەربارەی حەڵاڵیی یان حەرامیی شتێك، چونکە زۆربەی زانایان دەڵێن: هەر حوکمێك کە ئەو شتە حەڵاڵە، یان ئەو شتە حەرامە، بە تایبەتیی بۆ حەرام، دەبێ بەڵگەکەی زۆر بەهێز بێ لە ڕووی سەنەدەوەو دڵنیاکەربێ، ئەگەرنا ئەو کەسەی بە پشت بەستن بە دەقێك کە بێهێزە، یاخود ڕاستییەکەی ساغ نەبووەتەوە، شتێك قەدەغە دەکات، دەچێتە بەر حوکمی ئەو ئایەتە موبارەکەی کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٞ وَهَٰذَا حَرَامٞ لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ١١٦﴾**النحل**، هەروەها بەوە کە زمانتان بە

درۆ دەیلێ، هەر لە خۆتانەوە مەڵێن: ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەڕامە، تاكو درۆ بە ناوی خواوە هەڵبەستن، ئەوانەی درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن سەرفرازنابن.

**٢-** لە هەر كام لە (**ابنُ عبَّاس**) و (**ابنُ مَسعود**)ەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) هاتوە كە: ﴿لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ﴾، [قسەی خافڵێنەر]یان بە (**الغِناء**) یاخود (**الغِناء وَنَحوهُ**)، گۆرانیی و شێوەی وی لێكداوەتەوە، ئنجا من دڵنیام كە ئەو دوو زاناو پسپۆڕەی قورئان و شەریعەت مەبەستیان ئەوە بووە كە چەمكی: ﴿لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ﴾، گۆرانییش دەگرێتەوە، نەك بڵێن مەبەست لە: ﴿لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ﴾، تەنیا گۆرانییە، هیچ گومانم لەوەدا نیە، چونكە خوا ﷻ دەیتوانی بفەرموێ: (**وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْتَرِي الغِنَاء**)، بەڵام فەرموویەتی: ﴿لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ﴾، واتە: قسەی خافڵێنەر، كە ئەوكاتە گۆرانییش دەگرێتەوە، حیكایەت گێڕانەوەش دەگرێتەوەو، زۆر شتی دیكەش دەگرێتەوە، كە ئێستا هەیەو كاتی خۆی نەبووە، بۆ وێنە: شانۆگەریی و فیلم و، ئەو قسەو باسانەی كە لە ئەنتەرنێت دا دەكرێن، لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان دا، ئێستا لەم ڕۆژگارەدا لە هەموو كاتێك باشتر، لە چەمك و واتای قسەی خافڵێنەرو قسەی پووچ و بێ ئامانج حاڵیی دەبین، لە ئەنجامی بەرەو پێشچوونی تەكنۆلۆجیای مەعلووماتیی و، ئەنتەرنێت و تۆڕە كۆمەڵایەتییەكاندا.

**٣-** وشەی (**لَهو**)، لە سوننەت و لە زمانی عەرەبییشدا، بە هەر جۆرە خافڵان و كات بەسەربردنێكی خۆش دەگوترێ، لە قسەو لە كردەوە، با چەند بەڵگەیەك لەو بارەوە بێنین:

### أ- وشەی (لهو) لە سوننەت دا:

**یەكەم:** {**عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّهَا زَفَّتْ امْرَأَةً إِلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَار، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا عَائِشَةُ! مَا كَانَ مَعَكُمْ مِنْ لَهْوٍ؟ فَإِنَّ الأَنْصَارَ يُعْجِبُهُمْ اللَّهْوُ}، (أخرجه البخاري:٤٨٦٧)**.

واتە: عائیشە دایكی بڕواداران (خوا لێی ڕازی بێ) ئافرەتێكی بۆ پیاوێك لە ئەنصارییەكان برد (پیاوێك لە پشتیوانەكان، بۆیان گواستوەتەوە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە! ئایا (**لَهو**)تان پێ نەبوو؟ چونكە پشتیوانەكان حەز لە (**لَهو**) دەكەن.

(لَهو)ش لە فەرهەنگەكانی زمان دا - وەك دوای باسیدەكەین - یانی: گۆرانیی، دەف، تەپڵ ... هتد، (لهو) ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە.

**دووەم:** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**فَصْلُ مَابَيْنَ الحَلاَلِ والحَرَامِ، ضَرْبُ الدُّفِّ وَالصَّوْتُ فِي النِّكَاحِ**}، (**أخرجه أحمد: ١٥٤٨٩، والترمذي: ١٠٨٨، وقال: حسن، والنسائي: ٣٣٦٩، وابن ماجه: ١٨٩٦، والطبراني: ٥٤٢، والحاكم: ٢٧٥٠، وقال: صحيح الإسناد**).

واتە: لێك جیاكەرەوەی حەڵاڵ و حەڕام، بریتیە لە لێدانی دەف و لە دەنگ، لە كاتی هاوسەرگیرییدا، دەنگ واتە: گۆرانیی و، دەفیش، كە لە عەرەبیی (**دُفّ**)ەو بە كوردیی (دەف) ئاشكرایە.

**سێیەم:** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**كُلُّ شَيْءٍ يَلْهُو بِهِ الرَّجُلُ بَاطِلٌ، إلاَّ رَمْيَ الرَّجُلِ بِقَوْسِهِ، أَوْ تَأْدِيبَهُ فَرَسَهُ، أَوْ مُلاعَبَتَهُ امْرَأَتَهُ، فَإِنَّهُنَّ مِنَ الْحَقِّ**}(**أخرجه الطيالسي: ١٠٠٦، ١٠٠٧، وأحمد: ١٧٣٣٨، والترمذي: ١٦٣٧، وابن ماجه: ٢٨١١، والحاكم: ٢٤٦٧، وقال: صحيح الإسناد**).

واتە: هەر (لَهو)ێك كە مرۆڤ پێی دەخافڵێ، پووچە، جگە لە سێ شتان: كە تیرو كەوانەكەی بەكاردێنێ بۆ تیرەندازیی (بۆ ئەوەی دەستی ڕاست بێ)،یان كە مەشق بە ئەسپەكەی دەكات، یان كە لەگەڵ ماڵ و خێزانی خۆیدا گەمەو یاریی دەكات، (ئەو سێیە هەرچەندە خافڵانن)، بەڵام هەقن (واتە: پاداشتیان لەسەرە).

**چوارەم:** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**سَتُفْتَحُ عَلَيْكُمْ أَرْضُونَ وَيَكْفِيكُمْ الله، فَلاَ يَعْجَزْ أَحَدَكُمْ أَنْ يَلْهُوَ بِأَسْهُمِهِ**}،(**أخرجه أحمد: ١٧٤٦٩، ومسلم: ١٩١٨**).

واتە: سەر زەمینانێكتان دەكەونە دەست (ئازادیان دەكەن)و، خواش ﷻ یارمەتیتان دەدات (دوژمنتان لە كۆڵ دەكاتەوە)، با یەكێك لە ئێوە دەستەپاچە نەبێ كە بە تیرەكانی خافڵان (یاریی) بكات، واتە: تیران بهاوێ و تیرەندازیی بكات، كە ئەو ناوی لێناوە (لَهو).

**ب - وشەی (لَهو) لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە:**

أ- **(الجَوهَري)**: گوتوویەتی: **(اللَّهْوُ:اللَّعِبُ)**[١]، واتە: **(لَّهو)**، یانی: یاریی.

ب- **(ابْنُ الفَارس)**: گوتوویەتی: **(كُلُّ شَيءٍ شَغَلَكَ عَنْ شَيء، فَقَدْ أَلْهَاكَ)**[٢]، واتە: هەرشتێك تۆ بێ ئاگا بكات و سەرقاڵت بكات، بتخافڵێنێ لە شتێك، ئەوە بۆ تۆ بووەتە خافڵێنەر **(لَهو)**.

ج- **(الخَليل بنُ أحمد الفَراهِيدي)** گوتوویەتی: **(اللَّهو ما شَغَلَكَ مِنْ هَوَىً وَطَرَبٍ)**[٣]، واتە: **(لَهو)** هەر شتێكە كە تۆ سەرقاڵبكات لە شتێك، لە ئارەزوو و دەنگی خۆشی ئینسان جووڵێنەر.

كەواتە: هەم لە ڕووی دەقەكانی سوننەتەوە، هەم لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە، بۆمان دەركەوت، كە **(لَهو)** هەر شتێكە مرۆڤ بخافڵێنێ، هەرشتێكە مرۆڤ سەرقاڵبكات، ئنجا چ پاداشتی لە بەرانبەردا هەبێ، وەك مەشقكردنی مرۆڤ بە ئەسپەكەی، كە ئێستا سەیارەو تەیارەو ئەوانە شوێنی دەگرنەوە، یاخود یارییكردن بە تیرەكان، تیرو كەوانەكەی، كە ئێستا تفەنگ و هەموو جۆرە چەكەكان كە سەربازەكان مەشقیان لەسەر دەكەن، شوێنی دەگرنەوە، یاخود یاریی و گەمە بكات لەگەڵ ماڵ و خێزانی دا.

٤- مەسەلەی **(لَهو)** بە گشتیی و گۆرانیی **(غِناء)** بە تایبەت، لەم ڕۆژگارەدا زێدەڕۆیی و لادانی زۆری تێدا كراوە، كاتی خۆشی هەر لەبەر ئەوە بووە، زانایان پێی هەستیار بوون و ئامێرەكانیان ناو ناوە: **(عادَةُ أهلِ المُجون)**، نەرێتی خەڵكی بێ بەندو بار، یان گوتوویانە: فلان ئامێرەو فلان ئامێرە، حەرامە بەكاربهێنرێن، لەبەر ئەوەی گوتوویانە: ئەوە عادەت و نەرێتی خەڵكی بێ بەندو بارە، ئەو ئامێرانە بەكاربهێنێ، نەك لەبەر خودی خۆیان، بەڵكو لەبەر ئەوەی عادەتی خەڵكی خراپە، واتە: ئەگەرنا لە ئەصڵدا ڕەواو موباحن، بەڵام لەبەر ئەوەی بە دەست خەڵكی خراپەوە بوون، بۆ ئامانجی خراپ و، لە شوێنی خراپدا بەكارهێنراون، زیاتر لەبەر ئەوە بەشێك لە زانایان پێیان هەستیار بوون.

---

(١) القاموس المحيط:ج٦، ص٢٤٨٧.

(٢) مُعجَم مقاييسُ اللغة: ج٥، ص ٤١٣.

(٣) البارِع في الُّلغة، لِأبي علي اسماعيل بنُ القاسم القالي البَغدادي ص١١٣.

٥- ئێمە لە كتێبی: (سروودو مۆسیقاو چەند بابەتێكی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا)[1]، لە بەشی سێیەمدا: {گۆرانیی و سروودو مۆسیقا}، باسێكی تێرو تەسەلمان لەو بارەوە كردوە، لە كۆتایی دا بە ناوونیشانی: [پوختەی قسان لە بارەی حوكمی گۆرانیی و سروودو مۆسیقاوە]، ئەوەم گوتوە كە ئێستا دەیخەمە ڕوو:

گوتوومە: خوێنەری بەڕێز!

خوای كاربەجێ ﷻ شتی حەڵاڵی بە دوو شێوە ڕوونكردۆتەوە:

١- بە كورتیی (**إجمالاً**) ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە كە ناكرێ سەرجەم جۆرو تاكەكانی شتە حەڵاڵەكان، كە یەكجار زۆرو زەوەندن، سەر ژمێر بكرێن، بەڵام بە گشتیی خوا ڕایگەیاندوە كە هەرچی لە ئاسمانەكان و زەوییدایە، بۆ بەندەكانی ڕام و دەستەمۆ كردوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴿١٣﴾ ﴾ **الجاثية**، واتە: هەرچی لە ئاسمانەكان و لە زەوییدا هەیە، لەلایەن خۆیەوە بۆ ئێوەی دەستەمۆو ڕامكردوە، (ئەوە جۆری یەكەمی ڕوونكردنەوەی شتی حەڵاڵ).

٢- بە درێژیی (**تَفصیلاً**) كە بریتیە لە باسكردنی چەند نموونەیەك، تاكو چاكەو نیعمەتی خۆی بەسەر بەندەكانیەوە دەربخات، بۆ نموونە، خوا دەفەرمویێ: ﴿ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ۖ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِىٓ أَخْدَانٍ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٥﴾ ﴾ **المائدة**.

واتە: ئەمڕۆ هەرچی پاك و چاكە بۆتان حەڵاڵ كراوە، هەروەها خواردن (سەربڕاو)ی ئەوانەی كتێبیان دراوەتێ بۆتان حەڵاڵەو، خواردن (سەربڕاو)ی ئێوەش بۆ ئەوان حەڵاڵە، هەروەها ئافرەتانی داوێنپاك لە بڕواداران و ئافرەتانی داوێنپاك لەوانەی لە پێش ئێوەدا كتێبیان دراوەتێ، بۆ ئێوە حەڵاڵن، (كە هاوسەرگیریيان لەگەڵدا بكەن)، هەر كات كرێیەكان (پاداشت و مارەییەكان)تان دانێ....

---

(١) لاپەڕە: ٧٠ - ٢٠٦، چاپی دووەم: ٢٠١٥ ز.

ئەوە بە نسبەت حەڵاڵەوە خوا ﷻ جاری وایە بە کورتیی و بە گشتیی باسیکردوەو، جاری واش هەیە چۆتە نێو وردەکارییەکان و هەندێ نموونەی باسکردوون، بەڵام خوای زاناو شارەزا ﷻ شتی حەرامی بە درێژیی خستۆتە ڕوو، نەك بە کورتیی، بەڵکو بەسەرجەم تاکەکانیەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿وَقَدۡ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيۡكُمۡ إِلَّا مَا ٱضۡطُرِرۡتُمۡ إِلَيۡهِ ﴿١١٩﴾﴾الأنعام، واتە: خوا هەرچی لێی قەدەغە کردوون، بە وردیی و بە ڕوونیی بۆی باسکردوون، مەگەر ئەوەی بۆی ناچاربن، ئەوەی بۆی ناچاربن، لە کاتی تێگیران و سەرتێوەستاندا، با لە ئەسڵ دا حەڕامیش بێت، بۆتان ڕەوا دەبێت.

لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەش هاتوە: {**عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «مَا أَحَلَّ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ فَهُوَ حَلالٌ، وَمَا حَرَّمَ فَهُوَ حَرَامٌ، وَمَا سَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ عَافِيَةٌ، فَاقْبَلُوا مِنَ اللَّهِ الْعَافِيَةَ، فَإِنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُنْ نَسِيًّا»، ثُمَّ تَلا هَذِهِ الْآيَةَ:** ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾﴾**مريم} (أخرجه الحاكم: ٣٤٧٧، وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ، ووافقه الذهبي).**

واتە: ئەبوو دەدەرداء ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر شتێك کە خوا لە کتێبی خۆیدا حەڵاڵی کردبێ، حەڵاڵەو، هەرشتێکیش کە قەدەغەی کردبێ، قەدەغەیەو، هەر شتێك لێی بێ دەنگ بوو بێ، ئەوە ڕەوایە، ئنجا ئەوەی خوا بۆی ڕەوا کردوون، لێی وەربگرن، چونکە ناگونجێ خوا هیچ شتێکی لە یاد بچێ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾﴾**مریم**، (واتە: پەروەردگارت هەرگیز شتی لە یاد ناچێ).

## ئێستاش دێینە سەر ئەنجامگیریی:

هەر کام لە گۆرانیی و ئامێرەکانی مۆسیقا، پێش ئیسلام هەبوون، کاتێك ئیسلامیش هاتووەو شەریعەت هاتۆتە خوارێ، هەرچەندە بە ڕوونیی و بە درێژیی باسی تێکڕای قەدەغە کراوەکانی کردوە، بەڵام باسی قەدەغە بوونی گۆرانیی و مۆسیقای نەکردوە، ئەوە قورئان لەبەر دەستماندایەو، ئەوە سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەریش ﷺ.

هەڵبەتە من لەو کتێبەدا [چەند بابەتێکی هونەریی ...]، باسی هەندێك دەقم کردوە کە زانایان کردوویانن بە بەڵگە، هەندێك ئایەت و، هەندێك دەقی سوننەت لەسەر: بە گشتیی قەدەغە بوونی گۆرانیی و ئامێرەکانی مۆسیقا، بەڵام ڕوونمان کردۆتەوە کە لە ڕاستییدا ئایەتەکان ئەوە ناگەیەنن و، فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش ﷺ، یان لە ڕووی سەنەدەوە ڕاست نین، یان لە ڕووی نێوەڕۆکەوە، پێغەمبەر ﷺ مەبەستی پێی شتێکی دیکە بووە، بۆیە وەك پوختەی ڕای خۆمان لەو بارەوە دەڵێین:

بناغەو نێوەڕۆکی گۆرانیی و مۆسیقا دەنگی خۆشە، دەنگی خۆشیش نیعمەتێکی خواییە وەك سەرجەم شتە ڕەوا (مُباح)ەکان و، لە ئەصڵدا ڕەوایە، بەڵام دوایی بە پێی ئەو چۆنیەتییەی پێی بەکاردێ، ئەو دەنگە خۆشە، چ هی بەشەر بێ، چ هی باڵندەبێ، چ هی ئامێرەکان بێ، بەگوێرەی ئەو ئامانجەی بۆی بەکاردێ و، بە پێی ئەو چۆنیەتییەی بۆی بەکاردێ، حوکمی دیاریی دەکرێ، ئەگەر بە چۆنیەتییەکی ڕەواو شەرعیی بەکاربێ، ئنجا تەماشای ئەو ئامانج و مەبەستە دەکەین کە بۆی بەکاردێ:

١- ئەگەر پێویست بوو، وەك قورئان خوێندنی فەڕزو، هاندانی خەڵك بۆ جەنگ و جیهاد لە کاتی پێویست بوونیدا، ئەوە پێویستەو، قورئانیش بە دەنگی خۆش دەخوێنرێ و، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**لَيسَ مِنَّا مَن لَم يَتَغَنَّ بالقُرآن**}، (**أخرجه البخاري: ٧٠٨٩، وأبو داود: ١٤٦٩، وغيرهما**)، واتە: هەر کەس دەنگی بە قورئان نەلارێنێتەوە، لە ئێمە نیە.

٢- ئەگەر ئامانج و مەبەستەکە پەسند بوو، بۆ نموونە: خۆشحاڵیی دەربڕین لە ڕۆژی جەژنداو، لە کاتی زەماوەنداو، هاندانی خەڵك بۆ کارێکی چاك، ئەوە ئەو دەنگە خۆشە چ هی مرۆڤ بێ، چ هی ئامێرەکان بێ، بەکارهێنانی بە پەسند (**مُستَحَبّ**) دادەنرێ، مادام ئەو ئامانجەی بۆی بەکاردێ، وابێ.

٣- بەڵام ئەگەر ئامانج و مەبەستەکە، شتێکی خراپ و قەدەغە بوو، بۆ نموونە: هاندانی خەڵك بۆ فەسادو بێ بەندو باریی و پێداهەڵگوتن و مەدحکردنی خەڵکی ستەمکار، ئەوە بێگومان ئامرازەکەش قەدەغەیە.

٤- ئەگەر بۆ ئامانج و مەبەستێکی ناپەسند (**مَکروُه**) بەکار بێ، بۆ وێنە: گوتنی قسەو شیعری ناپەسندو، هاندانی خەڵك بۆ شتی ناپەسند، ئەوە بەکارهێنانی ئەو ئامرازەش ناپەسندە.

٥- ئەگەر ئەو ئامانج و مەبەستە کە دەنگی خۆش و گۆرانیی و مۆسیقای بۆ دەکرێتە هۆکارو ئامراز، هیچ کام لەو چوار حاڵەتەی نەبن کە باسمانکردن، هیچ کام لەو چوار حوکمە شەرعییەش (پێویستبوون، پەسندبوون، قەدەغەبوون، ناپەسندبوون)ی بەسەردا نەچەسپن، ئەوە هەر لەسەر حاڵەتی ئەصڵیی خۆی، کە ڕەواییە ماوەتەوە.

کەواتە: گۆرانیی و مۆسیقا لە ئەصڵدا وەك دەنگ و سەدای خۆش، حەڵاڵ و زەلاڵە، بەڵام دوایی بە گوێرەی نێوەڕۆکیان و، چۆنیەتیی و ئامانجی بەکارهێنرانیان، حوکمەکەیان دەگۆڕێ، وەك (**العِزّ بن عَبدُالسَّلام**) لە کتێبی (**قَواعِدُ الأَحکام في مَصالِحِ الأَنام**) لە ژێر ناوونیشانی: (**حاسَّةُ السَّمْعِ وَمَا يَتَعَلَّقُ بِهَا مِنَ الأَحكامِ الخَمْسَة**)دا[١]، گوتوویەتی: گوێ ڕاگرتن لە دەنگ و سەدایەکان بە گشتیی پێنج حوکمە شەرعییەکانی بەسەردا دەچەسپن، ئەگەر ئامانجەکە واجب بێ، واجبە، سوننەت بێ، سوننەتە، ڕەوا بێ، ڕەوایە، ناپەسند بێ، ناپەسندە، قەدەغە بێ، قەدەغەیە.

---

(١)ج١، ص٣٤٢.

هەڵبەتە ئێمە لەو کتێبەدا کە ئاماژەم پێدا: (سروودو مۆسیقاو چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا)، بە تەفصیل باسمکردووەو، قسەی ئەوانەم هێناوە کە دەڵێن: بەگشتیی گۆرانیی و مۆسیقا حەرامن، هەروەك قسەی ئەوانەشم هێناوە کە دەڵێن: بە گشتیی هەموو جۆرەکانی گۆرانیی و بەکارهێنانی ئامێرەکانی مۆسیقا حەلاڵن، ئەوانەم هەموو بەرپەرچ داوەتەوەو، خەتی نێوەڕاست ئەوەیە کە دەگونجێ دەنگی خۆش چ هی مرۆڤ، چ هی ئامێرەکان، بۆ مەبەستی چاك بەکاربێ، دەشگونجێ بۆ مەبەستی خراپ بەکاربێ، ئنجا بە پێی جۆری بەکارهێنانی، ئەو ئامانجەی بۆی بەکاردێ، ئەو شوێنەی تێیدا بەکاردێ حوکمەکەی دەگۆڕێ.

٦- فراوانیی و کراوەو گونجاو پێشاندانی ئیسلام گرنگە:

لێرەدا قسەیەکی (**القُشَيري**) دێنم: (**قَالَ القُشَيري:ضُرِبَ بَينَ يَدَي النَّبيّ يَومَ دَخَلَ المَدينَةَ، فَهَمَّ أبوبَكرٍ بِالزَّجرِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: دَعهُنَّ يا أَبَابَكْرٍ حَتَّى تَعلَمَ اليَهودُ أنَّ دينَنَا فَسِيحٌ، فَكُنَّ يَضْرِبْنَ وَيَقُولْنَ: نَحْنُ بَنَاتُ النَّجَارِ ياحَبَّ ذا مُحَمَّداً مِن جارٍ**)، (**أخرجه البخاري:٩٥٢، ومسلم:٨٩٢، وابن حبّان: ٥٨٧٧**) قوشەیریی دەڵێ: (لە بەردەمی پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە چووە مەدینە دەف لێدرا [کۆمەڵە ئافرەتێك] ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ) ویستی تێیان بخوڕێ و بێدەنگیان بکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبوو بەکر! لێیانگەڕێ، با جوولەکەکان بزانن ئایینی ئێمە فراوانە، ئنجا ئافرەتەکان دەفیان لێدەداو دەیانگوت:

ئێمە کچانی بەنوو نەججارین، دراوسێی موحەممەد ﷺ چەند خۆشە!

لەو بارەوە دەقی دیکەش زۆرن، کە من لەو کتێبەدا هێناومن، کە لە صەحیحی بوخاریی و موسلیم داو، لە سەرچاوەکانی دیکەی سوننەت هاتوون، بۆ نموونە:

یەکێکیان ئەوەیە کە ئافرەتێك، کە پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێك گەڕابۆوە، هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! نەزرم کردوە ئەگەر تۆ بە سەلامەتیی گەڕایەوە، دەف لێبدەم و گۆرانیی بڵێم، ئەویش فەرمووی: {**إِنْ كُنْتِ نَذَرْتِ فَافْعَلِي وَإِلَّا فَلَا**}[1]، ئەگەر نەزرت کردوە، بیکە، ئەگەرنا، مەیکە.

دیارە سروودو گۆرانییەکانی ئەوانیش، هەر ئەو شیعرانە بوون کە شاعیرەکانیان گوتوویانن.

٧- بوونی ڕاجیایی لەو مەسەلەیەدا، بەڵگەی نەبوونی دەقی ڕوون و دیارییکەرە:

هەر کات دەقێك هەبێ کە بابەتێك یەکلایی بکاتەوەو هەڵیبڕێ، ڕاجیایی لە نێو زانایاندا پەیدا نابێ، ئنجا لە ڕاستییدا وەك پێشتریش ئاماژەیەکم پێدا: زانایان کە هەستیارییان پەیدا بووە بەرانبەر بە ئامێرەکانی گۆرانیی گوتن و ئامێرەکانی مۆسیقا، زیاتر لەبەر ئەوە بووە کە ئەو ژینگەیەی ئەوانی تێدا بوون، زیاتر خەڵکی خراپ و بێ بەندو بار ئەو ئامێرانەیان بەکارهێناون، بۆ ئامانجی خراپ و بۆ گۆرانیی خراپ و، بۆ مەبەستی خراپ و، بە چۆنیەتیی خراپ و ناشەرعیی، بۆیە هەستیارییان بەرانبەر پەیدا کردوون، ئەگەرنا ناگونجێ دەنگی خۆش هەر لەبەر ئەوەی دەنگی خۆشە، حەڕام بێ، چونکە خوا کە دەفەرموێ: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوییدایە، بۆ ئێوەی دروستکردووەو ڕەخساندوە، کە ئێوە لێیان بەهرەمەندبن، یەکێك لەو شتانەی کە خەڵك لێیان بەهرەمەندن، دەنگی خۆشە، شتی جوانە، شتی خۆشە، خوا بە گشتیی دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ

(١) {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ بَعْضِ مَغَازِيهِ فَجَاءَتْ جَارِيَةٌ سَوْدَاءُ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي كُنْتُ نَذَرْتُ إِنْ رَدَّكَ اللَّهُ تَعَالَى سَالِمًا أَنْ أَضْرِبَ عَلَى رَأْسِكَ بِالدُّفِّ، فَقَالَ: إِنْ كُنْتِ نَذَرْتِ فَافْعَلِي، وَإِلَّا فَلَا، قَالَتْ إِنِّي كُنْتُ نَذَرْتُ، قَالَ: فَقَعَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَضَرَبَتْ بِالدُّفِّ} أخرجه الترمذي: ٣٦٩٠، وأحمد: ٢٣٠٦١، تعليق شعيب الأرنؤوط : إسناده قوي.

﴿أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِ ﴿٣٢﴾﴾ **الأعراف**، بڵێ: کێ ئەو جوانییەی کە خوا بۆ بەندەکانی هێناویەتە دی، قەدەغەی کردووە، کێ بژیوە خۆش و بەتامەکانی قەدەغە کردوون؟!

واتە: خوا شتەکانی بەگشتیی بۆ مرۆڤەکانی خوڵقاندوون، بەڵام گرنگ ئەوەیە بەو شێوەیە بەکاربێن، کە لە چوارچێوەی شەریعەتدایەو بۆ ئامانجی شەرعیی و ڕەوا بەکاربێن و، بۆ هاندانی خەڵك بۆ چاکەکاریی، یاخود لانی کەم بۆ خافڵانێکی ڕەوا (**مُباح**) بەکاربێن، کات بەسەربردنێکی ڕەوا، نەك بۆ هاندانی خەڵك بەرەو گوناحو تاوان و، بەرەو زوڵم و ستەم و بەرەو خراپەو شتی قەدەغە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بڕوادارانی کردارچاك، بەهەشتە پڕ نازو نیعمەتەکانیان هەن، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، ئەوە بەڵێنی چەسپاوی خوایە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:**

١)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کردەوە باشەکانیان ئەنجامداون، باخ و بێستانە پڕ نازو نیعمەتەکانیان هەن.

بڕوایان هێناوە، واتە: بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، یانی: هەقیان ناسیوە، هەق بە چەمك و واتای فراوان و ڕاستەقینەی، کە لە ئیمان بە خواو، ئیمان بە فریشتەکان و، بە کتێبەکان و، بە پێغەمبەران و، بە ڕۆژی دوایی و، بە قەدەرو، ئیمان بە هەققانیەتیی ئەو شەریعەتەی کە موحەممەد ﷺ لە خواوە بۆی دابەزێنراوە، لەوەدا بەرجەستە دەبێ، ﴿وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، یانی: بە پێی ئەو هەققەش کە تێی گەیشتوون و وەریانگرتووە، لە عەقڵ و دڵیاندا چەسپاوە، مامەڵەیان کردوە، ڕەفتاریان کردوە، لە هەموو بوارەکانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییدا.

کە دەفەرموێ: ﴿لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ﴾، واتە: باخ و بێستانە پڕ نازو نیعمەتەکانیان بۆ هەن، لێرە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ﴾، لە بەرانبەر ئەوانەی پێشێدایە، کە قسەی خافڵێنەر دەکڕن، قسەی خافڵێنەریش وەك پێشتریش باسمان کرد: هەر شتێکە خەڵك بخافڵێنێ و بێ

ئـاگای بـكات، لـە شـتێك كـە پێویسـتە پێـوەی سـەرگەرم بـێ، كـە بـە ڕاسـتیی لـەم سـەردەم و ڕۆژگارەی ئێمـەدا، [قسـەی خافڵێنـەر] چەمـك و واتایەكـەی لـە هەمـوو ڕۆژگارێـك باشـتر بـۆ ئێمـە بەرجەسـتەیە، كـە بریتیـە لـە هەموو شـتانەی كاتـی خەڵك دەكـوژن، ئـەو هەمـوو هۆكارانـەی پەیداكـراون بەهـۆی ئەنتەرنێتـەوە، وەك تـۆڕە كۆمەڵایەتییـەكان بەهـۆی جۆرەكانیانـەوە: واتـس ئـاب و فەیسـبووك و ئینسـتیگرام و تویتـەرو... هتـد) كـە زۆر لەوانـە لـە ڕێـی موبایلیشـەوە بەكاردێـن و، خەڵكێكـی زۆر كاتێكـی زۆری لـێ دەڕواو تەمەنێكـی زۆری لـێ بـە زایـە دەچـێ، ئنجـا بەرانبـەر ئـەو جـۆرە كەسـانەدا، كـە بـە پـارەی خۆیـان قسـەی خافڵێنـەر (**لهـو الحديـث**) دەكـڕن و تەمەنـی خۆیـان كـە سـەرمایەی بوونیانـە، دەیسـووتێنن لـە بەرانبـەر ئەوانـدا، ئـەو جـۆرە كەسـانە هـەن، كـە بڕوایـان هێنـاوە بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێنـرێ و، كـردەوە باشـەكانیش ئەنجـام دەدەن، ئەوانـە بـاخ و بێسـتانە پـڕ نـازو نیعمەتەكانیـان هـەن.

٢)- ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، بێ كۆتایی و بڕانەوە.

٣)- ﴿ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗا ﴾، بەڵێنی ڕاست و چەسپاوی خوایە.

(**وَعَدَهُـمُ اللَّـهُ وَعْـدَاً حَقَّـاً، لا شَـكَّ فِيـهِ، وَلا خـلافَ لَـهُ**)، خـوا بەڵێنێكـی ڕاسـتی پێـداون كـە گومـان و دوو دڵیـی تێدانیـەو، پێچەوانەشـی نیـە كـە بەڵێنەكـە دێتـە دی.

٤)- ﴿ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، خواش زاڵی كارزانە، بە دڵنیایی زاڵێتیی و باڵا دەستیی خوا، هەروەها كاربەجێیی خوا، خوازیاری ئەوەن، بەڵێنی خۆی بەرێتە سەر.

لـە سـوورەتی (**الكهـف**)دا خـوای تـاك و پـاك دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتۡ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡفِرۡدَوۡسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبۡغُونَ عَنۡهَا حِوَلٗا ﴿١٠٨﴾ ﴾، واتـە: بـە دڵنیایـی ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاو كـردەوە باشـەكان ئەنجـام دەدەن، باخەكانـی (فیردەوس)یـان بـۆ دەكرێـن بـە شـوێنی دابەزێنـران و شـوێنی میوانداریـی، تێیانـدا دەمێننـەوە بـە هەمیشـەیی، ئاواتیـش ناخـوازن لێیـان بچنـە دەرێ.

چونکە هەیە بیربکاتەوەو بڵێ: ئەو تەمەنە نەبڕاوە بێ کۆتاییەی ئینسان، ئایا بێزار نابێ تێیدا؟ ئایا دەبێ پێی خۆش نەبێ لەوێ لابچێ و بچێ بۆ شوێنێکی دیکە؟ بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا﴾، چونکە ئینسان لە هەر شتێك بێزار دەبێ بۆ شتێکی دیکە، لەبەر ئەوەیە کە شتێکی لەوە چاکتر یان خۆشتر شك دەبات، بەڵام هەموو ئاواتەکانی مرۆڤ لە بەهەشتدا دێنە دی، پاشان لە بەهەشتدا ژیانێکی وشك و ڕۆتینیی نیە، کە ئینسان بێزار بکات، بەڵکو خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێ: ﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ ﴿٧١﴾﴾ **الزخروف**، هەرچی نەفسەکان بیخوازن و چاوەکان لەززەتی لێبکەن، تێیدا هەیە، کەواتە: هەرچی مرۆڤ بیخوازێ، سروشتی مرۆڤ بیخوازێ و مرۆڤ ئارەزووی بکات، لێیەتی.

## مەسەلەی چوارەم:

**خـوا ئاسـمانەکانی بـە کۆڵەگـە نەبینـراوەکان ڕاگرتـوون و، چیایەکانیشـی کردوونـە مایـەی لەنگەرگرتـن و نەجووڵانـی زەوی، ژیاندارانـی زۆریشـی لـە زەوییـدا بڵاوکردوونـەوەو، بـە ئـاوی لەسـەرەوە دابەزێندراویـش، هـەر ڕووەکێکـی بەرهەمـداری ڕوانـدوەو، پەرستراوانی ساختەی دیکـەش، هیـچ کام لەوانەیـان پـێ دروسـت ناکرێـن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٖۚ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿١١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

**١)-** ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَا ﴾، خوا ﷻ ئاسمانەکانی بە کۆڵەکانێك کە ئێوە نایانبینن، دروستکردوون.

لـە سـووڕەتی (الرعـد)دا دەفەرمـوێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَا ﴿٢﴾ ﴾**الرعـد**، خـوا ئـەو زاتەیـە کـە ئاسـمانەکانی بەرزکردوونەوە بـە کۆڵەکانێك کـە نایانبینـن، یاخـود بەبـێ کۆڵەکـە، کـە بیانبینـن، پێشـتریش ئاماژەمـان پێـداوە لـە تەفسـیری سـووڕەتی (**الرعـد**)داو، لـەو بـارەوە قسـەمان کـردوە کـە زانایـان لـە بـارەی ئـەم ڕسـتەیەوە: ﴿بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَا ﴾، دوو ڕایـان هـەن:

**١-** خوا ئاسمانەکانی دروست کردوون و بەرز کردوونەوە بە کۆڵەکانێك، کە نایانبینن.

**٢-** ئێوە ئاسمانەکان دەبینن هیچ کۆڵەکەیان نین.

ئێمە دوایی لە خستنەڕووی چەند سەرنجێکدا، زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەوە مەسەلەیەو، قسەی هەندێك لە زانایان لەو بارەیەوە دێنین.

٢)- ﴿وَأَلْقَىٰ فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾، هەروەها (خوا)، چیایەکانی خستوونە نێو زەوی و تێیفڕێداون، تاکو نەتانجووڵێنێ.

﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾، یانی: (**كَرَاهَةَ أَن تَمِيدَ بِكُم**)، لەبەر پێناخۆشبوونی ئەوە کە بتانجووڵێنێ، یاخود: (**لِأَن لا تَميدَ بِكُم**)، بۆ ئەوەی نەتانجووڵێنێ، خوا چیایەکانی تێفڕێداون، چیا قورسەکان تاکو زەوی لەنگەر بگرێ، لە سوورەتی (**النحل**)دا دەفەرمووێ: ﴿وَأَلْقَىٰ فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ ﴿١٥﴾﴾ **النحل**، هەر هەمان تەعبیریش لەوێدا هاتووە، کە ئێمە کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (**النّحل**)دا، لەو بارەوە قسەمان کردوە، واتە: چیایە قورسەکانی خستوونە نێو زەوی، بۆ ئەوەی نەتانجووڵێنێ ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾، یانی: (**لِأَن لا تَميدَ بِكُم**)، تاکو نەتانجووڵێنێ.

(**تَمِيدَ**) یانی: (**تَمِيلَ**)، واتە: مەیەلان بکات و بتانجووڵێنێ و جووڵە جووڵ بکات لە ژێرتاندا.

لە ڕابردووشدا چەند جارێك باسمان کردوە: چیایەکان، کە خوا ﷻ لە سوورەتی (**النبأ**)دا دەفەرمووێ: ﴿وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾﴾ **النبأ**،چیایەکانمان کردوونە گوڵمیخ (سینگ)، زانایان دەڵێن: هەر چیایەك چەندەی بەدەرەوەیە، لە ڕێکاری دەریاوە (١٠ - ١٥) هێندەی لە ناخی زەویدایە، بۆ وێنە: چیای هیمالایا کە نیزیکەی نۆ کیلۆمەتر (٩کم) بەرزە، لووتکەی ئیڤریست بەرزییەکەی: (٨٩٦٤) مەترە، دە پازدە (١٠ - ١٥) هێندەشی بە ناخی زەویدا چووەتە خوارێ، بۆیە توێکڵی زەوی کە ئێمە لەسەری دەژین، بەهۆی ئەو چیایانەوە چینێکی بەردینی زۆر پتەو، بەهۆی چیایەکانەوە ڕووکاری زەوی داگرتووە، کە دەبێتە هۆی ئەوەی توێکڵی زەوی پتەو بێ و، پێکەوە پەیوەست بێ و نەجووڵێ.

٣)- ﴿ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ ﴾، هەروەها (خوا) لە هەموو ژیانداریکی تێدا (لە زەوی دا) بڵاوکردۆتەوە، لە هەر ژیانداریك، یانی: لە هەر شتێك کە لەسەر زەوی، دەڕوات، هەم زیندەوەران دەگرێتەوە، هەم ئاژەڵان، هەم پەڕەوران، هەم دڕندان، هەموو ئەوانەی کە لەسەر زەوی دەژین.

(بَثَّ) یانی: (نَشَرَ) بڵاوی کردۆتەوە، (فیها) ڕاناوەکەی بۆ زەوی دەچێتەوە، چونکە پێشتر باسی زەوی کراوە، بۆیە خوا ڕاناوی (ها) بۆ ئەوێ دەباتەوە، لەو زەوییەدا کە پێشتر باسکرا، هەموو ژیانداریکی بڵاوکردۆتەوە.

٤)- ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، لە سەرێوەش ئاومان دابەزاندوە.

وەك زۆرجاران باسمان کردوە هەمیشە خوا باسی ئاو دەکات کە دایبەزاندوە، چونکە ئاو: باران و بەفرو تەرزە، هەروەها ئاونگ و هەڵمی ئاویش دەگرێتەوە.

٥)- ﴿ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴾، ئنجا لە وێدا، ڕوواندومانە (بەهۆی ئەو ئاوەوە) لە هەر ڕووەکێکی بەرهەمدار، (زَوج) بە مانای (صنف) دێ، لە هەر جۆرێك، (کَریم)یش یانی: (حَسَناً کَثیرَ الخَیر) چاك و بەرهەمدار، یان: (کَریم: الجَیِّدُ مِنْ نَوعِهِ)، هەر شتێك کە لە جۆری خۆی زۆر باش بێ، دەشگونجێ (زوج) بە مانای ڕووەك (نبات) بێ، چونکە ڕووەکەکانیش هەموویان نێرو مێیان هەیە.

٦)- ﴿ هَٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ ﴾، ئەمە دروستکراوی خوایە، ئەوەی باسکرا:

أ- ئاسمانەکان بە کۆڵەکەی نەبینراو، ڕاگیراون، یاخود ئاسمانەکان بەرزکراونەوە، دەیانبینین بێ کۆڵەکەن.

ب- زەوی چیایەکانی تێدا دانراون، بۆ ئەوەی جووڵە جووڵ نەکات لە ژێرتاندا.

ج- لە هەموو زیندەوەرێکی لە زەویدا بڵاوکردوەتەوە.

د- خوا لە سەرێوە ئاوی دابەزاندوە.

هـ- لە هەموو ڕووەکێکی پڕ بەرهەمداری پێ ڕواندوە.

٧)- ﴿ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ﴾، دەجا پێشانمدەن ئەوانەی جیا لەو [کە بریتین لەو شتانەی دەپەرسترێن لەگەڵ خوا، جگە لە خوا، لە جیاتی خوا]، چییان دروستکردووە!

کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَرُونِي ﴾، پێشانمدەن، دەگونجێ مەبەست پێی دیتنی چاویی (**الرؤية البَصَرِيَّة**) بێ، واتە: دەگونجێ پێشان بدرێ بە چاو، دەشگونجێ مەبەست بینینی دڵ و زانستیی (**الرؤية القَلْبيَّة وَالعِلميَّة**) بێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ﴾، (**إجْرَاء اسمُ المَوْصُولِ العُقَلاَء عَلَى الأَصْنَامِ، مُجَارَاةً لِلمُشرِكِين إذ يَعُدّونَهَا عُقَلاء**)، خوا ناوی (**مَوصول**) کە بۆ عاقڵان بەکاردێ، بۆ بتەکانی بەکارهێناوە، ئەمە لەگەڵدا ڕۆیشتنی هاوبەش بۆخوا دانەرانە، کە ئەوان پێیان وابوو بتەکانیان عەقڵ و هۆشیان هەیە، دواتر خوا بە پێی عەقڵی ئەوان ئەو ڕاناوەی بۆ بەکارهێناون.

٨)- ﴿ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾، بەڵکو ستەمکاران لە گومڕاییەکی ئاشکرادان، واتە: ئەو پەرستراوە ساختانە هیچیان دروست نەکردووە، بەڵام ستەمکارانێك کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن لە گومڕاییدان، نەك لەبەر ئەوەی پەرستراوەکانیان شتیان دروستکردووە، بەڵکو لەبەر ئەوەی خۆیان سەرگەردانن و لە گومڕاییەکی ئاشکرادان، دەیانپەرستن.

کە دەفەرموێ: ﴿ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾، (**بَل: لِلإضرابِ الإنتِقَالِي مِن غَرَضِ المُجَادَلَةِ إلى غَرَضِ تَسجيلِ ضلالِهِم**)، (**بَل**): بۆ گواستنەوەیە لە مەبەستی موناقەشەو شەڕە قسەوە، بۆ مەبەستی تۆمارکردنی گومڕاییەکەیان.

هەروەها: ﴿ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾، یانی: لە نێو گومڕاییدان و گومڕایی هەر چوار دەوری گرتوون، گومڕاییەکەش زۆر ڕوون و ئاشکراو بێ پێچ و پەنایە.

## پێنج کورتە سەرنج

١- ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَا ﴾، **(الطبري)** گوتوویەتی: **(بِغَيرِ عَمَدٍ كَمَا تَرَونَهَا)** ئاسمانەکان بە بێ کۆڵەکە دروستکراون و ڕاگیراون، وەك دەیانبینن، یانی: ئاسمانەکان دەبینین کە کۆڵەکەیان نین، یاخود: **(لَهَا عَمَدٌ غَيرُ مَرْئِيَةٍ)** کۆڵەکەیان هەن، بەڵام کۆڵەکەکان نابینرێن، وادەبینرێ کە مەبەست پێی هێزی کێشندە **(قوة الجاذبيّة)**یە.

لە بارەی ئەوەوە کە خوا ﷻ ئاسمانەکانی ڕاگرتوون و بەرزکردوونەوە، چەند ئایەتێك هەن:

أ- لە سووڕەتی **(فاطر)**دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: بێگومان خوا ئاسمانەکان و زەوی دەگرێ کە لابچن و بەملاولادا بڕۆن و، ئەگەر لابچن لە دوای خوا، کەس نیە بیانگرێ، [بەس خوا ڕاگیری کردوون]، بێگومان خوا زۆر هێدیی و مەندو زۆر لێبوردەیە.

ب- لە سووڕەتی **(الحج)**دا، هەمان مەبەست بە تەعبیرێکی دیکە دێنێ: ﴿ وَيُمۡسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦٓۚ ﴿٦٥﴾ ﴾، واتە: (خوا) ئاسمان دەگرێ کە بکەوێتە سەر زەوی، مەگەر بە مۆڵەتی خۆی، ئاسمان دیارە هەمووی جێی نابێتەوە بکەوێتە سەرزەوی، یانی: پارچەیەك لە ئاسمان، پارچەیەك لە خڕۆکەکان بکەوێتە سەرزەوی، جار جار پارچەی ورد دەکەونە سەر زەوی، بەڵام ئەوە کە پارچەیەکی گەورە بکەوێتە سەر زەوی و، خەڵکی سەر زەوی و، هەموو ئەوانەی لەسەر زەویین، بفەوتێن، خوای میهرەبان دەیگرێ و ناهێڵێ ئەوە ڕووبدات، ﴿ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦٓۚ ﴾، مەگەر ئەو کاتەی خوا ﷻ بیەوێ ژیان لەسەر زەوی کۆتایی پێ بێنێ.

ج- هەروەها لەو بارەوە، ئەم دەقەش هەیە لە سووڕەتی **(النحل)**دا، کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ مُسَخَّرَٰتٖ فِي جَوِّ ٱلسَّمَآءِ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُۚ ﴿٧٩﴾ ﴾، واتە:

ئایا سەرنجیان نەداوەتە باڵندەکان، دەستەمۆ کراون، ڕامکراون، لە هەوای ئاسماندا، لە هەوای سەرێدا، جگە لە خوا هیچ کەس نایانگرێ.

**د-** هەروەها لە سوورەتی (**الملك**)یشدا، هەمان مەبەست دووبارە بۆتەوە: ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ فَوۡقَهُمۡ صَٰٓفَّٰتٖ وَيَقۡبِضۡنَۚ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحۡمَٰنُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءِۭ بَصِيرٌ ١٩﴾، واتە: ئایا سەرنجیان نەداوەتە باڵندان لە سەروویانەوە، بە ڕیز وەستاون، باڵەکانیان پان ڕاخستوون و، جار جار باڵەکانیشیان لێك دەدەن، جگە لە خوای خاوەن بەزەیی هیچ کەسێك نایانگرێ، ئەو بینەری هەموو شتێکە.

ئێستاش چەند قسەیەك لە (**الطَّبَري**)وە دێنین:

**یەك:** (**الطَّبَري**) لە (**ابنِ عَبَّاس**)ەوە دەیهێنێ، دەڵێ: (**لَعَلَّهَا بِعَمَدٍ لا تَرَونَهَا**)[١]، واتە: ڕەنگە ئاسمانەکان بە چەند کۆڵەکەیەك وەستا بن، کە ئێوە کۆڵەکەکان نەبینن.

**دوو:** (**الطَّبَري**) لە (**مُجاهِد**)ەوە دەیهێنێ: (**إِنَّهَا بِعَمَدٍ لاَ تَرَونَهَا**)[٢]، واتە: ئاسمانەکان بە چەند کۆڵەکەیەکن (یانی: بە چەند کۆڵەکەیەك وەستاون)، کە ئێوە کۆڵەکەکان نابینن.

**سێ:** هەروەها (**الطَّبَري**) لە (**عِكرِمة**)ەوە دێنێ، دەڵێ: (**تَرَونَهَا بِغَيرِ عَمَدٍ، وَهِيَ بِعَمَدٍ**)[٣]، واتە: ئێوە ئاسمانەکان دەبینن بە بێ کۆڵەکە، بەڵام کۆڵەکەیان هەن.

**چوار:** هەر (**الطَّبَري**)[٤]، لە (**ابنِ عَبَّاس**)ەوە دەیهێنێ دەڵێ: (**لَهَا عَمَدٌ لا تَرَونَهَا**) واتە: ئاسمانەکان کۆڵەکەیان هەن، بەڵام ئێوە کۆڵەکەکان نابینن.

هەر کام لەو چوار قسانە کە (**الطَّبَري**) بەو ژمارانەی کە باسمکردن هێناونی، پشتگیریی ئەو ڕایە دەکات، کە ئەو ئاسمانانە کۆڵەکەیان هەن، بەڵام کۆڵەکەکان

---

(١) جامع البيان: ٢٨٠٧٣.

(٢) جامع البيان: ٢٨٠٧٤.

(٣) جامع البيان: ٢٨٠٧٦.

(٤) جامع البيان: ٢٨٠٧٧.

نەبینراون، ئنجا زانستی گەردووناسیی ئێستا دەریخستوە کە هێزی کێشندە هۆکاری ڕاوەستانی گەردوونە بە هەموو پێکهاتەکانیەوە، بۆ وێنە: لە نێوان مانگ و زەویدا، لە نێوانی زەوی و خۆردا، خۆر زەوی بە لای خۆیدا دەکێشێ، هەروەها زەوی مانگ بە لای خۆیدا دەکێشێ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا یەکدیش پاڵ پێوە دەنێن، هەم یەکدی ڕاکێشانیان هەیە، هەم یەکدی فڕێدان و پاڵ پێوەنانیان هەیە، لە ئەنجامی ئەو کێشان (**جَذب**) و فڕێدان (**طَرد**)ەدا، ئەو سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆرداو، سووڕانەوەی مانگ بە دەوری زەویدا، هەروەها سووڕانەوەی خۆر بە دەوری داڵی ڕاوەستاوداو، هەروەها کەهکەشانەکان هەموویان، لە ئەنجامی ئەو هێزی ڕاکێشان و پاڵ پێوەنانەدا، ئەو خولانەوانە دروست دەبن و، ئەو ئەستێرەو خڕۆکەو کەهکەشانانە بەو شێوەیە ڕادەوەستن.

٢- ﴿ وَأَلْقَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ ﴾، چەسپاوەکانیشی فڕێداونە نێو زەوی، تاکو نەتانجووڵێنێ.

لە سووڕەتی (**الأنبياء**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا فِي ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ ﴿٣١﴾ ﴾، لەوێ بە شێوەی نادیار (غیاب) هاتوە، لێرەدا بە شێوەی دواندن (**خطاب**)، پێشەوا (**الطَّبَري**) لە بارەی: ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾ەوە، دەڵێ: (**أَنْ لاَ تَمِيدَ بِكُم، يَقُولُ: أَنْ لاَ تَضْطَرِبَ بِكُم، وَلاَ تَتَحَرَّكَ يُمْنَةً وَيُسْرَةً، وَلَكِن تَستَقِرُّبِكُم**)[1]، واتە: ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾، یانی: بۆ ئەوەی نەتانجووڵێنێ، جووڵە جووڵ نەکا لە ژێرتاندا، بە لای ڕاست و چەپدا نەجووڵێ، بەڵکو سەقامگیرو ڕاوەستاو بێ لە ژێرتاندا.

لووتکەی ئێڤریست لە چیای هیمالایا کە هەشت هەزارو هەشت سەدو شەست و چوار (٨٨٦٤) مەتر بەرزە، دەوری نۆ کیلۆمەتر، ئنجا هەر چیایەك چەندەی بە دەرەوەیە (١٠ - ١٥) هێندەشی لە ناخی زەویدایە، بۆیە خوا ﷻ لە سووڕەتی (**النبأ**)دا بە وشەی گوڵمیخەکان (**أوتاد**) چیایەکانی ناوهێناوە، کە بە تەئکید ئەو چیایانە دەبنە هۆی ئەوەی توێکڵی زەوی زۆر مەحکەم بێ.

---

(١) جامع البيان: ج٢١، ص٨٧.

**٣-** كە دەفەرموێ: ﴿ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ ﴾، هەزاران جۆر ژیاندارو زیندەوەری ئاویی، خاكیی، دەریایی، ژێر زەوی هەن، كە زانایان دەڵێن: زیندەوەرە نەبینراوەكان كە لە ژێر زەویدا هەن و، لە هەموو شتێكدا هەن، ئەگەر كۆ بكرێنەوە سەریەك لە ڕووی قەبارەشەوە، زۆر زۆر زیاترن لە ژیاندارە بینراوو بەرهەستەكان.

**٤-** كە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، لەسەرێوە ئاومان دابەزاندوە، باسمانكرد: ئەو ئاوەی دادەبەزێنرێ، بە سێ جۆری: باران و بەفرو تەرزە، دادەبەزێ، بۆیە هەمیشە خوا وشەی ئاو (**ماء**) بەكاردێنێ، تاكو هەر سێ حاڵەتەكە بگرێتەوە و، جگە لەوانیش بگرێتەوە.

**٥-** كە دەفەرموێ: ﴿ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴾، لە هەموو جۆرە ڕووەكێكی بەرهەمدارمان پێ ڕواندوە، بەو ئاوە، وشەی (**كَرِيم**) واتە: بەرهەمدارو چاك لە جۆری خۆی، وەك لە دەرسەكانی ڕابردوودا لە تەفسیری سوورەتی (**الشعراء**)دا، باسی ڕووەكمان كرد بە گشتیی لەبەر ڕۆشنایی تەفسیری (**النَّابلُسي**)دا، بە دڵنیاییش جیهانی ڕووەك هەر لە سەوزەوە بگرە، تاكو تەڕەكارو، دارو درەخت و میوەو هەموو ئەوانە كە خوا لەسەر زەوی ڕوواندوونی، جیهانێكی زۆر قەڵەباڵغەو زۆر گەورەو گرنگە و، ژیانی بەشەریش بە ڕووەكەوە بەندە، هەروەك ژیانی ئاژەڵیش بە ڕووەك و شیناوردەوە پەیوەستە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە هەشت (٨) ئایەت پێك دێ، ئایەتەكانی: (١٢ - ١٩)، ئەو هەشت ئایەتە تەرخانكراون بۆ باسی (لقمان) خوا لێی ڕازی بێ، كە خوا حیكمەتی پێداوەو، ئەویش چەند ئامۆژگارییەكی زۆرحەكیمانەی كوڕەكەی دەكات، كە زۆربەی بوارەكانی دین و ژین دەگرنەوە، وەك:

١- خوا پەرستیی و، خۆ پاراستن لە شیرك.

٢- چاكە لەگەڵ باب و دایك دا.

٣- چاكەو تاعەتكردن و خۆپاراستن لە گوناهو خراپە، كە هەمووی دێتەوە ڕێی مرۆڤ.

٤- نوێژ بەرپاكردن.

٥- فەرمان بە پەسند.

٦- ڕێگری لە ناپەسند.

٧- خۆڕاگریی لەسەر بەڵاو گرفتاریی.

٨- ڕوو لە خەڵك گرژ نەكردن.

٩- بە فیزو كەشخە بەڕێدا نەڕۆیشتن و، بەشێوەیەكی میانجیی ڕێكردن و بەڕێداڕۆیشتن.

١٠- دەنگ زۆر هەڵنەهێنان.

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن
كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ
إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ
وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن

تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ
مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ
مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِي ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ
ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ
مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ
إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَٱقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ
ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی حیکمەتیشمان بە لوقمان دابوو کە: سوپاسی خوا بکە، هەر کەسێکیش سوپاس (ی خوا) بکات، تەنیا بۆ خۆی (بە سوودی خۆی) سوپاسگوزاریی دەکات و، هەر کەسیش سپڵەیی (بەرانبەر بە خوا) بکات، بێگومان خوا بێنیازی ستایشکراوە ﴿١٢﴾ یادیش بکەوە کاتێك لوقمان بە کوڕەکەی خۆی گوت، لە کاتێکدا ئامۆژگاریی دەکرد: ئەی کوڕێژگەکەم! (خوا بپەرستەو) هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، بێگومان هاوبەش دانان (بۆ خوا) ستەمێکی مەزنە ﴿١٣﴾ مرۆڤیشمان ڕاسپارد (بە چاکەکاریی) لە بارەی باب و دایکیەوە: دایکی بێهێزیی لەسەر بێهێزیی (لە سکیدا) هەڵیگرتووەو، (ماوەی شیرپێدان و) لە شیر بڕینەوەشی لە میانی دووساڵان دایە، (ڕامان سپارد) کە سوپاسی من و دایك و بابت بکە، سەرەنجام تەنیا بۆ لای منە ﴿١٤﴾ ئەگەر (باب و دایکیشت) لەگەڵت دا تێکۆشان، شتێك بکەیە هاوبەشم کە زانیارییت پێی نیە (بوونی نیە)، بەقسەیان مەکە، بەڵام لە (ژیانی) دنیادا بە شێوەیەکی پەسند هاوەڵایەتییان بکەو، شوێن ڕێبازی ئەو کەسەش بکەوە، کە

لە ناخەوە بۆ لای من گەڕاوەتەوە، دواییش گەڕانەوە (ی هەموو لایەك) تەنیا بۆ لای منە، ئنجا هەواڵی ئەوەتان پێدەدەم کە دەتانکرد ﴿١٥﴾ ئەی کوڕیژگەکەم! بە دڵنیایی ئەگەر کردەوە هێندەی گرانایی دەنکێکی خەرتەلە بێ لە نێو گابەردێکدا بێ، یان لە ئاسمان بێ، یان لە زەویدا بێ (ڕۆژی دوایی) خوا دەیهێنێ، بێگومان خوا پەنهانزانی شارەزایە ﴿١٦﴾ ئەی کوڕیژگەکەم! نوێژ بەرپا بکەو، فەرمان بە پەسند بکەو، ڕێگریی لە ناپەسند بکەو، لەسەر ئەو (ناخۆشیی)ەی تووشت دێ خۆڕاگربە، بەڕاستیی ئەوە لەو کارانەیە کە (لەلایەن خواوە) پێویست کراون ﴿١٧﴾ (لەبەر خۆ بەزلگریی) ڕووت لە خەڵکی وەرمەگێڕەو، زۆر شادمانانە بەسەر زەویدا مەڕۆ، بێگومان خوا هەر لە خۆباییەکی شانازییکەری خۆشناوێ ﴿١٨﴾ لە ڕۆیشتنیشتدا میانجیی بەو، لە دەنگیشت بگرەوە (لە کاتی قسەکردندا)، چونکە ناخۆشترینی دەنگان دەنگی کەرانە ﴿١٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(اَلْحِكْمَةَ): بە کوردیی دەگونجێ بڵێین: دانایی، کارامەیی، لێزانیی، چەند پێناسەیەکی هەن، کە ئێستا سێیان دێنین:

١- یەکێك لە پێناسەکانی: **(إِصَابَةُ الحَقِّ عِلْمَاً وَعَمَلاً)** حیکمەت ئەوەیە ئینسان لە ڕووی زانیاریی و لە ڕووی کردەوەوە، هەق بپێکێ.

٢- هەروەها پێناسە کراوە بە: **(العِلْمُ النَّافِع وَالعَمَلُ الصَّالِح)** زانیاریی بەسوودو کردەوەی باش، کە لەگەڵ ئەوەی پێشێ دا تێك دەکاتەوە.

٣- هەروەها پێناسە کراوە بە: **(معرِفَةُ حَقَائِقِ الأَشْيَاءِ عَلَى مَا هِيَ عَلَيْهِ لِقَصْدِ العَمَلِ بِمُقتَضَى العِلْمِ)** ناسینی چییەتی شتەکان، وەك لە واقیعدا هەن، بە ئامانجی کردەوە کردن بە پێی زانیاریی.

(يَعِظُهُۥ): واتە: ئامۆژگاریی دەكرد، (الوَعْظُ: كَلامٌ يَرِقُّ لَهُ القَلْبُ)، (وَعْظ): بریتیە لە قسەیەك كە دڵ بۆی نەرم بێ، واتە: بە سۆزو هەست و نەستەوە، ئامۆژگارییەكە ئاڕاستە بكرێ و، سەرەنجام دڵی بەرانبەرەكە بۆی نەرم بێ و وەربیگرێ.

(وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ): واتە: بێهێزیی لەسەر بێهێزیی، یان لە دوای بێهێزیی، (الوَهْنٌ: مَصْدَرٌ، وَهَنَ يَهِنُ وَهْنَاً)، واتە: (ضَعُفَ يَضْعُفُ ضُعْفَاً أو ضَعْفَاً) بێهێزبوو، (الوَهْنُ:الضُّعْفُ، وَقِلَّةُ الطَّاقَةِ عَلَى عَمَلِ شَيءٍ، وَهْنَاً عَلَى وَهْن، أي:وَهْنَاً وَاقِعَاً عَلَى وَهْن)، (وَهن): بریتیە لە بێهێزیی و كەم توانایی لەسەر ئەنجامدانی كارێك.

كە دەفەرموێ: (وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ)، واتە: بێهێزییەك كەوتۆتە سەر بێهێزییەكی دیكە، دەشگونجێ مەبەست لە بێهێزیی لە دوای بێهێزیی، ئافرەت كە تۆلدار دەبێ بە منداڵ، بێگومان ڕۆژ بۆ ڕۆژ لە هێزی خۆی كەم دەبێت و، دەچێتەسەر هێزی كۆرپەكە، بۆ ئەوەی گەشە بكات.

(وَفِصَٰلُهُۥ): (الفِصَالُ: الفِطَامُ، وَهُوَ الفَصْلُ عَنِ الرِّضَاعَة)، (فِصَال)، واتە: (فِطَام)، (فَطَمَتِ المرأَةُ الطِّفْلَ عَنِ الرِّضَاعَةِ)، ئافرەتەكە منداڵەكەی لە شیر بڕیەوە، واتە: چیدیكە شیری پێ نەدا.

(جَٰهَدَاكَ): واتە: زۆر لەگەڵت تێكۆشان و هەوڵیان لەگەڵدای، (المُجَاهَدَةُ: شِدَّةُ السَّعِيّ وَالإِلْحَاح)، (مُجَاهَدَة): بریتیە لە زۆر هەوڵدان و سووربوون لەسەر شتێك، كەواتە: (جَاهَدَاك) یانی: (بَذَلا مَا فِي وِسعِهِمَا مَعَكَ)، واتە: هەرچی لە توانایاندا هەیە لەگەڵ تۆ بەكاریان هێنا، بۆ ئەوەی تۆ بێننە سەر ئەو قەناعەتەی خۆیان.

(وَصَاحِبْهُمَا): (أي: عَاشِرْهُمَا)، واتە: هاوەڵایەتییان بكە، لەگەڵیاندا ژیان ببەرە سەر.

(مِثْقَالَ): (المِثقَالُ: مَا يُقَدَّرُ بِهِ الثِّقَلُ)، (مِثقَال): ئەوەیە کە ئەندازەی گرانیی شتی پێ دیاریی دەکرێ، یاخود (مِثقَال)، یانی: (قَدْرُ حَبَّةٍ) بە ئەندازەی دەنکێك، یان: (زِنَةُ حَبَّةٍ) کێشی دەنکێك، یانی: دەنکە خەرتەلەیەك.

(حَبَّةٍ): (الحَبَّةُ: وَاحِدَةُ الحَبِّ)، (حَبَّة) تاکی (حَبّ)ە، (حَبّ) یانی: دانەوێڵە یان دەنك، ئنجا دەنکی خەرتەلەبێ، دەنکی گەنم بێ، دەنکی جۆ بێ، پێی دەگوترێ: (حَبَّة).

(خَرْدَلٍ): بە کوردیی خەرتەلەی پێ دەڵێین، جۆرێکە لە ڕووەك، تۆوەکەی زۆر بچووکە لە زەنگیانە بچووکترە.

(صَخْرَةٍ): (الصَّخْرُ: الحَجَرُ الصَّلْبُ)، (صَخْر): بریتیە لە بەردی ڕەقی پتەو بە تایبەت کە گەورە بێ.

(عَزْمِ ٱلْأُمُورِ): أ- کارە پێویستکراوەکان.

ب- یاخود: (عَزم الأمُور: مِمَّا عَزَمَهُ اللَّهُ وَأَمَرَبِهِ)، ئەو کارانەن کە خوا فەرمانی پێکردوون و پێویستی کردوون.

ج- یاخود: (عَزمِ الأمُور: مِمَّا يَنْبَغي لَهُ العَزْمُ وَالإِرَادَةُ القَوِيَّة)، ئەو کارانەی پێویستییان بە ویست و توانای پتەو هەیە، بۆ ئەوەی ئەنجام بدرێن.

د- یاخود: (مِنْ عَزْمِ الأمُور، أي: مِن مَعْزُومِ الأمُور) ئەو کارانەی کە پێویستکراون لەلایەن خوای پەروەردگارەوە.

(وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ): واتە: ڕووت وەرمەچەرخێنە، ڕووت گرژمەکە، (لآ تُصَعِّر: أي: لآ تُمِلْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ كِبْراً عَلَيهِم، وَإِعْجَاباً وَاحْتِقَاراً لَهُم)، واتە: ڕووت لامەدە لە خەڵك، لەبەر ئەوەی خۆت لە بەرانبەر ئەواندا بە گەورە دەگری و، بە خۆت سەرسامی و، ئەوان بە کەم تەماشا دەکەی، دەگوترێ: (صَاعَرَ وَصَعَرَ: أي: أَمَالَ عُنُقَهُ إلي جَانِبٍ مُشْتَقٌّ مِنَ الصَّعَرِ، وَهُوَ دَاءٌ يُصِيبُ الإِبِلَ)، خوێندراوەتەوە: (وَلآ

**تُصَاعِـر خَـدَّكَ للنَّـاس**)، ئنجـا (**صَاعَـرَ وَصَعَّـرَ**)، واتـە: ملـی لادا بـۆ لایـەك، کـە لـە (**صَعَـر**) ەوە هاتـوە، (**صَعَر**)یـش جـۆرە دەردێکـە تووشـی حوشـتر دێ، ملـی بـە لایەکـدا ڕەق دەبـێ و ناتوانـێ مـل ڕاسـت بـکات.

(مَرَحًا): (**المَـرَحُ: فَـرْطُ النَّشَـاطِ مِـن فَـرَحٍ وازدِهَـاءٍ، وَيَظْهَـرُ ذَلِـكَ فِـي المَشِـي تَبَخْتُـرَاً**)، (**مَـرَح**): ئەوەیـە کـە ئینسـان زۆر بـە جموجـۆڵ بـێ لـە ئەنجامـی زۆر دڵخـۆش بـوون و شـایی بەخـۆ بـوون دا، ئنجـا ئـەو شـانازیی بـە خـۆوە کـردن و، زۆر دڵخـۆش بوونـە لـە حاڵەتـی ڕۆیشـتندا، بـە فیـزو کەشـخەوە، دەردەکـەوێ.

(مُخۡتَالٖ): (**المُخْتَـالُ: إسْـمُ فَاعِـلٍ مِـن اخْتَـالَ مِـن فِعْـلِ خَـالَ، إذَا كَان ذَاخُيَـلاءِ فَهُـوَ خَائِـلٌ**)، (**مُختَـالُ**): نـاوی بکـەر (**إسـمِ فَاعِـل**)ە، لـە (**إختَـالَ**)ەوە هاتـوە، ئەویـش لـە کـرداری (**خَـالَ**)ەوە هاتـوە، (**خَـالَ**) یانـی: (**كانً ذَاخُيَـلاءِ فَهُـوَ خَائِـلٌ**)، واتـە: خاوەنـی (**خُيَـلاء**)و فیـزو کەشـخەیە، (**خَائِـل**)، بابـای کەشـخەکەر، فیزکـەر کـە بـە فیـزو دەمـار دەڕوات.

(فَخُورٖ): (**شَدِيدُ الفَخْر**)، زۆر شانازیی بە خۆکەر.

(وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ): بـە شـێوەیەکی میانجیـی بـڕۆ، (**القَصْـدُ: الوَسَـطُ العَـدْلُ بَيْـنَ طَرَفَيـنِ**) (قصـد) بریتیـە لـە میانجیـی و نێوەڕاسـت بـوون لـە نێـوان دوو لادا، خەتـی نێوەڕاسـت گرتـن.

(وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَ): لـە دەنگـت بگـرەوە، (**الغَـضُّ: نَقْـصُ قُـوَّةِ آسْـتِعْمَالِ شَـيءٍ**)، (**غَـضّ**) بریتیـە لـە کەمکردنـەوەی هێـزی بەکارهێنانـی شـتێك، لێـرەدا یانـی: کەمکردنـەوەی دەنـگ هەڵبڕیـن.

(إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ): ناخۆشـترینی دەنـگان، (**أَنْكَـرَ: إسْـمُ تَفْضِيـلٍ فِـي كَـوْنِ الصَّـوْتِ مَنْكُـوراً، فَهُـوَ تَفْضِيـلٌ مُشـتَقّ مِـنَ الفِعْـلِ المَبنـيِّ لِلمَجْهُـولِ، مِثْـلُ: أَشْـغَلَ مِـنْ ذَاتِ النِّحْيَيْـنِ، أي: أَشَـدَّ مَشْـغُولِيَّة مِـن المـرأة الَّتِـي أُرِيـدَتْ فِـي هَـذَا المَثَـل**)، (**أَنكَـرَ**):

ناوی (**تَفْضِیل**)ە، لەوەوە کە دەنگێك ناخۆشویستراو و، نا پەسند بێ، واتە: ناوی هەڵبژاردن (**تَفضیل**)ە، لە کردارێکی بکەر نادیار وەرگیراوە، وەك (**أَشْغَلَ مِنْ ذَاتِ النِّحْيَيَنِ**) ئافرەتێك بووە ناوی (**ذاتِ النِّحييَنِ**) بووە، ئنجا (**أشغَلَ مِن ذاتِ النِّحيينِ**)، یانی: (**أشَدَّ مَشغولِية**)، زۆر سەرقاڵتره لە (**ذَاتِ النِّحْيَينِ**)، ئنجا (**أَنْكَرَ: الأَصْوُات**)یش یانی: (**أشَدَّ مَنكوريةً**) زۆر ناخۆشتر لە هەموو دەنگان.

کەواتە: (**أنكَرَ أي: أَقْبَحَ وَأَشَرَّ**) ناخۆشترین و خراپترین و ناقۆلاترین دەنگ، ناخۆشترین دەنگ، دەنگی کەرانە، لەبەر ئەوەی کەر هەتا توانای هەیە دەنگ هەڵدێنێ، لە کاتێکدا دەزەڕێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئـەم هەشـت ئایەتـە دەربـارەی لوقمانـی حەکیمـن، وەك پێشـتریش گوتمـان: لوقمـان (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، تەنهـا لـەم سـووڕەتی لوقمانـەدا نـاوی هاتـوە، ئامۆژگارییەکانی لوقمانیـش بـۆ کوڕەکـەی تەنیا لـەم سـووڕەتی لوقمانـەدا هاتـوون، زانایانیـش لـە بـارەی لوقمانـەوە، کـە بـە: لوقمانـی حەکیـم ناسـراوە، ڕاجیایـی زۆریـان هەیـە لـەو بـارەوە کـە:

١- ئایا پێغەمبەر بووە، یان نا؟ کەمێك گوتوویانە: پێغەمبەر بووەو زۆربەی گوتوویانە: پێغەمبەر نەبووەو هەر ئەم ڕایەش ڕاستە، چونکە خوا ﷻ لە نێو پێغەمبەراندا کە لە قوڕئاندا ناوی هێناون، ناوی بیست و پێنجیانی هێناوە، هەموویان پێکەوەو، چەند جارێك دووبارە بوونەوە، بەڵام ناوی لوقمانی تێدا نیە.

٢- ئایا لوقمان لە چ نەتەوەیەك بووە؟ زۆربەیان گوتوویانە (ئەفریقایی) بووە، ئنجا هەندێك گوتوویانە: فڵان وڵات و هەندێك گوتوویانە: فڵان وڵات، زۆربەش گوتوویانە: (ڕەشپێست) بووە.

٣- ئایا لە چ ڕۆژگارێکدا بووە؟ زۆربەیان دەڵێن: لە ڕۆژگاری داووددا عليه السلام بووە، هەندێکی دیکەش ڕۆژگارێکی دیکە دەڵێن.

٤- ئایا قسەو پەندەکانی لوقمان چی بوون و چەند بوون؟ بێگومان، زۆر قسەی نەستەق و پەندی باش لە لوقمان گێڕدراونەوە، کە ئێمە دوایی چەند نموونەیەکیان لێ دێنین، بەڵام هیچ کام لەو قسانەی لوقمان ناتوانین بڵێین: بە دڵنیایی ئەوە هی لوقمانەو، پەندو قسەی نەستەق و ئامۆژگاریی ئەوە، جگە لەوەی خوا لە قوڕئاندا باسی کردووەو، قسەیەکیش بە سەنەدێکی ڕاست بۆمان دەربکەوێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، چونکە قسە کردن لە نادیارێك کە بەڵگەمان لەسەری نیە، لە مەگەر

لە ڕێگەی وەحییەوە، ئەگەرنا ئێمە لێی دڵنیانین، بەڵێ دەگونجێ بە گومانی زاڵ بڵێین ڕەنگە وابێ، بەڵام ناتوانین بڵێین بە دڵنیایی وایە.

شایانی باسە: ئەو ئامۆژگاریيانەی کە لەم ئایەتانەدا هاتوون، کە خوا ﷻ لێی گێڕاونەوە، سەرجەم بوارەکانی: ئیمان و عەقیدە، عیبادەت و **طاعەت**، ڕەوشت و ئاکار، هەڵسوکەوت لەگەڵ باب و دایك و لەگەڵخەڵکدا، هەموو ئەو بوارانە دەگرنەوە کە دوایی باسیان دەکەین و، سەرجەم ئامۆژگارییەکانی لوقمان دە (١٠) ئامۆژگارییـن کە لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوون و ئاڕاستەی کوڕەکەی خۆییان دەکات.

جێی سەرنجە: خوا ﷻ باسی لوقمان دەکات، بەس تیشك دەخاتە سەر ئامۆژگاریی و قسە نەستەقەکانی، بەڵام باسی خۆی کە ئایا: کێ بووە؟ چۆن بووە؟ لە کوێ بووە؟ کەی بووە؟ چەند ژیاوە؟ ئەوانە باسیان نەکراوە، چونکە خوا ﷻ لە قورئاندا ئەو شتانە باس دەکات کە بۆ ئێمە جێی سوودن، دەرس و پەندو عیبرەتیان لێ وەردەگیرێ، بەڵام هیچ دەرس و پەندێك لەوە وەرناگیرێ، ئایا لوقمان خەڵکی کوێ بووە؟ کەی ژیاوە؟ چەند ساڵ ژیاوە؟ چی کردوە؟ ئەو شتانەی پەیوەندییان بە ژیانی تایبەتیی و کەسیی ئەوەوە هەیەو، بۆ ئێمە جێی دەرس و پەندو عیبرەت نین، بەڵام قسەکانی و هەڵوێستەکانی بۆ ئێمە جێی سوودن، بۆیە خوا ﷻ چ لە بەسەرهاتی لوقمان دا، چ لە هەر کام لە بەسەرهاتەکانی دیکەدا، تیشك دەخاتە سەر ئەوەی کە بۆ ئێمە پێویستە.

لەم ئایەتانەدا خوا ﷻ ئاوا باسی لوقمان دەکات:

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ ﴾، ئەم (و)ە، ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی پێشێ، واتە: وەك چۆن خوا ﷻ ئەو کارانەی پێشێی کردن: ئاسمانەکانی بە کۆڵەکەی نەبینراو دروستکردن، چیایە قورسەکانی خستنە نێو زەوی، تاکو جووڵە جووڵ نەکات لە ژێرتانداو، هەموو زیندەوەرێکی لە زەویدا بڵاوکردەوەو،

ئاوی لە ئاسمانەوە دابەزاندو، هەموو جۆرە ڕووەکێکی بەرهەمداری پێ ڕواند، وەك چۆن ئەوانەی کرد: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ﴾، بە جەختکردنەوە حیکمەتیشمان بە لوقمان دابوو.

﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ﴾، پێمانگوت: سوپاسی خوا بکە! لە بەرانبەر ئەوەدا کە خوا نیعمەتی حیکمەتی بە تۆ داوە، ﴿وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ﴾، هەر کەسێکیش سوپاس بکات، سوپاسی خوا بکات، بە دڵنیایی تەنیا بۆ خۆی سوپاسی کردوەو، سوودی سوپاسگوزارییەکەی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، ئەگەرنا خوا ﷻ لەوە بەرزترە لە سوپاسکردنی بەندەکانی بەهرەمەندبێ، یان بە پێچەوانەوە لە سپڵەیی و نا سوپاسییان زەرەرمەند بێ.

﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ﴾، هەر کەسێکیش سپڵەو بێ ئەمەگ بێ، نادیدەگربێ بۆ چاکەکانی خوا، ئەوە بە دڵنیایی خوا بێنیازی ستایشکراوە.

لێرەدا بۆیە وشەی (**كَفَرَ**)مان بە سپڵەیی و ناسوپاسیی کرد، لێکدایەوە، چونکە لە بەرانبەر (**شُكْر**) دایە، (**شُكْر**) واتە: سوپاسگوزاریی و بە چاکەی خوا زانین و، دان بە چاکەی خواداهێنان، خۆ بە قەرزدارو منەتباری خوا زانین، (**كَفَرَ**)ش لێرەدا لە چاوگی (**كُفرَان**)ەوە هاتوە، واتە: ناسوپاسیی کردو چاکەی خوای نادیدەگرت.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی خستنە ڕووی ئامۆژگاریی لوقمان بۆ کوڕەکەی: ﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ﴾، هەروەها یاد بکەوە کاتێك لوقمان بە کوڕەکەی خۆی گوت، لە کاتێکدا کە ئامۆژگاریی دەکرد، واتە: لە کاتێکدا کە هەوڵیدەدا لە دەروونیەوەو لە ناخیەوە بیجووڵێنێ و، هەست و سۆزی بخاتە ژێر کاریگەریی خۆی، بۆ ئەوەی ئامۆژگارییەکەی لێ وەربگرێ، چۆنی ئامۆژگاریی کرد؟ ﴿يَٰبُنَىَّ﴾، بە کوردیی دەبێتەوە: کوڕێژگەکەم! یان کوڕە خۆشەویستەکەم! کوڕە شیرینەکەم! چونکە لە زمانی عەرەبییدا کاتێك شتێك گچکە بکرێتەوە، بۆ خۆشویستراوییەتی، وەك (**بُنَيَّ**) ئەگەرنا لە ئەصڵدا (**يا إبني**)ە، ئەی کوڕەکەم! بەڵام

(**یا بُنَيَّ**) ئەی کوڕە گچکەکەم! کوڕی شیرینم! چونکە منداڵی بچووك خۆشەویستەو عەتف و سۆزی زیاتری باب و دایکی لەسەرە، ئنجا لەو ڕووەوە کە منداڵی گچکە خۆشەویستترە، پیاوی گەورەش جاری وا هەیە لە لایەن باب و دایکیەوە گچکە دەکرێتەوە، واتە: وەك چۆن منداڵی گچکە خۆشویستراوە، تۆش ئاوا خۆشویستراوی.

کەواتە: لێرەدا (**یا بُنَيَّ**) ئەی کوڕیژگەکەم! ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم! کوڕە شیرینەکەم! ﴿لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ﴾، هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، دیارە کوڕەکەی لوقمان خوا پەرست بووە، بۆیە پێویستی نەکردوە بڵێ: ڕۆڵە خوا بپەرستە، خوا پەرست بووە، بەڵام مەترسیی هاوبەش بۆ خوا دانانی خستۆتە بەرچاو، هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، ئنجا نەیگوتوە چ شتێك، یانی: هیچ شتێك و هیچکەس مەکە هاوبەشی خوا، ﴿إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ﴾، بە دڵنیایی هاوبەش دانان ستەمێکی مەزنە، شیرك ئەوەیە تۆ جگە لە خوا لەگەڵ خوادا یەکسان بکەی، لە شتێکدا کە تایبەتمەندییەکی خوای پەروەردگارە ﷻ، لە بەدیهێنەرایەتییدا، لە خاوەنداریێتییدا، لە پەروەردگاریەتییدا، لە پەرستراویەتییدا، لە ناوو سیفەتەکانیدا هەتا دوایی، جاری دیکەش گوتوومانە: ئێمە لە کۆتایی سوورەتی (**یوسف**)دا، باسێکی خەست و خۆڵمان لە بارەی شیرکەوە کردوە.

خوا ﷻ ئەم دوو ئایەتە موبارەکە نێواخن دەکات لەگەڵ قسەکانی لوقمان دا، چونکە پێچەوانەی حیکمەتە، لوقمان بڵێ: کوڕم! لەگەڵ باب و دایکت چاك بە، بۆیە خوا ﷻ ئەم دوو ئایەتە موبارەکە نێواخن دەکات و، دەیانکاتە نێو بڕەی قسەکانی لوقمان (ئامۆژگارییەکانی لوقمان) بۆ کوڕەکەی کە ئەوەش هەر ئامۆژگارییەکی زۆر گەورەیەو، خوا ﷻ هەم لێرە، هەم لە سوورەتی (**العنكبوت**)، هەم لە سوورەتی (**الأحقاف**)و، لە سوورەتی (**الإسراء**)دا، لە هەموو ئەو سوورەتانەدا، خوا ﷻ دووبارەی دەکاتەوە: ئامۆژگاریی کردنی مرۆڤ بە چاکە کردن لەگەڵ باب و دایکی دا: ﴿وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ﴾، ئامۆژگاریی مرۆڤمان کرد سەبارەت بە باب و دایکی.

ئنجا دێتە سەر ڕۆڵی دایكی: ﴿ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ ﴾، دایكی هەڵیگرتوە، بێهێزیی لەسەر بێهێزیی، یاخود بێهێزیی لە دوای بێهێزیی، كە بە تەئكید ئافرەت كاتێك تۆڵدار دەبێ، كۆرپە لە سكیدا پەیدا دەبێ، ڕۆژ بە ڕۆژ بێهێزدەبێ، چونكە لە وزەو توانای جەستەی ئافرەتەكە (دایكەكە) بۆ كۆرپەكە دەچێ، بۆ ئەوەی پێی گەورە بێ، هەتا كۆرپەكە گەشە دەكات و گەورەتر دەبێ، دایكی بێهێزتر دەبێ.

﴿ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ ﴾، جگە لەوەی بێهێزیی لەسەر بێهێزیی هەڵیگرتوە لە سكی خۆیدا، لە شیر بڕینەوەشی لە ماوەی دوو ساڵاندا، دوای ئەوەی تۆڵەكەشی دا دەنێ، ئنجا دوو ساڵیش شیری پێدەدات، ئەوجار لێی دەبڕێتەوە، ئەگەر ماوەی شیر پێدانەكە تەواو بكات، وەك لە سوورەتی (**البقرة**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴿٢٣٣﴾ ﴾ **البقرة**، دایكان دوو ساڵ شیر بە منداڵەكانیان دەدەن، بۆ هەر كەسێ بیەوێ ماوەی شیر پێدان تەواو بكات، ماوەی تەواوی شیر پێدان دوو ساڵە، بەڵام دەشگونجێ زووتریش ئەو منداڵە لە شیر ببڕێتەوەو فێرەخواردن بكرێ.

﴿ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ ﴾، مرۆڤمان ڕاسپاردو ئامۆژگارییمان كرد كە: سوپاسگوزاریی بۆ من و بۆ دایك و بابت بكە، ﴿ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴾، گەڕانەوە هەر بۆلای منە، بزانە چۆن دێیەوە بۆ لای من!

﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴾، ئەگەر زۆریشت لەگەڵت تێكۆشان شتێك بكەی بە هاوبەشی من، كە زانیارییت لەبارەیەوە نیە، بۆیە زانیارییت لە بارەیەوە نیە، چونكە بوونی نیە لە واقیعدا، هەر شتێك بوونی نەبێ، زانیاریی پێوەی پەیوەست نابێ، ئنجا ئەگەر هەوڵێكی وایاندا شتێك كە بوونی نیە، بیكەیە هاوبەشم، ﴿ فَلَا تُطِعْهُمَا ﴾، فەرمانبەریی و گوێڕایەڵییان مەكە.

بەڵام کە لە شیرك و کوفرو لە گوناهو تاواندا بە قسەی باب و دایکت ناکەی، هەرچەندە زۆر هەوڵیشت لەگەڵبدەن، مانای وانیە لەگەڵیان خراپ بی: ﴿ وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ﴾، لە دنیادا لە ڕووی ژیانی دنیاییەوە، بە چاکەو پەسند مامەڵەیان لەگەڵدا بکە، ﴿ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ﴾، هەروەها بکەوە شوێن ڕێبازی ئەو کەسەی بۆ لای من گەڕاوەتەوە، واتە: پێشینی چاك ئەوانەی سەرمەشق بوون لە خێرو چاکەدا، شوێن ئەوان بکەوە، بزانە ئەوان لەگەڵ باب و دایکیاندا چۆن مامەڵەیان کردوە، ئەوانە بکە سەر مەشقی خۆت و، بیانکە پێشڕەوی خۆت، لە مامەڵە لەگەڵ باب و دایکتداو، لە هەر هەڵسوکەوتێکی دیکەی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی دا، ﴿ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ ﴾، دوایی گەڕانەوەتان، یاخود: شوێنی گەڕانەوەتان، یاخود: کاتی گەڕانەوەتان بۆ لای منە، ﴿ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، ئنجا هەواڵتان پێدەدەم بەوەی دەتانکرد، کەواتە: بزانن و باش سەرنج بدەن! چۆن دەچنەوە خزمەت پەروەردگارتان، چۆن دێنەوە بۆ لای من، بە چ توێشوویەکەوە، بە چ هەگبەیەکەوە، چیتان پێیە؟ بە دەستی پڕو بە توێشووی باش و، بە ڕووی سوورەوە بێنەوە بۆ لام.

### ئنجا دێتەوە سەر ئامۆژگارییەکانی لوقمان:

**ئامۆژگاریی یەکەمی:** وەك دواتریش باسی دەکەین - لە بارەی ئیمانەوە بوو، لە بارەی تەنیا خوا پەرستنەوە بوو.

**ئامۆژگاریی دووەم:** لە بارەی کردەوانەوەیە، کردەوەی چاك یان خراپ: ﴿ يَٰبُنَيَّ ﴾، ئەی کوڕیژگەکەم! ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم! ﴿ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ ﴾، ئەم ڕاناوەی (**هَا**) یان دەچێتەوە بۆ چاکەو خراپە، (**إِنَّهَا: أي: الحَسَنَةُ أو السَّيِّئَة**) یاخود دەچێتەوە بۆ تاعەت، واتە: فەرمانبەریی، یاخود، هەر ڕاناوێکە بەکاردەهێنرێ لە سیاقی قساندا، بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ شتێکی دیارییکراو، ﴿ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ ﴾، ئەی کوڕە شیرینەکەم! دڵنیابە

ئەگەر هێندەی گرانایی دەنكێك لە خەرتەلە بێ، كردەوەی مرۆڤ، چاكەی مرۆڤ، خراپەی مرۆڤ، ﴿ فَتَكُن فِى صَخۡرَةٍ ﴾، ئنجا ئەو دەنكە خەرتەلەیە لە گاشە بەردێكدا بێ، بەردێكی ڕەقی پتەو، ﴿ أَوۡ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِى ٱلۡأَرۡضِ ﴾، پاشان ئەو بەردەش لە ئاسمانەكاندا بێ، یاخود لە زەوییدا، ئەو كردەوەیەش هێندەی دەنكە خەرتەلەیەك بێ، لە هەناوی ئەو بەردەدا، ئەو بەردەش لە ئاسمانەكان بێ لە هەر گۆشەیەكی ئاسمانەكان، یاخود لە زەوی دا بێ، لە هەر شوێنێكی زەوی، ﴿ يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُۚ ﴾، خوا دەیهێنێ، ئەو كردەوە دێنێتەوە ڕێت، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا پەنهانكاری شارەزایە، ئەوەش ئامۆژگاریی دووەم، كە ئاگات لە خۆ بێ، چاكە و خراپە لە خوا ون نابێ و دێتەوە ڕێت.

**ئامۆژگاری سێیەم:** ﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، ئەی كوڕە شیرینەكەم! ئەی كوڕیژگەكەم! نوێژ بەرپا بكە، دوای ئەوەی باسی ئیمان و خوا پەرستیی و، خۆ پاراستن لە شیرك كرا، دوایی باسی چاكەو خراپە كرا بە گشتیی، ئنجا باسی باشترین چاكە دەكرێ، كە بریتیە لە بەرپاكردنی نوێژ، ئێمە لە سوورەتی **(العنكبوت)** دا باسێكمان كرد دەربارەی نوێژ بەرپاكردن، چۆنە و چیە و بەرهەمەكانی نوێژ بەرپاكردن چەندن؟!

**ئنجا ئامۆژگاریی چوارەم:** ﴿ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾، هەروەها فەرمان بە پەسند بدە، چ شتێك پەسندو چاكە، فەرمانی پێ بكە، هەوڵبدە با دەورو بەرەكەت ئەنجامی بدەن.

**ئامۆژگاریی پێنجەم:** ﴿ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ﴾، خراپەش قەدەغە بكە، **(مَعروف)** شتی بە پەسند زانراوە، **(مُنكَر)**یش، شتی بە خراپ زانراوە، خراپە قەدەغە بكەو ڕێی لێبگرە.

**ئامۆژگاریی شەشەم:** ﴿ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ﴾، كەسێك بیەوێ فەرمان بە پەسند بكات و، ڕێگریی لە ناپەسند بكات، بە تەئكید كۆمەڵێك كۆسپ و لەمپەری

دێنە ڕێ، خەڵك دژایەتیی دەكات، كەسانێك هەن مل نادەن بۆ ئەنجامدانی چاكەو، كەسانێك هەن مل نادەن بۆ دەست هەڵگرتن لە خراپە، لەگەڵ ئەوانەدا تێكهەڵدەنگوێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ﴾، خۆڕاگریش بە لەسەر ئەوەی تووشت دەبێ، دێتە ڕێت لە ئەنجامی ئەنجامدانی پرۆسەی فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپەدا، ﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴾، بێگومان ئەوە لە كارە پێویستكراوەكانە، لەو كارانەیە كە خوا پێویستی كردوون، یاخود لەو كارانەیە كە پێویستی بە ئیرادەیەكی پتەو بەهێز دەكات.

**ئامۆژگاریی حەوتەم:** ﴿ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ ﴾، ڕووی خۆشت لە خەڵك وەرمەچەرخێنە، وەك پێشتر باسمانكرد: (**تصعیر**): بریتیە لەوەی كە مرۆڤ ڕووی خۆی وەرگێڕێ، ڕووی خۆی گرژ بكات و وەرچەرخێنێ، كە لە (**صَعَرْ**)ەوە هاتوە، (**صَعَرْ**) جۆرە دەردێكە تووشی حوشتر دێ، ملی ڕەق دەبێ، یان بەلایەكدا ملی ڕەق دەبێ، ناتوانی ملی چاك باداو بسووڕێنێ، واتە: وەك حوشترێك مەكە كە ملی ڕەق بووە، تۆش ئاوا بە فیز مل لە خەڵكی لا بدەی و تەماشایان نەكەی و ڕوویان لێ وەرچەرخێنی.

**ئامۆژگاریی هەشتەم:** ﴿ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ﴾، هەروەها بە كەیف و شادیی و دڵخۆشیی و دەمارەوە بەزەوییدا مەڕۆ، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴾، بە دڵنیایی خوا هەر كەسێكی خۆشناوێ كە خەیاڵی وایە گەورەیەو خۆی بە زلدەگرێ، یاخود شانازیی بەسەر خەڵكدا دەكات، (**مُخْتَال**) لەسەر كێشی (**إفتِعَال**)ە، (**إختَالَ يَختَالُ**) لە (**خَالَ**)ەوە هاتوە، (**خَالَ**) واتە: فیزی كردو دەمارو كەشخەی نواند لە زاتی خۆیدا، بەڵام (**فَخور**) بریتیە لە فەخر فرۆشیی و شانازیی كردن بەسەر خەڵكدا.

**ئامۆژگاریی نۆیەم:** ﴿ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ ﴾، لە ڕۆیشتنتدا میانجیی بە، نە زۆر پەلە پەلێ بكە، لاقت لەبەر یەك بئاڵقێن و، نە زۆریش بە مردەلۆخەیی بڕۆ، بە شێوەیەكی میانجیی بڕۆ.

**ئامۆژگاریی دەیەم:** ﴿ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَ ﴾، لە دەنگیشت بگرەوە، دەنگ زۆر هەڵمەهێنە، خوا ﷻ بە پێویستی نەزانیوە بفەرمووێ: دەنگیشت زۆر کپ مەکە، چونکە بە زۆریی وایە، خەڵك بەهۆی دەنگ هەڵهێنانەوە، یەکدی جاڕس و بێزار دەکەن، کە دەشفەرمووێ: ﴿ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَ ﴾، یانی: دەنگەکەت کە بەرزە، لێی بگرەوە، دەنگی نزم نەبووە، تاکو بفەرمووێ: دەنگ هەڵهێنە، ﴿ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ﴾، بێگومان ناخۆشترینی دەنگەکان، دەنگی کەرانە، (حَمیر) کۆی (حِمَار)ە، (حِمَار) کەر (گوێدرێژ)، بۆچی دەنگی کەر ناخۆشە؟ چونکە هەتا تینی تێدایە، دەنگ هەڵدێنێ، زۆر بە قووەت و زیاد لە پێویست، زەڕەی کەریش بە تەئکید دەنگێکی جاڕسکەرو بێزارکەرە، خوا ﷻ ڕێگریی دەکات لە زۆر دەنگ هەڵهێنان، ئەمەش ئامۆژگارییەکی گەورەی تێدایە بۆ ئەو وتار بێژانەی بە دەنگی بەرز دەنەڕێنن بەسەر خەڵکداو، هاوار دەکەن هەتا تینیان تێدایە! پێم سەیرە! دەبێ ئاگایان لە فەرمایشتی خوا نەبێ! کە خوا دەنگ زۆر هەڵهێنان و دەنگ زۆر بەرزکردنەوەی قەدەغە کردوەو، شوبهاندوویەتی بە دەنگی گوێدرێژ (کەر)ەوە، کە زۆر دەنگ هەڵدێنێ، زیاد لە ئەو ئەندازەیەی پێویستە، مرۆڤ دەبێ خۆی بپارێزێ لەوە کە شتێك بکات، وەك هی ئاژەڵێك بچێ، کە خوای پەروەردگار وەك نموونەی نەفامیی و نەزانیی هێناویەتەوە، وەك لە سووڕەتی (**الجمعة**)دا دەفەرمووێ: ﴿ كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢا ۝٥ ﴾، واتە: ئەوانەی کە کتێبی خوایان پێدراوەو کاری پێ ناکەن، وەك گوێدرێژێك وایە، بارێك کتێبی لێندراون، گوێدرێژ باری کتێبیشی لەسەر پشتی هەبێ، هیچ لێیان بەهرەمەند نابێ.

ئنجا کە لێرەش دا خوا ﷻ دەنگ زۆر هەڵهێنانی تەشبیه کردوە بە دەنگی کەرانەوە، ئەوە بەسە بۆ ئەوەی کە ئینسان لە دەنگ زۆر هەڵهێنان و هاوار کردن بپرینگێتەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ڕاگەیاندنی ئەوە کە خوا حیکمەتی بە لوقمان بەخشیوەو پێی فەرمووە: سوپاسی خوا بکات، چونکە سوپاسکردنی مرۆڤ بۆ خوا ﷻ، بە سوودی خۆیەتی و، سپڵەییشی زیان لە خوا نادات، بە تەنیا خۆی لێی زەرەرمەندەو، باسی ئامۆژگاریی لوقمانیش بۆ کوڕەکەی کە هاوبەش بۆ خوا دانەنێ، چونکە هاوبەش بۆ خوا دانان ستەمێکی مەزنە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ﴾، بە دڵنیایی ئێمە حیکمەتمان بە لوقمان دابوو.

پێشتر چەند پێناسەیەکی حیکمەتمان کردن، یەکێکی دیکە لە پێناسەکانی حیکمەت ئەوەیە:

(**الحِكمَةُ: وَضْعُ الشَّيء فِي مَوضِعِهِ**)، حیکمەت دانانی شتە لە شوێنی خۆیدا، لە زمانی کوردییدا (حیکمەت) بە: دانایی، وەستایی، کارامەیی، لێزانیی، تەرجەمە کراوە.

شایانی باسە: لە تەفسیری سوورەتی (**الإسراء**)دا، کە خوا ﷻ بەو ئایەتە دەست پێ دەکات: ﴿لَّا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا ﴿٢٢﴾﴾**الإسراء**،

تاکو ئایەتی (٣٩)، واتە: هەژدە ئایەت، ئایەتی کۆتایی ئەوەیە کە دەفەرمویّ: ﴿ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ ۗ وَلَا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلْقَىٰ فِى جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا ﴿٣٩﴾﴾ **الإسراء**، واتە: ئەوە ئەو حیکمەتەیە کە پەروەردگارت بۆ تۆی سروشکردوە، ئنجا ئێمە لەویّ باسێکی سەربەخۆمان لەو بارەوە کردوەو ڕوونمانکردۆتەوە کە لە میانی ئەو هەژدە ئایەتەدا، خوا ﷻ دوازدە خەسڵەتی بەرزو پەسندو، دوازدەی ناپەسندیش، واتە: بیست و چوار خەسڵەتی چاك و خراپی خستوونە ڕوو، ناویشی لە هەموو ئەوانە ناوە حیکمەت.

کەواتە: لە ڕاستییدا مانای ڕاستەقینەی حیکمەت، واتە: خۆ بژارکردن لە خوو و خەسڵەتە خراپەکان و، خۆڕازاندنەوە بە سیفەتە بەرزو چاکەکان، کە کەسێکیش وابیّ بە تەئکید قسەی بەجیّ دەبیّ و، کرداری بە جیّ دەبیّ، دانا دەبیّ و، وەستا دەبیّ، لێزان دەبیّ و، کارامە دەبیّ.

٢)- ﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ﴾، حیکمەتمان بە لوقمان دابوو، کە سوپاس بۆ خوا بکات، واتە: کاکڵ و جەوهەری حیکمەت بریتیە لە سوپاسگوزاریی بۆ خوای بەرز، هەر کەسێك سوپاسگوزاریی بۆ خوا بکات، ئەو حیکمەتە کە خوا پێیداوە، بە نێو خەڵکدا بڵاوی دەکاتەوە، کەواتە: لوقمان (خوا لێی ڕازی بێ) کە ئامۆژگاریی کوڕەکەی دەکات، کە منداڵی مرۆڤ، ئەگەر کوڕە، ئەگەر کچە، لە هەموو کەس زیاتر مافی لەسەریەتی، لە هەموو کەس زیاتر مرۆڤ (باب و دایك) بەرانبەر بە منداڵی خۆیان بەرپرسیارن، بۆیە لوقمان لە ئامۆژگاریی کردنی کوڕەکەیەوە دەست پێدەکات، ئنجا خوا ﷻ دوای ئەوەی دەفەرمویّ: حیکمەتمان بە لوقمان دابوو، نێوەڕۆك و جەوهەری حیکمەتەکە، لەوەدا بەرجەستە دەکات، کە سوپاسگوزاریی بۆ خوا بکات، یەکەمین بەشی سوپاسگوزاریی بۆ خوا، ئەوەیە کە ئینسان ئەو نیعمەتەی خوا پێیداوە، لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاری بێنیّ، لە هەموو کەسیش شایستەتر کە ئینسان بۆی دڵسۆز بیّ و بە تەنگیەوە بیّ، پەرۆشی بیّ، ڕۆڵەو جگەر گۆشەی خۆیەتی، بۆیە لوقمان لە کوڕەکەیەوە دەست پێدەکات.

٣)- ﴿ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ﴾، هەر كەسێ سوپاسگوزاریی بكات، بە سوودی خۆی سوپاسگوزاریی دەكات، واتە: خۆی بەهرەمەندە لە سوپاسگوزارییەكەی، (أي: لا يَسْتَفيدُ مِنْ شُكْرِهِ إلاّ هُو)، بۆیە خوا وا دەفەرمووێ، بۆ ئەوەی خەڵك گومانێكی وایان نەچێتە دڵ، كە بۆیە خوا دەفەرمووێ: سوپاسم بكەن تاكو من بەهرەمەند بم، نەخێر، خوا لەوە بەرزترە كە لە سوپاسگوزاریی بەندەكانی بەهرەمەند بێ، هەروەها لەوەش بەرزترە كە لە سپڵەیی بەندەكانیشی زەرەرمەند بێ.

٤)- ﴿ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴾، هەر كەسێكیش سپڵەیی بكات، ناسپاسیی بكات، بە دڵنیایی خوا بێنیازی ستایشكراوە، (كُفْرٌ) دەگونجێ بە مانای بێ بڕواییش بێ، بەڵام لێرەدا بەوە دەزانین: چونكە پێچەوانەی شوكر، بریتیە لە سپڵەیی و ناسپاسیی و بێ ئەمەگیی، ئنجا لێرەدا مادام پێكەوە هاتوون، كەواتە: ئەگەر (شكر) سوپاسگوزارییە، (كُفر)یش لێرەدا بە مانای نا سوپاسیی و بێ نمەكیی و بێ وەفایی دێ، هەر كەسێ بێ ئەمەگیی و ناسپاسیی بكات، ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا دەوڵەمەندی ستایشكراوە.

لێرەدا (حَميد) (فَعِيل)ی بە مانای (مَفعول)ە، (أي: مَحْمُودٌ) خوا ستایشكراوو مەدحكراوو، پێداهەڵگوتراوە، ئەگەر خەڵكیش بەرانبەری ناسپاس و سپڵە بێ، خوا ﷻ هەر وەك خۆیەتی.

٥)- ﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ ﴾، یاد بكەوە كاتێك لوقمان بە كوڕەكەی خۆی گوت لە كاتێكدا (لە حاڵێكدا) كە ئامۆژگاریی دەكرد.

٦)- ﴿ يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ﴾، ئەی كوڕیژگەكەم! ئەی كوڕە چكۆڵەكەم، هاوبەش بۆ خوا دامەنێ.

لە زمانی عەرەبییدا عادەت وایە، ئەگەر شتێك گچكە كرایەوە، نیشانەی ئەوەیە زۆر خۆشدەویسترێ و بەرانبەرەكەی زۆری بە تەنگەوەیە، زۆری پەرۆشەو، بەزەیی و سۆزی بەرانبەری هەیە، (التَّصغيرُ لِتَنزيلِ الكَبيرِ مَنْزِلَةَ الصَّغيرِ شَفَقَةً

وَمَحَبَّةً لَهُ)، گچکەکردنەوە بۆ ئەوەیە هی گەورە بهێنرێتە شوێنی گچکە لە ڕووی پەرۆش و خۆشویستنەوە، کەواتە: (یا بني) یانی: ئەی گچکەکەم، ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم! چونکە شتی گچکە خۆشەویستترە، عادەت وایە منداڵ تاکو گچکەترە خۆشەویستترە، عەتف و سۆزی باب و دایکی زیاتر لەسەریەتی، لەبەر ئەوەی زیاتر پێویستیی بە عەتف و سۆزو ئاگالێبوونی باب و دایکیەتی، خوا وایکردوە.

کەواتە: مەرج نیە کوڕەکەی لوقمان لە تەمەندا گچکە بوو بێ، واتە: ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم! بە قەدەر منداڵێکی گچکە خۆشم دەوێی، هاوبەش بۆ خوا دامەنێ.

٧)- ﴿إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ﴾، بە دڵنیایی هاوبەش بۆ خوا دانان، ستەمێکی مەزنە، زۆربەی توێژەرەوانی قورئان، کە سەرنجی تەفسیرەکانیانمدا دەڵێن: بۆیە لوقمان لە ئامۆژگاریی کردنی کوڕەکەی دا، لەوەوە دەستیپێکردوە، دەڵێ: هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، چونکە کوڕەکەی هاوبەش بۆ خوا دانەر بووە! بەڵام پێم وایە لەوەدا نەیانپێکاوە، چونکە خوا ﷻ بە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ﴿لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ ٦٥﴾ **الزمر**، ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی، کردەوەکەت هەڵدەوەشێتەوە، هەروەها خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ ١﴾ **الأحزاب**، واتە: ئەی پێغەمبەر! ﷺ پارێز لە خوا بکەو فەرمانبەریی کافرو مونافیقەکان مەکە، کەسێك کە لە شتێك نەهی دەکرێ و قەدەغە دەکرێ، مانای ئەوە نیە ئەو شتەی تێدایە، یانی: هۆشداریی پێدەدرێ کە وریا بێ تووش نەبێ، ئنجا ئەگەر لوقمان کوڕەکەی موشریك و خوا نەناس بووایە، لە جیاتی بڵێ: شەریك بۆ خوا دامەنێ، دەیگوت: کوڕم خوا بپەرستە، بەڵام نا! کوڕەکەی خوا پەرست و خواناس بووە، بەڵام لوقمان هۆشداریی پێدەدات کە تووشی شیرك نەبێ، چونکە لە ڕاستییدا ئەوانەی خوا دەناسن و خوا دەپەرستن، تووشی شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانان دەبن، بەڵام کەسێك کە خوا نەپەرستێ و خواناس نەبێ، ڕوو لە خوا نەبێ، تووشی شیرك نابێ، بەڵکو

ئەوانە تووشی ئیلحادو زەندەقە دەبن، ئەوانە لە حاڵەتی ئیلحادو زەندەقەدان، کەسێك مەترسیی لێدەکرێ تووشی هاوبەشی بۆ خوا دانان ببێ، کە خوا پەرست و خواناس بێ، دەبێ لە خۆی وریا بێ لە مامەڵەکردنی لەگەڵ کەسەکان و لەگەڵ شتەکاندا، هیچ کام لەوانە نەیەنێتە ئاستی خواو ڕیزی خوا، لە هیچ شتێك لە تایبەتمەندییەکانی خوای پەروەردگاردا، کە ئەوە مانای شیرکە.

﴿ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی هاوبەش بۆ خوا دانان ستەمێکی مەزنە، مرۆڤ لە خۆی دەیکات، لە پەیامی خوا دەیکات، لە گەردوون دەیکات، کە پێچەوانەی ئەو سیستەمەیە کە خوا بۆ هەموو گەردوونی داناوە، کە هەمووی هاوار دەکات: جگە لە خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو، مشوورخۆرو پەرستراوێکی دیکە نیە، لەو بارەوە با ئەم فەرموودەیە ببینین:

{عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴿٨٢﴾ ﴾ الأنعام، شَقَّ ذَلِكَ عَلَى أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَقَالُوا: أَيُّنَا لَمْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، لَيْسَ كَمَا تَظُنُّونَ، إِنَّمَا هُوَ كَمَا قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ: ﴿ يَـٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾}، (أخرجه البخاري ٤٧٧٦، ومسلم: ١٢٤).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوار کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴿٨٢﴾ ﴾الأنعام، (واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو ئیمانەکەیان لەگەڵ ستەمدا ئاوێتە نەکردوە...)، ئەوە لەسەر دڵی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر قورس بوو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ کام لە ئێمە ستەمی لە خۆی نەکردوە؟ «وایانزانیوە (ظُلم) لێرەدا بە مانای گوناهو لادان و خراپەیە» پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لێرەدا مەبەست لە (ظُلم) ئەوە نیە، کە ئێوە گومانتان بردوە، بەڵکو ئەمە ئەوەیە کە لوقمان بە کوڕەکەی گوت: ﴿ يَـٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە:

ئەی کوڕیژگەکەم! هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، بە دڵنیایی هاوبەش بۆ خوا دانان ستەمێکی مەزنە.

کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ﴾ (٨٢) **الأنعام**، ئەوە مەبەست پێی شیرکە، واتە: کەسێك هێمنیی و ئاسایشی بۆ هەیە لە ڕۆژی دوایی دا، ئەمینە لە سزای خوا، کە ئیمانی هێنابێ و، ئیمانەکەشی لەگەڵ شیرکدا ئاوێتە نەکردبێ.

## مەسەلەی دووەم:

**ئامۆژگارییکردنی خوا بۆ مرۆڤ، لە بارەی باب و دایکیەوە، بە تایبەت دایکی کە بە زەحمەت لە سکیدا هەڵیگرتووە، دوای دوو ساڵانیش لە شیر بڕیویەتەوە، بەڵام لە کاتی هەوڵدانیاندا بۆ هاوبەش دانان، دەبێ مرۆڤ بە قسەی باب و دایکی نەکات، بەڵام وەك ژیانی دنیا هەر بە باشی لەگەڵیاندا مامەڵە بکات، لەو بارەوەش مرۆڤ دەبێ ڕێبازی صاڵحان بگرێ و ئەوان بکاتە سەرمەشقی خۆی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ ﴾، مرۆڤمان ڕاسپاردو، ئامۆژگارییمان کرد، لە بارەی باب و دایکیەوە، (**الوَصِيَّةُ: التَّقَدُّمُ إلى الغَيْرِ بِمَا يَعْمَلُ بِهِ مُقْتَرِناً بوَعْظٍ**)، (**وَصِيَّة**): بریتیە لەوەی کەسێکی بەرانبەر لێی بچیە پێش، شتێکی ئاڕاستە بکەی کاری پێ بکات، بەڵام ئەو شتە کە پێی دەڵێی ئاوێتە بێ لەگەڵ ئامۆژگاریی و قسەی هەست جووڵێندا.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ ﴾، واتە: ئامۆژگاریی مرۆڤمان کردوە، هەر مرۆڤێك کە چاکە لەگەڵ باب و دایکیدا بکات، بە چاکەکاریی لەگەڵ باب و دایکیدا مرۆڤمان ڕاسپاردوە.

٢)- ﴿ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ ﴾، دایکی هەڵیگرتوە، بێهێزیی لەسەر بێهێزیی، ﴿ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ ﴾، (**أي: ضَعْفاً عَلَى ضَعْف**)، بێهێزیی لە دوای بێهێزیی، واتە: دایك کە

بە کۆرپەکەی دووگیان دەبێ، ڕۆژ بە ڕۆژ لە هێزو پێزو وزەی دایك کەم دەبێتەوەو، کۆرپەکەی گەشەی پێدەکات، تاکو دایدەنێ، تاکو کۆرپەکە لێی جیا دەبێتەوەو لە دایك دەبێ.

کەواتە: لێرەدا ﴿ وَهۡنًا عَلَىٰ وَهۡنٍ ﴾، وەسفی حاڵی دایکە، ﴿ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ ﴾، لە حاڵێکدا کە دایکی بێهێزیی لەسەر بێهێزیی ئەو کۆرپەی هەڵگرتوە، وەك ئەو دایکە خۆی بووبێتە بێهێزیی.

٣)- ﴿ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيۡنِ ﴾، لە شیر بڕینەوەشی لە ماوەی دوو ساڵاندا، (**الفِصَالُ: التَّفْرِيقُ بَيْنَ الصَّبِيِّ وَالرَّضَاعِ، أَي: الفِطَام**)، (**فِصالُ**) و (**فِطَام**) هەریەکن، واتە: منداڵی شیرە خۆرە لە شیر ببڕێتەوە، چیدیکە شیری پێ نەدرێ.

٤)- ﴿ أَنِ ٱشۡكُرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيۡكَ ﴾، ئامۆژگاریی و ڕاسپاردنەکەمان بۆ مرۆڤ بەرانبەر باب و دایکی ئەوە بوو کە پێمان فەرموو: سوپاس بۆ من بکەو، سوپاسگوزاریی بۆ باب و دایکیشت بکە.

٥)- ﴿ إِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ ﴾، گەڕانەوە بۆ لای منە، سەرەنجام بۆ لای منە، کەواتە: بزانە چۆن دێیەوە بۆ لام!

٦)- ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي ﴾، ئەگەر زۆریش هەوڵیان لەگەڵدای، لەگەڵت دا تێکۆشان، خۆیان لەگەڵ دا ماندووکردی کە هاوبەشم بۆ دابنێی.

چی بکات بە هاوبەشی؟

٧)- ﴿ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ ﴾، شتێك کە زانیارییت پێی نیە.

(**مَا**) لێرەدا (**اسمِ المَوصول**)ە، یانی: (**الَّذِي لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ**)، شتێك کە تۆ هیچ زانیارییت لە بارەیەوە نیە، واتە: بوونی نیە، چونکە هەر شتێك بوونی هەبێ، زانیاریی پێوەی پەیوەست دەبێ، شتێك کە زانیاریی مرۆڤ پێوەی پەیوەست نەبێ، مانای وایە بوونی نیە، واتە: شتێك مەکە هاوبەشم کە بوونی

نیـە، وەك هاوبـەش بـۆ خـوا، بوونـی نیـە، ئەگەرنـا وەك پەیكەرێـك و ئەسـتێرەو مانـگ و خـۆرو، هـەواو ئـارەزوو و حیـزب و ڕژێمێكـی كافـر، هەروەهـا وەك ئێسـك و پڕووسـكێك كـە خەڵـك دەیپەرسـتێ، ئـەوە بوونـی هەیـە، بـەڵام وەك هاوبـەش بـۆ خـوا، بوونـی نیـە.

٨)- ﴿ فَلَا تُطِعْهُمَاۖ وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ﴾، ئەگەر هەوڵیان لەگەڵدای شتێك بكەی بە هاوبەشم، كە زانیارییت لە بارەیەوە نیە (بوونی نیە)، گوێڕایەڵییان مەكە، بە قسەیان مەكە، ﴿ وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ﴾، بەڵام لە ڕووی ژیانی دنیاییەوە بە پەسندو چاكە مامەڵەیان لەگەڵدا بكە، (**المُصَاحَبَةُ: المُعَاشَرَةُ**)، (**مُصَاحَبَةٌ**) یانی: (**مُعَاشَرَة**) هەڵسوكەوت لەگەڵداكردن، (**المَعْروف: الشَّيء المتَعَارفُ المَألوف**)، شتێك كە بە پەسند زانراوەو هۆگریی پێوەكراوو چاكە.

٩)- ﴿ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ﴾، بكەوە شوێن كەسێك كە بۆلای من گەڕاوەتەوە یانی: (**إقتَدِ بِسيرَة المُنِيبينَ أي: الرَّاجِعينَ إليَّ**)، بە دوای ڕێ و شوێنی ئەوانە بكەوە، كە بۆ لای من گەڕاونەوە، ئەوانەی گەڕاونەوە بۆ لای من، بیانكە سەر مەشقی خۆت لە مامەڵە لەگەڵ باب و دایكتدا، چونكە چاكە لەگەڵ باب و دایك دا، بە شێوەی تیۆریی كە باس دەكرێ، جیایە لەوەی كە بە بەرجەستە كراویی ببینی، لە كێدا دەیبینی؟ لەو كەسانەدا كە بۆ لای خوا گەڕاونەوە، كەسێك بۆ لای خوا گەڕابێتەوەو بەڕاستیی دۆستی خوا بێ، وەفاداریشە بۆ مرۆڤەكان، بە تایبەت بۆ نیزیكترینی مرۆڤەكان، كە باب و دایكنی و، لەگەڵیاندا چاكەكارە، لەبەر ئەوەی لەگەڵ خوادا ڕاستە، لەگەڵ خەڵكی خواشدا چاكە.

١٠)- ﴿ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ ﴾، دوایی گەڕانەوەتان بۆلای منە، (**مَرْجِع**) واتە: (**رُجُوع**) گەڕانەوەتان بۆ لای منە، یاخود: (**مَرجِع**) بە مانای ناوی شوێنە (**اسمِ مَكان**)، یاخود ناوی كاتە (**اسمِ زَمَان**)، واتە: گەڕانەوەتان، یان شوێنی گەڕانەوەتان، یان كاتی گەڕانەوەتان، بۆ لای منە، كە ئەمە هەم دەگونجێ گفت و بەڵێن بێ، هەم دەشگونجێ هەڕەشەو ترساندن بێ، واتە: بۆ لای من دەگەڕێنەوە، پاداشتان دەدەمەوە لەسەر چاكەكاریی

لەگەڵ باب و دایکتان، یاخود: بۆ لای من دەگەڕێنەوە، ئەگەر لەگەڵ باب و دایکتان خراپ بووبن، ئەوە تووشی سزا دەبن.

١١)- ﴿فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، هەواڵتان پێدەدەم بەوەی کە دەتانکرد، کەواتە: بزانن چۆن دێنەوە بۆ لام، چونکە هەرچی دەیکەن، لە لای من هەڵگیراوەو، دواییش دەیخەمەوە بەرچاوی ئێوەو هەواڵتان پێدەدەم.

## پێنج كورتە سەرنج

**یـــەك:** دەگونجێ ئەوەی لەو دوو ئایەتەد (١٤ - ١٥) هاتوە، قسەی لوقمان بێ، دەشگونجێ فەرمایشتی ڕاستەوخۆی خوا ﷻ بێت، زۆر لە توێژەرەوان گوتوویانە: ئەوە هەر درێژەی قسەی لوقمانە، بەڵام ئەو ڕایە بەهێزترەو زیاتر بە عەقڵ و دڵەوە دەنووسێ، كە ئەوە فەرمایشتی ڕاستەوخۆی خوا بێ، چونكە خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ ﴾، ئەمە باسی قسەی لوقمان نیە! ئنجا صیغەو شێوەی داڕشتنی قسەی لوقمان بە جۆرێكی دیكەیە، ئەم قسانەش خوا ﷻ هەمووی دەبەستێتەوە بە خۆیەوە: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴾، دوایی، ﴿ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، هەمووی خوای پەروەردگار بە خۆیەوە پەیوەستی دەكات، كەواتە: ئەوە فەرموودەی ڕاستەوخۆی خوا پەرەوەردگارەو، نێواخنی ئامۆژگارییەكانی لوقمان كردوە، ئایا حیكمەت لەوەدا چییە؟ لە تەفسیرەكاندا نەمبینیوە، بەڵام بە بۆچوونی من حیكمەتەكەی ئەوەیە: بۆ لوقمان ڕەنگە ڕێك نەبووبێ و پێچەوانەی حیكمەتەكەی بووبێ، بە كوڕەكەی بڵێ: ڕۆڵە! لەگەڵ من و دایكت دا چاك بە، باب و دایك نابێ بە منداڵی خۆیان بڵێن: لەگەڵمان چاك بە! بەڵكو ئەو منداڵە دەبێ بۆ خۆی هەست و شعووری هەبێ، ئنجا لە جیاتی ئەوەی خوا ﷻ قسەی ڕاستەوخۆی لوقمان بێنێ بۆ كوڕەكەی، كە لەگەڵ باب و دایكت چاك بە، فەرمایشتی خۆی هێناوە، بۆ ئەوەی لوقمان ڕاستەوخۆ ئەو قسەیە بە كوڕەكەی نەڵێ.

**دوو:** لە تەفسیری سووڕەتی (**الإسراء**)دا، ئایەتەكانی: (٢٣ - ٢٥)دا، باسێكی كورتمان لە بارەی مامەڵە لەگەڵ باب و دایكدا كردوە، پێویستە هەر كەسێك بیەوێ بە تەفصیل لەو بابەتە ئاگادار بێ، بگەڕێتەوە بۆ ئەوێ، چونكە ئێمە هەر بابەتێك، لە شوێنێك دەیتوێژینەوە، لە شوێنەكانی دیكە خوێنەرانی بەڕێز حەواڵەی ئەوێ دەكەینەوە، تاكو

پێویست نەکات لە هەموو شوێنەکان ئەو کورتە باسانەی دەیانکەین، دووبارەیان بکەینەوە.

**سێ:** لە بارەی وەسیەتکرانی مرۆڤەوە بۆ چاکە کردن لەگەڵ باب و دایکیدا، دیارە هەر مەسەلەیەك لە یەك شوێندا بێ هەر گرنگەو، بێگومان خوا بە خۆڕایی هیچ فەرمایشتێك نافەرموێ، بەڵام مەسەلەیەك لە سێ شوێندا هاتبێ، گرنگترە لەوەی لە شوێنێكدا هاتبێ، مەسەلەیەكیش لە حەوت شوێندا هاتبێ، گرنگترە لەوەی لە سێ شوێندا هاتبێ، ئنجا با تەماشای ئەو حەوت شوێنانە بکەین، کەم مەسەلەیان تێدا هاتوە:

١- لە سوورەتی (**لقمان**)دا: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ﴾.

٢- لە سوورەتی (**البقرة**)دا: ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا ﴿٨٣﴾ ﴾.

٣- لە سوورەتی (**النساء**)دا: ﴿ وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴿٣٦﴾ ﴾.

٤- لە سوورەتی (**الأنعام**)دا: ﴿ قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴿١٥١﴾ ﴾.

کە لە ڕابردوودا ئەوانەمان هەموویان تەفسیر کردوون، لە بەرگەکانی ئەم تەفسیرەدا.

٥- لە سوورەتی (**الأحقاف**)دا: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ

أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓۖ إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾، واتە: مرۆڤمان بە چاکەکاریی لەگەڵ باب و دایکیدا ڕاسپارد، دایکی بە قورسی هەڵیگرت و بە قورسیش دایناو، هەروەها پێ دوو گیان بوونی و لە شیر بڕینەوەی لە ماوەی سی (٣٠) مانگدا....

ئنجا ئەگەر دوو ساڵ (٢٤) مانگ لە سی (٣٠) مانگ دەرکەین: (٣٠ - ٢٤ = ٦) شەش مانگ دەمێنێتەوە، کەواتە: لای کەمی دوو گیان بوونی ئافرەت، دەگونجێ شەش مانگ بێ، کە گەیشتینە تەفسیر کردنی سووڕەتی **(الأحقاف)** یش لەو بارەوە باسی زیاتر دەکەین.

٦- سوورەتی (العنکبوت): ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ﴿٨﴾﴾.

٧- سوورەتی **(الإسراء)**: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًاۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾﴾.

**چوار:** هۆی هاتنە خواری ئەم دوو ئایەتە، ڕاست نیە کە بەسەرهاتەکەی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص بێ، بەڵکو لێرەدا خوا ﷻ وەك فەرمایشتێکی خۆی دەیخاتە نێو ئامۆژگارییەکانی لوقمانەوە بۆ کوڕەکەی، بەڵام بەسەرهاتەکەی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص، هۆی هاتنە خواری ئایەتەکەی سووڕەتی **(العنکبوت)**ە، کە ئایەتی ژمارە (٨)ەو، کاتی خۆی تەفسیرمان کرد.

**پێنج:** مەسەلەی چاکەکردنی ڕۆڵە لەگەڵ باب و دایکیدا، یەکجار گرنگ و هەستیارەو، خوای کارزان و میهرەبان باش دەزانێت لە دنیای بەشەردا چی ڕوودەدات و، پێویستە چ شتێك زۆر جەختی لەسەر بکرێتەوە، بۆیە لە حەوت شوێنی قورئاندا، خوا ﷻ بە مرۆڤەکان دەفەرموێ: لەگەڵ باب و دایکتاندا چاك بن، بە زۆریی وایە کە لە دوای فەرمانکردنی بە بەندایەتیی کردن و پەرستنی خۆی، فەرمان دەکات بە چاکە لەگەڵ باب و دایکدا.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ئاگادارکردنەوەی لوقمان بۆ کوڕەکەی کە ئەگەر چاکەو خراپە، هێندەی دەنکە خەرتەلەیەکیش بێ و لە گاشە بەردێك دابێ، یان لە ئاسمانەکان، یان لە زەوییدا، خوای پەنهانزان و شارەزا دەیهێنێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ فَتَكُن فِي صَخۡرَةٍ أَوۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ١٦ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ ﴾، یانی: ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم! ئەگەر بێت و کردەوە (چاك و خراپ) هێندەی گرانایی دەنکە خەرتەلەیە کێشی بێ، ﴿ إِنَّهَآ إِن تَكُ ﴾، (إِنَّها) ئەم (هَا)یە، (ضَمِيرُ القِصَّةِ، إِنَّهَا القِصَّةُ)، بەسەرهات وایە کە، یاخود (إِنَّها) ڕاناوە دەچێتەوە بۆ (مَعصِيَة) گوناه، دەشگونجێ (**إِنَّهَا: أي الحَسَنَةُ او السَّيئَة**) بە دڵنیایی چاکەو خراپە.

٢)- ﴿ فَتَكُن فِي صَخۡرَةٍ ﴾، (ئنجا ئەو چاکەو خراپەیە) لە گاشە بەردێکدا بێ، بەردێکی پتەوی ڕەق.

٣)- ﴿ أَوۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، یان لە ئاسمانێدا بێ، بەو بەرزییەو بەو دوورییە، یاخود لە زەوییدا بێ، لە جیهانی بەرز دابێ، یان لە جیهانی نزم (**فِي العَالَمِ العُلوي أو السُّفْلِي**).

٤)- ﴿ يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُ ﴾، خوا دەیهێنێ، لە لای خوا تۆمار کراوەو دێتە ڕێت و پێشانتی دەداتەوە.

٥)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴾، بە دڵنیایی خوا پەنهانزانی شارەزایە، (**اللَّطِيفُ:مَنْ يَعلَمُ دَقَائِقَ الأَشْيَاءِ، وَيَسلُكُ فِي إِيصَالِهَا إلى مَن تَصْلُحُ لَهُ مَسلَكَ الرِّفقِ**)، (**لَطِيف**) ئەو زاتەیە

کە وردەکاریی شتەکان دەزانێ و، لە گەیاندنی شتەکان دا بۆ هەر کەسێك کە بۆی باشبن، ڕێی وردو پەنهانکار دەگرێتەبەر، (خَبِير)یش واتە: شارەزا کە بە زۆریی زانیاریی خوا - کە بە هەموو شتێك زانایە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ۝٦٢﴾ العنكبوت، - لە قورئانێ دا پەیوەستە بە شتەکانەوە، کە بریتیە لە کەشفکردنی شتەکان بۆ خوا بە زانیارییەکەی، بەڵام (خَبِير) زیاتر مەبەست پێی شارەزایی خوایە ﷻ بە مرۆڤەکان و بە هەڵسوکەوتەکانیان و بە حاڵ و باڵیان.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ﴾، ئەمە سێ جەختکەرەوەی تێدان:

**یەکەم:** بانگکردن ﴿يَٰبُنَيَّ﴾، ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم!.

**دووەم:** ﴿إِنَّهَآ﴾، (إِنَّ) ئامرازی چەسپاندن و جەختکردنەوەیە، (هَا)ش، (ضَمِيرُ القِصَّةِ)، ڕاناوی بەسەرهاتە، یانی: بەسەرهات وایە، حاڵ وایە.

**سێیەم:** ﴿إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ﴾، باس نەکراوە ئەم (تَكُ) بۆچی دەچێتەوە؟ بەڵام بە سیاق و سەلیقە: یان مەبەست پێی گوناهو تاوانە، یان مەبەست پێی کردەوەیە، چاك یان خراپ، ئەگەر تاوان و خراپەیە، یاخود کردەوەیە چ چاك، چ خراپ و لە هەناوی گاشە بەردێکی ڕەق و پتەو دابێ، ئەویش لە ئاسمانەکان بێ، کە زۆر دوورو بەرزن، یاخود لە زەویدابێ، کە سەد پەناو بەسیوی تێدایە، ئەوە لە دەستی خوا قوتار نابێ و خوا پێی ئاگادارەو تۆماری دەکات و دەیهێنێتەوە ڕێت، چونکە خوا پەنهانزانی شارەزایە.

## مەسەلەی چوارەم:

**ئامۆژگاریی بە بەرپاکردنی نوێژو، فەرمان بە پەسندو، ڕێگریی لە ناپەسندو، خۆڕاگریی لەسەر بەڵاو گرفتارییەکان، هەروەها ڕوو لە خەڵکی وەرنەگێڕان و، بە فیزو کەشخە بە ڕێدا نەڕۆیشتن و، بە شێوەی میانجیی ڕۆیشتن و، زۆر دەنگ هەڵنەهێنان:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرۡ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٖ ﴿١٨﴾ وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ﴿١٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم! نوێژ بەرپا بکە، نوێژ گەورەترین کردەوەی مرۆڤە لە نێوان خۆی و خوادا ﷻ، لە دوای ئیمان، گەورەترین کردەوە، نوێژە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ العَبْدُ يَوْمَ القِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ صَلاَتُهُ**}، (**أخرجه الترمذي: ٤١٣، وقال: حسن غريب، والنسائي: ٤٦٥، وابن ماجه: ١٤٢٥**)، واتە: بێگومان یەکەمین کردەوە کە بەندە لەسەری لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێ، نوێژە، نوێژ بەرپاکردنیش لە تەفسیری سوورەتی (**العنكبوت**)دا باسمانکرد، چییەو چۆنە؟

**٢**)- ﴿ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾، هەروەها فەرمان بکە بە هەرچی پەسندە، یانی: هەرچی پەسندە بۆ خۆت ئەنجامی بدەو، فەرمانیشی پێبکە لە دەرەوەی خۆت.

٣)- ﴿ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ﴾، دیسان ڕێگریی لە ناپەسند بکە، نا پەسند بۆ خۆت دەستی لێ هەڵگرەو خۆتی لێ دوور بگرەو، لە دەرەوەی خۆشت فەرمانی پێ بکە.

٤)- ﴿ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ﴾، خۆڕاگریش بە لەسەر ئەوەی تووشت دێ، بە تەئكید كەسێك فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند بكات، دەبێ خۆشی دابنێ بۆ گرفتاریی و بەرەنگاربوونەوەی كەسانی خراپەكارو، كەسانێك كە مل نادەن بۆ چاكە، بە شێوەیەك لە شێوەكان لەگەڵیاندا تووشی تێكگیران دەبێ، بۆیە هەر كات فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپەت كردە پیشە، دەبێ قەڵغانی خۆڕاگریی لەسەر سەری خۆت ڕاگری.

كەواتە: ﴿ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ﴾، یانی: (**تَحَمَّلْ مَا يُصِيبُكَ بِسَبَبِ الأَمْرِ بالمَعروفِ والنَّهيِ عَنِ المُنْكَرِ**)، خۆڕاگربە لەسەر ئەوەی تووشت دێ، بە هۆی فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسندەوە.

٥)- ﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوە لە كارە پێویستكراوەكانە، یان: ئەوە لە كارە حەوجێی عەزیمەتەكانە.

أ- (**أي: مِنَ الأُمُورِ المَعْزُومَةِ مِنَ اللَّهِ تَعَالي**)، لەو كارانەن كە لە خواوە پێویستكراون و جەختیان لێكراوەتەوە.

ب- یاخود: (**مِنَ الأُمُورِ الَّتِي تَحْتَاجُ إلى العَزِيمَةِ القَوِيَّة**)، ئەوە [نوێژ بەرپاكردن و فەرمان بە پەسندو، ڕێگریی لە ناپەسندو، خۆڕاگریی لەسەر ئەوەی دێتە ڕێت] دەگونجێ بۆ هەر چواریان بچێتەوە، لەو كارانەن كە پێوستییان بە عەزیمەت و ویستی پۆڵایین و بەهێز دەكات.

دەشگونجێ تەنیا بچێتەوە بۆ خۆڕاگریی لەسەر ئەوەی دێتە ڕێت، دەشگونجێ بگەڕێتەوە بۆ فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسندو، خۆڕاگریی لەسەر ئەوەی دێتە ڕێت، دەشگونجێ بۆ هەر چواریان بگەڕێتەوە، بێگومان هەر چواریان پێویستیان بەعەزیمەتی پتەو دەكات و، هەر چواریشیان لەو كارانەن كە خوا ﷻ پێویستی كردوون.

٦)- ﴿ وَلَا تُصَعِّرۡ خَدَّكَ لِلنَّاسِ ﴾، هەروەها ڕووی خۆت لە خەڵك وەرمەچەرخێنە، ﴿ وَلَا تُصَعِّرۡ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**وَلَا تُصَاعِر**)، ڕووی خۆت وەرمەچەرخێنە، ملی خۆت با

مەدە، (**الصَّعَرُ: داءٌ يَأْخُذُ الإِبْلَ فِي أَعْنَاقِهَا أَو رُؤُسِهَا حَتَّي تُلْفِتَ أَعْنَاقَهَا**)، (**صَعَر**): دەردێکە تووشی حوشتر دێ لە ملیدا، یاخود لە سەریدا، تاکو وای لێ دێ، ملی با بدات و ڕەق بێ.

ئـەو کەسـەش کـە خـۆی بـە زل دەگـرێ لـە بەرانبـەر خەڵکیـداو، ملیـان لێدەسـووڕێنێ، چوێنـراوە بـە حوشـترێکەوە کـە تووشـی مـل ئێشـەو مـل ڕەق بـوون بـووە، کـە ئەمـە جۆرێکیشـە لـە بـە کـەم تەماشـا کـردن، یانـی: بابـای خـۆ بەزلگـر بـە حوشـترێك تەشـبیە کـراوە، کـە تووشـی مـل ڕەق بـوون بـووە.

٧)- ﴿ وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ﴾، هەروەها بە فیزو کەشخە بە زەوییدا مەڕۆ، (**المَرَحُ: شِدَّةُ الفَرَحِ وَالتَّوَسُّعِ فِيهِ**)،(**مَرَح**): بریتیە لە زۆر خۆشحاڵ بوون و فراوانیی لە خۆشحاڵییداو، لە دەمارو خۆ بەزلگرییدا، بەو جۆرە بە زەوییدا مەڕۆ.

٨)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴾، بە دڵنیایی خوا هەر خۆ پێ زۆرێکی شانازییکەری خۆشناوێ.

یانـی: کەسـێك لـە خۆیـدا پێـی وابـێ سـیفەتێکی هەیـە لـە خەڵکـی دیکـەدا نیـە، ئنجـا ئـەوە بـۆی ببێتـە هـۆی پەیدابوونـی سـیفەتی (**خُيَـلاء**)، ئەویـش ئەوەیـە کـە ئینسـان خەیاڵـی وابـێ لـە خەڵـك گەورەتـرەو گرنگتـرە، (**فَخر**)یـش بریتیـە لـە: (**المُباهـاة فِـي الأشـياء الخَارِجَـةِ عَـنِ الإنسَـان**)، ئەوەیـە مـرۆڤ شـانازیی بـە شـتێکەوە بـکات کـە لـە دەرەوەی خۆیـدا هەیـە، بـە جـل و بەرگـی، بـە وڵاخـی، بـە سـەیارەی، بـە خانووبـەرەی، بـە پـارەو سـامانی، کەواتـە: (**إختيَـال**): ئەوەیـە کـە مـرۆڤ لـە زاتـی خۆیـدا خـۆی پـێ گـەورەو زل بـێ، بـەڵام (**فَخـور**): ئەوەیـە کـە لـە دەرەوەی خۆیـدا ئـەو خۆبەزلگرییـە بەسـەر خەڵکـدا بـکات، (**إختيَـال**) ئەوەیـە مـرۆڤ، لـە دەروونـی خۆیـدا خـۆی پـێ زۆرە، بـەڵام (**فَخـر**) ئەوەیـە کـە ئـەو شـانازیی بـە خـۆوە کردنـەی، دەرکـەوێ و خەڵـك هەسـتی پێبـکات.

ئنجا هەر کەسێك وابێ، خوا خۆشی ناوێ.

٩)- ﴿ وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ ﴾، هەروەها لە ڕۆیشتنتدا میانجیی بە، نە زۆر بە خێرایی بڕۆ، نە زۆر بە مردەلۆخەییش بڕۆ.

١٠)- ﴿ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَ ﴾، لە دەنگیشت کەم بکەوە، لە دەنگت بگرەوە، (**الغَضُّ: النَّقصُ**)، (**غض**)، یانی: کەمکردنەوە، دەنگت زۆر هەڵمەیەنە.

١١)- ﴿ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ﴾، بە دڵنیایی ناخۆشترینی دەنگەکان، دەنگی کەرانن، (**أنكر: أي أقبَح وَأوحَش**)، یانی: ناقۆڵاترین و نامۆترین، (**أنكَر**) لە (**مَنكور**)ەوە هاتوە، (**مَنكور**)، یانی: ناخۆشویستراوو ناپەسند کراو.

پێویستە مرۆڤ بە ئەندازەی ئەوە کە پێویستە، دەنگ هەڵێنێ، هەروەك لە ڕۆیشتندا بە ئەندازەی ئەوە کە پێوستە، پێ هەڵێنێ، ئنجا بە خاکیەتیی لەگەڵ خەڵکدا مامەڵە بکات، بۆ ئەوەی خۆی لەو سیفەتانە بپارێزێ کە خوا دەفەرموێ خاوەنەکانیانی خۆشناوێن.

## کورتە باسێک لە بارەی لوقمان و حیکمەتەکەیەوە

بەڕێـــــزان!

لە سێ بڕگەدا باسی لوقمان ﭬو، حیکمەتەکەی دەکەین:

### یەکەم: لوقمان کێ بووەو چۆن بووە؟

پێشتریش باسمانکرد کە مشتومڕ هەیە لە بارەی لوقمانەوە: ئایا پێغەمبەر بووە، یان پێغەمبەر نەبووە؟ ئایا خەڵکی چ شوێنێك بووە؟ بە چ زمانێك دواوە؟ لە چ ڕۆژگارێکدا ژیاوە؟ بەڵام هیچ شتێکی جێی دڵنیایی و مسۆگەر لەو بارەوە نیە.

لە (**السِّيرة النَّبوية لابن هِشام**)دا[1]، ئەمە هاتوە: (**قِيلَ كَانَ رَاعِيَاً لِلغَنَمِ، وَقيلَ كَانَ خَيَّاطاً، وَقيلَ كَانَ قَاضِيَاً فِي بَنِي إسرائيل فِي زَمَانِ داود**)، واتە: گوتراوە: لوقمان شوانی مەڕان بووە، هەروەها گوتراوە: دارتاش بووە، دیسان گوتراوە: بەرگ دروو بووە، گوتراویشە: دادوەرو قازیی بووە لە نێو گەلی (**بَنِي إسرائيل**) لە ڕۆژگاری داوود ؈ دا.

زۆربەیان ئەوەیان هێناوە کە لوقمان لە ڕۆژگاری(**داوود**)دا بووە، بەڵام خوا ﮋ باسی ڕەچەڵەکی لوقمان ناکات، بەڵکو باسی حیکمەتەکانی دەکات، چونکە ئەوەی بۆ ئێمە جێی سوودو بەهرەیە، حیکمەت و قسە نەستەقەکانی لوقمانن، نەك ئەو وردەکارییانەی دیکە، کە زانایان گەلێك جار زۆریان بەدوا کەوتوون، بێ ئەوەی بناغەیەکی زانستییان هەبێ، یانی: هەندێکیان زۆر لاپەڕەیان پڕ کردوونەوە بۆ ئیسپاتی ئەوە کە یەکێك بووە لە ڕەش پێستەکان و لە فلان

---

(١) ج٢، ص ٢١٩-٢٢٠، (طَبعة دار ابن الهَيثَم) سنة: (٢٠١٢)م.

ڕۆژگاردا بووە، هەروەها هەندێك بەسەرهاتان دێنن کە هیچیان جێی دڵنیایی و پشت پێ بەستن نین.

هەروەها هەر لە سیرەی (**إبنُ هِشام**)دا هاتوە: (**قَالَ ابْنُ إِسْحَاقٍ فِي السِّيرة: قَدِمَ سُوَيدُ بنُ الصَّامِت أخوُ بَني عَمرِو بنِ عَوفٍ مَكَّةَ حَاجَّاً أو مُعتَمِراً، فَتَصدّى لَهُ رَسولُ اللَّهِ ﷺ فَدَعَاهُ إلي الإسلَام،فَقَالَ لَهُ سُوَيد: فَلَعَلَّ الّذي مَعَكَ مِثلُ الّذي مَعي، فَقَالَ لَهُ رَسولُ اللَّهِ ﷺ: وَمَا مَعَكَ؟ قَالَ: مَجَلَّةُ لُقمَان، فَقَالَ لَهُ رَسولُ اللَّهِ ﷺ: أعرِضْهَا عَلَيَّ، فَعَرَضَهَا عَلَيهِ، فقَالَ: إنَّ هَذَا الكَلَامَ حَسَنٌ، وَالّذي مَعي أحسَنٌ مِنْ هَذَا، قُرَآنٌ أَنزَلَهُ اللَّه، فَقَالَ ابنُ إسحَاقٍ: فَقَدِمَ المَدِينَةَ فَلَم يَلْبَث أَنْ قَتَلَتْهُ الخَزرَج، وَكَانَ قَتلُهُ يَومَ بِعَاثٍ، وَكَانَ رِجَالٌ مِن قَومِهِ يَقولونَ: إنّا لَنَرَاهُ قَد قُتِلَ وَهُو مُسلِمٌ، وَكَانَ قَومُهُ يَدعونَهُ الكَامِل**)[1].

(**إبنُ إسحاق**) لە سیرەکەی دا دەڵێ: سوەیدی کوڕی صامیت کە لە بەنی عەمری کوڕی عەوف بوو، بە حەج، یاخود بە عومرە هات، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد بۆ ئیسلام، سوەید پێیگوت: ڕەنگە ئەوەی بە تۆیە (ئەو وەحیی و پەیامە) وەك ئەوە بێ کە بە منە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: چیت پێیە؟ گوتی: مەجەللەی لوقمان، (حیکمەتەکانی لوقمان کە کۆ کراونەوە)، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: کوا پێشانمبدە (بۆم ڕانوێنە)، ئەویش حیکمەتەکانی بۆ خوێندنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەمە قسەیەکی باشە، بەڵام ئەوەی لە لای منە لەوە چاکترە، قورئانێکە خوا دایبەزاندوە، (**إبنُ إسحاق**) دەڵێ: دوایی سوەیدی کوڕی صامیت هاتە مەدینەو، زۆر پێ نەچوو خەزرەجییەکان کوشتیان لە ڕۆژی (**بِعاث**)دا، [ڕۆژێك بووە کاتی خۆی ئەوس و خەزرەج تێیدا بەشەڕ هاتوون]، پیاوانێك لە گەلەکەی (یانی: خزمانی سوەیدی کوڕی صامیت) دەیانگوت: ئێمە پێمان وایە بە مسوڵمانەتیی کوژراوە، هەروەها خەڵکەکەی پێیان دەگوت: (**الكَامِل**) پیاوی تێرو تەواو.

---

(١) هەمان سەرچاوە و بەرگ و لاپەڕە.

لەبەر ئەوەی حیكمەتەكانی لوقمانی لەبەر بوون و كاریشی پێكردوون و، هەر ئەوەش گەیاندوویەتی بەوە كە مسوڵمان ببێ، بە پێی ئەو ڕیوایەتەی (**إبنُ إسحاق**) هێناویەتی.

## دووەم: حیكمەتەكانی لوقمان لەم سوورەتەدا:

پێشتریش باسمانكرد لوقمان خوا لێی ڕازی بێ، دە (١٠) ئامۆژگاری گەورەو گرنگ ئاڕاستەی كوڕەكەی دەكات، كە سەرجەم بوارەكانی دینداریيان پێدەگرێتەوە.

ئەوانیش بەمجۆرەن: پێش هەموو شتێك پێی دەڵێ:

**١-** ﴿يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ﴾، ئەی ڕۆڵە گیان! هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، هاوبەش بۆ خوا دانان ستەمێكی مەزنە.

ئەوە یەكەم حیكمەت و ئامۆژگاریی لوقمانە بۆ كوڕەكەی.

پێشتریش باسمان كرد كە هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: كوڕەكەی موشریك بووە، بۆیە بابی پێی دەڵێ: هاوبەش بۆ خوا دامەنێ! بەڵام ئەوە قسەیەكی بێ بنەمایەو، لە ڕاستییدا وا دیارە كوڕەكەی خوا پەرست و خواناس بووە، بەڵام بابی هۆشداریی پێدەدات، دەڵێ: ڕۆڵە گیان! ئاگات لە خۆ بێ تووشی شیرك نەبی! هەروەك چۆن خوا ﷻ لە قورئاندا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ ٦٥﴾**الزمر**، واتە: ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی، كردەوەكەت هەڵدەوەشێتەوە، ئەوەش مانای ئەوە نیە كە بگونجێ پێغەمبەر ﷺ هاوبەش بۆ خوا دابنێ، بەڵام ئەوە هۆشدارییە بۆ پێغەمبەر ﷺ و، هۆشدارییە بۆ ئوممەتەكەشی، كەواتە: یەكەم ئامۆژگاریی لوقمان بۆ كوڕەكەی، ئەوەیە كە لە شیرك وریا بێ، لەسەر خوا پەرستیی و خوا بە یەكگرتن بەردەوام بێ، بەڵام وریا بێ، شیرك تێكەڵی ئیمانەكەی نەكات.

٢- ﴿ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ فَتَكُن فِي صَخۡرَةٍ أَوۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُۚ ﴾، ئەی ڕۆڵە گیان! ئەگەر چاکە، یان خراپە، هەر کردەوەیەك، هێندەی گرانایی دەنکە خەرتەلەیەك بێ، لە نێو هەناوی گا بەردێك دابێ، لە ئاسمان یان لە زەوییدا بێ، خوا دەیهێنێ، کەواتە: لە خۆت وریابە! تووشی خراپە نەبی، چونکە خراپە ون نابێ و، سەر گەرمی چاکە بە، بە دڵنیایی چاکە دێتەوە ڕێت.

٣- ﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، ڕۆڵە گیان! نوێژ بەرپا بکە، لە ڕاستییدا نوێژ بەرپا کردن بناغەی دینداریيە، کۆڵەکەی دیندارییە، هەوێنی دینداریی و مسوڵمانەتییە.

٤ و ٥ - ﴿ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ﴾، فەرمان بە پەسند بکەو، ڕێ لە ناپەسند بگرە.

٦- ﴿ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ ﴾، لەسەر ئەوەش کە تووشت دێ، خۆڕاگر بە، هەر کەسێ فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە بکات، دەبێ قەڵغانی پشوو درێژیی و خۆڕاگریی لەسەر سەری خۆی هەڵدا، چونکە بە تەئکید فەرمان کردن بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند، گرفتاریی و سەر ئێشە بۆ ئینسان دێنێتە پێش.

٧ و ٨ - ﴿ وَلَا تُصَعِّرۡ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ ﴾، ڕووی خۆت لە خەڵك وەرمەچەرخێنە، وەك حوشترێك کە تووشی ملە ڕەقە بووە، واتە: خۆت بە زل مەگرە لە بەرانبەر خەڵکدا، بابای خۆ بەزلگر لووتی دەچێتە ئاسمانێ و مل ناسووڕێنێ بە لای خەڵکدا، وێنەی حوشترێك کە تووشی نەخۆشیی ملە ڕەقە بووە، ﴿ وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ ﴾، بە فیزو کەشخەو شادمانیی و خۆشحاڵیی بە ڕێدا مەڕۆ، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٖ ﴾، چونکە بە دڵنیایی خوا هەر خۆ بەزلگرێك لە دڵی خۆیداو، هەر شانازییکەرێك بەسەر خەڵکدای، خۆشناوێ.

٩- ﴿ وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ ﴾، لە ڕۆیشتنتدا میانجیی بە، ئەوەی پێشێ دەفەرموێ: بە دڵخۆشیی و شادمانیی بە ڕێدا مەڕۆ، بە لە خۆبایی بوون و لە کەوڵی خۆ دەرچوونەوە، بەڵام ئەمەیان دەفەرموێ: با چۆنیەتیی ڕۆیشتنەکەت میانجیی بێ، ﴿ وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ ﴾،

لە ڕۆیشتنتدا میانجیی بە، نە تێپەڕێنەو نە کورتی بێنە، نە زۆر خێرا بڕۆ، مەگەر شتێك پێویست بکات، جاری وا هەیە پێویست دەکات ڕابکەی، ئەوە جیایە، بەڵام کە پێویست نەکات، بە شێوەیەکی میانجیی بڕۆ، بە مردەلۆخەیی مەڕۆ، هەروەها زۆر بە خێراییش مەڕۆ.

١٠- ﴿وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَ﴾، لە دەنگیشت بگرەوە، زۆر هاوار مەکە، قیڕە قیڕ مەکە، دەنگ هەڵمەیەنە، چونکە ناخۆشترین دەنگ، دەنگی کەرانە، کەرەکان زۆر دەنگیان هەڵدێنن.

## سێیەم: هەندێك لە حیکمەتەکانی لوقمان:

من بە گوشراویی و بە خێرایی دەیانهێنم، ئەگەرنا لە تەفسیرەکاندا زۆر شت باسکراوەو پاڵدراوەتە لای لوقمان، بەڵام من ئەو بیست و سێیەم لێ گوڵبژێر کردوون:

١- (**مَنْ كَانَ لَهُ مِنْ نَفسِهِ وَاعِظ، كَانَ لَهُ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ حَافِظ**)، واتە: هەر کەسێك لە خودی خۆیدا ئامۆژگارییکاری هەبێ، لەلایەن خواشەوە پارێزەری هەیە.

٢- (**مَنْ أَنْصَفَ النَّاسَ مِنْ نَفْسِهِ، زَادَهُ اللَّهُ بِذَلِكَ العِزَّة**)، واتە: هەر کەسێك بە ئینصاف بێ بۆ خەڵك لە دژی خۆی، خوا عیززەتی بۆ زیاد دەکات، واتە: ئەگەر هەقێکی خەڵکی کەوتە لا، بە ئینصاف بێ بۆ خەڵك لە دژی خۆی، یاخود تۆڵەی خەڵك لە خۆی بسێنێتەوە، یان ئەگەر هەڵەیەکی بەرانبەرکردن، داوای لێبوردنیان لێ بکات، ئەوە پێی بەرز دەبێتەوە، عیززەت و پێگەی لە نێو خەڵکدا پێی زیاد دەکات.

٣- (**ضَرْبُ الوَالِدِ لِوَلَدِهِ كَالسَّمَادِ لِلزَّرْعِ**)، واتە: لێدانی باب و دایك بۆ ڕۆڵەیان، وەك پەین وایە بۆ کشتوکاڵ، یانی: چۆن کشتوکاڵ بە پەین زیاد دەکات و گەشە دەکات، لێدانی باب و دایکیش گەشە بە منداڵ دەدات، هەڵبەتە مەبەستیش ئەوە نیە فەلاقەی بکەن! بەڵکو جاروبار زبر بن لەگەڵ منداڵی خۆیانداو لە خراپە بیگێڕنەوە، چونکە ئەو منداڵە

عەقڵی کامڵ نەبووە تاکو بۆ خۆی لە خراپە بسڵەمێتەوە، دەبێ باب و دایك جار جار بیهێننەوە سەر ڕێ و ئامۆژگاریی بکەن و، تەمبێی بکەن، ئەگەر پێویست بوو جاری وا هەیە گوێی بادەن و زللەیەکیشی لێبدەن، وەك چۆن کە پەین بە کشتوکاڵ دەکەی، زیاد دەکات، لێدان و زبریی باب و دایکیش لە کاتی پێویست دا لەگەڵ منداڵی خۆیان، ئاوا پێی گەشە دەکات و زیاد دەکات.

٤- (**يَا بُنَيَّ ارْجُواللَّهَ رَجَاءً، لا يُجَرِّيكَ عَلَى مَعْصِيَتِهِ، وَخَفِ اللَّهَ سُبحَانَهُ خَوْفَاً، لا يُؤيِسُكَ مِنْ رَحْمَتِهِ**)، واتە: ڕۆڵە گیان! ئەوەندە ئومێدەواربە بە خوا، کە ئومێدەواربوونت بە خوا، بوێرت نەکات لەسەر سەرپێچیی خواو، هێندەش لە خوا ﷻ بترسێ، ترسێکی وا نەبێ نائومێدت بکات لە بەزەیی خوا.

٥- (**لاَ تُرْسِل رَسُولاً جَاهِلاً، فَإِنْ لَمْ تَجِد حَكِيمَاً فَكُنْ رَسُولَ نَفْسِك**): واتە: هەرگیز نوێنەرێکی نەفام بۆ شتێك مەنێرە، ئەگەر بابایەکی لێزان و کارامەت نەدۆزیەوە بیکەیە نوێنەری خۆت، بۆ خۆت نوێنەری خۆت بە.

یانی: خۆت بچۆ کارەکەی خۆت بە تەڕەفی بەرانبەر بڵێ، نەك نەفەرێکی نەفام بنێری کارەکەت لێ سەقەت بکات!

٦- (**لاَ خَيْرَ لَكَ فِي أَنْ تَتَعَلَّمَ مَا لَمْ تَعْلَم، وَلَمَّا تَعْمَل بِمَا قَدْ عَلِمْتَ، فَإِنَّ مِثْلَ ذَلِكَ مِثْلَ رَجُلٍ احتَطَبَ حَطَبَاً، فَحَمَلَ حُزمَةً وَذَهَبَ يَحْمِلُهَا فَعَجَزَ عَنْهَا، فَضَمَّ إِلَيهَا أُخْرَى**)، واتە: هیچ بەرژەوەندییەك بۆ تۆ لەوەدا نیە، زانیارییەك فێر بی، کە نایزانی، بەڵام جارێ ئەوەی فێری بووی، کارت پێ نەکردوە، وێنەی ئەوە وەك پیاوێك وایە، کۆڵە دارێکی کردوە، چووە هەڵیبگرێ، بەڵام نەیتوانیوە، ئنجا کە ئەو کۆڵەی نەتوانیوە، کۆڵێکی دیکەشی خستۆتە سەر ئەو کۆڵە!.

واتە: تۆش زانیارییەك کە جارێ کارت پێ نەکردوە، مەچۆ زانیارییەکی دیکە فێربی و بیخەیە گەڵ ئەو زانیارییەی کە کارت پێی نەکردوە، سەرەنجام زانیاریی زۆرت هەبێ، بەڵام کردەوەی کەمت هەبێ.

٧- (لِتَكُنْ كَلِمَتُكَ طَيِّبَةً، وَلْيَكُن وَجهُكَ بَسْطاً، تَكُنْ أَحَبَّ إِلى النَّاسِ مِمَّنْ يُعْطِيهُمُ العَطَاء)، واتە: با قسەت خۆش بێ و، ڕووت خۆش بێ، لە لای خەڵکی خۆشەویستتر دەبی لەو کەسەی کە دەیانداتێ، [بەڵام بە پرتەو بۆڵەو، بە ڕووی گرژو قسەی ناخۆش].

٨- (كُنْ كَمَنْ لاَ يَبْتَغِي مَحْمَدَةَ النَّاسِ، وَلا يَكْسِبُ ذَمَّهُم، فَنَفْسُهُ مِنْهُ فِي عَنَاءٍ، وَالنَّاسُ مَنْهُ فِي رَاحَةٍ)، واتە: تۆ وەك كەسێك بە، كە بە تەما نیە خەڵك ستایشی بكات، هەروەها سەرزەنشت و لۆمەی خەڵكیش بۆ خۆی پەیدا ناكات، بۆیە لە خودی خۆیدا ماندوویە، بەڵام خەڵك بە دەست ئەوەوە ئاسوودەیە.

ئینسان ئەگەر خۆی ماندوو بكات و خەڵك ئاسوودە بكات، زۆر باشترە لەوەی خۆی ئاسوودە بكات و خەڵك ماندوو بكات!.

٩- (جَالِسِ العُلَمَاءَ وَ زَاحِمْهُم بِرُكْبَتَيْكَ، فَإِنَّ اللَّهَ يُحِي القُلُوبَ بِنُورِ العِلْمِ، كَمَا يُحِي الأَرْضَ المَيْتَةَ بوابِلِ السَّمَاء)، واتە: لەگەڵ زانایان دابنیشەو ئەژنۆت بە ئەژنۆیانەوە بنووسێنە، (بە ئەدەبەوە لە خزمەتیاندا بە)، چونكە خوا دڵەكان بە ڕووناكیی زانیاریی زیندوو دەكاتەوە، وەك چۆن زەوی مردوو، بە بارانی ئاسمان دەژیەنێتەوە.

١٠- (إِنَّ دَاراً تَسِيرُ إِلَيْهَا، أَقْرَبُ إِلَيْكَ مِنْ دَارٍ تَخْرُجُ عَنْهَا): واتە: مەنزڵگایەك كە بەرەو ڕووی دەچیت، نزیكترە لە مەنزڵگایەك كە لێی دەردەچیت.

واتە: هەمیشە قیامەت نزیكترە لە تۆ لە دنیا، چونكە دنیا تۆ لێی دەردەچی، بەڵام قیامەت بۆ لای دەچی!

١١- (قِيلَ لِلُقْمَانَ: أَيُّ النَّاسِ شرٌّ؟ قَالَ: الَّذِي لاَ يُبَالِي أَنْ يَرَاهُ النَّاسُ سَيِّئاً أَو مُسِيْئاً)، واتە: بە لوقمان گوترا: چ كەسێك لە هەموو كەس خراپترە؟ گوتی: ئەو كەسەی گوێ ناداتێ خەڵك بە خراپ ببینن، یان بە خراپەكار ببینن.

یانی: دەربەست نیە هەرچەندە خەڵك خراپەشی لێ ببینن و، بە خراپی ببینن، بێ شەرمە، شەرم بەخۆ نیە.

١٢- (قيلَ لِلُقمَانِ: مَا بَلَغَ بكَ مَانَرَى؟ فَقَالَ: صِدْقُ الحَدِيثِ، وَأَدَاءُ الأَمَانَةِ، وَتَرْكُ مَالاَ يَعنِيني)، واتە: بە لوقمان گوترا: چ شتێك تۆی گەیاندۆتە ئەو پێگەیەی کە ئێمە دەتبینین؟ (ئاوا ناوو ناوبانگت هەیەو، پیاوێکی حەکیمی و، خەڵك خوا خوایەتی تۆزێ لە خزمەتت دابنیشێ)، گوتی: ڕاستگۆیی و ئەمانەت پارێزیی و، خۆ هەڵنە قورتاندن لە شتێك کە پەیوەندیی بە منەوە نیە.

١٣- (مَنْ يُخَيِّرُ الدُّنيَا عَلَى الآخِرَة، تَفُوتهُ الدُّنيَا وَلا يُصِيبُ الآخِرَة)، واتە: هەر کەسێك دنیا بەسەر دواڕۆژدا هەڵبژێرێ، دنیاکەشی دەڕوا، دواڕۆژیش وەدەست ناهێنێ.

١٤- (قَالَ لُقْمَانُ لابْنِهِ: إنَّ اللَّهَ رَضِيَني لَكَ، فَلَم يُوصِيني بِكَ، وَلَم يَرضَكَ لِي، فَأَوْصَاكَ بِي)، واتە: لوقمان بە کوڕەکەی گوت: خوا منی بۆ تۆ پەسند کردوە، بۆیە ئامۆژگاریی منی نەکردوە لە بارەی تۆوە، بەڵام بە تۆ ڕازی نەبووە (چۆن مامەڵەم لەگەڵدا دەکەی!)، بۆیە ئامۆژگاریی تۆی کردوە لە بارەی منەوە.

هەمـوو قورئـان بپشـکنە بـە بـاب و دایـك نالـێ: لەگـەڵ منداڵتـان چـاك بـن، چونکـە چاکیـی بـاب و دایـکان لەگـەڵ منداڵـدا، شـتێکی سروشـتیی و خواڕسـکە، بـەڵام هەمیشـە بـە منـداڵان و ڕۆڵـەکان دەڵـێ: لەگـەڵ بـاب و دایکتـان دا چـاك بـن، واتـە خـوا لـە مـن ڕازییـە وەك بـاب و دایـك، دەزانـێ مـن لەگـەڵ تـۆدا چاکـم، بۆیـە ئامۆژگاریـی منـی نەکـردوە، بـەڵام زانیویەتـی تـۆ ئەگـەر خـوا ئامۆژگارییـت نـەکات، چـاك نابـی، بۆیـە ئامۆژگاریـی کـردووی.

١٥- (كُنْ لأَصْحَابِكَ موَافِقَاً إلاَّ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلّ)، واتە: لەگەڵ هاوەڵەکانتدا گونجاوو تەبا بە، مەگەر لەسەرپێچیی خوای زاڵی پایەداردا.

لەسـەرپێچیی خـوادا، لەگـەڵ کەسـدا تەبـاو گونجـاو مەبـە بڵێـی: بـا ناتەبـاو نەگونجـاو نەیەمـە بەرچـاوی ڕەفیقەکانـم، چاکـە بکـەن، یـان خراپـە بکـەن لەگەڵیانـدا بـم! وەك کوردەواریـی دەڵێـن: (لەگـەڵ عامـێ دەچێتـە شـامێ)، نـا، ئەگـەر خەڵـك چـاك بـوون، لەگەڵیـان بـە، ئەگـەر خـراپ بـوون لەگەڵیانـدا مەبـە، بـا برادەرو دۆسـت و، خـزم و بـاب و دایکیشـت بـن.

١٦- (إِذَامْتَلأَتِ المَعِدَةُ نَامَتِ الفِكْرَةُ، وَخَرَسَتِ الحِكمَةُ، وَقَعَدَتِ الأَعْضَاء عَنِ العِبَادَة)، واتە: کاتێك گەدە پڕ بوو، عەقڵ دەخەوێ و حیکمەتیش لاڵ دەبێ، [زمانی حیکمەت لاڵ دەبێ و مرۆڤ قسەی چاکی بۆ نایەت]و، ئەندامەکانیش دادەنیشن لەوەی کە خوا پەرستیی بکەن، سست و تەنبەڵ دەبن و خوا پەرستییان بۆ ئەنجام نادرێ.

١٧- (لاَ تَكُن حُلْوَاً فَتُبْلَع، وَلا تَكُن مُرّاً فَتُلفَظ)، واتە: هێندە شیرین مەبە قوت بدرێی، هێندەش تاڵ مەبە فڕێ بدرێی، ئەوە بە شێوەیەکی دیکەش گوتراوە: (لا تَكُن رَطباً فَتُعْصَر، وَلاَ تَكُن يَبَساً فَتُكْسَر)، واتە: هێندە تەڕ مەبە بگوشرێی، هێندەش ڕەق مەبە بشکێنرێی.

١٨- (إِيَّاكَ وَالدَّينَ، فَإِنَّهُ ذُلُّ النَّهَارِ، وَهَمُّ اللَّيلِ)، واتە: خۆت لە قەرز بپارێزە، چونکە بە ڕۆژگار مایەی زەبوونییە، (کە بابای خاوەن قەرز دەبینی شەرمەزار دەبی)و، بە شەوێش مایەی خەم و خەفەتە.

بە پێی توانا خۆت لە قەرز بپارێزە، بە زۆرییش وایە خەڵك بەهۆی زێدە مەسرەفیەوە تووشی قەرزداریی دەبێ.

١٩- (مَنْ كَذَبَ ذَهَبَ مَاء وَجهِهِ، وَمَن سَاء خُلُقُهُ كَثُرَ غَمُّهُ)، واتە: هەر کەسێك درۆ زۆر بکات، ئاوی ڕووانی دەڕوا (ئابڕووی نامێنێ)و، هەر کەسێك ڕەوشتی خراپ بێ، خەم و خەفەتی زۆر دەبن.

زەمی وی دەکات، جنێو بەو دەڵێ، غەیبەتی وی دەکات، دڵی ئەوی دیکە دێشێنێ، هەقی وی دەخوات، سەرەنجام خەڵکیش کاردانەوەیان دەبێ و، تووشی خەم و خەفەت و نارەحەتیی زۆر دەبێ.

٢٠- (إِنَّ الدُّنيَا بَحْرٌ عَمِيقٌ، وَقَدْ غَرِقَ فِيهِ أُنَاسٌ كَثِير، فَاجْعَل سَفِيْنَتَكَ تَقْوَى اللَّهِ تَعَالى، وَحَشْوَهَا الإِيْمَان، وَشِرَاعهَا التَّوَكُّل عَلَى اللَّهِ تَعَالي)، واتە: دنیا دەریایەکی قووڵە، خەڵکێکی زۆر تێیدا نغرۆ بوون و خنکاون، تۆش با لە دەریای دنیادا، پارێز لە خوا کردن کەشتییەکەت بێ و، ئەوەی کەشتییەکەتی پێ پڕ دەکەی، ئیمان بێ و، با چارۆگەی کەشتییەکەشت پشت بە خوای بەرز بەستن بێ.

**٢١- (قَالَ لُقْمَانُ لابْنِهِ: يَا بُنَيَّ! خُذِ الدُّنيَا بَلاَغاً، وَلاَ تَرْفُضْهَا فَتَكُونَ عَالَةً عَلَى النَّاسِ، وَ لا تَدْخُل فِيهَا دُخُولاً يَضُرُّ بآخِرَتِك)**، واتە: لوقمان بە کوڕەکەی گوت: ئەی ڕۆڵە گیان! ئەوەندە لە دنیا بگرە کە بتگەیەنێتە مەنزڵ و، دنیا فڕێ مەدە، دوایی حەوجێی خەڵکی بێ (بار بیت بەسەر خەڵکەوە)، هەروەها واش مەڕۆ نێو دنیاوە، کە زیان بە مەنزڵگای دواڕۆژت بگەیەنێ.

**٢٢- (مَنْ لا يَمْلِكُ لِسَانَهُ، يَنْدَمُ، وَمَنْ يُكثِرِ المِرَاءَ، يُشْتَمُ، وَمَنْ يَدْخُل مَدَاخِلَ السُوءِ، يُتَّهَم)**، واتە: هەر کەسێك زمانی خۆی نەگرێ، پەشێمان دەبێتەوەو، هەر کەسێك زۆر مشت و مڕو شەڕە قسە بکات، قسەی پێ دەگوترێ (جنێوی پێ دەگوترێ)، هەر کەسێك بچێتە شوێنی گومان لێکراو، تۆمەتبار دەکرێ.

**٢٣- (سُئِلَ مَاالَّذِي أَجْمَعْتَ عَلَيهِ فِي حِكمَتِك؟فَقَالَ: لاَ أَتَكَلَّفُ مَا قَدْ كُفِيتُهُ، وَلاَ أُضَيِّعُ مَا وُلِّيتُهُ)**، واتە: پێی گوترا: ئەوەی کە تۆ حیکمەتەکەت هەموو تێدا کۆ کردۆتەوە بریتیە لە چی؟ گوتی: شتێك کە لە جیاتی من جێبەجێکراوە، خۆمی پێوە ئەزیەت نادەم و، شتێکیش کە عایدی من کراوە، زایەی ناکەم.یانی: شتێك کە خوا ﷻ وە ئەستۆی خۆی گرتوەو بۆ خۆی بۆت دەکات، پێویست ناکات تۆ وێی بڕزی و، خۆتی پێوە ناڕەحەت بکەی، بەڵام شتێك کە حەواڵەی تۆ کراوە (عایدی تۆ کراوە)، ئەوە زایە مەکە، واتە: تۆ کاری خۆت بکە، ئەوەش کە کاری خوای پەروەردگارە، ڕزقەو ئەجەلەو زۆر شتی دیکەیە، کە خوا ﷻ بەدەست خۆیەوە گرتوون، ئەوە حەواڵەی خوا بکە، بەڵام ئەوەی حەواڵەی تۆ کراوە، کە بریتیە لەوەی پابەندبی بە شەریعەتەوە، بەپێی توانای خۆت هۆکارەکان بگریەبەرو، چاکە بکەی و خۆ لە خراپە بپارێزی و، ئەوانەی کە ئەرك و مافیان لەسەرتە، ئەرك و مافیان بۆ جێبەجێ بکەی، تۆ کاری خۆت بکەو، لەوە گەڕێ کە خوا ﷻ بۆ خۆی بە دەست خۆیەوە گرتوە.

ئەم بیست و سێ حیکمەتە کە من وەك گوڵبژێر هێناومن، ئەگەرنا حیکمەتەکانی لوقمان هەندێکیان گەیاندوویانە شەست (٦٠) حیکمەت و، هەندێکیان گەیاندوویانە هەشتا (٨٠) حیکمەت، بەڵکو باسی پێنج سەد (٥٠٠) حیکمەتیش کراوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە نـۆ ئایـەت پێکهاتـوە، ئایەتەکانـی: (٢٠ - ٢٨)، کـە تێیانـدا باسـی چاکـەو نیعمەتەکانـی خـوا لەسـەر مـرۆڤ کـراوە، هەروەهـا باسـی هەڵوێسـتی نەرێنییانـەو خراپـی بێبڕوایـان لـە بەرانبـەر خـوا ﷻ و، کتێـب و بەرنامەکەیـداو، هەڵوێسـتی پەسـندو چاکـی چاکەکارانـی بـۆ خـوا ملکـەچ، کـراوە.

دوایـی باسـی ئـەوە کـراوە کـە چـۆن مامەڵـە لەگـەڵ بێبڕوایانـدا بکـرێ، لـە لایـەن پێغەمبـەری خاتەمـەوە موحەممـەد ﷺ و، لـە لایـەن شـوێنکەوتووانیەوە؟.

لـە کۆتاییشـدا کۆمەڵێـك سـیفەت و کـردەوەی بـێ وێنـەی خـوای تـاك و پـاك خراونە ڕوو، وەك: بـە دیهێنـان، خاوەنداریێتیـی ڕەهـا، زانیاریـی، توانـای بـێ سـنوور، بـێ نیازیی، ستایشـکراویی، زاڵیـی، کارزانیـی، هەروەهـا بیسـەرو، بینەربوونـی خوا ﷻ.

﴿أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً
وَبَاطِنَةً ۗ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا
قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۚ أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ
يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴿٢١﴾ ۞ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ
اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ ۗ وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُ ۚ
إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ
نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٢٤﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ
اللَّهُ ۚ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ إِنَّ اللَّهَ

هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٢٦﴾ وَلَوۡ أَنَّمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن شَجَرَةٍ أَقۡلَٰمٞ وَٱلۡبَحۡرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦ سَبۡعَةُ أَبۡحُرٖ مَّا نَفِدَتۡ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٢٧﴾ مَّا خَلۡقُكُمۡ وَلَا بَعۡثُكُمۡ إِلَّا كَنَفۡسٖ وَٰحِدَةٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ﴿٢٨﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئایا نابینن (ئەی خەڵکینە!) کە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدایە بۆی ڕام و ملکەچکردوون، چاکەو نیعمەتە ئاشکراو پەنهانەکانی خۆی بە تەواویی پێداون (بەسەردا ڕژاندوون)! کەچی باباى واش هەیە لە خەڵکی، بەبێ زانیاریی و ڕێنمایی و کتێبێکی ڕوونکەرەوە، شەڕە قسە لە بارەی خواوە دەکات! ﴿٢٠﴾ ئەگەر پێشیان بگوترێ: پەیڕەویی لەو (پەیام)ە، بکەن کە خوا دایبەزاندوە، دەڵێن: (شوێن ئەوە ناکەوین)، بەڵکو پەیڕەویی لەوە دەکەین کە باب و باپیرانمان لەسەری دیوە، ئایا ئەگەر شەیتان بەرەو ئازاری کڵپە (ی دۆزەخ)یش بانگیان بکات (هەر دوای دەکەون)؟ ﴿٢١﴾ هەر کەسێکیش ڕووی خۆی بە خوا بسپێرێ و، بۆی ملکەچ بێ، لە حاڵێکدا کە چاکەکاریشە، ئەوە توند دەستی بە بەهێزترین قوڵفەوە گرتوەو، سەرەنجامی کارەکانیش تەنیا بۆ لای خوایە ﴿٢٢﴾ کەسێکیش بێبڕوا بێ، با بێبڕواییەکەی دڵتەنگت نەکات، (چونکە) گەڕانەوەیان بەس بۆ لای ئێمەیە، ئنجا هەواڵی ئەوەیان پێ دەدەین کە دەیانکرد، بە دڵنیایی خوا بە نهێنیی سینەکان زانایە ﴿٢٣﴾ کەمێك (لە ژیانی دنیا) بەهرەمەندیان دەکەین، دوایی بەرەو لای ئازارێکی سەخت و بێڕەزا پەلکێشیان دەکەین ﴿٢٤﴾ ئەگەر لێشیان بپرسی: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروستکردوون؟ بە جەختکردنەوە دەڵێن: خوا، بڵێ: ستایش بۆ خوا، بەڵکو زۆربەیان نازانن (بۆیە جگە لەو دەپەرستن) ﴿٢٥﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، هی خوایە، بە ڕاستیی خوا بێ نیازی

ستایشکراوە ﴿٢٦﴾ ئەگەر بێت و هەرچی درەختە لە زەویدا قەڵەم بن (و ئاوی دەریاش مەرەکەب بێ)و، دوای ویش حەوت دەریای دیکەی بخرێنە سەر (تاکو وشەکانی خوایان پێ بنووسرێن)، وشەکانی خوا تەواو نابن، بێگومان خوا زاڵی کارزانە ﴿٢٧﴾ دروستکردنتان و زیندووکردنەوەتان تەنیا وەك (دروستکردن و زیندوو کردنەوەی) کەسێکە، بە دڵنیایی خوا بیسەری بینەرە ﴿٢٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(﴿وَأَسۡبَغَ عَلَيۡكُمۡ﴾): (أي: **أَكْمَلَ وَأَتَمَّ**)، واتە: چاکەکانی خۆی بەسەر ئێوەدا تەواو کردوون.

(**السَّابِغُ: الكَامِلُ، دِرْعٌ سَابِغَةٌ، والجَمْعُ: سَوَابِغ، سَاتِرَةٌ لِجَمِيعِ الجِسْمِ، وَإِسْبَاغُ النِّعَمِ إِكْثَارُهَا، وَأَصْلُ الإِسْبَاغِ جَعْلُ مَا يُلْبَسُ سَابِغَاً، أي: وَافِيَاً فِي السِّتْرِ**)، (**سَابِغ**)، واتە: داپۆشەر بە تەواویی، دەگوترێ: (**دِرْعٌ سَابِغَةٌ**): زرێیەکی (**سَابِغَة**) کە بە (**سَوابِغ**) کۆ دەکرێتەوە، واتە: هەموو جەستە دادەپۆشێ، (**إِسْبَاغُ النِّعَم**) مەبەست زۆرکردنی چاکەکانەو، لە ئەصڵدا وشەی (**إِسْبَاغْ**) ئەوەیە کە ئەو پۆشاکەی دەپۆشرێ بە تەواویی جەستە داپۆشێ و، هیچی لێ بە دەرەوە نەمێنێ.

(﴿بِٱلۡعُرۡوَةِ﴾): (**اليَدُ الَّتِي يُمْسَكُ بِهَا الكُوز، أَوِ الكُوبُ أَوِ الإِبْرِيقُ**)، (**عُروَة**): بریتیە لەو هەنگڵەی کە دەستی پێ دەگیرێ بە گۆزە، یاخود بەرداخ، یاخود هی مەسینە، (**عُروَة**): لە کوردییدا دەبێتە هەنگڵ و قوڵفەو دەستەگیرە، ئەوەی کە دەستی تێدەگیرێ.

(﴿ٱلۡوُثۡقَىٰ﴾): واتە: زۆر بەهێز، یانی: (**المُحْكَمَةُ القَوِيَّةُ، وَهِيَ تَأْنِيثُ أَوْثَق: هَذَا أَوْثَق وَهَذِهِ وثْقَى، مِثْلُ: أَصْغَر وَصُغْرَى**)، (**وثْقَى**)، واتە: زۆر بەهێزو پتەو، کە (**وثْقَى**) مێینەی (**أَوْثَق**)ە، دەگوترێ: (**هَذَا أَوْثَق وَهَذِهِ وثْقَى**)، (**هَذَا**): بۆ شتێکە بە نێر

دابنرێ، ئەوە بەهێزترە، (هَـذِهِ وثُقَـى) ئەمەشیان بۆ ئەوەیە کە بە مێینە دابنرێ، بەهێزترە، وەك: (أَصْغَـر وَصُغْرى)، گچکەترو گچکەتر بۆ نێرو مێ.

هەڵبەتە لە زمانی عەرەبییدا جگە لە نێرو مێی ڕاستەقینە، هەموو شتێکیش ئەو شتانە کە ڕەگەز (جنس)یان تێدا نیە بە ڕواڵەت، هەر ڕاناوی نێر، یان مێیان بۆ بەکاردەهێنرێن، بۆ وێنە: هەموو ئەوانەی لە جەستەی مرۆڤدا جووتن، ڕاناوی مێیان بۆ بەکاردەهێنرێ، وەك: (يَـد، عَيـن، أُذُن، رِجل، قَـدَم)، بەڵام ئەوانەی کە تاکن بۆ وێنە: (أنـف، ظَهـر، بَطـن، رَأس) ئەوانە ڕاناوی نێریان بۆ بەکاردەهێنرێ.

(نَضۡطَرُّهُمۡ): یانی: (نُلجِئُهُـم ونُضَيِّـقُ عَلَيْهِـم الخِنَـاق)، واتە: ناچاریان دەکەین و، ئێچکیان[١] لێ وێك دێنینەوەو، تەنگیان پێ هەڵدەچنین.

(غَلِيظٖ): (الغِلَـظُ: السُّـمْكُ، أي: عَـذَابٌ كَبيـرٌ شَـدِيد)، کە وشەی (غَلِيْـظ) لە ڕاستییدا بە مانای پتەو، بە مانای ئەستوورو قەبە دێ (زبر)، بەڵام کە سزای پێ وەصف بکرێ، واتە: سزایەکی گەورەو سەخت و بێڕەزا.

(يَمُدُّهُۥ): (يُعينُـهُ وَيُسَـاعِدُهُ إذا نَفَـدَ مَـاؤُهُ)، واتە: یارمەتیی دەدات و، هاوکاریی دەکات، هەر کاتێك دەریایەکە ئاوی بڕا، حەوت دەریای دیکە یارمەتی دەدەن، یاخود (يَمُـدُّهُ: أي يَزِيـدُهُ مِـدَاداً، والمِـدَادُ: الحِبْـرُ الَّـذِي يُكْتَـبُ بِـهِ)، واتە: مەرەکەبی بۆ زۆر دەکەن، مەرەکەبی بۆ زێدە دەکەن، چونکە (مِدَاد) ئەو مەرەکەبەیە کە پێی دەنووسرێ.

(نَفِدَتۡ): (أي: إنْتَهَت وَفَنِيَت)، واتە: تەواو بوو و، کۆتایی هات.

---

(١) ئێچك: دارێکە لە شێوەی دار لاستیك (فندەق)دا، گوریس و قەیاسەو کەژووی باری وڵاخی پێ توند دەکرێ.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

بەڕێـــــــــزان!

تـەوەری گشـتیی ئـەو نـۆ ئایەتـە موبارەكـە، باسـی یەكتایـی خوایـە ﷻ، باسـی ئەوەیـە كـە تەنیـا خـوا شایسـتەی بەندایەتیـی بـۆ كـران و پەرسـترانە، بـەڵام سـەرەتای ئـەو نـۆ ئایەتـە موبارەكـە كـە تـەوەرە گشـتییەكەیان باسـی خـوای پـەروەردگارو، تەنیایـی خـواو یەكتایـی خوایـە، بـە خسـتنە ڕووی چاكـەو نیعمەتەكانـی خـوا، لـە ژیانـی مرۆڤـدا دەسـت پێـدەكات:

خـــوا دەفەرمـــوێ: ﴿ أَلَمْ تَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئایـا نابینـن، ئـەی مرۆڤـەكان! كـە خـوا هەرچـی لـە ئاسـمانەكان و هەرچـی لـە زەویدایـە، بـۆ ئێـوەی ڕام و ملكـەچ و دەسـتەمۆ كـردوە؟ كـە مەبەسـت پێـی هەمـوو ئـەو پێكهاتانـەی ئاسـمانەكان و زەوییـن، بـە كەهكەشـانەكانەوە، كەهكەشـانەكانیش بـە ئەسـتێرەكانیانەوە، بـە خڕۆكەكانیانـەوەو، پاشـان ئـەوەی لـە زەویدایـە بـە هەمـوو پێكهاتەكانیـەوە، بـە بەرگـە هەوایـەوە، بـە بەرگـە ئاوییـەوە، بـە بەرگـە خاكییـەوە، بـە چیاكانیـەوە، بـە ڕووەك و بـە شـیناوردو، بـە ژیاندارانـی دەریـاو، ژیاندارانـی هـەواو، ژیاندارانـی سـەر زەوی، بـە هەموویـەوە بـۆ ئێـوە ڕام و دەسـتەمۆ كـراوە، ملـی پێكەچكـراوە، وای لێكـراوە لێـی بەهرەمەندبـن و لێتـان عاصـێ نەبـێ، بـە مەرجێـك یاسـا گەردوونییەكانـی خـوا بدۆزنـەوە، بـۆ چۆنیەتیـی مامەڵەكـردن لەگـەڵ ئـەو دروسـتكراوانەی خـوادا، كـە دەتوانـن باشـترین بەهرەیـان لـێ وەربگـرن.

﴿ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ﴾، هەروەهـا چاكـە ئاشـكراو پەنهانەكانـی خـۆی بەسـەر ئێـوەدا ڕژانـدوون، تـەواوی كـردوون، واتـە: ئـەو چاكانـەی دەبینرێـن و بەرهەسـتن و، ئـەو چاكانـەی پەنهانـن و نابینرێـن و، نابەرهەسـتن، یانـی: هەمـوو

ئـەو چاكانـەو، ئـەو شـتانەی كـە ژیانـی ئێـوە پێویسـتیی پێیانـە، بـۆ ئێـوەی فەڕاهـەم هێنـاون و، بەسـەر ئێوەیـدا ڕشـتوون و بـۆ ئێـوەی تـەواو كـردوون.

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ﴾، لـە حاڵێكیشـدا خـوا ئـەوەی بـۆ كـردوون، كەچـی لـە خەڵكیشـدا كەسـی وا هەیـە، مرۆڤی وا هەیـە مشـت و مڕ دەكات، شـەڕە قسـە دەكات لـە بـارەی خـواوە، بەبـێ زانیاریـی و بەبـێ ڕێنمایـی و بەبـێ كتێبێكـی ڕۆشـنكەرەوەو ڕێ پێشـاندەر، كـە دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەكانـدا بـاس دەكەیـن، ئـەو سـێیانە بۆچـی لـە یـەك ڕەوت دا هاتـوون: زانیاریـی، ڕێنمایـی، كتێبـی ڕوونكـەرەوە، خوڵاصـەی مانایەكـەی ئەوەیـە: بـە بـێ ئـەوەی هیـچ بـەر چـاو ڕوونییـەك و، هیـچ شـارەزاییەكی هەبـێ، لـە بـارەی خـواوە ﷻ شـەڕە قسـەو دمبـەدم و مشـتومڕ دەكات.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾، ئەگـەر ئـەو جـۆرە كەسـانە پێیـان بگوتـرێ: شـوێن ئـەوە بكـەون كـە خـوا دایبەزانـدوە، ﴿قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآ﴾، دەڵێـن: [شـوێن ئـەوە ناكەویـن، خـوا دایبەزانـدوە]، بەڵكـو شـوێن ئـەوە دەكەویـن كـە بـاب و باپیرانمـان، پێشـینانمان لەسـەری بینیـوە، ﴿أَوَلَوۡ كَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾، ئایـا ئەگـەر شـەیتانیش بانگیـان بـكات بـەرەو ئـازاری دۆزەخ، بـەرەو ئاگـری كڵپـە سـەندووی دۆزەخ، هـەر بـە دوای پێشـینانیان دەكـەون؟ ئەگـەر شـەیتان بـاب و باپیرانیشـیانی بانـگ كردبـێ بـۆ سـزای دۆزەخ، یانـی: بانگـی كردبـن بـۆ كوفـرو شـیرك و، گوناهـو تـاوان و لادانێـك كـە دەیانگەیەنـێ بـە سـزاو ئـازاری كڵپـەی دۆزەخ، هـەر دوایـان دەكـەون؟ شـتێكی نالۆژیكیـی و نەفامانەیـە تـۆ بـە دوای كەسـێك بكـەوی، كـە شـەیتان كڵاوی لەسـەر نـاوەو، هەڵیخەڵەتانـدوەو بـەرەو دۆزەخ بانگـی كـردوە!

﴿وَمَن يُسۡلِمۡ وَجۡهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ﴾، هـەر كەسـێك ڕووی خـۆی بـۆ خـوا ملكـەچ بـكات، بـە خـوای بسـپێرێ و، چاكەكاریـش

بێ، ئەوە دەستی بە قوڵفەیەکی زۆر مەحکەم و بەهێزەوە گرتوە، دەستی بە دەستەگیرەیەکی توندو قایمەوە گرتوە، کە ناپچڕێ، وەك لە سوورەتی (**البقرة**)دا دەفەرموێ: ﴿لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۝٢٥٦﴾**البقرة**، واتە: پچڕانی بۆ نیە، ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ﴾، سەرەنجامی کارەکانیش تەنیا بۆ لای خوایە ﷻ.

کەواتە: ئەوەی شوێن باب و باپیرانی و پێشینانی دەکەوێ، بە لاساییکردنەوەی کوێرانە، لە حاڵێکدا کە ئەو باب و باپیران و پێشینانە، شەیتان بانگی کردوون بۆ ئاگری دۆزەخ، ئەویش شوێنیان دەکەوێ، ئەوە لە لایەك، هەروەها ئەو کەسەش کە ڕووی خۆی بە خوا سپاردوەو، بۆ خوا ملکەچەو چاکەکاریشە، مانای وایە دەستێکی بە دەستەگیرە (قوڵفە)یەکی قایمەوە گرتوە، هەموو ئەوانە کاروباریان دەچێتەوە بۆ لای خوا ﷻ.

ئنجا خوا ﷻ ئامۆژگاریی پێغەمبەر ﷺ دەکات، هەروەها ئامۆژگاریی و ڕێنمایی هەر کەسێکی دیکەش دەکات، کە بە دوای پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکەوێ، دەفەرموێ: ﴿وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحۡزُنكَ كُفۡرُهُۥٓ﴾، هەر کەسێکیش بێبڕوا دەبێ، یاخود سپڵەو ناسوپاس دەبێ، (**كُفْرَ**) هەم بە مانای بێبڕوابوون، دێ، هەم بە مانای سپڵەبوون و ناسوپاس بوون، دێ، هەر کەسێك کە (**كُفر**)ی کرد، یان (**كُفرَان**)ی کرد، بێبڕوا، یاخود سپڵە بوو، ﴿فَلَا يَحۡزُنكَ كُفۡرُهُۥٓ﴾، با بێبڕوایی وی، یاخود سپڵەیی و ناسوپاسیی وی، تۆ دڵتەنگ نەکات، ﴿إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ﴾، چونکە گەڕانەوەیان، یان شوێنی گەڕانەوەیان، یاخود: کاتی گەڕانەوەیان تەنیا بۆ لای ئێمەیە، ﴿فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓاْ﴾، ئنجا هەواڵیان پێ دەدەین بەوەی کە کردوویانە، ئەوەی بە عەقڵ و دڵیان کردوویانە، یان بە زمانیان گوتوویانە، یان بە ئەندامەکانیان ئەنجامیان داوە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، بە دڵنیایی خوا زانایە بە هاوەڵی، یان: خاوەنی سینەکان، (**ذَات**) بە مانای (**صَاحِب**) دێ، (صاحب: هاوەڵ، خاوەن)، (**صُدور**)یش کە کۆی (**صَدر**)ە، بە مانای سینەکان دێ، هاوەڵی، یان: خاوەنی سینەکان کێیە؟.

مەبەست ئەو نهێنییانەن کە مرۆڤەکان لە دڵ و سینەکانی خۆیاندا پەنهانیان دەکەن، کە هێندە لە دڵ و سینەکاندا سەقامگیرو نیشتەجێ بوون، بوون بە هاوەڵ و خاوەنی سینەکان، ئەگەرنا سینەکان خۆیان هاوەڵ و خاوەنی نهێنییەکانن، بەڵام نهێنییەکان کە مرۆڤەکان لە دڵ و سینەی خۆیاندا پەنهانیان دەکەن، نیازو مەبەستەکان، خولیاو ئاواتەکان لە چاك و خراپ، هێندە لە دڵ و دەروونەکاندا نیشتەجێ بوون، بوون بە هاوەڵ و خاوەنی ئەو سینانە.

﴿ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ﴾، ئێمە ماوەیەکی کەم، یاخود: بەهرەمەندبوونێکی کەم، بەهرەمەندیان دەکەین، (تَمتُّع) واتە: (مَتَاع) بۆ فەڕاهەمهێنان، (مَتَاع)یش بە مانای: ڕابواردنێکی کەم، یاخود: گوزەرانێکی کەم، یاخود: بەهرەمەندبوونێکی کەم، دێ، ئنجا: ﴿ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ﴾، واتە: ماوەیەکی کەم بەهرەمەندیان دەکەین لە ژیانی دنیا، یاخود بە بەهرەمەندبوونێکی کەم (**أي: نُمَتِّعُهُم تَمتيعَاً قَلِيلاً**)، ﴿ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴾، دوایی پەلکێشیان دەکەین بەرەو ئازارێکی زبرو بێڕەزاو ئەستوورو قەبە، کە لێرەدا مەبەست پێی سەخت و بە ئێش و ژانە، ناچاریان دەکەین بۆ ئەوێ، پەلکێشیان دەکەین بۆ ئەوێ.

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴾، ئەگەر پرسیاریان لێ بکەی [لەو هاوبەش دانەرانە]، کێ ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی؟ بەجەختکردنەوەوە دەڵێن: خوا، ﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، بڵێ: ستایش بۆ خوا، ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵکو زۆربەیان نازانن، واتە: قەدری خوا نازانن و پایەو مەقامی بەرزو بێ وێنەی خوا نازانن، بۆیە هاوبەشی بۆ دادەنێن، بۆیە هەندێك لە دروستکراوەکان دێننە ئاستی خوا، دێننە ڕیزی خواوە، بە خەیاڵی خۆیان دەیانکەن بە هاوبەشی خوا، لە هەندێك لە جۆرەکانی بەندایەتیی بۆ کران و پەرستراندا.

﴿ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هی خوایە، هەمووی خاوەنەکەی خوایە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴾، بە دڵنیایی هەر خوا دەوڵەمەندی ستایشکراوە، هەر خوا بێ نیازی ستایشکراوە، واتە: ئەوان

ئەگـەر بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکـەن، خۆیـان بەهرەمەنـدن لـە بەندایەتییەکەیـان، ئەگەرنـا خـوا بـێ نیازە، نـەك بـە بەندایەتیـی کردنـی ئـەوان و ملکەچیـی و پابەندیـی ئـەوان، خـوا بەهرەمەنـد ببـێ!! هەروەهـا (**الحَمیـد**) (**فَعیـل**)ی بـە مانـای (**مَفعـول**) ە، یانـی: (**مَحمـود**)، واتـە: خـوا ستایشـکراوە، ئەوانیـش ستایشـی نەکـەن، خـوا هـەر ستایشـکراوە لـە زاتـی خۆیـداو، ئەوانـەش کـە بەندایەتیـی بـۆ خـوا دەکـەن، خۆیـان لێـی بەهرەمەنـدن و، ئەوانـەش کـە کوفـر و خراپـە دەکـەن، خۆیـان لێـی زەرەرمەندن، ئەگەرنـا خـوا ﷻ دەوڵەمەنـدی ستایشـکراوە، بـێ نیـازی ستایشـکراوە لـە هەمـوو حاڵانـدا.

ئنجـا خـوا ﷻ دیمەنێکـی زۆر سەرنجڕاکێشـمان دەخاتـە بەرچـاو، کـە وەك لـە پێناسـەی ئـەم سـوورەتەدا باسـمان کـرد، لـە هەمـوو قورئانـدا تەنیـا لێـرەدا بـەم شـێوەیە هاتـوە، دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَـٰمٌ ﴾، ئەگـەر بێـت و هەرچـی درەخـت کـە لەزەویـدا هەیـە، ببێتـە قەڵـەم، (**أَنَّمَـا**) بەسـەریەکەوە نووسـراوە، بـەڵام بـە تەئکیـد لـە ئەصڵـدا لـە یـەك جیایـە: (**وَلَـوْ أَنَّ مـا فِـي الأَرْضِ مِـنْ شَـجَرَةٍ أَقْـلامٌ**)، ئەگـەر هەرچـی درەختـە لـە زەویـدا قەڵـەم بـن، پێنـووس بـن، (**أَقْـلامٌ**) کـۆی (**قَلَـم**)ە، یانـی: قەڵـەم، پێنووسـیش بـەکاردێ، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا هـەر قەڵـەم زیاتـر بـاوە، ﴿ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ ﴾، دەریـاش ئـەو دەریایـەی ئێسـتا واتـە: بەرگـە ئاویـی زەوی، هەمـوو ئۆقیانووسـەکان، ئـاوی دەوری زەوی هەمـووی - کـە زیاتـر سـێ لەسـەر چـواری پانتایـی زەوی ئـاو داپۆشـیووە - هەمـووی مەرەکـەب بـێ و، حـەوت هێنـدەی دیکەشـی، بکرێنـە هـاوکار، دەریـاش لـە دوای خـۆی، حـەوت دەریـای دیکـە ببنـە هـاوکاری، بـۆی زێـدە بکرێـن، حـەوت هێنـدەی دیکـەی بـۆ زێـدە بکـرێ و هەمـووی ببێتـە مەرەکـەب و، درەختەکانـی زەوی هەموویـان قەڵـەم بـن و، وشـەکانی خوایـان پـێ بنووسـرێن، ﴿ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَـٰتُ ٱللَّهِ ﴾، وشـەکانی خـوا تـەواو نابـن، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾، بێگومـان خـوا زاڵـی کارزانـە.

ئەوە مرۆڤ دەبێ زۆر تەماشای بکات و تێوەی ڕامێنێ! زانیاریی خوا، وشەکانی خوا، نهێنییەکانی خوا لە گەردووندا لە سەروو خواری دروستکراوەکانیدا چەندە زۆرن! ئەگەر ئاوی دەریا هەمووی مەرەکەب بێ، نەك تەنیا ئەم دەریایەی ئێستا کە پتر لە سێ لەسەر چواری پانتایی زەوی داپۆشیوە، بەڵکو حەوت هێندەی دیکەشی بۆ زێدە بکرێ، هەندێك لە زانایانیش دەڵێن: حەوتیش لێرەدا هەر بۆ زۆرییە، ئەگەرنا مەرج نیە بە دیارییکراویی (مُحَدَّد)ی تەنیا حەوت هێندەی دیکە، بەڵکو هەزار هێندەی دیکەو، هەزاران هێندەی دیکەشی بخرێتە گەڵ و ببێتە مەرەکەب، درەختەکانی زەوییش هەموویان ببنە قەڵەم و، وشەکانی خوایان پێ بنووسرێن، وشەکانی خوا هەر تەواو نابن، مەرەکەبەکە تەواو دەبێ، بەڵام وشەکانی خوا تەواو نابن.

﴿ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ﴾، ئایەتی پێشێ باسی زانیاریی بێ سنووری خوای کرد، ئنجا ئەمەیان باسی تواناو دەسەڵاتی بێ سنووری خوا دەکات دەفەرموێ: وەدیهێنانتان و زیندووکرانەوەتان، تەنیا وەك یەك کەس وایە، ئەی مرۆڤەکان! هەمووتان چ وەدیهێنرانتان لەلایەن خواوە، چ دوایی زیندووکرانەوەتان، تەنیا وەك وەدیهێنران و زیندووکردنەوەی یەك کەس وایە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا بیسەری بینەرە.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**سەرنجراکێشانی مرۆڤان بۆ ڕامکران و ملپێکەچکرانی هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بۆیان و، بەسەر دارِشتنی چاکەو نیعمەتە ئاشکراو پەنهانەکان، کەچی شەڕە قسە کردنی کەسانێك لە بارەی خواوە، بەبێ زانیاریی و ڕێنمایی و، شوێن نەکەوتنی پەیام و بەرنامەی خوا بە بیانووی شوێنکەوتنی پێشینان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً ۗ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۚ أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴿٢١﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾، ئایا نابینن، سەرنج نادەن، کە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، بۆی ملکەچ و دەستەمۆ کردوون؟! لێرەدا ڕووی دواندن لە کۆی مرۆڤەکانە، ئەی مرۆڤەکان! ئەی خەڵکینە! ئایا نابینن؟ مەبەست لە بینینش لێرەدا بەڵێ دەگونجێ بینینی چاو بێ، بەڵام زیاتر مەبەست بینینی عەقڵ و دڵە، ئایا بە چاوی عەقڵ و دڵ نابینن، بۆیەش دەڵێم: زیاتر مەبەست پێ بینینی عەقڵ و دڵە، چونکە بەڵێ مرۆڤ ژمارەیەك لە چاکەو نیعمەتەکانی خوا دەبینێ، کە لە ئاسمانەکان و زەویدا بۆی دەستەمۆ کراون، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان نابینێ، بەڵام بە عەقڵ و دڵ پەییان پێ دەبات و دەرکیان دەکات، کە خوا هەموو ئەو شتانەی بۆ

مرۆڤ دەستەبەر کردوون، کوا مرۆڤ گەردیلەکان دەبینێ؟ کوا مۆلۆکۆلەکان دەبینێ؟ کە توخمەکان پێکدێنن، کوا مرۆڤ ئەو تیشکەی لە خۆردا هەیە دەیبینێ، کە چۆن دروست دەبێ، هەمووی تەقینەوەی نێو کییە؟ کوا مرۆڤ ژێر زەوی دەبینێ؟ کوا ژێر دەریاکان دەبینێ؟ کوا مرۆڤ بەرگە هەوا هەمووی دەبینێ؟!

کەواتـە: لێـرەدا مەبەسـت لـە دیتـن، هەرچەنـدە دەگونجـێ بینینـی چاویـش بـێ، بـۆ هەندێـك لـە چاكـەو نیعمەتەكانـی خـوا، بـەڵام زیاتـر مەبەسـت بینینـی عەقڵ و دڵـە.

(**سَخَّرَ**) یانـی: دەسـتەمۆو ملكەچـی كـردوە، ڕامیكـردوە، (**التَّسْخِيرُ هُوَ الإنْقِيَادُ لِلّهِ بِمُهِمَّةٍ يُؤَدِّيها بلا ختيَارٍ فِي التَّنَقُّلِ مِنْهَا**)، (**تَسخير**): یانـی: ملكەچكردنـی شـتێك بـۆ خـوا، بـۆ ئـەوەی ئەركێـك ئەنجـام بـدات، بـێ ئـەوەی بـژاردەی لەبـەر دەسـت دا هەبـێ، لـەوەی ئـەو كارە بـكات، یـان بگوازێتـەوە بـۆ كارێكـی دیكـە، بـۆ وێنـە: خـوای پـەروەردگار خـۆری دەسـتەمۆو ڕامكـردوە، هەمـوو ڕۆژێ لـە خۆرهەڵاتـەوە هەڵـدێ بـەرەو خۆرئـاوا.

هەڵبەتـە ئـەو سـووڕانەوەی زەویـی بـە دەوری خۆیـدا، لـە بەرانبـەری خـۆردا، کـە ئێمـە وا دێتـە بەرچاومـان: خـۆر هەڵـدێ، لـە ڕاسـتییدا ئـەوە زەوییـە بـە دەوری خۆیـدا لـە بەرانبـەر خـۆردا دەخولێتـەوە، ئـەو لایـەی دەكەوێتـە ڕووی خـۆر، دەبێتـە ڕۆژو ڕووەكـەی دیكەشـی دەبێتـە شـەو، كـە وەك جـاری دیكـەش باسـمان كـردوە: زەوی بـە نزیكەیـی سـی (٣٠) كیلۆمەتـر لـە خولەكێكـدا دەبـڕێ لـە سـووڕانەوەی بـە دەوری خۆیـدا، لـە بەرانبـەر خـۆردا، بـەڵام لـە سـووڕانەوەی بـە دەوری خـۆردا، لـە چركەیەكـدا سـی (٣٠) كیلۆمەتـر دەبـڕێ، واتـە: شەسـت (٦٠) هێنـدەی سـووڕانەوەی خـۆی خێراتـر بـە دەوری خـۆردا دەخولێتـەوە، كـە دەبێتـە هـۆی پەیدابوونـی چـوار كەشـەكان و، سـووڕانەوەی خۆیشـی بـە دەوری خۆیـدا، لـە بەرانبـەر خـۆردا، دەبێتـە هـۆی پەیدابوونـی شـەوو ڕۆژ، ئنجـا: خـۆر، زەوی، مانـگ، ئەسـتێرەكان، كەهكەشـانەكان، هەموویـان ئـەو ئەركانـەی خـوا بـۆی دیارییكـردوون، بەبـێ لاملیـی

و سـەرپێچیی ئەنجامیـان دەدەن، ئـا ئەوەیـە مەبەسـت لـە (تَسـخیر) ڕامکـردن و دەسـتەمۆ کـردن.

﴿ مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و هەرچـی لـە زەویـدا هەیـە، واتـە: هەمـوو پێکهاتەکانـی گـەردوون لـە خزمەتـی بەشـەر دان، بەشێوەیەك لـە شـێوەکان، هەڵبەتـە تاکـو ئێسـتا کەمێـك لـەو بەهرەمەنـد بوونانـەی مـرۆڤ لـە کەهکەشـانەکان و لـە ئاسـمان، دۆزراونـەوە،

بـەڵام مـادام خـوا وا دەفەرمـوێ، دیـارە هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و لـە زەویـدا هەیـە، بـە جۆرێـك لـە جـۆرەکان پەیوەندیـی هەیـە بـە ژیانـی مرۆڤـەوەو، بـەوەوە کە مـرۆڤ ئـەو هەلومەرجـەی بـۆ دابیـن بـێ و، لـەم سـەر زەوییـە بـژی و تاقیکردنـەوەی خـۆی بـدات، تاکـو ئـەو کاتـەی لـە سیسـتم و بەرنامـەی خـوادا هەیـە، ژیانـی مـرۆڤ لەسـەر زەوی بـەردەوام بـێ.

٢)- ﴿ وَأَسۡبَغَ عَلَيۡكُمۡ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةٗ وَبَاطِنَةٗ ﴾، هەروەهـا (خـوا) چاکـە ئاشـکراو پەنهانەکانــی خــۆی بەســەرتان دا ڕژانــدوون.

(نِعَمَـهُ) خوێندراویشـەتەوە: (نِعمَتَـهُ)، ئنجـا ئەگـەر (نِعمَتَـهُ) بـێ، واتـە: خـوا چاکـەی خـۆی بـە تەواویـی بەسـەر ئێوەدا ڕشـتوە، کە ئـەو کاتە مەبەسـت پێی جینسـی چاکەیە، بـەڵام ئەگـەر (نِعَمَـهُ) بـێ، واتـە: خـوا چاکەکانـی خـۆی بەسـەر ئێـوەدا ڕشـتوون و بـە تەواویـی بـە ئێـوەی داون، وەك چـۆن پۆشـاکێك هەمـوو جەسـتەی مرۆڤ دادەپۆشـێت، نیعمەتـەکان و چاکەکانـی خـواش سـەرتاپای ژیانـی ئێوەیان داپۆشـیوە.

﴿ ظَٰهِرَةٗ وَبَاطِنَةٗ ﴾، چاکەکانی خوا کە ئاشکران، هەروەها کە پەنهانن.

(أَسْـبَغَ: أي: أَتَـمَّ وَأَكْمَـلَ)، ئنجـا ئایـا (أَتَـمَّ وَأَكْمَـلَ) جیاوازییـان چییـە؟ (تَمَـام) لـە ڕووی چەندێتییەوەیـە، (كَمَـال) لـە ڕووی چۆنیەتییـەوە، چونکـە لـە سـوورەتی (المَائِـدة)دا هاتـوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ

نِعْمَتِي ﴿٣﴾، (كَمَال) و (تَمَام)، (كَمَال)ی بۆ دین بەكارهێناوەو، بۆ نیعمەت (تَمَام)ی بەكارهێناوە، واتە: كە دەفەرموێ: ﴿أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾، دینەكەتان لە ڕووی چۆنیەتییەوە، پێش دابەزینی ئەو ئایەتە موبارەكە، كە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: كۆتا ئایەتە لە قورئان دابەزیبێ، یاخود پێش ئەو حەجی ماڵئاواییە، لە ڕووی چۆنیەتییەوە ئایین و بەرنامەكە تەواو نەبووەو لەو ڕۆژەدا تێرو تەواو بووە و، هەموو شتێكی تێدا ڕاگەیەندراوە، بەڵكو جێبەجێ كراوە لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ.

بەڵام: ﴿وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي﴾، چاكەكانی خۆم بۆ تەواو كردوون، چاكەكان لە ڕووی چەندێتییەوە، تەواو كراون، لەسەرتان.

لێرەدا (أَسبَغَ)ش هەر بە مانای (أَتَمَّ) تەواوی كرد دێ، دەشگونجێ بە مانای كامڵكرد (أَكْمَلَ)ش بێ، ئنجا: (إسبَاغُ النِّعَم: أي إِكْثَارُهَا)، ئەوە كە چاكەكانی خوا هەموو مرۆڤەكانیان داپۆشیون، واتە: خوا چاكەكانی خۆی زۆر كردوون.

پێناسەی (نِعمَة)یش بەمجۆرە كراوە: (النِّعْمَةُ: المَنْفَعَةُ التَّي يُرِيدُ فَاعِلُهَا الإِحْسَانَ إِلَى غَيْرِهِ)، (نِعْمَة): بریتیە لەوەی كەسێك سوودێك بە كەسێك بگەیەنێ، كە بیەوێ چاكەی لەگەڵدا بكات.

دیارە كە دەفەرموێ: ﴿ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً﴾، ئەوە دیارە نیعمەتە ئاشكرایەكانی خوا دیارن، نیعمەتە پەنهانەكانیشی چ لە خودی مرۆڤدا، لە جەستەیی، لە ڕووی ڕووحیی، لە ڕووی دەروونیی، لە ڕووی خێزانیی، لە ڕووی كۆمەڵایەتیی، نیعمەتە ئاشكرایەكان، ئەوانەن كە مرۆڤ دەتوانێ بە پێنج هەستەكانی هەستیان پێ بكات، بە ئاشكرا بیانبینێ، هەستیان پێ بكات، مامەڵەیان لەگەڵدا بكات، پەنهانەكانیش بۆ وێنە: نیعمەتی ئۆخژن و ئارامیی دڵ و دەروون، هەروەها ئەو هۆگرییەی كە لە نێوانی ژن و مێرددا هەیە، دیسان ئەو خۆشەویستیەی كە لە نێوانی باب و دایك و ڕۆڵەدا هەیە، هەروەها ئەو ئۆخژن و ئارامییەی بەهۆی

بەندایەتیی بۆ خواو خوا پەرستی بۆ خواوە، پشت بە خوا بەستن و، بەرچاو ڕوونیەی بەهۆی خوا پەرستیەوە دێتە دی، ئەو هێمنیی و ئاسایشەی کە خەڵك لێی بەهرەمەند دەبن لەماڵی خۆیانداو لە وڵاتی خۆیاندا، ئەوانە هەمووی چاكەو نیعمەتی پەنهانن.

٣)- ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ﴾، لە نێو خەڵکیدا کەسی وا هەیە، شەڕە قسەو مشت و مڕ دەکات، لە بارەی خواوە، بێ زانیاریی و بێ ڕێنمایی و بێ کتێبێکی ڕۆشنکەرەوە.

یانی: بێ ئەوەی زانیاریی هەبێ و، بە بێ ئەوەی ڕێنمایی لەبەر دەستدا بێ و، بە بێ ئەوەی کتێبێکی ڕۆشنکەرەوەی لەبەر دەستدا بێ، زانایان گوتوویانە: پلەکانی زانیاریی و شارەزایی ئەم سێیەن:

**أ/** پلەو قۆناغی یەکەمی زانیاریی، ئەوەیە کە مرۆڤ بۆ خۆی زانیاریی وەدەست بێنێ.

**ب/** پلەو قۆناغی دووەمی زانیاریی، بریتیە لەوەی مرۆڤ ئەگەر بۆ خۆشی نەتوانێ زانیاریی وەدەست بێنێ، گوێ بگرێ بۆ جگە لە خۆی و لەوەوە زانیاریی وەربگرێ، (**التَّلَقِّي مِنَ العَالِم**)، لە کەسێك کە زانایە فێر ببێت و وەربگرێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ **النحل**، واتە: ئەگەر نازانن [ناتوانن خۆتان زانیاریی پەیدا بکەن] لە کەسانێك بپرسن کە خاوەنی زیکرن، واتە: شارەزای بەرنامەی خوان، یاخود پسپۆڕو شارەزان لەو بوارەدا، دەبێ پرسیاریان لێ بکرێ.

**ج/** پلەو قۆناغی سێیەمی زانیاریی، ئەوەیە کە مرۆڤ لە کتێبێکی ڕێ ڕۆشنکەرەوەدا بخوێنێتەوە، بە هۆی کتێبێکەوە کە دەیخوێنێ و لێی شارەزا دەبێ، پێی ئاشنا دەبێ، زانیاریی وەدەست بێنێ.

بۆیە خوا ﷻ ئەوانەی کە بەبێ هیچکام لەو سێ جۆرە زانیارییە، بەبێ ئەوەی کە خۆیان زانیارییان هەبێ، بەبێ ئەوەی گوێ لە کەسێکی دیکە بگرن

کە زانایەو، بە ڕێ دەزانێ و، بە دوای ڕێنمایی ئەوان کەون، بەبێ ئەوەی کە لە کتێبێکیشدا کە ئەو کتێبە ڕێیان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە، کە بە تەئکید مەبەست پێ وەحیی و پەیامی خوایەو کتێبی خوایە، بەبێ ئەوەی هیچکام لەو جۆرە زانیارییانەیان هەبێ لە بارەی خواوە، شەڕە قسەو مشت و مڕ دەکەن، کە ئەوە شتێکی بێ جێیە، ئینسان دەبێ بەبێ زانیاریی قسە لە هیچ شتێکەوە نەکات.

٤)- ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآ ﴾، ئەگەر پێشیان بگوترێ: بکەونە شوێن ئەوە کە خوا دایبەزاندوە، [قورئان].

دەڵێن: [شوێن قورئان ناکەوین، شوێن ئەوە ناکەوین خوا دایبەزاندوە] بەڵکو دوای ئەوە دەکەوین کە باب و باپیرانمان لەسەری بینیوە.

ئێمە کە چاومان هەڵێناوە، باب و باپیرانمان لەسەر چ ڕچەو ڕێبازێك بوون، بە دوای وی دەکەوین، واتە: لاساییکردنەوەی کوێرانە، لاساییکردنەوەی نالۆژیکییانە، بەبێ ئەوەی بزانن: باب و باپیرانیان لەسەر ڕێی ڕاستن یان نا، مادام پێشینانیان بوون و باب و باپیرانیان بوون، یەکسەر چۆن مەڕ سەر لە دوای یەك دەنێ، جاری وا هەیە مەڕێك سەری لێ دەشێوێ لە کاوێك خۆی هەڵدەدێرێ، مەڕەکانی دیکەش بە دوای ویدا هەموویان خۆیان هەڵدەدێرن! کە ئەوە لە ڕاستییدا مامەڵەو ڕەفتارێکی ئاژەڵانەیە، مرۆڤ خوا بۆیە عەقڵی پێداوە، عەقڵی تۆ جیایە لە هی باب و باپیرانت، عەقڵی تۆ جیایە لە عەقڵی ئەو، بۆ خۆت بە عەقڵی خۆت بیربکەوە، بەڵام مرۆڤ کاتێك لە هیدایەتی خواو، لە ئیمان بە خواو، لە بەندایەتیی بۆ خوا، دوور دەکەوێتەوە، دەچێتەوە سەر سروشتی ئاژەڵ و مەڕو بزن، بۆیە دەڵێن: بەڵکو ئێمە شوێن ئەوە دەکەوین کە باب و باپیرانمان لەسەری بینیوە!

٥)- ﴿ أَوَلَوۡ كَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴾، ئەدی ئەگەر شەیتان بەرەو ئازاری کڵپەدار(ی دۆزخ) بانگیان بکات؟! خوای موتەعال لە وەڵامیاندا دەفەرموێ: چۆن

دوای پێشینان و باب و باپیرانتان دەكەون؟ ئەدی ئەگەر شەیتان باب و باپیرانی ئێوەی بانگكردبێ بۆ سزای كڵپەداری دۆزەخ؟ لێرەدا: (**الإسْتِفْهَامُ تَعْجِيبيٌّ، أي: أَيَتَّبِعَونَ آبَآئَهُم وَلَوكَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُ الآبَاءَ إلى عَذَابِ السَّعِيرِ**)، پرسیاركردنەكە بۆ سەرسوڕماندنە، واتە: ئایا هەر بە دوای باب و باپیرانیان دەكەون، ئەگەر شەیتانیش ئەو باب و باپیرانەی بانگكردبن، بۆ سزای كڵپەداری دۆزەخ؟

یاخود: ئایا هەر شوێن باب و باپیرانیان دەكەون، با شەیتانیش ئەو شوێنكەوتوو و لاساكەرەوە كوێرانە، بانگ بكات بەرەو سزای دۆزەخ، ئایا دەبێ هەر بە دوای باب و باپیرانیان بكەون؟ یا بەهۆی دنە دانی شەیتان و بانگكردنی شەیتانیشەوە، بێ ئەو شوێنكەوتن و لاساكردنەوە كوێرانەی باب و باپیرانیان، واتە: ئەوە شتێكی نالۆژیكییەو شتێكی سەرسوڕهێنەرو ناماقووڵە.

## مەسەلەی دووەم:

**هەر کەس بەڕاستیی و ساغیی ڕوو بکاتە خوا، دەستی بە دەستەگیرەو قوڵفەیەکی مەحکەمەوە گرتووەو، نابێ بە بێبڕوایی کافرانیش دڵتەنگ بێت، چونکە سەرەنجام بۆ لای خوای زانایە، کە زانایە بە نهێنیی سینەکان و دوای کەمێك گوزەرانی دنیا، بێبڕوایەکان پەلکێشی ئاگری دۆزەخ دەکرێن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُۥٓ ۚ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٢٤﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ﴾، هەر کەس ڕووی خۆی بە خوا بسپێرێ و چاکەکاریش بێ، بە دڵنیایی بە توندیی دەستی بە قوڵفەو دەستەگیرەیەکی زۆر قایمەوە گرتوە.

**(إِسْلَامُ وَجْهِهِ لِلَّهِ، تَمْثِيلٌ لِإِفْرَادِهِ تَعَالَى بِالعِبَادَةِ، كَأَنَّهُ لاَ يُقبِلُ بِوَجْهِهِ عَلَى غَيْرِ اللَّهِ، وَتَعدِيَةُ فِعلِ «يُسلِمُ» بِحَرفِ «إلى» مَجَازٌ فِي الفِعْلِ بِتَشبِيهِ نَفْسِ الإِنْسَانِ بالمَتَاعِ الَّذِي يَدْفَعُهُ صَاحِبُهُ إِلى آخَرَ)**، واتە: ڕووی خۆ بە خوا سپاردن، بۆ ڕوونکردنەوەی خوای بەرز بە تاك گرتنە لە بەندایەتییدا، هەروەك ئەو کەسە ڕووی خۆی نەکاتە جگە لە خوا، غەیری خوا نەکات، [بەڵام لە ئەصڵدا یانی: بە دڵ و دەروون و، بە ناخ و ڕواڵەت خۆی ملکەچ ناکات بۆ جگە لە خوا]، کرداری (يُسْلِمُ)، بۆیە بە (إلى) بەرکاری خواستوە، چونکە ئەوە مەجازە لەوەدا کە نەفسی مرۆڤ چوێنراوە بە کەل و پەلێکەوە کە خاوەنەکەی دەیدات بە جگە لە خۆی.

واتـە: تـۆش ڕووی خـۆت، نەفسـی خـۆت وەك شـمەكێك و كـەل و پەلێـك دەدەی بـە خـوای پـەروەردگار، بۆیـەش بـە پیتـی (إلـى) تێپەڕێنـراوە بـەرەو بـەركار تاكـو مانـای پێـدان و پێبەخشـین بخرێتـە نێـوی.

﴿ وَهُوَ مُحْسِنٌ ﴾، (و)ی (وهـو محسـن) بـۆ حاڵـە، یانـی: لـە حاڵێدا كە چاكەكاریشـە، یانـی: لـە دەروونـەوە خـۆی بـۆ خـوا سـاغ كردۆتـەوەو، لـە هەمـان كاتـدا بـە ڕواڵـەت چاكەكاریشە.

﴿ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ﴾، ئـەوە بـە دڵنیایـی تونـد دەسـتی گرتـوە بـە دەسـتەگیرەیەكی قایـم و مەحكـەم، (مَسَـكَ) گرتوویەتـی، (تَمَسَّـكَ) تونـدی گرتـوە، (إسْتَمْسَـكَ) زۆر تونـدی گرتـوە، چونكـە: (زِيَـادَةُ المَبْنَـى تَـدُلُّ عَلَـى زِيَـادَةِ المَعْنَـى)، یانـی: زۆر قایـم دەسـتی گرتـوە، بـە چـی؟ ﴿ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ﴾، (عُـروَة): بـە هەنگڵـی دیـزەو گـۆزەو، مەسـینەو سـوڕاحیی، هەروەهـا بـە هـەر قوڵفەیـەك دەگوتـرێ، كـە ئینسـان دەسـتی تێبگـرێ.

(الوُثْقَـى) (مُؤَنَّـث)ی (أَوْثَـق)ە، (أَوْثَـق) یانـی: بەهێزتـر (وُثْقَى)ش یانـی: بەهێزتر، بەڵام لەبـەر ئـەوەی سیفەتی (عُرْوَة)یـە، (عُـرْوَة)ش (مُؤَنَّث)ە، بۆیـە بە (وُثْقَـى) هێناویەتی.

كەواتـە: كەسـێك ڕووی خـۆی كردبێتـە خـواو خـۆی بـە خـوا سـپارد بـێ، چاكەكاریـش بێ، ئـەوە زۆر بـە توندیـی دەسـتی بـە دەسـتەگیرەو قوڵفەیەكـی مەحكـەم و نەپسـاوەوە گرتـوە.

٢)- ﴿ وَإِلَى ٱللَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴾، سەرەنجامی كارەكانیش تەنیا بۆ لای خوایە ﷻ.

٣)- ﴿ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُۥٓ ﴾، هەر كەسێكیش بێبڕوا بێ، با بێبڕوایی ئەو تۆ دڵتەنگ نەكات.

﴿ فَلَا يَحْزُنكَ ﴾، خوێندراویشـەتەوە: (فَـلاَ يُحْزِنـكَ)، (حَزَنَـهُ يَحْزُنُـهُ) و (أَحْزَنَـهُ يُحْزِنُـهُ)، چ بـە سـیانیی (ثُلاثـي)، چ بـە چواریـی (رُباعـي) هـەر یـەك واتایـان هەیـە، كەسـێك كـە بێبڕوایـە، بـا كوفرەكـەی تـۆ دڵتەنـگ و نارەحـەت نـەكا، بۆچـی؟.

٤)- ﴿إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓاْ﴾، گەڕانەوەیان تەنیا بۆ لای ئێمەیە، ئنجا هەواڵیان پێ دەدەین بەوەی کردوویانە، وشەی (**مَرجِع**) زۆرجاری دیکەش گوتوومانە: دەگونجێ (چاوگ) بێ، واتە: گەڕانەوەیان، دەگونجێ (ناوی شوێن) بێ، واتە: شوێنی گەڕانەوەیان، دەشگونجێ (ناوی کات) بێ، واتە: کاتی گەڕانەوەیان بۆ لای ئێمەیە.

٥)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، بە دڵنیایی خوا بە نهێنییەکانی سینەکان زانایە، (**ذَاتِ الصُّدُور**): (**النَّوَايَا وَأَغْرَاضُ النَّفْسِ كَأَنَّمَا مَلَكَتِ الصُّدورَ فَصَارَت صَاحِبَتَهَا**) واتە: ئەو نیازو ئامانجانەی لە دڵدا هەن، وەك بووبنە هاوەڵ یان خاوەنی سینەکان، هێندە ڕۆچوون لە سینەکاندا، ئەگەرنا لە ئەصڵدا سینەو دڵ خاوەنی نهێنییەکانە، بەڵام ئەو نهێنییانە وا ڕۆچوون و ئاوێتەی دڵ و سینەکان بوون، وەك بووبنە خاوەنی سینەکان.

٦)- ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا﴾، کەمێك پێیان دەگوزەرێنین، (**أي: نُمَتِّعُهُم تَمْتِيعاً قَلِيْلاً**)، کەمێك بەهرەمەندیان دەکەین، (**التَّمْتِيعُ: العَطَاءُ المُؤَقَّتُ وَقَلِيْلاً صِفَةٌ لِمَصْدَرِ مَفعولٍ مُطْلَقٍ أَي: تَمْتِيْعاً قَلِيلاً**)، (**تَمْتِيع**) واتە: ماوەیەکی کەم پێیان دەگوزەرێنین کە بریتیە لە ژیانی دنیا، بەهرەمەندیان دەکەین، لێیان دەگەڕێین، تاقیکردنەوەی خۆیان بدەن.

(قَلِيلًا) سیفەتی چاوگی بەرکارێکی ڕەهایە.

٧)- ﴿ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾، دواییش پەلکێشیان دەکەین، ناچاریان دەکەین بەرەو ئازارێکی ئەستووری زەبەلاح.

(**الإضْطِـرَارُ: الإلْجَـاء وَهُـوَ جَعْـلُ الغَيـرِ ذا ضَـرورَةٍ أي: لُـزُوم**)، (**إِضْطِـرَار**) یانـی: پەنـا پێبـردن، ناچـار کـردن، بـە کوردیـی پەلکێشـکردن، ئەویـش ئەوەیـە کـە تـۆ بەرانبەرەکـەت وا لـێ بکـەی ناچـار بـێ و پەیوەسـت بـێ بـە شـتێکەوە، (**وَالغَلِيـظُ مِـنْ صِفَـاتِ الأَجْسَـادِ أي: القَـوِيُّ الخَشِـن، وَأُطْلِـقَ عَلَـى الشَّـدِيد**)، (**غَليـظ**): لـە سـیفەتی شـتە ماددییەکانـە، دەگوتـرێ: (**حَبـلٌ غَليـظ**)، واتـە: پەتێکـی ئەسـتوورو مەحکـەم، بـەڵام لێـرەدا خوازراوەتـەوە بـۆ سـەختیی و توندیـی، یانـی: سـزایەکی سـەخت و بێـڕەزا.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بێبڕوایان لە وەڵامی پرسیاری کێ ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی؟ دا دەڵێن: خوا، کەواتە: بە هۆی نەزانییەوە جگە لە وی دەپەرستن، خوا خاوەنی هەموو شتێکەو، زانیارییەکەی هێندە بێسنوورە، کە هەرچی درەختی زەوییە ببێتە قەڵەم و، هەرچی دەریایەو حەوت هێندەی دیکەشی بۆ بکرێتە مەرەکەب، هەموو وشەکانی خوایان پێ نانووسرێن و، دروستکردن و ژیاندنەوەی تێکڕای مرۆڤانیش بۆ خوا وەك هی کەسێك ئاسانە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾، ئەگەر پرسیاریان لێبکەی - لە بێبڕوایەکان - کێ ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی؟ بەجەختکردنەوە دەڵێن: خوا.

٢)- ﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾، بڵێ: ستایش بۆ خوا، بەڵکو زۆربەیان نازانن، بۆیە جگە لە خوا ﷻ دەپەرستن، واتە: زۆربەیان کە لە داهاتووشدا لەسەر نەزانیی خۆیان دەمێننەوەو، نەزانییەکەیان سەریان پێ دەکێشێ بۆ شیرك و جگە لە خواپەرستن، بەڵام دیارە کەمێکیان کە بە ڕووناکیی زانیاریی وەحیی، عەقڵ و دڵیان ڕۆشن دەبێتەوە، ئەوانەیان هیدایەتی خوا وەردەگرن و واز لە شیرك دێنن، بۆیە دەفەرمووێ: (**بَلْ أَكْثَرُهُمْ**) بەڵکو زۆربەیان، نازانن.

یاخـود: زۆربەیـان نازانـن کـە تەنیـا خـوا ﷻ شایسـتەی پەرسـترانە، بۆیـە جگـە لـە خـوا دەپەرسـتن، بـەڵام کەمێکیـان دەشـزانن تەنیـا خـوا شایسـتەی پەرسـترانە، بـەڵام بۆیـە جگـە لـە خـوا دەپەرسـتن، چونکـە بازاڕیـان بـە شـیرك گـەرم دەبـێ، بـە بتپەرستیی، بـە پەرستنی جگـە لـە خـوا، بەرژەوەندییـە ناشـەرعییەکانی دنیایـان دابیـن دەبـن و، بۆیـان دەستەبەر دەبـن، نـەك لەبـەر ئـەوەی نازانـن، دەزانـن، بـەڵام دەزانـن کـە بەرژەوەندییـە ناشـەرعییەکانیان، بـە هـۆی پەرسـتنی جگـە لـە خـواو گرتنـی ڕێبـازی جگـە لـە خـواوە ﷻ دەسـتەبەر دەبـن.

لێـرەدا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۚ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، ئـەم تەعبیـرە لـە سـوورەتی (**العنكبوت**)یشـدا هاتـوە، بـەڵام بـە جیاوازییـەوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾ ﴾.

لێـرە فەرموویەتـی: ﴿ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، لـەوێ دەفەرموێ: ﴿ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾، واتـە: چـۆن لا دەدرێـن؟ چـۆن لـە پەرسـتنی خـوا لادەدرێـن و، تووشـی شـیرك و پەرسـتنی جگـە لـە خـوا دەکرێـن، مـادام دان بـەوەدا دەنێـن کـە هـەر خـوا ئاسـمانەکان و زەوی هێناونـە دی، خـوا مانـگ و خـۆری ڕامکـردوون؟.

لێـرە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بڵـێ: سـتایش بـۆ خـوا، بەڵکـو زۆربەیـان نازانـن، لـە سـوورەتی (**العنكبـوت**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ مِن بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۚ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾، واتـە: ئەگـەر لێیـان بپرسـی: کـێ لـە ئاسـمانەوە ئـاوی دابەزانـدوەو، لـە دوای مردنـی زەوی پـێ ژیاندۆتـەوە؟ بـە جەختکردنـەوە وە دەڵێـن: خـوا، بڵـێ: سـتایش بـۆ خـوا بەڵکـو زۆربەیـان (نافامـن)، لێـرەش دەفەرمـوێ: زۆربەیـان نازانـن، وەسـفکردنیان لـە سـوورەتی (**لقمـان**)دا بـە (نەزانیـی) سـیاقەکە دەیخـوازێ و، لـە سـوورەتی (**العنكبوت**)یـش دا وەسـفکردنیان بـە (نەفامیـی) سـیاقەکە دەیخـوازێ، هەروەهـا جیاوازییەکانـی دیکـەش بەهەمـان شـێوە،

وەك زۆرجاران گوتوومانە: خوای پەروەردگار ئەو ڕاستییانەی دووبارەیان دەكاتەوە لە قورئاندا، دیارە دووبارە كردنەوەیان پێویستە، بەڵام هەرجارە بەشێوەیەك و بە پێی ئەوە كە لەگەڵ ئەو سیاق و، ئەو شوێن و باس و خواسەدا، پڕ بە پێست و پێكەڵپێك و گونجاوە.

٣)- ﴿ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەكان و زەوی دایە، هی خوایە، واتە: خاوەندارێتیی ڕەها بۆ ئاسمانەكان و زەوی، تەنیا هی خوایە.

٤)- ﴿ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴾، بە دڵنیایی هەر خوا دەوڵەمەندی ستایشكراوە، (**غَني**) واتە: دەوڵەمەند، بێنیاز، كە پێویستیی بە جگە لە خۆی نیە، (**حَمِید**) واتە: (**مَحمود**)، (**فَعیل**)ی بە مانایی (**مَفعول**)ە، واتە: ستایشكراو و مەدحكراو، كەواتە: خوایەك ﷻ خاوەندارێتیی ڕەهای گەردوون و بوونی هەبێ بە سەرو خواریەوەو، خاوەنی ئەوپەڕی دەوڵەمەندیی و بێنیازیی بێ و، ئەوپەڕی ستایشكراو بێ، شایستەیە بەس ئەویش بەندایەتیی بۆ بكرێ، ئەگەر كەسانێكیش ئەو نەپەرستن، دیارە خوا ﷻ هیچ زیانێكی پێ ناگات، هەروەك بە پەرستنی ئەوان بۆ خوا هیچ سوودێكی پێ ناگات، بەڵكو ئەوە خۆیانن كە لە بەندایەتیی كردن بۆ خوادا بەهرەمەندن و، لە نەپەرستنیشیدا، زەرەرمەندن، وەك لە سوورەتی (**فصلت**) دا دەفەرمووێ: ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ ۖ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: هەر كەسێك كردەوەی چاك بكات، سوودەكەی بۆ خۆیەتی و، هەر كەسێك خراپە بكات، زیانەكەی تەنیا بەر خۆی دەكەوێ.

٥)- ئنجا خوا ﷻ زانیاریی بێ سنووری ڕەهای خۆیمان بۆ دەخاتە ڕوو، دەفەرمووێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ ﴾، ئەگەر هەرچی درەختە لە زەویدا ببێتە قەڵەم، دەریاش بۆی ببێتە مەرەكەب، ئنجا لە دوای خۆشی حەوت دەریای دیكەش بە ئەندازەی خۆی بخرێنە سەری (بۆ نووسینی وشەكانی خوا)، وشەكانی خوا تەواو نابن (مەرەكەبە كە دەبڕێ و وشەكانی خوا نا بڕێن).

وشـەی (يَمُـدُّهُ) خوێندراویشـەتەوە: (يُمِـدُّهُ)، (مَـدَّهُ يَمُـدُّهُ) و (أَمَـدَّهُ يُمِـدُّهُ)، زانایان دەڵێـن: هەردووكیـان بـە مانـای (يَزِيـدُهُ مِـدَاداً) مەرەكەبـی بـۆ زیـاد بـكات، (مِـدَاد) یـش بـە مانـای مەرەكـەب (حِبـر)ە، دەگوتـرێ: (مَـدَّ الـدَّوَاةَ يَمُدُّهَـا) و (أَمَـدَّ الـدَّوَاةَ يُمِدُّهَـا) هەردووكیـان بـە یـەك واتـان، (دَوَاة) ئەوەیـە كـە مەرەكەبـی تێدەكـرێ، (مَـدَّ الـدَّوَاةَ يَمُدُّهَـا)، (وَأَمَّدَهـا يُمِدُّهـا)، واتـە: مەرەكەبـی تێكـرد، تێیـدەكات، (مَـدَتُّ الـدَّوَاةَ مَـدّاً) و (أَمـدَتُّ الـدَّوَاةَ إِمـداداً أي: جَعَلـتُ فيهَـا المِـداد)، واتـە: مەرەكەبـم تێكـرد.

دوایی سەرنجی زیاتر لەم ڕستە موبارەكە دەدەین.

٦)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾، بە دڵنیایی خوا زاڵی كارزانە، باڵادەستی كاربەجێیە.

ئەوجـار خـوا باسـی دەسـەڵاتی بـێ سـنووری خـۆی دەكات و دەفەرمـوێ: ﴿مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ﴾، دروسـتكردنتان و زیندووكرانەوەتـان، تەنیـا وەك هـی یـەك كـەس وایـە، بـە عەرەبیـی ئـاوای لـێ دێتـەوە: (مَـا خَلْـقُ جَميعكُـم، وَلا بَعْثُكُـم إلاَّ كَخَلْـقِ وَبَعْـثِ نَفـسٍ وَاحِـدَة)، واتـە: دروسـتكرانی تێكڕاتـان ئـەی مرۆڤـەكان! هەروەهـا زیندووكرانەوەتـان، دوای مردنتـان، هـەروەك دروسـتكران و زیندووكرانـەوەی یـەك كـەس وایـە.

دەسـتەڵاتی خـوا بێسـنووره، هـەروەك زانیارییەكـەی بێسـنووره، دەسـەڵات و ویسـتی خـواش بێسـنووره، بـۆ ئێمـە قـورس و ئاسـان هەیـە، بـۆ ئێمـە گـران و سـووك هەیـە، بـەڵام بـۆ خـوا ﷻ شـتەكان هەموویـان وەك یەكـن، لـەو ڕووەوە كـە لەبەردەم دەسـەڵات و ویسـتی بێسـنووری خـوادا، هـەر كاتـێ ویسـتی پەیـدا دەبـن.

٧)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ﴾، بە دڵنیایی خوا بیسەری بینەرە.

## شەش سەرنج لەسەر ئایەتی ژمارە: (٢٧)

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِي ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾ ﴾.

ئەگەر هەرچی درەختە لە زەویدا، ببنە قەڵەم و، دەریاش لە دوای خۆی حەوت دەریای دیکە ببنە هاوکاری و بخرێنە سەری، هەموویان ببنە مەرەکەب بۆ قەڵەمەکان و، وشەکانی خوایان پێ بنووسرێن، وشەکانی خوا تەواو نابن و مەرەکەبەکە تەواو دەبێ، بە دڵنیایی خوا باڵادەستی کارزانە:

١- وشەی (**مَدَّ الشَّيءُ بَعْضُهُ بَعْضاً، مِثْلُ: مَدَّ النِّيلُ الخَلِيجَ أَي: زَادَ فِيهِ**)، شتێك هەندێكی بۆتە درێژ کردنەوە بۆ هەندێکی وەك: ڕووباری نیل کەنداوی زیاد کرد، کەنداو (**خليج**) ئەو شوێنەیە کە ئاوی لێ کۆ دەبێتەوە.

(**أَمَدَّ الشَّيءَ مَا لَيْسَ مِنْهُ**)، وشەی (**أَمَدَّ**) بە پێی ڕای هەندێك لە زانایان (**مَدَّالشَّيءُ بَعْضُهُ بَعْضاً**)، (**مَدَّ**) ئەوەیە کە لە زاتی خۆیدا بێ، شتێك لە جۆری خۆی هەر لە خۆی بۆی بێ، بەڵام (**أَمَدَّ الشَّيءَ: أَي بِمَا لَيْسَ مِنهُ**)، (**أَمَدَّ**) کاتێك بەکاردەهێنرێ، واتە: بە (**رُبَاعِي**) کاتێك بەکاردەهێنرێ کە لە دەرەوەی خۆی هاوکاریی بۆ بێت، هەندێکیشیان گوتوویانە: (**مَدَّ**) و (**أَمَدَّ**) وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، بە یەك واتان[1]، کەواتە: هەردوو ڕایەکان هەن:

أ- (**مَدَّ**) و (**أَمَدَّ**) واتە: خستیە سەری، بوو بە هاوکاری، زۆری کرد.

ب- یاخود: (**مَدَّ**) یانی: لە زاتی خۆیدا ئەو شتە هەندێکی هەندێکی زیاد کرد، بۆ وێنە: ڕووباری نیل کەنداوەکەی خۆی زیاد کرد، کە هەر یەکن، (**أَمَدَّ**)ش ئەوەیە کە شتێك زیاد بکرێ لە دەرەوەی خۆیڕا هاوکاریی و زێدەیی بۆ بێ.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٤، ص ٦٥.

٢- هەندێك لە زانایان ڕایان وایە کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡبَحۡرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦ سَبۡعَةُ أَبۡحُرٖ﴾، دەریاش لە دوای خۆی حەوت دەریای دیکە ببنە هاوکارو پشتیوانی، مەبەست لە ژمارەی حەوت بۆ زۆرییە نەك بە دیارییکراویی (مُحَدَّد) تەنیا حەوت هێندەی دیکەی ئاوی ڕووی زەوی، بخرێنە سەر ئەو ئاوەو بکرێنە مەرەکەب وشەکانی خوایان پێ بنووسرێن، وشەکانی خوا تەواو نابن، واتە: ژمارەی حەوت بۆ زۆریی بەکارهێنراوە، وەك یەكێك بە یەکێکی دیکە دەڵێ: حەوت جاران هاتم بۆ لات، نەك مەبەست ئەوە بێ کە بە دیارییکراوی تەنیا حەوت، (**الشَّعراوي**) لە (**خواطِر**)[1]ەکەی خۆیدا، وا دەڵێ و ئەو ڕایە زیاتر زاڵ دەکات.

بەڵگەیەکی دیکەش لەو بارەوە ئەوەیە کە بگوترێ: ئاوی دەریاکانی سەر ڕووی زەوی چەندە، ئەگەر حەوت هێندەی دیکەشی بخرێتە گەڵ، بە تەئکید وشەکانی خوا تەواو نابن، بەڵام ئایا ئەگەر حەوتسەد هێندەی دیکەی بخرێتە سەر، وشەکانی خوا تەواو دەبن؟ ئەدی ئەگەر حەوت ملیار هێندەی دیکەی بخرێتە سەر وشەکانی خوا تەواو دەبن؟ بێگومان هەر تەواو نابن، بۆیە واپێ دەچێ لێرەدا مەبەست زۆریی بێ.

هەروەك دەشگونجێ مەبەست بە دیارییکراوی حەوت هێندە بێ، چونکە عەقڵی مرۆڤ ئەوەندەشی چاك بۆ وەخۆگیر(**إستِيعَاب**) ناکرێ، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە کە ئەگەر هەر حەوت هێندەی بخرێتە سەر، وشەکانی تەواو نابن، بەڵام ئەگەر: هەشت هێندەی بخرێتە سەر، نۆ هێندە، دە هێندە، وشەکانی خوا تەواو دەبن! مەبەست ئەوە نیە، تەنیا مەبەست پێشاندانی زانیاریی فراوانی خواو، فراوانی وشەکانی خواو، لە ژمارە نەهاتنی وشەکانی خوایە ﷻ.

٣- مەسەلەیەکی دیکە: ئەمیش (**الشَّعراوي**) لە (**خَواطِر**)[2] ەکەی خۆیدا هێناویەتی - (**جُعِلَ الإِمْدَادُ لِلمَاءِ، وَلَم يُجْعَل لِلشَّجَرِ، لِأَنَّ القَلَمَ الوَاحِدَ يَكتُبُ بِحِبْرٍ كَثِير**).

---

(١) ج١٩، ص١١٧٢٢.

(٢) ج١٩، ص١١٧٢١.

واتـە: (**إمدَاد**)ەکـە، هاوکارییکردنەکـەو زێدەبوونەکـە، تەنیـا بـۆ ئاوەکـە کـە ببێتـە مەرەکــەب، بەکارهێنــراوە، بــەڵام بــۆ درەختەکانــی ڕووی زەوی، بەکارنەهێنــراوە، چونکـە یـەك قەڵـەم دەگونجـێ یـەك بـار مەرەکـەب بەکاربهێنـێ.

یانــی: خــوا بــە پێویســتی نەزانیــوە بفەرمــوێ: حــەوت هێنــدەی دیکــەش کــە درەخــت ئێســتا لــە ڕووی زەوی هــەن، بخرێنــە گەڵیــان و بکرێنــە قەڵــەم، چونکــە مەرەکــەب پێــی دەنووســرێ و دەبــڕێ، بــەڵام قەڵەمەکــە دەگونجــێ مەرەکەبێکــی زۆر بەکاربهێنــرێ و، هــەر یــەك قەڵــەم بــێ و نەبــڕێ.

٤- کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ أَنَّمَا فِی ٱلۡأَرۡضِ مِن شَجَرَةٍ أَقۡلَـٰمٌ ﴾، ئەم لە (**مِنْ**)ە بۆچی لەوێیە؟ واتە: ئەگەر لە سەرەتای هەر شتێك کە پێی دەگوترێ: درەخت لەسەر زەوی ﴿ مِن شَجَرَةٍ ﴾، بەڵام ئەگەر (**مِنْ**)ەکەی لەگەڵ نەبێ، واتە: درەختەکانی زەوی بکرێنە قەڵەم، ئایا چ جۆرە درەختێك؟ ڕەنگە جۆرێکی تایبەت بێ، لەوان و هەموویان نەبن، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ أَنَّمَا فِی ٱلۡأَرۡضِ مِن شَجَرَةٍ أَقۡلَـٰمٌ ﴾، واتە: ئەگەر هەر لەو سەرەتایەوە کە درەختیان پێدەگوترێ، بکرێنە قەڵەم و، ئەو قەڵەمانەش هەموویان، ئاوی دەریای ڕووی زەوی و، حەوت هێندەی دیکەشیان بخرێنە گەڵ و، بۆیان بکرێتە مەرەکەب و وشەکانی خوایان پێ بنووسرێن، وشەکان تەواو نابن.

٥- (**القُرطُبي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا،[1] قسەیەك لە (**أبو جَعفَر النحَّاس**)ەوە دێنێ، پێم خۆش بوو بیهێنم، دەقەکەی بە عەرەبیی دێنم و دوایی مانای دەکەم، دەڵێ: (**فَقَدْ تَبَيَّنَ أَنَّ الكَلِمَاتِ هاهُنا يُرَادُ بِهَا العِلمُ وَحَقَائِقُ الأشياءِ، لأنَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلِمَ قَبْلَ أن يَخْلُقَ الخَلْقَ ما هُوَ خَالِقٌ فِي السَّماواتِ وَالأرضِ مِن كُلِّ شَيءٍ، وَعَلِمَ مَا فيهِ مِن مَثَاقِيلِ الذَّرِ، وَعَلِمَ الأجنَاسَ كُلَّهَا، وَمَا فيهَا مِنْ شَعرَةٍ وَعُضوٍ، وَمَا فِي الشَّجَرَةِ مِنْ وَرَقَةٍ، وَمَا فيهَا مِن ضُرُوبِ الخَلقِ، وَمَا يَتَصَرَّفُ فِيهِ مِن ضُروبِ الطَّعمِ وَاللَّونِ، فَلَو سمَىَّ كُلَّ دابَّةٍ وَحْدَهَا وَسَمَّى أَجْزائَهَا عَلَى مَا عَلِمَ مِنْ قَلِيلِهَا وَكَثِيرِهَا، وَمَا تَحَوَّلَتْ عَلَيْهِ مِن أَحْوَالٍ، وَمَا زَادَ فيهَا مِن كُلِّ زَمَانٍ وَبَيَّنَ كُلَّ شَجَرَةٍ وَحَدَّهَا، وَمَا تَفَرَّقَّت إلَيهِ، وَقَدَّرَ مَا يَيبَسُ مِنْ ذَلِكَ مِنْ كُلِّ زَمَانٍ، ثُمَّ كُتِبَ البَيَانُ عَلَى كُلّ واحِدٍ**

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٤، ص٦٤.

**مِنهَا، مَا أَحاطَ اللَّهُ جلَّ ثَناءوه بِهِ مِنهَا، ثُمَّ كَانَ البَحْرُ مِدَاداً لِذَلِكَ البَيَانِ الَّذِي بَيَّنَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَنْ تِلْكَ الأَشْيَاءِ:** ﴿يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦ سَبۡعَةُ أَبۡحُرٖ﴾، **لَكَانَ البَيَانُ مِنْ تِلْكَ الأَشْيَاءِ، أَكْثَر).**

(**أبو جَعفَر النَّحاس**) باسی شتەکانی زەوی کردوە، دەڵێ: ڕوون بووەوە کە وشەکان لێرەدا مەبەست پێیان زانیاریی و، چییەتی شتەکانە، چونکە خوای زاڵی پایەدار، پێش ئەوەی دروستکراوەکان دروست بکات، زانیویەتی ئەوەی کە لە ئاسمانەکان و لە زەویدا، هەرچی دروستی دەکات زانیویەتی، هەروەها زانیویەتی کە گرانایی گەردیلەکانیان، هەروەها ڕەگەزەکانیانی هەموو زانیوە، هەروەها چەند موویان تێدان و چەند ئەندامیان هەن؟ (ئەوە بە نسبەت زیندەوەرەکانەوە)، هەروەها بە نسبەت درەختەکانەوە، هەر درەختێك چەند گەڵای پێوەن؟ هەروەها چەند دروستکراوی خوای تێدا هەن و، چەند لە جۆرەکانی تام و ڕەنگ و ئەوانەی بەسەردا دێن؟.

ئنجا ئەگەر خوا ﷻ هەر زیندەوەرێکی بە تایبەتیی ناو هێنابایەو، بەشەکانی ناو هێنابانایە، لەوەی کە لە بارەیەوە زانیوە، لە زۆرو لە کەم و، لەو حاڵانەی کە بەسەری دادێن، لەوەی کە لە هەر ڕۆژگارێکدا لێی زیاد دەبێ، پاشان هەر درەختێکی باس کردبایە بە تەنیاو، ئەوەی لەو درەختە جیا دەبێتەوە، لە لق و پۆپ و، ئەوەی باس کردبایە کە لێی وشك دەبێ لە هەر ڕۆژگارێکدا، پاشان ڕوونکردنەوەی ئەوەی هەموو نووسیبایە، لەسەر هەر کامێك لەو شتانەو، لەوەی کە خوا ﷻ زانیارییەکەی دەوری داوە، دوایی ئاوی دەریا مەرەکەب بووایە بۆ ئەو ڕوونکردنەوەیە، کە خوا (**تَبَارَكَ وَتعالى**) ڕوونی دەکاتەوە، لە بارەی ئەو شتانەوەو، لە دوای ئەو دەریایەش حەوت هێندەی دیکە دەریا هاتبانە گەڵی، بۆ ئەوەی کە ئەو ڕوونکردنەوانە بنووسێ لە بارەی ئەو شتانەوە، ئێستا ڕوونکردنەوەکە زیاتر بوو [واتە: مەرەکەبەکە تەواو دەبوو، بەڵام ڕوونکردنەوەی وشەکانی خوا تەواو نەدەبوو].

ئنجا ئەبو جەعفەری نەححاس بەس باسی شتەكانی زەوی كردوە، كە زەوی شتێكی بچووكە لە چاو ئەو گەردوونە پان و پۆڕە، كە ئێستا زانیاریی گەردووناسیی و، فیزیا، زیاتر فراوانیی گەردوونی بۆ ئێمە دەرخستوە، كە زانایانی گەردووناس دەڵێن: تیرەی گەردوون بە پازدە ملیار (١٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵی تیشكیی مەزەندە دەكرێ، ژمارەی كەهكەشانەكانی نێو گەردوون بە هەزار ملیار(١٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) واتە: یەك تریلیۆن كەهكەشان مەزەندە دەكرێن، بۆ وێنە كەهكەشانەكەی ئێمە كە (ڕێی كاكێشان)ی پێ دەڵێن، ژمارەی ئەستێرەكانی بە یەك تریلیۆن (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) واتە: هەزار ملیار ئەستێرە مەزەندە دەكرێن، كە یەكێك لە ئەستێرەكان خۆری ئێمەیە، خۆریش ئەو نۆ خڕۆكە بە دەوریدا دەخولێنەوە! بەڵی: ئەبوو جەعفەری نەححاس تەنیا باسی دروستكراوەكانی زەوی كردوە، لە ژیانداران و لە ڕووەك و... هتد، بەڵام ئەو دروستكراوانەی خوا خوڵقاندوونی، زۆر زۆر فراوانترن.

٦- (**راغب الأصفهاني**) دەڵێ: ئەگەر تەماشای ئایەتەكانی قورئان بكەین بۆمان دەردەكەوێ كە وشەی (**إِمْداد**) لە قورئاندا بەكارهێنراوە، بۆ ئەو شتانەی خۆشویستراون، بەڵام وشەی (**مَدّ**) بۆ ئەو شتانەی ناخۆشویستراون، بۆ وێنە:

أ- لە سوورەتی (**طور**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمۡدَدۡنَٰهُم بِفَٰكِهَةٖ وَلَحۡمٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: بەهەشتییەكانمان (ئیمداد كرد) هاوكارییمان كردن بە میوەو بە گۆشت لەوەی ئارەزووی دەكەن.

ب- هەروەها لە سوورەتی (**نوح**)دا نووح ﷺ بە گەلەكەی خۆی دەڵێ: ﴿ وَيُمۡدِدۡكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ ﴿١٢﴾ ﴾، واتە: (خوا) هاوكارییتان دەكات، بۆتان زۆر دەكات سامان و كوڕان.

بەڵام وشەی (**مَدّ**) بۆ شتی ناخۆشویستراو بەكارهاتوە لە قورئان دا، بۆ وێنە:

أ- لە سوورەتی (**مريم**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلۡعَذَابِ مَدّٗا ﴿٧٩﴾ ﴾، واتە: لە سزاو ئازار بۆی زیاد دەكەین، وشەی (**مَدّ**)ی بەكارهێناوە.

**ب-** هەروەها لە سوورەتی **(البقرة)**دا دەفەرموێ: ﴿وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ١٥﴾، واتە: بۆیان زیاد دەکات لە یاخیی بوونی خۆیاندا سەراسیمە بن و سەرگەردان بن.

کە دەگونجێ کە ئایەتی دیکەش لەو بارەیەوە بهێنرێنەوە.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەش دا وەك گوتمان: ئەو دوو ڕایە هەر هەن، کە وشەی **(مَدّ)** و **(إمْداد)** کە هەردووك خوێندنەوەکانیش هاتوون، یەك واتایان هەیە، لێرە: **(يَمُدُّهُ)** و **(يُمِدُّهُ)**، بۆیە دەگونجێ وشەی **(مَدّ)** و **(إمْداد)** لە هەندێك شوێندا بە یەك واتا بێن، یان بە واتای لێك نیزیك و، دەشگونجێ لە هەندێك شوێنیشدا **(إمْداد)** بۆ شتی باش و **(مَدّ)** بۆ شتی خراپ بەکاربێ، وەك **(راغب)** گوتوویەتی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان شەش ئایەتی کۆتایی ئەم سوورەتە دەگرێتە خۆی: (٢٩ - ٣٤)، کە تێیاندا باسی خستنە نێو یەکدی شەوگارو ڕۆژگارو، جێگۆڕکەیان و، ڕامکرانی خۆرو مانگ، کراوە، هەروەها باسی هەقێتیی خواو پووچیی پەرستراوە ساختەکان کراوەو، سەرنج بۆ ڕۆیشتنی کەشتییەکان بە دەریادا ڕاکێشراوەو، باسی حاڵەتی ترس و لەرزی سواربووانی کەشتییان، بە هۆی شەپۆلە داپۆشەرەکانی دەریاوە کراوە.

لە کۆتاییدا خوا بانگی مرۆڤایەتیی کردوە، کە پارێز لە خوا بکەن و، سام لە ڕۆژێك بکەن کە باب و ڕۆڵە لە فریای یەکدی نایەن، پاشان خوا باسی زانیاریی ڕەهاو بێ سنووری خۆی کردوە، کە هیچ شتێکی لێ پەنهان و شێردراوە نیە.

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ
كُلٌّ يَجْرِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا
يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ
بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾ وَإِذَا غَشِيَهُم
مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ ۚ وَمَا يَجْحَدُ
بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْا۟ يَوْمًا لَّا يَجْزِى
وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ
ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ
ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ
تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(ئەی مرۆڤ !) ئایا نابینی کە خوا بە شێنەیی شەوگار دەخاتە نێو ڕۆژگارەوەو، ڕۆژگاریش بە ئەسپایی بە نێو شەوگاردا دەکات و، خۆرو مانگیشی ملکەچ کردوون، هەر کامیان بەرەو کاتێکی ناوبراو (دیارییکراو) دەڕوات، هەروەها (ئایا نازانی) خوا شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن ﴿٢٩﴾ ئەو (تەگبیرو بەڕێوەبردنەش) بە هۆی ئەوەوەیە کە تەنیا خوا هەقەو، ئەوەی جگە لەوی لێی دەپاڕێنەوە، ناهەق و پووچە، هەروەها بەس خوا بەرزی گەورەیە ﴿٣٠﴾ ئایا نابینی کەشتیی بە هۆی چاکەی خواوە (کە ئاوی وا دروستکردوە، کەشتیی پێیدا بڕوات) بە دەریادا دەڕوات، (خوا ئەوەی خستە ڕوو) تاکو لە نیشانەکانی خۆیتان پێشان بدات، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانە هەن بۆ هەموو (مرۆڤێکی) زۆر خۆڕاگری زۆر سوپاسگوزار (بۆ خوا) ﴿٣١﴾ لە کاتێکیش دا (دەریا ئاڵۆز دەبێ) شەپۆلێکی وەك سێبەران دایاندەپۆشێ، بە ملکەچیی خۆ بۆ خوا ساغکەرەوانە لە خوا دەپاڕێنەوە، کەچی دوای ئەوەی بەرەو وشکانیی دەربازی کردن، هەیانە میانجییەو، تەنیا هەر زۆر پەیمان شکێنێکی زۆر سپڵە نکووڵیی لە نیشانەکانمان دەکات ﴿٣٢﴾ ئەی خەڵکینە! پارێز لە پەروەردگارتان بکەن و، ترس و سامی ڕۆژێکتان هەبێ کە هیچ بابێك سوود بە ڕۆڵەکەی ناگەیەنێ و، هیچ ڕۆڵەیەکیش هیچ سوودێك بە بابی ناگەیەنێ، بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە، ئنجا با ژیانی دنیا فریوتان نەدات و، (شەیتانی) فریودەر بەرانبەر بە خوا هەڵتانەخەڵەتێنێ ﴿٣٣﴾ بێگومان خوا زانیاریی (هاتنی) کاتی تێکچوونی دنیای لەلایەو، باران دەبارێنێ و، دەزانێ چی لە منداڵدانانەدا هەیەو، کەس نازانێ بەیانی چی دەکات و، کەس نازانێ لە چ زەوییەك (شوێنێك)دا دەمرێ، بەڕاستیی خوا زانای شارەزایە ﴿٣٤﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يُولِجُ): (الوُلُـوجُ: الدُّخُـولُ فِـي مَضِيـقٍ)، (وُلُـوجُ): بریتیـە لـە چوونـە نێـو شـتێکی تەنگەبـەر، هەروەهـا (إيـلاج) و (وُلُـوج): بـە مانـای: خرانـە نێـوی شـتێك بـۆ شـتێك بـە ئەسـپایی و بـە شـێنەییش، دێ، یانـی: (الدُّخُـولُ فِـي شَـيءٍ بِرِفْـقٍ).

(مُّقْتَصِدٌ):(مُتَوَسِّـطٌ)، واتـە: میانجیـی، (المُقْتَصِـدُ: الفاعِـلُ لِلقَصْـدِ وَهُـوَ التَّوَسُّـطُ بَيْـنَ الطَّرَفَيْـن)، (مُقْتَصِـد): کەسـێکە ئەنجامـدەری (قَصْـد) بـێ، ئەویـش بریتیـە لـە میانجیـی لـە نێـوان دوو لادا، واتـە: بـە هیـچ لایەکـدا تێنەپەڕێنـێ و داینەشـکێنێ.

(خَتَّـارٍ): (الخَتْـرُ: غَـدْرٌ يَخْتُـرُ فِيـهِ الإنْسَـانُ، أَي: يَضْعُـفُ وَيَكْسِـرُ لاجْتِهَـادِهِ فِيـهِ، الخَتْـرُ: أَقْبَـحُ الغَـدْرِ)، وشـەی (خَتَّـار) صیغـەی زێدەڕۆیـی (خَاتِـر)ە، وەك (غَـدَّار) صیغـەی زێدەڕۆیـی (غَـادِر)ە، ئنجـا (خَتْـر): بریتیـە لـە غەدرێـك، ((غَـدْر)) یانـی: پەیمـان شـکاندن)، کـە مـرۆڤ تێیـدا (خَتْـر) دەبـێ، واتـە: بێهێـز دەبـێ و دەشـکێ، لەبـەر ئـەوەی زۆر هەوڵـی تێـدا دەدات، هەروەهـا (الخَتْـر) ئـاواش لێکدراوەتـەوە: (أَقْبَـحُ الغَـدْرِ) ناقۆڵاتریـن غـەدرو پەیمـان شـکاندن، کەواتـە: (خَتَّـار) یانـی: زۆر پەیمانشـکێن.

(كَفُورٍ): (المُبَالِـغُ فِـي كُفْـرَانِ النِّعْمَـة)، (كفـور) کەسـێکە زێدەڕۆیـی بـکات لـە نادیـدە گرتـن و، سـپڵەیی کـردن بـە چاکەکانـی خـوا، یانـی: زۆر زۆر ناسـوپاس.

(تَغُرَّنَّكُمُ): (لا تَغُرَّنَّكُم) یانی: (لا تَخْدَعَنَّكُمْ) با هەڵتاننەخەڵەتێنێ.

(ٱلسَّاعَةِ): (السَّـاعَة الَّتِـي تَقُـومُ فِيهـا القِيَامَـة)، (سـاعة): بریتیـە لـەو کاتـە دیاریکـراوەی کـە ئاخیرزەمانـی تێـدا دێ، لێـرە لـەو سـیاقە لـە سـوورەتی (لقمـان)دا ئـەوە دەگەیەنـێ، ئەگەرنا (ساعَة) بـەو کاتـەش دەگوترێ کـە ڕۆژی دوایـی و کۆتایـی ئـەم ژیانـە دنیاییـەی تێـدا دێ، جـاری واش هەیـە وشـەی (ساعَة): هـەم بـۆ ئاخیـر

زەمان و هەم بۆ قیامەت و زیندوو بوونەوەش بەکارهاتوە، جاری واش هەیە بە واتای یەکێکیان بەکارهاتوەو، ئەوە بە پێی سیاقەکە دەزاندرێ.

هەروەها (السَّاعَةُ: جُزْءٌ مِنْ أَجْزَاءِ الزَّمَانِ وَيُعَبَّر بِها عَنِ القِيَامَةِ)، (سَاعَة): بەشێکە لە بەشەکانی کات، تەعبیریشی پێ دەکرێ لە قیامەت، لە ڕۆژی دوایی و، لەو کاتەش کە دنیا تێیدا کۆتایی دێ.

(ٱلۡغَيۡثَ): (المَطَرْ) واتە: باران، یاخود بارانێك كە لە فریا دێ و دوای ئەوەی خەڵك چاوەڕوانیی کردوە، بۆیان دەبارێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئەم شەش ئایەتانەی سوورەتی (لقمان) هەموویان بە یەکەوە پەیوەستن وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك، زۆر جاران گوتوومانە: ئایەتەکانی هەر سوورەتێك وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن و یەکدی دەبەستنەوە، لێرەش خوا ﷻ دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشێدا، باسی هەندێك لە سیفەتەکان و، کارە ناوازەکانی خۆی کرد، ئنجا باسی هەندێکی دیکەیان دەکات و دەفەرمووێ:

﴿أَلَمۡ تَرَ﴾، ئایا سەرنجت نەداوە؟ لە ئایەتەکانی پێشێ دا بە: ﴿أَلَمۡ تَرَوۡاْ﴾، دەستی پێکرد، ئایا سەرنجتان نەداوە؟ بە کۆ مرۆڤەکانی دواندن، بەڵام لێرەدا بە تاك، هەر کام لە مرۆڤەکان دەدوێنێ، دوای ئەوەی بە کۆ دواندنی و، هەندێك لە نازو نیعمەت و چاکەکانی خۆی خستە بەرچاویان، ئنجا تاك تاکیان دەدوێنێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ﴾، یانی: (أَلَمْ تَرَ أَيُّهَا الإِنْسَان) ئەی مرۆڤ! ئایا نەتبینیوە؟ سەرنجت نەداوە؟ نەتبینیوە بە چاوی سەرو بە چاوی عەقڵ و دڵ، هەردووکیان دەگرێتەوە، ﴿أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ﴾، کە خوا شەوگار دەخاتە نێو ڕۆژگارەوەو، ڕۆژگار دەخاتە نێو شەوگارەوە؟ واتە: شەوگار بەو شوێنە

دادێنێ کە پێشتر ڕۆژگاری لێبووە، ڕۆژگاریش دێنێتە ئەو شوێنەی کە پێشتر شەوگاری لێبووە، وەك لە سوورەتی (**الزمر**)دا دەفەرموێ: ﴿يُكَوِّرُ ٱلَّيۡلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيۡلِ ۝٥﴾، واتە: شەوگار بەسەر ڕۆژگاردا دەپێچێ و، ڕۆژگار بەسەر شەوگاردا دەپێچێ.

هەروەها لە سوورەتی (**الأعراف**)دا دەفەرموێ: ﴿يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا ۝٥٤﴾، واتە: بە شەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ، بە خێرایی شوێنی دەکەوێ، بە ئاشکرا لەم ئایەتە موبارەکانەوە دیارە، کە خوا دەفەرموێ: ئەو زەوییەی ئێوە لەسەری دەژین، هێلکەیی و خڕ هەڵکەوتوە، هەمیشە شەوو ڕۆژ لەسەری، بە دوای یەکدا دێن، وەك یەکدی ڕاو بنێن و، بەسەر یەکدا بپێچرێن، چونکە شەوگارو ڕۆژگار هەردووکیان وەك پۆشاکێکی سپی و ڕەش وان، کە لە زەوییەوە دەپێچرێن، شەوگار پۆشاکێکی ڕەشەو، ڕۆژگار پۆشاکێکی ڕوون و سپییە، بە دەوری زەوییەوە دەپێچرێن، وەك لە ئایەتەکەی سوورەتی (**الزمر**)دا دەفەرموێ: ﴿يُكَوِّرُ ٱلَّيۡلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيۡلِ ۝٥﴾، (**تَكْوِير: كُورُ العَمَامَة**)، (**تَكْوِير**) مێزەر کە دەپێچرێ، یانی: قەف و قەدەکانی بەسەر یەکدا دەپێچرێن، شەوگارو ڕۆژگاریش، ئاوا بە دوای یەکدا دێن، ئەمە بە ئاشکرا دەریدەخات کە ئەو شوێنەی ڕۆژگارو شەوگار ئاوا بە دوای یەکدا دێن، یەکدی دادەپۆشن و بەسەر یەکەوە دەپێچرێن، دەبێ خڕو هێلکەیی هەڵکەوتبێ.

﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى﴾، هەروەها خۆرو مانگیشی دەستەمۆو ڕام و ملکەچ کردوون، هەر کامێکیان بەرەو کاتێکی دیارییکراو دەڕوات، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾، هەروەها ئایا سەرنج نادەن: کە خوا شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن؟

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ﴾، ئەوەش ئەو تەگبیرو مشوورخۆرییە، ئەو بە دوای یەکدا هێنانی شەوو ڕۆژە، ئەو ڕامکردنی مانگ و خۆرە بۆ کاتێکی دیارییکراو، بە هۆی ئەوەوەیە کە بەس خوا هەقە، چەسپاوە، ڕاستە، ﴿وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِ

﴿ ٱلْبَٰطِلُ ﴾، دیسان بە هۆی ئەوەوەیە کە ئەوەی لە جیاتی وی، یاخود جگە لەو لێی دەپاڕێنەوە، پووچە، بێ نێوەڕۆکە، ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ ﴾، هەروەها بە هۆی ئەوەوەیە کە هەر خوا بەرزی گەورەیە.

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ ﴾، خوا دووبارەی دەکاتەوە: ئایا سەرنج نادەی! بە چاوی سەرو بە چاوی عەقڵ و دڵ، ڕانامێنی! کە کەشتیی بەهۆی چاکەی خواوە بە دەریادا دەڕوات؟.

(**فُلْك**) دەگونجێ تاك بێ، دەشگونجێ کۆ بێ، (**فلك**) هەم بە مانای (**سَفِينَة**)، هەم بە مانای (**سُفُن**) دێ، کەشتییەکان دەڕۆن، یان کەشتیی بە دەریادا دەڕوات بە هۆی چاکەی خواوە، بۆچی بەهۆی چاکەی خواوە؟ چونکە خوا دەریای وا لێکردوە کە ئاو جۆرە ماددەیەکی شل بێ، کەشتیی و بەلەم لەسەری بخزن، ئەگەر وەك وشکانیی بووایە، مەگەر وەك سەیارە تایەو پێچکەیان هەبووایە، ئەگەرنا نەیاندەتوانی بڕۆن و ئاوا بخزن، چونکە کەشتییەکان و بەلەمەکان لەسەر ئاو دەخزن، ئنجا خوا وایکردوە ئاو حاڵەتەکەی وابێ، بەلەم و کەشتیی لەسەری بخزن و، بتوانن بڕۆن، هەروەك خوا هەوای والێکردوە، فڕۆکە بتوانێ تێیدا جووڵە بکات، ﴿ لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ ﴾، خوا ئەوەی بۆ ڕەخساندوون، تاکو لە نیشانەکانی خۆیتان پێشان بدات، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانە هەن، بۆ هەر زۆر خۆڕاگرێکی زۆر سوپاسگوزارو شوکرانە بژێر، چونکە کەسێك زۆر خۆڕاگر بێ و زۆر شوکرانە بژێر بێ، دڵەکەی زیندوو دەبێ، دڵەکەی ڕۆشن دەبێ، ئیدی لە ئەنجامی ئەوەدا، تەماشای هەر شتێك بکات، دەستی خوای تێدا دەبینێ و، وەك نیشانەی خوا دێتە بەرچاوی.

﴿ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ ﴾، لە کاتێکدا شەپۆلێکی وەك تاریکاییان دایانبپۆشێ، (**ظُلَل**) کۆی (**ظُلَّة**)یە، (**ظُلَّة**) یانی: سێبەر، یان: هەورێك کە سێبەری کردوە، لە کاتێکدا شەپۆلێك دایانبپۆشێ وەك سێبەران، ئنجا کەسێك سواری کەشتییە گەورەکان بووبێ لە دەریا گەورەکاندا، ئەو دیمەنە چاك دەزانێ

چۆنە! چونکە جاری وا هەیە ئەو کەشتییە، بە تایبەتی ئەگەر لە شەودا بێ، کاتێك کە با هەڵدەکات و شەپۆلی گەورە گەورە دێن، ئەو کەشتییە کاتێك سەرەکەی (نووکەکەی) بەرز دەبێتەوە، دوایی بەرەو خوار دەچێ، دەڵێی تاکو بنی دەریا گیر نابێ، هەروەها کە بە لای ڕاست و چەپدا دێ، یان بە لای پشتەوەدا دەشکێتەوە، شەپۆلەکان هێندەی کێون بەرز دەبنەوە، ئەو کەشتییە گەورە هەرچەندە زۆر زل بێ، ئەگەر حەوت قات بێ، ئەگەر دە قات بێ، ئەگەر سێ هەزار (٣٠٠٠) کەس، ئەگەر دە هەزار (١٠,٠٠٠) کەس، یان سەد هەزار (١٠٠,٠٠٠) کەس هەڵبگرێ، یاخود باری زۆر گەورەو دەیان فڕۆکەی لەسەر بن، بەڵام لە نێو ئەو دەریا گەورەدا، هەروەك شتێکی بچووك ئەو شەپۆلانەی دەریا، یاریی و گەمەی پێ دەکەن.

دەفەرموێ: کاتێك کە شەپۆلێك دایانبپۆشێ وەك تاریکاییان، ﴿ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾، لە خوا دەپاڕێنەوەو ملکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ کردۆتەوە، لە کاتێکدا لێی دەپاڕێنەوە، ملکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ کردۆتەوەو، بەشی کەسیان پێوە نەهێشتوە، ملکەچییەکەیان تەنیا بۆ خوایە.

﴿ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ فَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ ﴾، بەڵام دوای ئەوەی بەرەو وشکانیی دەربازی کردن، هەیانە میانجییە، واتە: هەیانە میانجییەو لەسەر خەتی نێوەڕاست ماوەتەوە، ئەگەر زۆریش نەبۆتە بەندەیەکی باش، بەڵام زۆریش بە لای کوفرو سپڵەیی دا نەشکاوەتەوە، حاڵەتێکی میانجییە، دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ: کە کاتێك بەرەو وشکانیی دەربازیان دەکات، تێیاندا هەیە کە میانجییە، بەڵام زۆربەیان نا سوپاس و سپڵەن بەرانبەر بە چاکەکانی خوا، بە بەڵگەی ئەوە کە دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٖ كَفُورٖ ﴾، تەنیا ئەوانەش نکووڵیی لە ئایەتەکانی ئێمە دەکەن، کە زۆر پەیمانشکێن و زۆر سپڵە بن، یانی: لەگەڵ خوادا زۆر پەیمانشکێن بن، کە پەیمان بە خوا دەدەن تەنیا ئەو بپەرستن و لێی دەپاڕێنەوە، کەچی دوای ئەوەی دەربازی کردن، پەیمانەکە دەشکێنن و،

لە جیاتی ئەوەی سوپاسگوزاریی بکەن، زۆر سپڵەو ناسوپاسن، ئەوانە نكووڵیی لە نیشانەكانی ئێمە دەكەن، كەواتە: هەیانە كە میانجییە، بەڵام زۆربەیان پەیمانشكێن و سپڵەن، ئەوە بە نسبەت مرۆڤەكانەوە بە گشتیی، یاخود بە نسبەت هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانەوە، كە تییاندا هەیە دوای ئەوەی دەربازیشی دەبێ، حاڵەتێكی میانجیی دەمێنێ و، زۆر مل نادات سپڵەیی و پەیمانشكاندن لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، بیرەوەرییەكانی تەنگانەی دەریاو، دەربازكرانی لەلایەن خواوە، هەر لەلا دەمێنن.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡ ﴾، ئەی خەڵكینە! پارێز لە پەروەردگارتان بكەن، واتە: خۆتان بپارێزن لەوە كە پەروەردگارتان شتێكتان لێ ببینێ، شتێكتان لێ ببیستێ، پێی ناخۆش بێ، خواش ﷻ دوو شتی لە مرۆڤدا پێ ناخۆشن:

**یەكەم:** ئەوە كە ئەركەكانی لەسەری فەرز كردوون، بیانچوێنێ.

**دووەم:** ئەو شتانەی لێی قەدەغە كردوون، قەدەغەكانی خوا بشكێنێ.

﴿ وَٱخۡشَوۡاْ يَوۡمٗا ﴾، هەروەها لە ڕۆژێكیش بترسێن، سام و هەیبەتی ڕۆژێكتان لە دڵدا هەبێ، ﴿ لَّا يَجۡزِي وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ ﴾، كە هیچ باببێك (هیچ باب و دایكێك) سوود بە ڕۆڵەی خۆی ناگەیەنێ، ﴿ وَلَا مَوۡلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيۡـًٔا ﴾، دیسان هیچ لە دایكبوویەكیش سوود بە باب و دایكی ناگەیەنێ، واتە: كەس دادی كەس نادات، باب و دایك و ڕۆڵە دەفریای یەكدی نایەن، ﴿ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ ﴾، بە دڵنیایی بەڵێنی خوا ڕاستە، ﴿ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا ﴾، با ژیانی دنیا فریوتان نەدات، هەڵتانەخەڵەتێنێ، ژیانی دنیا یانی: ئارەزووەكانی ژیانی دنیا، با شتی حەرام لە ژیانی دنیا فریوتان نەدات، ئەگەرنا ژیانی دنیا هەمووی لە مرۆڤ قەدەغە نەكراوە، خوا ئێمەی لێرەدا داناوە تاكو تاقیمان بكاتەوەو، نیعمەتەكانی بۆ ئێمە خوڵقاندوون، بەڵام كە دەفەرموێ: با ژیانی دنیا فریوتان نەدات یانی: شتە قەدەغەكان و ئارەزووە خراپەكانی دنیا فریوتان

نەدەن، ئەگەرنا بە تەئكید بایی ئەوەندە كە ئینسان ژیانی بسووڕێ و، مەداری ساز بێ، بۆی هەیە بەهرەمەند بێ لە نازو نیعمەتەكانی خوا، وەك خوا لە سوورەتی (**الأعراف**)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ ﴿٣٢﴾ ﴾، واتە: بڵێ كێ ئەو جوانییەی خوا بۆ بەندەكانی دەریهێناوەو، ئەو بژیوە خۆش و بە تامانەی بۆ بەندەكانی دروستیكردوون، كێ قەدەغەی كردوون؟ بێگومان كەس قەدەغەی نەكردوون، بەڵام گرنگ ئەوەیە تۆش - ئەی مرۆڤ! - ژیانی دنیاو ڕابواردنی دنیا، وەك ئامراز تەماشا بكەی، بۆ وەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خوا، پاشان وەك ژیانێكی كاتیی و وەك شوێنی تێدا تاقیی كرانەوە، تەماشا بكەی، نەك گوریسی لە بن ڕابخەی و بە كۆڵی دابدەی و تەنیا دنیا ببینی!! ﴿ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ ﴾، هەروەها با فریودەر بەرانبەر بە خوا فریوتان نەدات، فریودەر بە پلەی یەكەم، دەگونجێ مەبەست پێی ئیبلیس بێ، كە خەڵكی زۆری فریو داوە، یاخود هەر شتێكی دیكە كە خەڵك فریو دەدات، با فریوتان نەدات لە بەرانبەر خوادا.

لە كۆتایی ئەم سوورەتە موبارەكەدا، خوا زانیاریی بێسنووری خۆی بۆ ئێمە دەردەخات و جارێكی دیكە، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ ﴾، بە دڵنیایی خوا زانیاریی (**ساعَة**)ی لە لایە، زانیاریی ئەو كاتەی كە ژیانی دنیای تێدا كۆتایی دێ، یاخود ئەو كاتەی كە مردووانی تێدا زیندوو دەبنەوە، یاخود (**ساعَة**) بە مانای ڕۆژی دوایی دێ، بە ئاخیر زەمانییەوەو، بە قیامەتییەوە بە هەموویەوە، بێگومان هەر خوا زانیاریی هاتنی ئەو ڕووداوە مەزنەی لە لایە، چ ئاخیر زەمان، چ هەڵسانەوە، چ هەردووكیان.

﴿ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ ﴾، بەس خواش باران دەبارێنێ، بارانێك كە لە فریای خەڵك دێ، ﴿ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ ﴾، تەنیا خواش دەزانێ چی لەنێو منداڵدانەكاندا هەیە، منداڵدانی كێ؟ هی مرۆڤان، هی ئاژەڵان، بە هەموو جۆرەكانیانەوە.

﴿وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ﴾، هەروەها هیچ کەسێك نازانێ بەیانیی چی دەکات و چ وەدەست دێنێ! ﴿وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ﴾، هیچ کەسێکیش نازانێ لەسەر چ زەمینێك، لە چ وڵاتێك، لە چ شوێنێك دەمرێ! ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ﴾، بێگومان خوا زانای شارەزایە، زانایە بە شتەکان و، شارەزایە بە کەسەکان و بە هەڵسوکەوتەکانیان.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سەرنجڕاکێشانی مرۆڤ بۆ جێگۆڕکێی شەوو ڕۆژو چوونە نێو یەکدییان و، ڕامکرانی خۆرو مانگ و، ڕۆیشتنیان بۆ کاتێکی دیارییکراو، گێڕانەوەی ئەو دیاردانەش بۆ ڕاستیی و چەسپاویی خواو، پووچەڵیی پەرستراوانی ساختەو، بەرزیی و گەورەیی و بێ وێنەیی خوا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ ﴾، ئایا نابینی، ئایا سەرنج نادەی کە خوا شەوگار دەخاتە نێو ڕۆژگارەوە؟ ڕووی دواندن لێرەدا لە کەسێکی دیارییکراو نیە، بەڵکو هەموو مرۆڤێك دەگرێتەوە، هەمزە (أ) لێرەدا، هەمزەی پرسیارلێکردنی نکووڵیلێکەرانە (**هَمزَةُ الإستفهامِ الإنكاري**)یە، دیتنیش لێرەدا دیتنی زانیاریی و چاوییە (**الرُّؤيَةُ عِلْمِيَّةٌ وَبَصَرِيَّة**)، چونکە ئەوەی کە باس دەکرێ، کە چوونە نێوی شەو بۆ ڕۆژو، چوونە نێوی ڕۆژ بۆ شەو، هەروەها ڕامکرانی مانگ و خۆر بۆ کاتی دیارییکراو، ئەوانە هەموویان هەم بە چاو دەبینرێن، هەم بە عەقڵ و هۆشیش دەرك دەکرێن.

(**يُولِجُ أَي: يُدْخِلُ**) پێشتریش گوتمان: (**إِيلاج**): بریتیە لە چوونە نێوێکی بە ئەسپایی، بە شێنەیی، چوونە نێو شتێکی تەنگەبەر، ئایا سەرنج نادەی چۆن خوا شەوگار دەخاتە نێو ڕۆژگار.

٢)- ﴿وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ﴾، هەروەها ڕۆژگاریش دەخاتە نێو شەوگار، ئەمە وەك ئایەتەكەی سووڕەتی (الزمر)ە، كە دەفەرموێ: ﴿يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ﴿٥﴾﴾، واتە: شەوگار بەسەر ڕۆژگاردا دەپێچێ و، ڕۆژگاریش بەسەر شەوگاردا دەپێچێ.

هەروەها لە سووڕەتی (یس)دا، كە دەفەرموێ: ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴿٣٧﴾﴾، واتە: نیشانەیەكی دیكە بۆیان ئەوەیە كە شەوگار ڕۆژگاری وەك كەوڵكردن لێ كەوڵ دەكەین لێ دەردەهێنین، [هەر كاتیش شەوگار ڕۆژگاری لێ دەرهێنرا، ڕووناكیی لێ دەرهێنرا]، ئیدی كتوپڕ ئەوان دەكەونە نێو تاریكییەوە.

بۆیە خوا ﷻ لێرەو لە شوێنەكانی دیكەش، بە زۆریی شەوگار پێش دەخات، چونكە هاتنی تاریكیی لە دوای ڕووناكیی زیاتر جێی سەرنجە، لەبەر ئەوەش كە ئەصڵ بریتیە لە تاریكیی و، خوا ﷻ بە ڕووناكیی تاریكیی دڕ پێداوەو لابردوە.

٣)- ﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾، هەروەها ئایا سەرنج نادەی و نابینی: خوا خۆرو مانگی دەستەمۆو ڕامكردوون، (تَسْخِير): بریتیە لە مل پێكەچكردنی شتێك و، ڕامكردنی.

٤)- ﴿كُلٌّ يَجْرِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾، هەر كامێكیان [لە مانگ و خۆر] بەرەو كاتێكی دیارییكراو، بەرەو كاتێكی ناوبراو دەڕوات، (الْجَرْيُ: الْمَشْيُ السَّرِيعُ)، (جَرْي): بریتیە لە ڕۆیشتنێكی خێرا.

٥)- ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾، كە بێگومان خواش بەوەی دەیكەن، شارەزایە، واتە: خوا ﷻ وەك چۆن شەوگار دەخاتە نێو ڕۆژگارو، ڕۆژگار دەخاتە نێو شەوگار، بەهەمان شێوە خۆرو مانگیشی دەستەمۆ كردوون، هەر كامێكیان بۆ كاتێكی دیارییكراو دێن و دەچن، هەروەها بزانن و سەرنج بدەن! خوا شارەزای ئەوەشە كە دەیكەن، كەواتە: بزانن كە خوا ئەم گەردوونەی هەڵخستوە تاكو ئێوە تێیدا بژین، وا مەزانن كە كردەوەكانتان تۆمار ناكرێن، كردەوەكانتان هەروا بێ هوودە دەڕۆن، بەڵكو خوا شارەزای ئەوەیە كە دەیكەن،

بۆیە بزانن چۆن لەم گەردوونەدا، لەم سەر زەوییە، بەو ئاسمان و بەو کەهکەشانانەوەو بەو سیستمە کە خوا دایناوە، بزانن چۆن ژیان دەبەنە سەر، چونکە دوایی کردەوەکانتان دێنەوە ڕێتان.

٦)- ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ﴾، ئەوەش بەهۆی ئەوەوەیە کە بەس خوا هەقە، چەسپاوەو ڕاستە.

٧)- ﴿ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ ﴾، هەروەها بە هۆی ئەوەوەیە کە ئەوەی لە جیاتی خوا، جگە لە خوا لێی دەپاڕێنەوە، پووچە، بێ بنەمایە.

لە سوورەتی (الحج)دا هەر ئەم تەعبیرە هاتوە، بە تۆزێك جیاوازییەوە، لەوێ دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ ﴿٦٢﴾ ﴾، کە ئەو (هُوَ)، (ئەو) ڕاناوێکی جیاکەرەوەیە (ضَميرُ الفَصل) مانایەکەی زیاتر تۆخ دەکاتەوە، کە لە هەندێك سیاق و شوێن دا، پێویست بەوە دەکات مانایەکەی زیاتر تۆخ بکرێتەوەو، لە شوێنێکی دیکە وا پێویست دەکات کەمتر تۆخ بکرێتەوە، بۆیە لە تەعبیرەکاندا جاری وا هەیە خوا وشەیەك کەم یان زیاد دەکات.

واتە: ئەم گەردوونە کە بەم شێوەیە بەڕێوەدەچێ، هەمووی سیستماتیك و ڕێکخراو (مُنَظَّم)ە، هۆکارەکەی ئەوەیە: خوا هەقەو چەسپاوە، بەدیهێنەرایەتیی خوا، پەروەردگارێتیی خوا، مشوورخۆرێتیی خوا، پەرستراوێتیی خوا، هەقەو چەسپاوە، بەڵام ئەوانەی لە جیاتی خوا، جگە لە خوا لێیان دەپاڕێنەوە، پووچ و بێ نێوەڕۆکن، کەواتە: وەك چۆن خوا ﷻ هەر خۆی ئەم گەردوون و ژیانە بەڕێوە دەبات، هەر ئەویش پێویستە بپەرسترێ و بەندایەتیی بۆ بکرێ، لێرەدا پیتێکی (جَرّ)ی گونجاو کە لەگەڵ ماناکەی دا دەگونجێ، دادەنرێ، کە قرتێنراوە پێش (أَن) وەك: (ذَلِكَ دَالٌ عَلَى أَنَّ اللَّهَ هُوَ الحَقُّ) واتە: ئا ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر خوا هەق و ڕاست و چەسپاوە.

وشەی (حَقّ) هەر جەڕەس و ئاوازی وشەکە، مانایەکەشی دەگەیەنێ، دوو پیتەکەی هەردووکیان پیتی (ح) و (ق)، کە (ق) دوو قافە تێکدا (دَغْم) کراون، هەردووکیان پیتی گەروو (حَلْق)یان پێ دەڵێن، کە هەر گۆ کردنی وشەکە بۆ خۆی، دەلالەت لەسەر مانایەکەی دەکات، (بَاطِل)یش کە لە چوار پیتی: (ب) و (ا) و (ط) و (ل) پێك دێ، ئەویش دیسان جەڕەس و دەنگی بێژەکە، مانایەکەشی دەگەیەنێ، وەك شتێکی بۆش، دەنگی هەیە بەڵام نێوەڕۆکی نیە.

٨)- ﴿وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾، هەروەها بەهۆی ئەوەوەیە کە خوا بەرزی گەورەیە.

کە دەفەرموێ: خۆرو مانگی دەستەمۆ کردوون، هەر کامێکیان بۆ کاتێکی دیارییکراو دەڕوات، واتە: هیچ کام لە دروستکراوەکانی ئەم گەردوونە بێ سیستم و بێ سەرپەرشتیار نین و، هەمووشیان بە ژیانی مرۆڤەوە لەم سەر زەوییە، پەیوەستن، بە تایبەتیی خۆرو مانگ، هەر زۆر پەیوەستن، وەك پێشتر باسمان کردوەو، دواتریش چەند سەرنجێك دەدەینە کۆی ئەو ئایەتانە، گرنگ ئەوەیە کە خوا ﷻ لێرەدا خستنە نێوی شەوگار بۆ ڕۆژگارو، خستنە نێوی ڕۆژگار بۆ شەوگارو، مل پێ کەچکردنی خۆرو مانگ، دەفەرموێ: هۆکاریان ئەوەیەو دەرەنجامی ئەوەن، کە خوا ﷻ تەنیا خۆی پەرستراوەو تەنیا ئەو هەقە، خوا ﷻ سەرنجی مرۆڤەکان ڕادەکێشێ: مادام تەنیا خوا هەمەکارەی گەردوونەو، سەرپەرشتیاری شەو و ڕۆژو خۆرو مانگەو لەبەر ئەوەش کە شارەزایە چی دەکەن و، ئاگاداری کردەوەکانتانە، عەقڵ و مەنتیق وا دەخوازێ کە ئێوە جگە لەو نەپەرستن، جگە لەو بەندایەتیی بۆ هیچ کەس و هیچ شتێك نەکەن.

چەند جارێك گوتوومانە: لە تەفسیری سوورەتی (یونس)دا باسێکی تایبەتمان دەربارەی: گەردوون و خۆرو زەوی و مانگ کردوەو، زانیاریی وردمان لە بارەی هەر کامێکانەوە خستۆتەڕوو، بۆ وێنە: ئەم خۆرەی ئێمە بە پێی مەزەنندەی

گەردووناسان دەڵێن: پێنج ملیار (٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)، ساڵ بەسەر تەمەنیدا تێپەڕیوە، پێنج ملیار ساڵە تیشك دەدات: بەشی پێنج ملیار ساڵی دیکەش تیشکی پێ ماوە، ئەگەر خوای پەروەردگار بیهێڵێتەوە.

بە نسبەت مانگەوە: هێزی ڕاکێشانی نێوان زەوی و مانگ، بە کێبلێکی پۆلایی مەزەندە دەکرێ، کە تیرەکەی پەنجا کیلۆمەتر(٥٠ کم) بێ، یانی: کێبلێکی پۆلایی، تیرەکەی لەو سەر بۆ ئەوسەر، ئەستوورییەکەی پەنجا کیلۆمەتر (٥٠ کم) بێ، هێزی ڕاکێشانی نێوان مانگ و زەوی، هێندە بەهێزە، هەر بۆیەش کە لە ئەنجامی هێزی ڕاکێشانی نێوان مانگ و زەوی دا، هەڵکشان و داکشان لە دەریاکاندا ڕوودەدات.

پێشتریش باسمان کردوە: ئەگەر زەوی خڕو هێلکەیی نەبووایە، نەدەگونجا شەو و ڕۆژ بە دوای یەکدا بێن، بەڵام لە ئەنجامی ئەوەدا کە زەوی خڕ هەڵکەوتوەو، لە بەرانبەر خۆردا بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، ئەو ڕووەی کە بەرەو خۆرە، دەبێتە ڕۆژو، بە پلە پلە ڕۆژ دێ، هەندێکی دەردەکەوێ، دوایی ئەویدیکە، دوای ئەویدیکە، هەتا ئەو ڕووەی لە خۆرە، دوایی وردە وردە دەکەوێتە ئەودیوو، تاریکیی بەسەردا دێ و دەبێتە شەو، ئنجا ڕووەکەی دیکە کە پێشتر شەو بووەو تاریك بووە، ڕوون دەبێتەوەو دەبێتە ڕۆژ، خوا لە سووڕەتی **(الأعراف)** دا دەفەرموێ: ﴿يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا ﴿٥٤﴾﴾، واتە: خوا بە شەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ (واتە: شەوگار دێنێتە شوێنی ڕۆژگارو، ڕووی زەوی پێ دادەپۆشێ)، بە خێرایی شوێنی دەکەوێ، خێرایی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا بریتیە لە دەوری سی کیلۆمەتر (٣٠ کم) لە خولەکێکداو، خێراییشی لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا سی (٣٠) کیلۆمەترە، شەست هێندەی خێرایی سووڕانەوەی بە دەوری خویدا.

**مەسەلەی دووەم:**

**سەرنجڕاکێشانی مرۆڤ بۆ دیاردەی ڕۆیشتنی کەشتییەکان لە دەریاداو، ملکەچانەی ساغ لە خوا پاڕانەوە، بۆ دەربازکردنیان لە کاتی تەنگانەی نێو دەریاداو، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە تەنیا پەیمانشکێنان لەگەڵ خوادا، نکووڵیی لە ئایەتەکانی دەکەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:**

١)- ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ ﴾، ئایا نابینی! [بە چاوی سەر کە دەبینرێ، هەروەها بە چاوی عەقڵ و دڵ]، ئایا سەرنج نادەی، ڕانامێنی! کە کەشتیی بە دەریادا دەڕوات بە هۆی چاکەی خواوە؟ ئەوە سێ جاران (أَلَمْ تَرَ) دووبارە بێتەوە لەم سووڕەتەدا:

**یەکەم:** ﴿ أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، بۆ سەرنجدانی ڕام و دەستەمۆ کردنی خوا بۆ هەرچی لە ئاسمان و زەویدایە.

**دووەم:** ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ﴾، بۆ سەرنجدان لە دیاردەی شەوو ڕۆژو، خۆرو مانگ.

**سێیەم:** ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ ﴾، بۆ سەرنجدانی ڕۆیشتنی کەشتییان بە دەریاداو دەربازکردنی سواربووانی کەشتییەکە لە کاتی تەنگانەو ناڕەحەتیی شەپۆلی سێبەر ئاسادا، کە بەسەریان دێ، وشەی (فُلْك) دەگونجێ کۆ بێ، دەشگونجێ تاك بێ.

ئنجا ئایا بۆچی کەشتیی یان کەشتییەکان بە دەریادا دەڕۆن، بە چاکەو بەخششی خواوە؟

٢)- ﴿لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ﴾، تاکو لە نیشانەکانی خۆیتان پیشان بدات، ئەم (ل) ە، بۆ هۆکار (عِلَّة)ە، واتە: یەکێك لە حیکمەت و هۆکارەکانی ئەوە کە خوا دەریای دروستکردوە، ئەوەیە کە لە نیشانەکانی پێشانتان بدات، چۆن کەشتیی و بەلەمەکان بە نێو دەریادا دەڕۆن.

٣)- ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا، [لەو دیاردەی ڕۆیشتنی کەشتیی و بەلەمەکان و پاپۆڕەکان بە ئاوی دەریادا]، نیشانە هەن بۆ هەر زۆر خۆڕاگرێکی زۆر شوکرانە بژێر، واتە: هەر کەسێك کە زۆر خۆڕاگر بێ، لە بەرانبەر بەڵاو گرفتارییەکانداو، زۆر شوکرانە بژێر بێ لە بەرانبەر چاکەو نیعمەتەکانی خوادا، ئا ئەوانە لە نیشانەکانی خوا بەهرەمەند دەبن و، ئا ئەوانە دیاردە سروشتییەکان بۆیان دەبن بە نیشانەی ناسینی خواو، دەرککردنی پەروەردگارێتیی خوا، خاوەندارێتیی خواو، مشوورخۆرێتیی خوا، بۆ گەردوون و ژیان و مرۆڤ.

٤)- ﴿وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾، کاتێك شەپۆلێك دایپۆشین وەك سێبەران، بە ساغکردنەوەی ملکەچییانەوە لە خوا پاڕانەوە، **(الغَشْيَانُ: مُسْتَعَارٌ لِلمَجِيءِ، لِأنَّهُ يُشْبِهُ التَّغْطِيَةَ، وَظُلَل: جَمْعُ ظُلَّة، وَهِيَ ماأَظَلَّ مِن سَحَابٍ وَغَيْرِهِ)**، **(غَشْيَانُ)** خوازراوەتەوە بۆ هاتن، چونکە وەك داپۆشین دەچێ، **(ظلل)**یش کۆی **(ظُلَّة)**یە، کە بریتیە لەوەی سێبەر بکات لە هەورو جگە لەویش.

﴿دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾، لە خوا پاڕانەوەو ملکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ کرد بۆوە، **(مُخْلِصِينَ)** واتە: ساغکەرەوانە، ﴿لَهُ ٱلدِّينَ﴾، ملکەچییان بۆوی، یانی: لە حاڵێکدا کە شەپۆل وەسەر کەشتییەکەیان دەگەڕێ، وەك سێبەری هەور، بەو مانایە کە شەپۆلەکە بەرز دەبێتەوە، وا هەست دەکەی کە بەسەریدا دێ، بەڵام ناکەوێتە سەری ئەگەرنا نغرۆ دەبن، لەو کاتەدا لە خوا دەپاڕێنەوە، بەڵام

ملکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ و یەکلادەکەنەوەو بەس لە خوا دەپاڕێنەوەو لە هیچ شتی دی ناپاڕێنەوە یانی: (**مُجَرِّدِينَ لَهُ الطَّاعَةَ وَالخُضُوع**) گوێڕایەڵیی و ملکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ دەکەنەوەو خڵتەی پێوە ناهێڵن، خڵتەی شیرك و ڕوو لە جگە لە خوا کردن.

٥)- ﴿فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ﴾، بەڵام کاتێك دەربازی کردن بەرەو وشکانیی، هەیانە میانجییە، لە سوورەتی (**العنكبوت**)دا دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾﴾، واتە: کاتێك دەربازی کردن بەرەو وشکانیی، کتوپڕ هاوبەشیان بۆ خوا دانا.

﴿فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ﴾، هەیانە میانجییە، (**المُقْتَصِدُ: الفَاعِلُ لِلقَصْدِ، وَهُوَ التَّوَسُّطُ بَيْنَ الطَّرَفَيْن**)، (**مُقْتَصِد**) بابای ئەنجامدەری (**قَصْد**)ە، ئەویش بریتیە لە میانجیی بوون لە نێوان دوولادا، واتە: خەتی نێوەڕاست گرتن، یانی: هەیانە خەتی نێوەڕاست دەگرێ، کاتێك کە دەربازیان دەکات بەرەو وشکانیی، بەملاولادا لانادات، وشەی: (**فَمِنْهُمْ**) ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوانە کەمن، کەمێك لەوان ڕێی ڕاست دەگرن و میانجیی دەبن.

کە دەفەرموێ: ﴿فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ﴾، چەند واتایەکیان بۆ لێکداونەوە:

أ- یەکێك لە واتایەکان ئەوەیە کە باسمان کرد، واتە: هەیانە کە میانجییە، نە بەولادا، نە بەولادا، لانادا، خەتی نێوەڕاست دەگرێ، بەڵام ئەوانە کەمن، بە زۆریی مرۆڤەکان، یان هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان (ئەگەر مەبەست پێی ئەوان بێ)، بە زۆریی پەیمانشکێن و سپڵەو ناسوپاس و بێبڕوان.

ب- هەندێکی دیکە وایان لێکداوەتەوە دەڵێن: (**مُقْتَصِد: مُعْتَدِلٌ فِي اعْتِقَادِهِ: فَتَارَةً يَعْزو هَذِهِ النَّجاةَ إِلى الله، وَتَارَةً إِلى غَيْرِهِ، كَمَهارَةِ الرُّبَّانِ، وَجَودَةِ السَّفِينَةِ**)[1]، واتە: هەیانە کە میانجییە لە بیروبڕوایدا، جارێك ئەو دەربازکرانە پاڵ دەداتە لای خواو، جارێکیش پاڵی دەداتە لای جگە لە خوا، وەك شارەزایی کەشتییوان و چاکیی کەشتییەکە.

(١) تفسير النابلسي، ج٧، ص١٠٦.

ج- بەڵام (الطبري) دەڵێ: (مُقْتَصِدٌ فِي قَوْلِهِ، وَإِقْرَارِهِ بِرَبِّهِ، وَهُوَ مَعَ ذَلِكَ مُضْمِرٌ الكُفْرَ بِهِ)[١] واتە: میانجییە لە قسەکردنی و لە دانپێهێنانی بە پەروەردگاریدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کوفری لە دڵی خۆیدا پەنهانکردوە.

د- (محمد الطاهر بن عاشور) دەڵێ: (المُقْتَصِدُ فِي الكُفْرِ أَوِ المُتَوَسِّطُ بَيْنَ الصَّلاحِ وَضِدِّهِ)[٢] واتە: میانجییە لە کافر بووندا (ڕۆنەچووە)، خەتی نێوەڕاستی گرتوە لە کافر بووندا، یاخود میانجییە لە چاکەکاریی و خراپەکارییدا.

هـ- (القرطبي) لە ئیبن و عەبباسەوە ڕیوایەت دەکات کە مانایەکەی ئەوەیە: (فَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنهُمْ كَافِرٌ، وَدَلَّ عَلَى المَحْذُوفِ: ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ﴾)[٣]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتوویەتی: کە فەرموویەتی: (فَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ) واتە: هەیانە میانجییە و خەتی نێوەڕاستی گرتوە، (وَمِنهُمْ كَافِرٌ)، هەشیانە بێبڕوایە، ئەوەی مانای [هەشیانە بێبڕوایە]، دەگەیەنێ، ئەو ڕستەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ﴾، واتە: تەنیا زۆر پەیمانشکێنێکی بێبڕوا، یان سپڵە نکووڵیی لە ئایەتەکانی ئێمە دەکات، ئەگەرنا خوای پەروەردگار (وَمِنهُمْ كَافِرٌ)ی باس نەکردوە، بەڵام ئەو ڕستەیە دەلالەتی لەسەر دەکات و دەیگەیەنێ.

بەندەش وام دێتە بەرچاو، کە مانای ڕاستتر ئەوەیە:

کە خوا ﷻ دەفەرموێ: کاتێك کە ئەوانە لە کەشتییدا شەپۆل دایاندەپۆشێ، وەك تاریکاییان، پەنا دەبەنە بەر خوا بە دڵسۆزیی، خۆیان بۆ پاڕانەوە لە خوا یەکلا دەکەنەوە، بەڵام کاتێك دەربازیان دەکات، کەمێکیان میانجیین و، ئەو دەربازکرانە لە تەنگانەیان، هەر لە هۆشدان (ذاكرة)دا دەمێنێتەوەو، جارێکی دیکە سەرەڕۆیی ناکەن و لانادەن، بەڵکو لەسەر خەتی نێوەڕاست دەمێننەوە،

---

(١) جامع البيان، ج٢١، ص١٠٦.

(٢) التحرير والتنوير، ج٢١، ص١٩١.

(٣) الجامع لأحكام القران ج١٤، ص٦٧.

کـە بریتیـە لـە خـوا پەرسـتیی و خـوا بـە یەکگرتـن، بـەڵام زۆربەیـان ئـەوەن کـە پەیمانشـکێنن و سـپڵەو ناسوپاسـن و چاکەکانـی خوایـان لەبیـر دەچـێ.

٦)- ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٖ كَفُورٖ﴾، تەنیا زۆر پەیمانشکێنێکی سپڵەش، نکووڵیی لە ئایەتەکانی ئێمە دەکات، (**جُحُود**) ئەوەیە مرۆڤ نکووڵیی بکات لە شتێك کە بە دڵ دەزانێ وایە، بەڵام بە زمان دانی پێدانەهێنێ، (**كَفُور: كَثِيرُ الكُفْرِ أَوِ الكُفْرانِ**)، (**كَفُور**): بە کەسێك دەگوترێ: زۆر بێبڕوا بێ، یاخود زۆر سپڵەو ناسوپاس بێ.

(**الخَتَّـارُ: شَـدِيدُ الخَتْـر، وَالخَتْـرُ: أَقْبَـحُ الغَـدْرِ وَأَشَـدُّهُ**)، (**ختّـار**): کەسـێکە (**خَتْر**)ەکـەی زۆر تونـد بـێ، (**خَتْر**)یـش، بریتیـە لـە خراپتریـن و ناقۆڵاتریـن جـۆری پەیمانشـکێنی.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بانگکردنی خوا بۆ مرۆڤایەتیی کە پارێز لە خوا بکەن و، لە ڕۆژێك بترسن کە باب و ڕۆڵە دادی یەکدی نادەن، بەڵێنی خواش چەسپاوەو، با وریا بن، ژیانی دنیاو شەیتانی فریودەر فریویان نەدەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْاْ يَوْمًا لَّا يَجْزِي وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٣٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ ﴾، ئەی خەڵکینە! پارێز لە پەروەردگارتان بکەن، لێرەدا ڕووی دواندن لە هەموو بەشەرە، لە هەموو مرۆڤایەتییە، (**تَقْوَى**)ش دەستپێکی هەیەو کۆتایی هەیە، تەقوا پلە پلەیە، دەستپێك و سەرەتای تەقوا، بریتیە لە ناسینی خوا، پاشان بڕوا بوون بە خوا ﷻ.

واتە: ئەی خەڵکینە! پەروەردگارتان بناسن و بڕوای پێبێنن و بەندایەتیی بۆ بکەن، تەقوا هەموو ئەوانە دەگرێتە نێو خۆی، وەك گوتراوە: (**التَّقْوَى: جِمَاعُ خِصَالِ الخَيْرِ كُلِّهَا**)، تەقوا کۆکەرەوەی هەموو خەسڵەتە باشەکانە.

٢)- ﴿ وَٱخْشَوْاْ يَوْمًا ﴾، [ئەی خەڵکینە!] لە ڕۆژێك بترسن، یانی: لە تەنگانەکانی ڕۆژێك و، لە کارەساتەکانی کە لەو ڕۆژەدا دەقەومێن بترسێن.

٣)- ﴿ لَّا يَجْزِي وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ ﴾، هیچ باب و دایکێك دادی ڕۆڵەو منداڵەکەی خۆی نادات، وشەی: (**وَالِد**) یانی: ئەو کەسەی کەسێکی لێبووە هەم دایك دەگەیەنێ، هەم بابیش دەگەیەنێ.

(**الوَالِدَيْـن**) و (**الأَبَوَيْـن**) هـەردووك دایـك و بـاب دەگەیەنـێ، ئەگـەر (والـد) بـە تەنێـش بـێ، هـەم بـاب دەگەیەنـێ، هـەم دایـك دەگەیەنـێ، بـاب / دایـك هیـچ دادی ڕۆڵەکـەی نـادات، (**أَي لايَدفَـعُ عَنْـهُ وَلا يَقْضِـي عَنْـهُ فِيـهِ**) واتـە: هیـچ بـەڵای لـێ بەرپـەرچ ناداتـەوە، هیچـی لـە جیاتـی جێبەجـێ نـاکات، تێیـدا.

چونکـە وشـەی (**الجَـزاء: يَجْـزِي جـزءً إذا عُـدِّيَ بِــ «عَـنْ» يأتـي بِمَعْنى دَفْـعَ عَنْـهُ، وَقَضَى عَنْـهُ**)، وشـەی (**جَـزاء**) ئەگـەر بـە (**عَـن**) تەعـەددا بـکات، ئەوە بـە دوو مانایـان دێ:

أ- لێی بەرپەرچ دایەوە.

ب- شتێکی لە جیاتی ئەو ئەنجامداو، لە کۆڵی کردەوە.

٤)- ﴿وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا﴾، هەروەها هیچ لە دایك بوویەکیش سوود بەو کەسە ناگەیەنێ کە ئەویان بووە، کە باب و دایکن، بۆیە خوا فەرموویەتی: (وَلَا مَوْلُودٌ)، نەیفەرموە: (**وَلَد**) چونکە (**مَوْلُود**) واتە: کەسێك کە پەیدابووە لە (**وَالِد**)ەوە، بەڵام (**وَلَد**) مەرج نیە ڕاستەوخۆ لەوەوە پەیدابووبێ، دەبینی (**وَالِد**)ەکە، مەبەست پێی باپیرە، بابی باپیرە، یاخود نەنکە، یاخود دایکی نەنکە، تاکو کۆتایی، بەڵام کە گوترا: ﴿وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا﴾، لە دایك بووەکە، کەسێك کە لە دایك بووە، باب و دایکەکە کە ڕاستەوخۆ لەوان پەیدا بووە، هیچ سوودیان پێ ناگەیەنێ.

٥)- ﴿إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ﴾، بە دڵنیایی بەڵێنی خوا ڕاستەو چەسپاوە، ئایا بەڵێنی خوا مەبەست پێی چییە؟ هاتنی ئاخیر زەمانە، هاتنی هەڵسانەوەو زیندووکرانەوەیە، هاتنی ڕۆژی دواییە.

٦)- ﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾، با ژیانی دنیا فریوتان نەدات.

٧)- ﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ﴾، هەروەها با فریودەر لە بەرانبەر خوادا، فریوتان نەدات، (**الغَرُورُ: كُلُّ مَا يَغُرُّ الإِنْسَانَ مِنْ شَيْطانٍ وَنَفْسٍ وَدُنياً**)، (**غَرُور**): هەر شتێك کە مرۆڤ فریوداو هەڵیخەڵەتێنێ، شەیتان بێ، نەفس بێ، دنیا بێ، (هەرچی بێ).

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴾: (**مَعْنـى البَاءِيَقْتَضِـي أَنَّهـا لِلسَـبَبِيَّة، فَبِالضَّـرُورَةِ يَكُـونُ السَّـبَبُ شَـأْنَاً مِـنْ شُـؤُونِ اللَّـهِ يُناسِـبُ المَقـامَ لاذَاتَ اللَّـهِ تَعَالـى، وَذَلِـكَ كَتَوَهُّـمِ شَـفَاعَةَ الشُّـرَكاءِ، أَو أَنَّ اللَّـهَ وَاسِـعُ الرَّحْمَـةِ**)، (**بِاللَّـهِ الغَـرُور**) ئـەم (ب)یـە مانـای هۆکاریـی دەگەیەنـێ، کەواتـە: دەبـێ ئـەوە کـە مـرۆڤ هەڵدەخەڵەتێنـێ بەهـۆی خـواوە یانـی: بەهـۆی حاڵێـك لـە حاڵەکانـی خـواوە بـێ، کـە مەقامەکـە دەیخـوازێ، نـەك خـودی خـوا ﷻ، وەك ئـەوە هاوبەشـەکان کـە پەرسـتوویانن، تکایـان بـۆ بکـەن، یـان وەك ئـەوە کـە خـوا بەزەیـی و لێبوردنـی زۆرە.

[یـان خـوا چ سـوودێك دەکات، لـەوەی کـە ئێمـە سـزا بـدات؟ ئـەو جـۆرە خەیـاڵ پڵاوانـە].

مـرۆڤ ئەگـەر لـە خـۆی وریـا نەبـێ، بـە هەڵـە تێگەیشـتن لـەو شـتانە هەڵدەخەڵەتێنـرێ و فریـو دەدرێ، لەلایـەن شـەیتانەوە لـە بەرانبـەر خـوادا ﷻ ئەگەرنـا مـرۆڤ بـە خـوا هەڵناخەڵەتـێ، بـەڵام مەبەسـت ئەوەیـە خەڵکینـە! بـا فریـودەر بـە هـۆی کارێـك لـە کارەکانـی خـواوە کـە مەقامەکـە دەیخـوازێ، هەڵتـان نەخەڵەتێنـێ، وەك ئـەوەی پەرسـتراوەکان تکامـان بـۆ دەکـەن، یـان فڵانکـەس بـە ڕەچەڵـەك دەچێتـەوە سـەر فڵانکـەس، یـان لەبـەر ئـەوەی کـوڕی فڵانکەسـە، کچـی فڵانکەسـە، یـان لەبـەر ئـەوەی کـە فـڵان کارەی کـردوە و، زیـان بـە خەڵـك ناگەیەنـێ، یـان لەبـەر ئـەوەی خـوا ڕەحمـی زۆرەو لێبوردنـی زۆرە، کـە ئەوانـە هەموویـان لـە کارەکان (**شـؤون**)ی خـوان، زۆرجـار فریـودەر (شـەیتان) ئەوانـە دەکاتـە بیانـووی هەڵخەڵەتانـی مـرۆڤ بەرانبـەر بـە خـوا.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**خستنە ڕووی ئەو ڕاستییە کە تەنیا خوا زانیاریی ئاخیرزەمان و توانای دابەزاندنی ئاو و، زانیاریی نێو منداڵدانان و، ئەوە کە مرۆڤ لە داهاتوودا چی دەکات و، لە کوێ دەمرێ؟ لە لایە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ  ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾، بە دڵنیایی خوا زانیاریی (ساعَة)ی لە لایە، واتە: تەنیا خوا ئەو زانیارییەی لە لایە، (ساعَة)ش وەك پێشتریش گوتوومانە: یانی: کاتێکی دیارییکراو، کە دەگونجێ مەبەست پێی ئەو کاتە دیارییکراوە بێ، کە دنیای تێدا کۆتایی دێ (ئاخیر زەمان)، دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو کاتە دیارییکراوە بێ کە مردووی تێدا زیندوو دەکرێنەوە، واتە: قیامەت، دەشگونجێ مەبەست کۆی ڕۆژی دوایی بێ هەردووك قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەت.

٢)- ﴿ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ ﴾، هەروەها خوا ئاو دەبارێنێ، **(أَي: وَإِنَّ اللَّهَ يُنَزِّلُ الغَيْثَ)** بە دڵنیایی تەنیا خوا ئاو دەبارێنێ، وشەی **(غَيْث)** مەبەست پێی ئاوێکە لە ئاسمان بێتە خوارو لە فریای خەڵکی بێ، ئنجا بارانە، بەفرە، تەرزەیە، ئاوێکە کە دادەبەزێ لە سەرێوە، بەڵام دەبێتە هۆی لە فریا هاتنی خەڵك و، دەربازکردنیان لە تەنگانەی وشکەساڵیی و بێ ئاویی.

٣)- ﴿ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِ ﴾، هەروەها خوا ئەوە دەزانێ کە لە منداڵدانەکاندا هەیە، واتە: تەنیا خوا ﷻ ئەوە دەزانێ کە لە منداڵداناندا هەیە، نەیفەرموە: **(مَنْ فِي الأَرحام)**،

فەرموویەتی: (مَا فِي الْأَرْحَامِ)، بۆ ئەوەی هەم نوتفە بگرێتەوە، هەم (عَلَقَة) و (مُضْغَة) و...هتد، هی مرۆڤ و هی ئاژەڵان، لە هەموو قۆناغەکانیان.

٤)- ﴿وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ﴾، هیچ کەسێك نازانێ بەیانیی چی دەکات، ئەوە کە مرۆڤ بەیانیی چی دەکات و، دوو بەیانیی چی دەکات؟ تایبەتترین حاڵی مرۆڤە، ئنجا ئەگەر مرۆڤ دڵنیا نەبێ لە تایبەتترین حاڵەتەکانی خۆی، مانای وایە زانیاریی ئەوەش تەنیا لە لای خوایە ﷻ بە وردیی و بە دڵنیایی.

٥)- ﴿وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ﴾، هیچ کەسێکیش نازانێ لە چ سەر زەمینێك دەمرێ.

بۆیە دەفەرموێ: (تَدْرِي) لە هەردوو: ﴿وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ﴾، ﴿وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ﴾، چونکە (دِرَايَة) بریتیە لەوە کە مرۆڤ هەوڵ بدات و کۆشش بکات، شتێك بزانێ، بۆیە وشەی (دِرَايَة) بۆ خوا ﷻ بەکار نایەت، چونکە خوا ﷻ بۆ زانینی شتەکان، پێویستیی بە هەوڵدان نیە، بەڵکو ڕاستەوخۆ هەموو شتەکان دەزانێ، بە بێ هەوڵ و تەقەللادان.

٦)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ﴾، بە دڵنیایی خوا زانای شارەزایە.

## حەوت سەرنج لەسەر ئایەتی ژمارە: (٣٤)

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾ ﴾.

**١-** ئەم ئایەتە نازناوی کلیلەکانی پەنهان (**مَفاتِحُ الغَيْب**)ی دراوەتێ، وەك لەم فەرمایشتەدا هاتوە:

**{عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَفَاتِحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ لاَيَعْلَمُهَا إِلاَّ اللَّهُ: لاَ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَتَى يَأْتِي الْمَطَرُ أَحَدٌ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَتَى تَقُومُ السَّاعَةُ، إِلاَّ اللَّهُ} (أخرجه البخاري: ٤٤٢٠، وغيره).**

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کلیلەکانی نادیار، پێنجن تەنیا خوا دەیانزانێ، هیچ کەس نازانێ بەیانیی چی تێدایە، جگە لە خوا، هەروەها هیچ کەس نازانێ چ لە منداڵدانەکاندا هەیە، جگە لە خواو، هیچ کەس نازانێ کەی باران لەسەرێ دێتە خوار، جگە لە خواو، هیچ کەس نازانێ لە چ سەر زەمینێك دەمرێ، جگە لە خواو، هیچ کەس نازانێ کەنگێ (**ساعة**) دێ واتە: ئاخیر زەمان، یاخود ڕۆژی دوایی، جگە لە خوا.

**٢-** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾، بە دڵنیایی تەنیا خوا زانیاریی هاتنی ڕۆژی دوایی، یان هاتنی ئاخیر زەمان، یان هاتنی قیامەتی، لەلایە، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا تێك ناگیرێ، کە وەك بیردۆزەیەکی گەردووناسان دەڵێ: تیشکی خۆر پێنج ملیار (٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵە داگیرساوەو، بەشی پێنج ملیار ساڵی دیکەش تیشکی پێ ماوە، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ

﴿قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٨٧﴾﴾ **الأعراف**، ئەم ئایەتە وەڵامی ئەو ئیشكالەمان دەداتەوە.

خوا دەفەرمووێ: لە بارەی (**ساعة**)وە پرسیارت لێ دەكەن، كەنگێ دەگیرسێتەوە، (كەنگێ لەنگەر دەگرێ؟) بڵێ: زانیارییەكەی تەنیا لە لای پەروەردگارمە، تەنیا پەروەردگارم بۆ كاتی خۆی دەری دەخات، لەسەر ئاسمانەكان و زەوی قورسە، كتوپڕ نەبێ بۆتان نایەت، لە بارەی (**ساعة**)وە لێت دەپرسن؟ وەك تۆ زۆر لێی شارەزا بی، بڵێ: زانیاریی وی تەنیا لە لای خوایە، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن.

كەواتە: (**ساعة**) ئاخیر زەمان، كۆتایی ئەم گەردوونە، كتوپڕ دێ، ئنجا كە كتوپڕ دێ، كەواتە: دوای پێنج ملیار (٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)ساڵی دیكە نیە، كە خۆر تیشكەكەی تەواو دەبێ، چونكە ئەگەر وابووایە، دەمانزانی، یاخود ئەگەر زانیاریی زیاتر بەرەو پێشەوە بچێ، دەتوانن زۆر بە وردیی دیاریی بكەن، كە لە دوای ئەوەندە ماوەی دیكە تیشكی خۆر كۆتایی پێ دێ، بەڵام خوا نەیفەرمووە: دوای ئەوەی كە تیشكی خۆر كۆتایی پێ دێ، ئاخیر زەمان دێ، بەڵكو فەرموویەتی: كتوپڕ دێ، ئنجا تەنیا خواش دەیزانێ، كەواتە: با زانیاریی بە مەزەننە بڵێ: دوای ئەوەندەی دیكە، خۆر تیشكەكەی دەبڕێ، یاخود سەر زەوی ئێمە بە كەڵكی ژیان نامێنێ، وەك ئێستا هەندێك لە زانایان باس دەكەن، كە ڕەنگە دوای پەنجا ساڵی دیكە، ئەم سەر زەوییە بە كەڵكی لێ ژیان نەمێنێ، بە هۆی ئەوەوە كە چینی ئۆزۆن زیاتر كون دەبێ و، بەهۆی ئەوەوە كە ژینگە زیاتر پیس دەبێ و، بەستەڵەكەكان زیاتر دەتوێنەوەو، هاوسەنگیی ژینگەیی زیاتر تێكدەچێ، ئەو قسانە دەكرێن بەڵام نا! خوا ﷻ نەیفەرمووە: دوای ئەوەی كە فڵان شتە دەبێ و فڵان شتە نامێنێ، ئاخیر زەمان دێ، بەڵكو فەرموویەتی: كتوپڕ دێ، وەك ئێمە لەو بارەوە لە كاتی تەفسیری ئایەتی (١٨٧) لە سووڕەتی (**الأعراف**) باسێكی سەربەخۆمان لە بارەی هاتنی ئاخیر زەمانەوە، بە شێوەی كتوپڕ كردوە، هەم ئایەتمان هێناون و هەم فەرمایشتی پێغەمبەرمان ﷺ هێناون.

**٣-** بە نسبەت دابەزینی ئاوەوە بە باران و بەفرو تەرزەوە، خوا نەیفەرموە: کەس نازانێ کەی دەبارێ، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ ﴾، (خوا) ئەوە ئاوە کە لە فریای مرۆڤەکان دێ، دایدەبەزێنێ، کەواتە: زانینی کاتی بەفرو تەرزەو باران بارین، هەرچەندە زیاتر بە گومانی زاڵیشە، لەگەڵ ئایەتەکەدا دژ ناوەستێ، چونکە ئایەتەکە نەیفەرموە: تەنیا خوا دەزانێ کەنگێ باران دەبارێ، یاخود کەنگێ ئاو لە ئاسمان دێتە خوارێ، بەڵکو فەرموویەتی: تەنیا خوا ئاو دەنێرێتە خوارو دایدەبەزێنێ، کە ئەوەش بە تەئکید شتێکی ئاشکراو بەڵگە نەویستەو، لە هەندێك شوێن هەوڵیان داوە هەوری دەستکرد دروست بکەن، بەڵام دەڵێن: ئەو مەسرەفەی کە تێیچووە، زۆر زیاتر بووە لەو بەرهەمەی کە لێی پەیدابووە، ئنجا بە تەئکید ئەوەی مرۆڤ دەیکات، لە قەدەر مرۆڤەو، ئەوەی خواش ﷻ دەیکات، لە قەدەر خوایە، هەڵبەتە ئەوەش کە مرۆڤ دەیکات، هەر بەو تواناو هێزو وزانەیە کە خوا ﷻ پێیداون، ئنجا ئەوە لە پایەی خوا ﷻ نەك نایەنێتە خوار، بەڵکو مرۆڤ ئەگەر بتوانێ هەر شتێك بکات، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ بەخششی خوا ﷻ کە خوا ئەو مرۆڤەی وا توانادار کردوە، بتوانێ ئەو شتە سەرسوڕهێنەرانە بکات، هەرچەندە بەداخەوە هەندێك خەڵك ئەوەندە سادەو سەرکێڵە، ئەگەر باسی منداڵی نێو بۆڕی دەکەن، ئەگەر باسی هەندێك شت دەکەن، باسی هەندێك عەمەلیات و چارەسەر دەکەن، دەڵێ: ئای مرۆڤ توانی وا بکات و وا بکات! خەڵك سەرسام دەبێ بەوەی کە دڵێکی دەستکرد بۆ کەسێك دابنێن، بەڵام سەرسام نابێ بەو هەموو دڵانەی خوا لەو مرۆڤانەدا دایناون، یان لەو هەموو ژیاندارانەدا دایناون!

**٤-** بەنسبەت ئەوەوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ ﴾، ئەوە کە لە ڕێی سۆنەرەوە کەشفی نێرو مێ دەکرێ، ئەویش لە قۆناغێکی دواتردا کە کۆرپە لە سکی دایکیدایە، ئەوەش دژ ناوەستێ لەگەڵ ئەوەدا کە خوا دەفەرموێ: خوا دەزانێ چی لە نێو منداڵدانەکاندا هەیە، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ ﴾، نەیفەرموە: (**وَيَعْلَمُ مَنْ فِي الأرحام**)، ئەگەر فەرمووبای (**مَنْ**) کێ، تەنیا نێرو مێیایەتیی دەگرتەوە، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ ﴾، خوا دەزانێ کاتێك کە لە حاڵەتی نوتفەدایە، لە

قۆناغی (عَلَقَة)دایە، لە قۆناغی (مُضْغَة)دایە، لە قۆناغی ئێسقاندایە، لە قۆناغی داپۆشرانی ئێسقان بە گۆشت و ماسوولکەدایە، لە قۆناغی ڕووح بە بەرداکراندایە، لە هەموو

قۆناغەکانـدا، هەمـوو شـتێکی لـە بـارەوە دەزانـێ، ئایـا ئـەو نوتفەیـە دەبێتـە مرۆڤـی گیانـدار، یـان نـا؟ ئایـا چ جـۆرە کەسـێك دەبـێ، چـاك یـان خـراپ، زیـرەك یـان تەنبـەڵ هەتـا دوایـی؟.

٥- بە نسبەت ئەوەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗا﴾، هیچ کەسێك نازانێ بەیانیی چی دەکات، هی وا هەیە دەڵێ: دەزانم بەیانیی چی دەکەم، دەچمە دائیرەو دەوام دەکەم، یان دەچمە کێڵگە، یان دووکان و بازاڕو کاری خۆم دەکەم! بەڵام واقیع ئەو جۆرە قسانەی زۆر بە درۆ خستوونەوە، زۆر کەس بە تەمای شتێك بووەو، دوایی ئەو شتەی بۆ نەکراوە، بە تەمای چوونە سەفەرێك بووە، بەڵام سەفەرەکەی بۆ نەکراوە، بە تەمای کارێك بووە، بەڵام کارەکەی بۆ نەکراوە، ئەو حاڵەتانە ئەوەندە زۆرن لە ژیانی بەشەردا، پێویست بە بەڵگە هێنانەوە ناکات.

٦- بە نسبەت ئەوەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ﴾، هیچ کەسێکیش نازانێ لە چ سەر زەمینێك دەمرێ، هەیە دەڵێ: با من دەزانم لە کوێ دەمرم! بەڵام لە ڕاستییدا ئەویش هەر قسەیە، چونکە هەبووە قەبریشی بۆ خۆی داناوە، بەڵام قەبری هەر بە قسمەت نەبووە!.

دەڵێـن: ملیارلێرێکـی لوبنانیـی هەبـووە زۆر دەوڵەمەنـد بـووە، کۆشـکێکی دروسـتکردوە، وەك چـۆن فیرعەونـەکان هەڕەمەکانیـان دروسـتکردوون کـە دوایـی بۆیـان ببنـە گـۆڕو لـەوێ دا بنێژرێـن، ئـەو هەڕەمانـەی لـە میسـڕ هـەن هەموویـان گـۆڕی فیرعەونەکانـن، کـە بـە سـۆغرەو بێـگاری دەیـان هـەزار کـەس دروسـتکراون، ئـەو ملیارلێـرە لوبنانییـەش گۆڕێکـی بـۆ خـۆی دروسـتکردوەو، کۆشـکێکی لەسـەر دروسـتکردوە، گوتوویەتـی: چـۆن نازانـم لـە کـوێ دەمـرم؟ ئیـدی وەسـیەت دەکات: کـە مـردم لەوێـدا بمنێـژن، بـەڵام خـوا ﷻ وەك بیکاتـە پەنـدو عیبـڕەت بـۆ خەڵکێـك،

لـە تەیـارەدا دەبـێ لەسـەر دەریـای سـپی نێوەڕاسـت، تەیارەکەیـان دەسـووتێ و، هەموویـان دەمـرن، جەنـازەی هەموویـان دەدۆزرێتـەوە، بێجگـە لـە هـی ئـەو و قەبرەکـەی بـە بۆشـیی دەمێنێتـەوە!.

لـە ڕاسـتییدا زۆر کـەس بـە تەمـا بـووە لـە شـوێنێك بنێـژرێ، لـە شـوێنێك بمـرێ، بـەڵام ئـەو کەسـەی بـە تەواویـی دەزانـێ هـەر کەسـە لـە کـوێ دەمـرێ، تەنیـا خـوای پـەروەردگارە، لـەو بـارەوە ئـەم دەقـەش هەیـە:

{عَـنْ أَبِـي عَـزَّةَ ﵁، قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ: **إِنَّ اللَّـهَ تَبَـارَكَ وَتَعَالَـى إِذَا أَرَادَ قَبْـضَ رُوحِ عَبْـدٍ بِـأَرْضٍ، جَعَـلَ لَـهُ إِلَيْهـا حَاجَـةً، فَلَـمْ يَنْتَـهِ حَتَّـى يَقْدَمَهـا، ثُـمَّ قَـرَأَ رَسُـولُ اللـه** ﷺ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴾، **(أخرجـه أحمـد: ١٥٥٧٨، والبخـاري فـي الأدب المفـرد: ٧٨٠، والحاكـم: ١٢٧، وقـال: صحيـح، ووافقه الذهبـي، وابـن حبـان: ٦١٥١))**.

واتـە: ئەبـوو عـەززە ﵁ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرمـوێ: ئەگـەر خـوا (**تَبَـارَكَ وَتَعَالَـى**) ویسـتی ڕووحـی بەندەیـەك لەسـەر زەمینێـك، (لـە وڵاتێـك بکێشـێ)، وا دەکات، کارێکـی هەبـێ بچـێ بـۆ ئـەوێ، واز ناهێنـێ تاکـو نەچـێ بـۆ ئەو شـوێنەو، لـەوێ گیانەکـەی دەکێشـرێ، دوایـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەو ئایەتـە موبارەکـەی خوێنـدەوە: ( إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ...).

٧- سـەرنجی کۆتایـی لـە ڕستەی کۆتایـی ئـەم ئایەتە دەدەیـن، کە خـوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا زانـای شـارەزایە، واتـە: زانایـە بە شـتەکان و، شـارەزایە بـە شـەخصەکان، بـە حـاڵ و باڵیـان و کردەوەکانیـان، بـە هەڵـس و کەوتیـان، واتـە: خـوا ﷻ وەك چـۆن هەموو شـتەکان دەزانـێ، هەموو شـەخصەکانیش دەناسـێ، ئـاگاداری هەمـوو کردەوەکانیشـیان و هەمـوو هەڵسوکەوتەکانیشـیانەو، تێکـڕای حاڵەتـە جـۆراو جۆرەکانـی ژیـان و گوزەرانیشـیانە.

لێرەدا دێینە کۆتایی سووڕەتی **(لقمان)**، خوا بە لوتف و کەڕەمی خۆی یارمەتییمان بدات و هیدایەتی زیاترمان بدات، کە باشتر لە قورئان تێبگەین، زیاتر پێوەی پابەند بین، قورئان زیاتر بۆمان ببێتە ڕووناکیی و هیدایەت: لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییماندا، تاکو هەم دنیامان ژیانێکی بەختەوەرانە بێ، هەم دوارۆژیشمان ژیانێکی سەرفرازانەی ڕوو سوورانە بێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێك

بەڕێـــزان!

خـوا پشـتیوان بـێ، ئەمـڕۆ کـە (١٣)ی (ذي القعـدة)ی سـاڵی (١٤٤٠) کۆچییـە، بەرانبـەر ١٦/ ٧/ ٢٠١٩ زایینـی، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیر کردنـی سـوورەتی (السـجدة) و ڕوونکردنـەوەو شـیکردنەوەی چەمـك واتـای ئایەتـە بـە پێزەکانـی، ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، وەك عادەتـی خۆمـان، سـەرەتا لـە پێناسـە و نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتەوە دەسـت پێدەکەیـن، ئەویـش لـە حـەوت بڕگـەدا:

## پێناسەی سوورەتی (السَّجدة) و بابەتەکانی

### ١)- ناوی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە چەند ناوێکی بۆ بەکارهێنراون:

أ/ (سُورَةُ السَّجْدَة).

ب/ (آلَم تَنْزِيل).

ج/ (آلَم تَنزِيلُ السَّجْدَة).

د/ (سُورَةُ تَنزِيلُ السَّجْدَة).

هـ/ (سُورَةُ المَضَاجِع).

بـەڵام بێگومـان، ئـەوەی کـە زیاتـر نـاوی پـێ دەرکـردوە، بریتیە لـە (سُـورَةُ السَّـجْدَة)، هەرچەنـدە ئـەم نـاوە، وەك زانایـان گوتوویانـە، ناوێکـی کـەم و کورتـە، لەبـەر ئـەوەی ئەگـەر مەبەسـت ئـەوە بـێ، لـەم سـوورەتەدا، سـەجدەی قوڕئـان خوێنـدن هەیـە، لـە نیزیکـەی چـواردە (١٤) سـوورەتی دیکەشـدا، سـەجدەی قوڕئـان خوێنـدن هەیـە.

بۆیـه هەندێکیـان گوتوویانـه: ئەگـەر بویسـترێ ئـەم سـوورەتە چـاك بناسـێنرێ، دەبـی بگوتـرێ: (**سُـورَةُ آلـم السَّـجْدَة**)، یـان (**سُـورَةُ آلـم تَنزِيـلُ السَّـجْدَة**)، هەرچەنـدە کـە دەگوتـرێ: (**سُـورَةُ السَّـجْدَة**)، لەبـەر ئـەوەی سـوورەتەکانی دیکـە، بـا سـەجدەی قورئـان خوێندنیشـیان تێدابـێ، بـەڵام بـەو نـاوە نەناسـراون، یەکسـەر زەیـن بـۆ ئـەم سـوورەتە دەچـێ، بـە هـۆی ئەوەشـەوەیە کـە ئـەو نـاوە بـۆی بۆتـە ناوێکـی عەلـەم و پێـی دەناسـرێ.

## ٢)- ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنە خواردا:

ئـەم سـوورەتە لـە ڕیزبەندیـی هاتنـە خـواردا، ژمـارە (٧٣)یـە، دوای سـوورەتی (**النحـل**) و پێـش سـوورەتی (**نـوح**) دابەزیـوە، لـە (**مصحف**)یشـدا ژمـارە (٣٢)یـە.

## ٣)- شوێنی دابەزینی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە مەککەییـە، هەرچەنـدە هەندێـك لـە زانایانیـان سـێ ئایەتیـان لـێ هـەڵاواردوون، گوایـە مەدینەییـن، کـە ئایەتەکانـی: (١٨ - ٢٠)، کـە ئەمـە دەقەکەیانـە:
﴿ أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗاۚ لَّا يَسۡتَوُۥنَ ١٨ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡمَأۡوَىٰ نُزُلَۢا بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٩ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ فَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمۡ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ٢٠ ﴾.

بـەڵام بەڵگەیەکـی وایـان بـە دەسـتەوە نیـە، کـە ئـەم سـێ ئایەتـە موبارەکـە مەدینەیـی بـن، بەڵکـو هەمـوو ئایەتەکانـی ئـەم سـوورەتە، وەك ئاڵقـەی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن و، وا پێدەچـێ هەمـووی لـە قۆناغـی مەککـەدا دابەزیبـێ.

## ٤)- ژمارەی ئایەتەكانی ئەم سووڕەتە:

ژمارەی ئایەتەكانی ئەم سووڕەتە موبارەكە: سی (٣٠)یە، هەندێكیشیان گوتوویانە: (٢٩) یان (٢٨)، یان (٢٧)ە، ئەو بۆچوونانەش هەن، بەڵام زۆرینە، ڕای یەكەمیان هەیە، كە ژمارەی ئایەتەكانی ئەم سووڕەتە موبارەكە، وەك سووڕەتی (مُلْك)، یانی: سووڕەتی (تَبَارَكَ)، سی (٣٠) ئایەتە، پێشتریش باسمان كردوە كە كەمیی و زۆریی ژمارەی ئایەتەكان، ناگەڕێتەوە بۆ ئەوە كە وشەیەك یان ڕستەیەك زانایەك بڵێ: لە قورئاندا هەیە، یەكێكی دیكەیان بڵێ: نیە! نەخێر، بەڵكو دەگەڕێتەوە بۆ درێژیی و كورتیی ڕستەكان، لە كوێ بوەستی و لە كوێ نەوەستی؟.

## ٥)- نێوەڕۆكی ئەم سووڕەتە:

نێوەڕۆكی ئەم سووڕەتەش، هەمان نێوەڕۆكی سووڕەتە مەككەییەكانە و بەگشتیی بۆ دوو بەشی سەرەكیی دابەش دەبێ:

بەشی یەكەم: سەرەتا باسی قورئان و باسی پێغەمبەری كۆتاییە موحەممەد ﷺ، دوایی باسی دروستكردنی خوایە ﷻ بۆ گەردوون و مرۆڤ، پاشان باسی زیندووكرانەوەو گیان كێشران و دیمەنێكی سامناكی قیامەت و سەرزەنشتكردنی خوا بۆ كافران، ئەوە ئایەتەكانی: (١- ١٤)، گرتوویاننە خۆیان.

بەشی دووەم: باسی چەند سیفەتێكی گەورەو گرنگی بڕواداران و پاداشتی سەرسوڕهێنەریان، دوایی باسی تاوانباران و سزای گچكە و نیزیك و، دوور و گەورەتریان، ئنجا ئاماژەیەك بە مووسا (علیه السلام) و ئەو كتێبەی كە پێیدراوەو، بۆگەلەكەی (گەلی بەنی ئیسڕائیل)، بەرچاوڕوونیی و ڕێنمانن بووە، لە كۆتاییش دا سەرنجڕاكێشانی مرۆڤان بۆ مێژووی گەلانی پێشوو و، زیندوو كرانەوەی زەمین بە هۆی ئاوێكەوە كە لەسەرێوە دادەبەزێنرێ و، سەرەنجامیش پرسیاری كافران لە بارەی قیامەتەوە و، وەڵامدرانەوەیان، ئەوەش ئایەتەكانی: (١٥ - ٣٠) گرتوویاننە خۆیان.

## ٦)- تایبەتمەندییەكانی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە موبارەكـە كۆمەڵێك تایبەتمەندیـی هـەن، كـە مـن حەوتیانـم لـێ كەوتووتـە بەرچـاو، یـان بـە پێویسـتم زانیـوە بیانهێنـم:

١- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی مشوورخواردن (**تدبیر**)ی خوا لە ئاسمانەوە بۆ زەویی و، بۆلا بەرزبوونەوەی لە ڕۆژێكی هەزار ساڵییدا كراوە: ﴿ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾ ﴾.

٢- تەنیا لەم سوورەتەدا ناوی فریشتەی مەرگ (**مَلَكُ المَوت**) هاتوە: ﴿ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾ ﴾.

٣- تەنیا لەم سوورەتەدا دیتن، پێش بیستن خراوە، بە نسبەت ڕووداوەكانی ڕۆژی دواییەوە، كە كافرەكان دەڵێن: ﴿ رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴿١٢﴾ ﴾.

٤- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی ئەوە كراوە، كە هیچكەس لە بڕواداراني چاكەكار نازانێ، چ پاداشتێكی دڵخۆشكەری بۆ شێردراوەتەوە لە قیامەتدا: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾.

٥- تەنیا لەم سوورەتەدا بۆ خراپەكاران باسی ئازار و سزای گچكەتر و گەورەتر كراوە: ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾.

٦- تایبەتمەندییەكی دیكەی ئەم سوورەتە: خوێندرانیەتی لە ڕكاتی یەكەمی نوێژی بەیانیی ڕۆژی جومعەدا: {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** ﷺ، **قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ** ﷺ **يَقْرَأُ فِي الْجُمُعَةِ، فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ، آلَم تَنْزِيلُ، السَّجْدَةَ، وَ**﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ ﴿١﴾ ﴾} (**أخرجه البخاري: ٥٢٢، ومُسلِم: ٦٥و ٦٦**).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە ﷺ، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ عادەتـی وابـوو لـە نوێـژی بەیانیـی ڕۆژی جومعـەدا (لـە ڕكاتـی یەكـەم لـە دوای سـوورەتی فاتیحـە)، (**آلَم تَنْزِيلُ**،

السَّـجْدَةَ)ی دەخوێنـد و، (لـە ڕکاتـی دووەم لـە دوای سـووڕەتی فاتیحـە سـووڕەتی ئینسـانی) دەخوێنـد: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ۝١﴾.

**٧- خوێنرانی لە شەواندا بەر لە خەوتن: {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لاَ يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ تَنْزِيلَ السَّجْدَةِ، وَ﴿تَبَـٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ۝١﴾الملك} (أخرجه أحمد: ١٤٦١، والدارمي: ٣٤١١، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح).**

واتـە: جابیـری کـوڕی عەبدوڵـڵا خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ عادەتی وابـوو شـەوانە نـە دەخـەوت تاکـو (آلَـم تَنْزِيـلُ، السَّـجْدَةَ) و، سـووڕەتی: ﴿تَبَـٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ ۝١﴾ی، نەخوێندبانایە.

## ٧)- دابەشکردنی ئایەتەکانی بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە ئەم سی (٣٠) ئایەتە، بۆ سێ دەرسان دابەش دەکەین، بەم شێوەیەی خوارەوە:

**دەرسی یەکـەم:** ئایەتەکانـی: (١ - ١٤)، واتـە: چـواردە (١٤) ئایـەت، کـە باسـی قوڕئـان و یەکتایـی خـوا لـە بەدیهێنەرایەتیـی و پەروەردگارێتیـی دا و، باسـی قیامـەت و سـزاو پاداشـت و، گیـان کێشـرانی مرۆڤـەکان، بـە گشـتیی و، بـە تایبـەت تاوانبـاران و، سەرشـۆڕبوونیان لـە بەرانبـەر خـوادا.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانـی: (١٥ - ٢٢)، واتـە: هەشـت (٨) ئایەت، باسـی ژمارەیەك لـە سـیفەتەکانی بـڕواداران و پاداشـتیان و، بـەراورد پێکردنیـان لەگـەڵ لا دەران و ئەو سـزایەدا کـە چاوەڕێیانـە، چ لـە دنیـادا کـە سـزای گچکـەو نیزیکـە، چ لـە دواڕۆژدا کـە سـزای دوورو گەورەیە.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەکانـی: (٢٣ - ٣٠)، واتـە: هەشـت (٨) ئایـەت، کـە ئاماژەیـەك بـە مووسـا (علیـە السـلام) و کتێبەکـەی و، گەلەکـەی (گەلـی بەنـوو ئیسـڕائیل) و

ئاماژەیەك بە دادگایی کردن و لێك هەڵاواردنی پاك و پیسان لە قیامەتدا و، سەرەنجڕاکێشانی مرۆڤەکان بۆ مێژووی گەلانی پێشوو و، دیاردەی زیندوو کرانەوەی زەوی بە ئاوی ئاسمان و، باسی پەلەکردنی کافران لە هاتنی قیامەت و سزاداو، وەڵامدرانەوەیان.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان کـە نیـوەی یەکەمی سـوورەتەکەیە و ئایەتەکانـی: (١ - ١٤)، دەگرێتە خـۆی، کـە تێیانـدا خـوا ﷻ باسـی هـەر سـێك بنـەڕەت و پایـە سـەرەکییەکەی ئیمـان و مسـوڵمانەتیی کردوە:

أ- قورئان و پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ لە ئایەتەکانی: (١ - ٣)دا.

ب- بەدیهێنەرو پەروەردگارو مشوورخۆربوونی خوا، بۆ گەردوون و تێکڕای پێکهاتەکانی گەردوون و، مرۆڤ، لە ئایەتەکانی: (٤ - ٩) دا.

ج- گیان کێشرانی مرۆڤان لەلایەن فریشتەی مەرگەوەو، زیندووکرانەوەیان لە ڕۆژی دوایی داو، سەر شۆڕبوونی تاوانباران لە قیامەتدا و، سەرزەنشتکرانیان لەلایەن خوا و، فریشتەکانەوە، لە ئایەتەکانی: (١٠ - ١٤) دا.

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾

﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ
بَلْ هُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٣﴾
ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ مَا
لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا شَفِيعٍ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٤﴾ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ
يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ
ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦﴾ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ
جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ وَجَعَلَ لَكُمُ

ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴿٩﴾ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ أَءِنَّا
لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدِۭۚ بَلۡ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ كَٰفِرُونَ ﴿١٠﴾ ۞قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ ثُمَّ
إِلَىٰ رَبِّكُمۡ تُرۡجَعُونَ ﴿١١﴾ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلۡمُجۡرِمُونَ نَاكِسُواْ رُءُوسِهِمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ رَبَّنَآ
أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴿١٢﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَأٓتَيۡنَا كُلَّ نَفۡسٍ
هُدَىٰهَا وَلَٰكِنۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ مِنِّي لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴿١٣﴾
فَذُوقُواْ بِمَا نَسِيتُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمۡۖ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡخُلۡدِ بِمَا
كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٤﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

(بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ئەلیف لام میم ﴿١﴾ دابەزاندنی ئەم کتێبە هیچ دوو دڵیی تێدانیە (کە) لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوەیە ﴿٢﴾ یان ئایا (بێبڕوایان) دەڵێن: (موحەممەد، بە ناوی خواوە) هەڵیبەستوە! (نەخێر وانیە)، بەڵکو ئەوە هەق و ڕاستە لە پەروەردگارتەوە، تاکو کۆمەڵێکی پێ بترسێنێ و هۆشیار بکەیەوە، کە بەر لە تۆ هیچ ترسێنەر و وریا کەرەوەیەکیان بۆ نەهاتوە، بەڵکو ڕێی ڕاست بگرن ﴿٣﴾ خوا ئەو کەسەیە کە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیان دایە، بە شەش ڕۆژ (شەش قۆناغ)ان، دروستکردوون و، دوایی چۆتە سەر تەخت (عەرش)، جگە لەوی هیچ سەرپەرشتیارێکتان نیەو، هیچ تکاکاریشتان نیە (بەبێ مۆڵەتی وی)، ئایا بیرتان ناکەوێتەوە! (کە جگە لە خوا هیچ کەس و هیچ شتێك شایستەی پەرستران نیە؟) ﴿٤﴾ (خوا) لە ئاسمانەوە هەتا زەمین سەرپەرشتیی کاروبار دەکات و بەڕێوەیان دەبات، دوایی لە (ماوە) ڕۆژێکدا، کە ئەندازەکەی هەزار ساڵە، بەپێی ژماردنی ئێوە، بۆ لای

بەرز دەبێتەوە ﴿٥﴾ ئا ئەو (خوای)ە، زانای پەنهان و ئاشكرایە، زاڵی میهرەبانە ﴿٦﴾ (خوا) ئەو كەسەیە كە هەمووو شتێكی بە باشترین شێوە دروستكردووەو، دەستپێكی دروستكردنی مرۆڤیشی لە قوڕەوە بووە ﴿٧﴾ دوایی وەچەكەی لە پوختەیەك لە ئاوێكی بێهێزو بێ بایەخ ڕەخساندوە ﴿٨﴾ دوایی ڕێك و پێكی كردو، لە ڕووحی خۆی فووی بە بەردا كردو، بیستن و چاوەكان و عەقڵەكانی بۆ ڕەخساندن، (بەڵام) بە كەمیی سوپاسگوزاریی دەكەن ﴿٩﴾ هەروەها (بێبڕوایەكان) گوتیان: ئایا كە لە زەوییدا ون بووین، (بووینەوە خاك و خۆڵ،) ئێمە لە نوێ دروست دەكرێینەوە؟ (بەڵێ بێگومان ئەوە ئاسانە)، بەڵام ئەوان بە دیداری پەروەردگاریان بێبڕوان، بۆیە نكوولیی لە زیندووكرانەوە دەكەن ﴿١٠﴾ بڵێ: فریشتەی مەرگ كە پێتان سپێرراوە (گیانتان بكێشێ)، دەتانمرێنێ، دواییش بۆ لای پەروەردگارتان دەگێڕدرێنەوە ﴿١١﴾ ئەگەر ببینی لە كاتێكدا تاوانباران لە لای پەروەردگاریان سەرشۆڕن، (بەسەر دانەواندنەوە وەستاون)، (دەڵێن:) پەروەردگارمان! (ئەوەی بە درۆمان دادەنا) دیتمان و بیستمان، بمانگێڕەوە (بۆ دنیا)، كردەوەی چاك دەكەین، ئێمە دڵنیاین (كە ئەوەی پەیامی خوا هێنابووی، ڕاستە) ﴿١٢﴾ ئەگەر ویستباشمان (ناچاركردن بەكاربێنین)، ڕاستە ڕێ بوونی خۆیمان، بە هەر كەسێك دەدا (بەڵام ئازادو سەرپشكمان كردوون) و بڕیاری چەسپاویش لەمنەوە درا، كە بێگومان دۆزەخ لە تێكڕای جینن و خەڵكی (كە بە ویستی ئازادانەی خۆیان بێبڕوا دەبن) پڕ دەكەم ﴿١٣﴾ (لە دواڕۆژدا پێیان دەڵێین:) لە سۆنگەی ئەوەوە كە دیداری ئەم ڕۆژانەتان لە بیركرد بوو، (ئازار) بچێژن، ئێمەش لە بیرمان كردن (پشتگوێمان خستن)و، ئازاری هەتا هەتایی بچێژن، بە هۆی ئەوەوە كە دەتانكرد (لە كوفرو خراپە) ﴿١٤﴾.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَعْرُجُ إِلَيْهِ): واتە: بۆ لای بەرز دەبێتەوە، (العُرُوجُ: ذَهَابٌ فِي صُعودٍ)، (عُرُوج): بریتیە لە ڕۆیشتن بۆ بەرزبوونەوە.

(نَسْلَهُ): (النَّسْلُ: الوَلَدُ لِكَونِهِ نَاسِلاً عَنْ أَبِيهِ، وَالنَّسْلُ: الإِنْفِصَالُ عَنِ الشَّيءِ)، (نَسْل): واتە: ڕۆڵە، لەبەر ئەوەی کە لە باب و دایکیەوە هاتوە، وەچە (نَسْل): بریتیە لە جیابوونەوە لە شتێك.

(سُلَالَةٍ): واتە: پوختە، وەرگیراو، دەگوترێ: (سَلَّ الشَّيءَ: مِنَ الشَّيءِ: نَزَعَهُ)، ئەو شتەی لەو شتە وەرگرت، واتە: لێی داڕنی، (وَسُلَّ الوَلَدُ مِنَ الأَبِ)، واتە: ڕۆڵەکە لە بابی وەرگیرا، بۆیەش بە ڕۆڵە گوتراوە: (سَلِيل)، واتە: کەسێك کە لە باب و دایکی وەرگیراوە.

(مَّهِينٍ): (أَي: ضَعِيف، الشَّيءُ المُمتَهَنُ الَّذِي لا يُعْبَأُ بِهِ)، (مَهِين): بە بێهێز دەگوترێ، چونکە لە (هَانَ)ەوە هاتوە، بە شتێکیش کە گرنگیی و بایەخیی پێ نەدرێ، دەگوترێ، کە لێرەدا مەبەست پێ تۆو (مني)ی پیاوە، کە منداڵی لێ دروست دەبێ، لەگەڵ هێلکۆڵەی ئافرەتدا.

(سَوَّىٰهُ): (تَسْوِيَةُ الشَّيءِ: جَعْلُهُ سَوَاءً)، (تَسْوِيَةُ الشَّيءِ): شتێك کە (تَسوِيَة) بکرێ، وەك یەکی لێ بکرێ، ڕێك بکرێ، (وَالسَّوِيُّ يُقَالُ: فِيما يُصَانُ عَنِ الإِفْرَاطِ وَالتَّفْرِيطِ)، (سَوِيٌّ): بە شتێك دەگوترێ کە لە زێدەڕۆیی و کەمتەرخەمیی بپارێزرێ.

(ضَلَلْنَا): (أَي: ضِعْنَا، فُقِدْنَا)، ون بووین، بزر بووین، (الضَّلَالُ: الغِيَابُ، وَمِنْهُ ضَلَالُ الطَّرِيقِ، وَالضَّالَّةُ: الدَّابَةُ الَّتِي ابتَعَدَت عَنْ أَهْلِهَا)، (ضَلَال): بە مانای ون بوون دێ، (ضَلَالُ الطَّرِيقِ) ڕێ ون کردنیش لەوەوە هاتوە، (ضَالَّة)، بە ئاژەڵێك دەگوترێ

کـە لـە خاوەنەکانـی دوور کەوتبێتـەوە، (**ضَالَّةُ الإِبِل**)، واتـە: ئـەو حوشـترەی کـە ون بـووە لـە خاوەنەکانـی و لـەو گاڕانـە کـە ئـەو یەکێـك بـووە لـە تاکەکانـی، دابـڕاوە.

(نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ ): واتـە: سـەریان شـۆڕکردوە، (**النَّكْسُ: قَلْبُ الشَّيءِ عَلَى رَأْسِهِ**)، (**نَكْس**): بریتیـە لـەوەی شـتێك لەسـەر سـەری ڕابگیـرێ، لاقـی لەسـەرێ بـن و سـەری لـە خـوارێ بـێ، ئنجـا (**ناكِسُ الـرَّأْس**)، واتـە: سەرشـۆڕ، کەسـێك کـە سـەری خـۆی شـۆڕ کـردوەو سـەری دانەوانـدوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (**بسـم اللـه الرحمـن الرحیـم**): بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە:

دەسپێکردنم بە ناوی خوایە، کە مەبەستی پێ چەند شتێکە:

١) ئەم کارە تەنها بۆ خوا دەکەم.

٢)- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەیکەم.

٣)- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەیکەم.

٤)- ئەم کارە بۆ هێنانە دی ڕەزامەندیی خوا ئەنجامی دەدەم.

﴿ الٓمٓ ﴾، ئەمانـە سـێ پیتـن: (ئەلیـف، لام، میـم)، لـەو بـارەوە پێشـتریش قسـەمان کـردوە، کـە:

أ - ئەمانە نهێنیی خوا ﷻ بوون، لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا ﷺ بەپێی ڕای هەندێك لە زانایان.

ب - یاخود بۆ ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ بووە، کە هۆشیاربە! ئەوە ئایەتت بۆ دادەبەزن.

**ج** - یاخود ئەو مانایەی کە زۆربەی زانایان گوتوویانە: خوای پەروەردگار دەیەوێ لەمیانی هێنانی ئەو پیتانەدا کە لە پێش بیست و نۆ (٢٩) لە سووڕەتەکانی قوڕئاندا هاتوون، کە جگە لە سووڕەتی (**العنكبوت**)و، سووڕەتی (**لقمان**)و، سووڕەتی (**القلم**)، لە هەموو بیست و شەش (٢٦) سووڕەتەکەی دیکەدا، یەکسەر دوای ئەم پیتانە باسی قوڕئان کراوە، کەواتە: خوا ﷻ دەیەوێ پێمان بفەرموێ: ئەو قوڕئانەی کە لەبەر دەستتان دایەو، ناتوانن قوڕئانێکی وا بێنن، بەڵکو دە (١٠) سووڕەتی بێنن، یان سووڕەتێکی وا بێنن، هەر لەو پیت و دەنگانە کە ئێوە لەبەر دەستتان دان و، پێیان دەنووسن و قسەیان پێ دەکەن، پێکهاتوە، ئنجا کە نەتانتوانی وێنەی قوڕئان، یان دە (١٠) سووڕەت، یان سووڕەتێکی بێنن، کەواتە: دڵنیابن کە خوا ﷻ لەو پیت و دەنگانە، ئەو فەرمایشتە بێ وێنەیەی خۆی بۆ ئێوە ناردوە.

﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ دابەزاندنـی کتێـب، هیـچ دوو دڵیـی تێدانیـە لـە پـەروەردگاری جهانییانەوەیـە.

وشـەی: (ٱلْكِتَٰبِ)، (أل)ی ناسـاندنی لەسـەرە ، کـە مەبەسـت لـە کتێـب، قوڕئانـە، دابەزاندنـی کتێبەکـە، کـە قوڕئانـە، دوو دڵیـی تێدانیـە، کـە لەلایـەن پـەروەردگاری جیهانییانەوەیـە.

﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ﴾، بەڵکـو ئایـا دەڵێـن: (موحەممـەد ﷺ) قوڕئانـی هەڵبەسـتوە (بـە نـاوی خـواوە؟) ﴿ بَلْ هُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ﴾، نـەك موحەممـەد هـەر هەڵـی نەبەسـتوە: بەڵکـو هـەر ئـەوە هـەق و ڕاسـت و چەسـپاوە و، لـە پەروەردگارتـەوە، ئـەی موحەممـەد ﷺ ! یـان: ئـەی هـەر کەسـێك کـە قوڕئـان دەخوێنـێ! ﴿ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ ﴾، تاکـو کۆمەڵێـك بترسـێنێ و وریـا بکەیـەوە کـە لـە پێـش تـۆدا هیـچ وریـا کـەرەوەو ترسـێنەریان بـۆ نەهاتـوە، ﴿ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴾، بەڵکـو ڕێـی ڕاسـت بگـرن، واتـە: بـەو نیزیکانـەو لـە پێـش تـۆدا، هیـچ ترسـێنەرمان نەنـاردوون، ئەگەرنـا هیـچ کۆمەڵـگاو ئۆمەتێـك نەبـووە،

کـە ڕەوانـە کراوێکـی تێـدا نەبـێ، واتـە: بـەو مێـژووەو بـەو سـاڵە نیزیکانـە کـە تـۆ تێیانـدا ڕەوانەکـراوی، لـە پێـش تـۆدا گەلـی عـەڕەب هیـچ پێغەمبەرێکیـان بـۆ نەهاتـوە، هەڵبەتـە زیاتـر گەلـی عـەڕەب دەگرێتـەوە، چونکـە یەکەمیـن دوێندراوانـی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ نەتـەوەی عـەڕەب بـوون، بـەڵام دوایـی هەمـوو مرۆڤایەتییـش دەگرێتـەوە، ئەگـەر هەمـوو مرۆڤایەتیـی بـە کۆمەڵێـك خەڵـك دابنرێـن، چونکـە لـە پێـش پێغەمبـەری خاتەمـدا ﷺ، لـە دوای عیسـاوە، نەزانـراوە هیـچ پێغەمبـەری دیکـە هاتبـن، پێغەمبەریـش ﷺ فەرموویەتـی: نیزیکترینـی پێغەمبـەران لـە منـەوە، عیسـای کـوڕی مەریەمـە، چونکـە لـە نێـوان مـن و ئـەودا، هیـچ پێغەمبـەری دیکـە نەبـوون.

ئنجـا پێغەمبـەری ئێمـە موحەممـەد ﷺ لـە سـاڵی (٦١٠)ی زایینیـی دا، کراوەتـە پێغەمبـەر و لـە (٥٧٠)دا لـە دایـك بـووە، عیسـاش ؊ ئەگـەر لـە یـەك (١)ی زایینیـی دا، یـان چەنـد سـاڵێك زووتـر، یـان درەنگتـر، بەپێـی ڕاجیایـی کـە لـە نێوانـی نەصرانییـەکان و مێـژوو نووسانیشـدا هەیـە، لـە دایـك بووبـێ، بـەڵای کەمـەوە لـە نێـوان لـە دایـك بوونـی عیسـا ؊و، ڕەوانەکرانـی موحەممـەددا ﷺ (٦١٠) سـاڵ مـاوە هەبـووە، ئنجـا خـوا ﷻ دوای ئـەوەی باسـی قوڕئـان و باسـی موحەممـەد ﷺ پێغەمبـەری خـۆی کـرد، کـە ئەرکەکـەی چییـە؟!

ئنجـا باسـی خـۆی دەکات ئـەو خوایـەی ئـەو قوڕئانـەی نـاردوەو، پێغەمبـەری ڕەوانـە کـردوە، دەفەرمـوێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ﴾، خـوا ﷻ ئـەو زاتەیـە کـە ئاسـمانەکان و زەویـی و ئـەوەی دەکەوێتـە نێوانیانـەوە، لـە شـەش ڕۆژانـدا، واتـە: بـە شـەش قۆناغـان هێناونـە دی، وشـەی: (أَيَّامٍ)، کـۆی (يَوم)ە، لـە زمانـی عەڕەبییـدا (يَـوم)، واتـە: کاتێکـی دیاریکـراو، ئنجـا لـە عـورف و بـاوی ئێمـەدا (يَـوم) واتـە: شـەو یـان ڕۆژ، یاخـود شـەو و ڕۆژ پێکـەوە، کـە بیسـت و چـوار (٢٤) سـەعاتن، بـەڵام لـە بەکارهێنانـی زمانـی عەڕەبیـی و لـە بەکارهێنانـی قوڕئانیشـدا: (يَـوم) وەك چـۆن ئـەو بیسـت و چـوار (٢٤) سـەعاتە، کـە شـەو و ڕۆژ پێـك دێنـن، دەگرێتـەوە، کاتـی ڕەهـاش دەگرێتـەوە، وەك عـەڕەب

دەڵێن: (یَومٌ لَكَ، وَیَوْمٌ عَلَیكَ)، یان خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ ...﴿١٤٠﴾﴾ آل عمران.

ئنجا لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾، دوایی خوا ﷻ چووە سەر تەخت (عەڕش)، واتە: چووە سەر تەختی خۆی، ئەوەشمان بە تایبەت لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا و، لە تەفسیری سوورەتی (**الأنعام**)دا و، لە تەفسیری سوورەتی (**یونس**)دا، باسکردوە، چوونە سەر عەڕشی خوا ﷻ و، بەرزبوونەوەی خوا ﷻ بۆ سەر عەڕش، چۆنە؟ ﴿مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيٍّ وَلَا شَفِيعٍ﴾، ئێوە جگە لەو (جگە لە خوا) هیچ سەرپەرشتیار و شەفاعەتکارو تکاکارێکتان نیە، واتە: هیچ کەس سەرپەرشتییتان ناکات جگە لە خوا ﷻ و، هیچ کەسیش تکاتان بۆ ناکات بە بێ مۆڵەتی خوا ﷻ،﴿أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ﴾، ئایا بیر ناکەنەوە؟ بیرتان ناکەوێتەوە؟ پەند وەرناگرن؟

﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ﴾، کاروبار هەڵدەسووڕێنێ لەسەرێوە بەرەو خوارێ، لە ئاسمانەوە، بەرەو زەویی، کاروبار هەڵدەسووڕێنێ، واتە: سەرێ و خوارێی گەردوون، سەروو خوارێی دروستکراوەکان، لە ژێر چاودێریی سەرپەرشتیی خوا دایە، ﴿ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾، دوایی ئەو کار بەڕێوەبردنە، یاخود دەرەنجامی ئەو کارە بۆ لای وی بەرز دەبێتەوە، لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی هەزار (١٠٠٠) ساڵە، بە پێی ژماردنی ئێوە لەوەی کە ئێوە دەیژمێرن، واتە: ڕۆژێك کە دەرەنجامی کاروبارەکان بۆ لای خوا ﷻ بەرز دەبێتەوە، ئنجا ئایا مەبەست پێی ڕۆژی دواییە؟ ئایا مەبەست پێی هەر ماوەی هەزار ساڵێکی ئێمەیە؟ گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ دەفەرموێ: لە ڕۆژێکدا دەرەنجامی کاروبارەکان بۆ لای خوا بەرز دەبێتەوە، دەرەنجامی ئەو کاروبار بەڕێوەبردنە، کە ئەندازەکەی بەپێی ئەوە کە دەیژمێرن هەزار ساڵە، ﴿ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾، ئا ئەوە زانای پەنهان و ئاشکرایە و، زاڵی میهرەبانە.

﴿ ٱلَّذِىٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَىۡءٍ خَلَقَهُۥ ﴾، خـوا ﷻ ئـەو زاتەیـە، کـە هـەر شـتێکی دروسـتیکردوە، بـە چاکیـی دروسـتیکردوە، بـە چاکتریـن شـێوە دروسـتیکردوە، ﴿ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴾، مرۆڤیشـی دەسـتپێکردوە، دەسـتپێکی دروسـتکردنی مرۆڤیشـی لـە قوڕێـوە هێنـاوە، واتـە: جەسـتەکەی، ﴿ ثُمَّ جَعَلَ نَسۡلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴾، دوایـی وەچەکەیشـی گێـڕاوە لـە ڕاپازنراوێـك لـە ئاوێکـی کـەم بایـەخ، لـە ئاوێـك کـە بـە قێـزەون و بـە کـەم تەماشـا دەکـرێ، کـە تـۆوی پیـاو و ئافرەتـە و مـرۆڤ ئەگـەر ببینـێ، زۆر بێـزی لـێ دەبێتـەوە، قێـزی لـێ دەبێتـەوە، کـەم بایەخـە، شـتێکی بێهێـزە، ﴿ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ﴾، دوایـی خـوا ﷻ ئـەو مرۆڤـەی (جەسـتەی ئـەو مرۆڤـەی)، ڕێکخسـت، تێـرو تـەواوی کـرد، واتـە: لـە سـکی دایکیـدا، پێشـێ نوتفەیـە، ئنجـا دەبێتـە عەلەقـە و، دوایـی دەبێتـە **موضغـە** و، دوایـی دەبێتـە ئێسـقان و، دوایـی ئێسـقانەکە بـە گۆشـت دادەپۆشـرێ، ئنجـا دوای ئـەوە ئامادەیـی ئـەوە پەیـدا دەکات ڕووحـی بـە بـەردا بکـرێ، ﴿ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ﴾، لـەو ڕووحە تایبەتییـەی دروسـتکراوێکی تایبەتیـی خوایـە، فـووی پێداکـرد، ڕووحـی خسـتە نێـو جەسـتەی ئـەو کۆرپـەوە، ﴿ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ ﴾، دوایی بیسـتن و چـاوەکان و عەقـڵ و دڵەکانیشـی بـۆ ڕەخسـاندن، ﴿ قَلِيلًا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴾، بـە کەمیـی سوپاسـگوزاریی دەکـەن، یانـی: (**شُكراً قَلِيلاً تَشكُرُون**)، سوپاسـگوزارییەکی کەمـی خـوا ﷻ دەکـەن، ئـەم (ما)یـە، زیـاد کـراوە بـۆ جەختکردنـەوەی کەمییەکـە، دەنـا دەیتوانـی بفەرمـوێ: (**قَلِيـلاً تَشْـكُرُون**)، کـەم سوپاسـگوزاریی دەکـەن، بـەڵام: ﴿ قَلِيلًا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴾، ئەمـە بـۆ زیاتـر جەختکردنـەوەی کەمیـی سوپاسـگوزاریی مرۆڤەکانـە بـۆ خـوا ﷻ.

ئنجـا خـوا ﷻ هەنـدێ قسـان دێنـێ کـە بێبڕوایـەکان دەیانگوتـن: ﴿ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِى ٱلۡأَرۡضِ ﴾، گوتیـان: ئایـا ئێمـە کاتێـك لـە زەوییـدا ون بوویـن، واتـە: بووینـەوە خـاك و خـۆڵ و ئێسـقانی پڕتـووکاو، ﴿ أَءِنَّا لَفِى خَلۡقٍ جَدِيدٍۭ ﴾، ئایـا ئێمـە لـە نـوێ دروسـت دەکرێینـەوە؟ ﴿ بَلۡ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ كَٰفِرُونَ ﴾، هیـچ بەڵگەیەکیـان

بەدەستەوە نیە، (کە زیندوو ناکرێنەوە بەڵکو ئەوان بە دیداری پەروەردگاریان) بێبڕوان، گرفتەکەیان بێبڕواییە بە دیداری پەروەردگار، ئەگەرنا ئەوە کە مرۆڤ جەستەکەی دەبێتەوە بە خاك و، ئێسقانی پرتووکاوو لە زەوییدا، ون دەبێ، بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی خوا ﷻ زیندووی ناکاتەوە، بەڵکو خوایەك کە لە نوێ پەیدای کردوە، دەتوانێ دووبارەشی بکاتەوە، بەڵکو مرۆڤێك کە شتێك دروست دەکات، دوایی لێی دەشکێ، لێی تێکدەچێ، دەتوانێ وەك خۆی، بەڵکو چاکتریش دروستی بکاتەوە.

﴿قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ﴾، بڵێ: فریشتەی مردن کە پێتان سپێردراوە، دەتانمرێنێ، ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ﴾، دوایی بۆ لای پەروەردگارتان دەگێڕدرێنەوە، ئەمە لە ڕاستیی دا ترساندن و هۆشداریی پێدانی بێبڕواوایانە، کە ئێوە وەك چۆن ژیانەکەتان بە دەست خۆتان نیە، کە چەند دەژین و، کەی کۆتایی پێ دێ، بەڵکو خوا ﷻ فریشتەیەکی عایدی ئەو کارەتان کردوە، کە (**مَلَكُ المَوت**)ە، کە لە هەندێك کتێباندا (عیزرائیل) گوتراوە، بەڵام ئەوە نە لە قورئان، نە لە سوننەتدا نەهاتوە، بۆیە وا باشترە هەر (**مَلَكُ المَوت**) بەکاربهێنرێ، فریشتەی مەرگ، فریشتەی مردن، ئێوە نە ئەندازەی ژیانتان، نە کاتی مردنتان بە دەست خۆتان نیە، کەواتە: بزانن کە ئێوە خاوەنێکتان هەیە، مشوورخۆرێکتان هەیەو، هێناونی و لاشتان دەبات، کەواتە: دەبێ ئاگاتان لەو مشوورخۆر و پەروەردگارو بەدیهێنەرەتان بێ، ئەو چۆنی پێ خۆشە، چۆن لێتان ڕازیی دەبێ، بەو شێوەیە ژیان بەرنە سەر، ئەگەر عاقڵبن وا دەکەن، ئەو خاوەنتانەو، ئەو هێنەرتانە، ئەو لابەرتانە، ئەو ژیێنەرتانە، ئەو مرێنەرتانەو زیندووکەرەوەتانە.

﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾، ئەگەر تۆ ببینی کاتێك کە تاوانبارەکان سەری خۆیان شۆڕ کردوە لە لای پەروەردگاریان، سەری خۆیان دانەواندوە، ئەگەر تۆ ئەو دیمەنە ببینی! دیمەنێکی زۆر سامناك دەبینی،

وەڵامی ئەگەر (لَو) قرتێندراوە، چونکە بە ڕەوت دیارەو، بۆ ئەوەشە کە زەین بە هەر لایەکدا بچێ، یانی: ئەگەر ئەوە ببینی، دیمەنێکی سامناك دەبینی، ئەگەر ئەو ڕۆژە ببینی، ئنجا بۆت دەردەکەوێ ئەو تاوانبارانە چەندە بەهەڵەدا چوونە! ئەگەر ئەوە ببینی ئنجا زۆر سوپاسی خوا دەکەی، کە تۆی خستۆتە سەر ڕاستە شەقامێك کە لە دنیادا سەربەرزت دەکات و، لە دواڕۆژیشدا سەر بەرزو ڕوو سوورت دەکات، نەك سەرشۆڕو سەردانەوێنەر.

ئنجا ئایا ئەو تاوانبارانە کە سەری خۆیان دانەواندوە لە لای پەروەردگاریان، چی دەڵێن؟ ﴿رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا﴾، پەروەردگارمان! ئەوە دیتمان و بیستمان، یانی: ئەوەمان دیت کە نکووڵییمان لێدەکردو، هەروەها بیستیشمان ئەوەی نکووڵییمان لێدەکردو لە پێغەمبەرانمان (**عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام**) دەبیست، کە پەیامی تۆ بوو، کەچی ئێمە بڕوامان پێ نەهێنا، بەڵام ئێستا لێرەدا هەم دیتمان و هەم بیستمان، دیتنی پێش خستوە، کە لە هەموو قورئاندا، تەنیا لێرەدا دیتن پێش بیستن خراوە، ئەویش لەبەر ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا دیمەنەکان بەر لەوەی ببیسترێن، دەبینرێن، لەبەر ئەوەی دیتنی دیمەنە سامناکەکانی ڕۆژی دوایی، زۆر گرنگترو لە پێشترە، لە بیستنی هەواڵەکان و دەنگەکان، ﴿فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا﴾، ئێستاش بمانگێڕەوە، بمانگێڕەوە بۆ ژیانی دنیا، یان: جارێکی دیکە بمانخەوە نێو تاقیکردنەوە، ﴿نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا﴾، کردەوەی باش دەکەین، ﴿إِنَّا مُوقِنُونَ﴾، بە دڵنیایی ئێمە بڕوای پتەومان هەیە، ناکرێ لە قیامەتیش هەر بڕوا نەهێنن، دوای ئەوەی هەموو شتێك بە چاوی سەر دەبینن، دەڵێن: ئێستا ئێمە هیچ دوو دڵ نین و، دڵ لە دڵ نادەین و، دڵنیایین، کە تۆ هەقی و پێغەمبەرانی تۆ هەق بوون، ڕۆژی دوایی هەقە، ئێستا دڵنیایین! بەڵام ئەوە هەر قسەیەکە، وەك لە سووڕەتی (**المؤمنون**)دا، خوا ﷻ لە وەڵامی کەسێکدا کە دەڵێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ رَبِّ ٱرۡجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّيٓ أَعۡمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكۡتُۚ﴾، (فەرموویەتی): ﴿كَلَّآۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَاۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ

﴿ يُبۡعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾، واتـە: کاتێـك یەکێکیـان مردنـی دەگاتـە سـەری، دەڵـێ: پـەروەردگارم! بمگێڕنـەوە، بەڵکـو لـەوەدا کـە بەجێـم هێشـتوە، (کـە ژیانـی دنیایـە)، کـردەوەی بـاش بکـەم، یاخـود ئـەو کـردەوە باشـانەی وازم لێهێنـاون، بچـم ئەنجامیـان بـدەم.

(خـواش ﷻ دەفەرمـوێ:) نەخێـر، ئـەوە قسـەیەکە هـەر خـۆی دەیـکات و، لـە پشـتانەوە پەردەیـەك هەیـە، تاکـو ڕۆژی زینـدوو کرانـەوە، یانـی: تـازە نایەنـەوە بـۆ دنیـاو چوونـە قۆناغێکـی دیکـەوە، کـە قۆناغێکـی ڕاگـوزەرەو، قۆناغێکـی کاتییـە، کـە قۆناغـی بەرزەخـە، تاکـو ڕۆژی لێپرسـینەوەو زیندووکرانـەوەو سـزاو پاداشـت دێتـە پێـش، کـە ڕۆژی قیامەتـە.

﴿ وَلَوۡ شِئۡنَا لَأٓتَيۡنَا كُلَّ نَفۡسٍ هُدَىٰهَا ﴾، ئەگـەر ویستباشـمان ڕاسـتە ڕێ بوونمـان بـە هەمـوو کەسـێك دەدا، واتـە: ئەگـەر ویسـتبامان بـە تۆبزیـی بیانکەینـە ئیمانـدار، هەمـوو مرۆڤێـك هیدایـەت و ڕاسـتە ڕێ بوونییمـان پـێ دەدا، ﴿ وَلَٰكِنۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ مِنِّي ﴾، بـەڵام ویسـتمان ئازادیـان بکەیـن، سـەرەنجام بڕیـار لەمنـەوە چەسـپا، ئنجـا بڕیارەکـەو فەرمایشـتەکە چۆنـە؟ ﴿ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی دۆزەخ لـە جنـدو مرۆڤـان تێکڕایـان پـڕ دەکـەم، ﴿ فَذُوقُواْ بِمَا نَسِيتُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَآ ﴾، ئنجا پێیـان دەڵێیـن: بیچێـژن (سـزای دۆزەخ بچێـژن) بـە هـۆی ئـەوەوە کـە دیـداری ئەمڕۆتـان لـە بیـر چـوو، دیـداری ئەمڕۆتـان نادیدەگـرت و فەرامـۆش کـرد، ﴿ إِنَّا نَسِينَٰكُمۡ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـەش ئێوەمـان لـە بیـر چـوو، یـان نادیـدە گـرت و، فەرامۆشـکرد، ئەگەرنـا خـوا ﷻ هیـچ شـتێکی لەبیـر ناچـێ: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّٗا ﴿٦٤﴾ ﴾مریم، واتـە: پـەروەردگارت هەرگیـز شـتی لەبیـر ناچـێ، یانـی: واتـان مامەڵـە لەگـەڵ دەکەیـن، وەك کەسـێك کـە شـتێکی لـە بیرچـوو بـێ، یانـی: ئێـوە پشـتگوێ دەخەیـن و فەرامـۆش دەکەیـن، ﴿ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡخُلۡدِ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾، سـزای هەمیشـە مانـەوەش بچێـژن، هەمیشـە مانـەوە لـە دۆزەخدا، بەهـۆی ئـەوەوە کـە دەتانکـرد، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە دەتانکـرد لە کوفـرو لـە خراپەو تـاوان، ئێسـتا سـزای هەرمـاو بـوون (لـە دۆزەخـدا) بچێـژن، چونکـە بابـای بێبـڕوا و

تاوانبار بە تەمایە، ئەگەر تاکو ملیۆنان ساڵ، ملیاران ساڵ بژی، لەسەر قەناعەت و بڕوایەکەی خۆی دەمێنێتەوە، بۆیەش بەپێی نیەتەکەی خۆی، بەپێی ئەوەی عەزمی لەسەر جەزم کردووە، دڵی خۆی لەسەر ساغکردۆتەوە، کە بمێنێتەوە لەسەر بێبڕوایی خۆی، خواش سبحانه وتعالى سزایەکی هەتا هەتایی و نەبڕاوەی دەدا.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

دابەزێنرانی قورئان هیچ دوو دڵیی تێدانیە، كە لە پەروەردگاری جیهانییانەوەیە، وەك بێبڕوایان دەڵێن: هەڵبەستراو نیەو، هەق و چەسپاوە، تاكو پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد ﷺ، ئەو خەڵكەی كە پێشتر ترسێنەرو هۆشیاركەرەوەیان بۆ نەهاتوە، بیانترسێنێ و هۆشیاریان بكاتەوەو، لە خەوی بێئاگایی بێداریان بكاتەوە:

خوا دەفەرموێ: ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۚ بَلۡ هُوَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٖ مِّن قَبۡلِكَ لَعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ ۝٣﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، ئەلیف لام میم، دابەزاندنی كتێب هیچ دوو دڵیی تێدا نیە، لە پەروەردگاری جیهانییانەوەیە. ﴿تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە، دەبێتە نیهاد (مبتدأ)، ﴿لَا رَيۡبَ فِيهِ﴾، (رَیب) بە مانای دوو دڵیی دێ.

﴿مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، ئەمە گوزارە (خبر)ی نیهاد (مبتدأ)ەكەی پێشییە ﴿تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، لە سوورەتی (البقرة)دا ئەم تەعبیرە ئاوا هاتوە: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢﴾، واتە: ئەو كتێبە هیچ دوو دڵیی تێدانیە، ڕێنماییە بۆ پارێزكاران، بۆچی لێرەدا دەفەرموێ: ﴿تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾؟.

هـۆكاری جیاوازییەكەیـان ئەوەیـە كـە ئـەم سـوورەتە لـە نێـو كافرەكانـدا دابەزیوە، بۆیـە خـوا ﷻ بـۆ نەهێشـتنی دوو دڵیـی لـە دابەزاندنـی ئـەم كتێبـەدا، دەیبەسـتێتەوە بـەوەوە كـە لـە پـەروەدگاری جیهانییانـەوە دابەزیـوە، بـەڵام لـە سـوورەتی (**البقـرة**) دا، چونكـە سـوورەتی (**البقـرة**) بـۆ كۆمەڵگایەكـی مسـوڵمان دابەزیـوەو، لـە نێـو مسـوڵمانان دا دابەزیـوە، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝ ﴾، ڕێنماییـكارە بـۆ پارێـزكاران، بـەڵام لێـرەدا دەفەرمـوێ: دابەزێنرانـی ئـەم كتێبـە هیـچ دوو دڵیـی تێدانیـە، كـە لـە پـەروەردگاری جیهانییانەوەیـە، واتـە: ئـەم كتێبـە بـۆ هەمـوو خەڵكـی هاتـوە، لـە لایـەن بەخێوكـەرو، ژیێنـەرو، مرێنـەرو، پـەروەردگارو، مشـوورخۆری هەمـوو جیهانییانـەوە.

**٢)**- ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ﴾، یان ئایا دەڵێن: هەڵیبەستوە؟ وشەی: ﴿ أَمْ ﴾، لە زمانی عەرەبیی دا، لە (بَل)، لە هەمزەی پرسیاركردن (أ) پێك دێ، واتە: (**بَل أَ يَقُولُونَ**)، بەڵكو ئایا دەڵێن: ﴿ ٱفْتَرَىٰهُ ﴾، هەڵیبەستوە؟ واتە: موحەممەد ﷺ قورئانی هەڵبەستوە؟ ئەم پرسیاركردنە، پێی دەگوترێ: پرسیاركردنی سەرسوڕهێنان (**الإستِفهامُ التَّعجِيبِي**)، بۆیەش بە (**فعل المضارع**) هێناویەتی، ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ﴾، بۆ ئەوەی وێنەكە بخاتە بەرچاو، هەروەها لەبەر ئەوەش كە ئەو قسەیەی ئەوان كاتی خۆی كردوویانە، لە هەموو چاخ و سەردەمەكاندا، ئەو قسە پووچانە بەرانبەر بە موحەممەدو ﷺ بەرانبەر بەو كتێبەی خوا بۆی دابەزاندوە، دووبارە دەبنەوە، بۆیە بە ڕێژگە (صیغة)ی (**مضارع**) هاتوە.

**٣)**- ﴿ بَلْ هُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ﴾، بەڵكو ئەو هەقە لە پەروەردگارتەوە، ﴿ بَلْ ﴾، لێرەدا (**للإِضْرَاب الإِبْطَالِي**)، بۆ گواستنەوەی پووچەڵكردنەوەییە، ئەم قورئانە نەك هەڵنەبەستراوە، بەڵكو چەسپاوەو هەقە لە پەروەردگارتەوە، هەق بریتیە لە شتی چەسپاو، ڕاست، نەگۆڕ.

**٤)**- ﴿ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ ﴾، بۆ ئەوەی كۆمەڵێك بترسێنی، وریا بكەیەوە، لە پێش تۆدا هیچ ورپاكەرەوەو هۆشیاركەرەوەو هیچ ترسێنەریان بۆ نەهاتوە، (**قَوم**) لە ﴿ لِتُنذِرَ قَوْمًا ﴾دا، بریتیە لە كۆمەڵە خەڵكێكی زۆر، كارێك كۆیان بكاتەوە،

ئنجا ئەو كارەی كۆیان دەكاتەوە، دەبێتە ڕاگیركەریان، كە بە تەئكید لێرەدا مەبەست پێی گەلی عەڕەبە، كە پێغەمبەر ﷺ یەكەمجار لە نێو ئەواندا ڕەوانە كراوە، هەندێكیش گوتوویانە: (قَوم)، لێرەدا هەموو مرۆڤایەتیی دەگرێتەوە، چونكە هەموو مرۆڤایەتیی بەو ئیعتیبارەی هەموویان بەندەی خوان و، هەموویان پێویستییان بە هیدایەتی خوایە، وەك كۆمەڵێك بن وایە، ئنجا ئایا بۆچی موحەممەد ﷺ بۆیان ڕەوان كراوە، تاكو وریایان بكاتەوەو بیانترسێنی؟.

٥)- ﴿لَعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ﴾، بەڵكو ڕێی ڕاست بگرن.

وەك گوتمان: لێرەدا ڕای ڕاسترو بەهێزتر ئەوەیە كە مەبەست پێی نەتەوەی عەڕەبە، زانایان باس دەكەن، دەڵێن: نەتەوەی عەڕەب سێ بەشن: **(العرب البائدة، العرب العاربة، العرب المستَعْرَبة)**.

**١/ (العرب البائدة)**: عەڕەبیی فەوتاو، وەك گەلی عادو ثەموودو، ئەوانەی خوا لە بەینی بردوون.

**٢/ (العرب العاربة)**: ئەو عەڕەبانەی كە هەر لە ئەصڵدا عەڕەب بوون، نەك گەلێكی دیكە بووبن و فێری زمانی عەڕەبیی بووبن، ئەمانیش پێیان دەگوترێ: قەحطانییەكان، كە لە حیجاز بوون، وەك ئەوس و خەزرەج و طەی، ئەوانەی دوای (**سَيلُ العَرِم**) كە بەسەر سەبەءدا هاتوە، بڵاوبوون.

**٣/ (العرب المستعربة)**: عەڕەبە عەدنانییەكان، ئەوانە ڕۆڵەكانی عەدنانن، كە ئەویش لە وەچەی ئیسماعیلە عليه السلام، ئیسماعیلیش كوڕی ئیبراهیمە عليه السلام، خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێ: ﴿وَاذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا ﴿٥٥﴾﴾مريم.

ئیسماعیل بەڵێ پێغەمبەر بووە، واتە: (**نبي**) بووەو، (**رسول**)یش بووەو، (**نبيّ**) بە هەردووك واتایەكەی (**فعيل**)ی بە مانای (**فاعل**) و (**فعيل**)ی بە مانای (**مفعول**)، واتە: هەواڵدەریش بووەو هەواڵپێدراویش بووە، هەروەها ڕەوانەكراوی

خـواش بـووە، بـەڵام پەیامەکـەی تایبـەت بـووە بـە خەڵکـە نیزیکەکانـی خـۆی و، بـە ماڵـە خەزوورانیـی، لـە هـۆزی جورهـوم و ئەوانـی دیکـەش، ئنجـا عـەرەب بە گشـتیی: خەڵکـی یەمـەن و یەمامـەو بەحرەیـن و، ئەوانـی دیکـەش کـە دوورگـەی عەرەبیـی کـۆی کردوونـەوە، هەموویـان گەڕاونـەوە بـۆ عەرەبـی عەدنانیـی و قەحطانیـی، ئەوانـەی کـە مـاون و، ئەوانـەش هیـچ کامیـان پێغەمبەرێکـی نیزیکیـان بـۆ نەهاتـوە، کـە نیزیـك بـێ لـە ڕۆژگاری موحەممـەدەوە ﷺ، ئـەم زانیارییانـە (**محمـد الطاهـر بـن عاشـور**)، هێناونـی[1].

کـە دەفەرمـوێ: ﴿لِتُنذِرَ قَوْمًا﴾، واتـە: لـە دەسـتپێکەوە ئـەوان وریـا بکەیـەوەو بترسـێنی، دوایـی کـۆی مرۆڤایەتییـش، بۆیـە ئـەوە لەگـەڵ گشـتگیربوونی پەیامـی پێغەمبـەردا ﷺ تێکناگیـرێ، چونکـە موحەممـەد ﷺ کـە لـە سـەرەتاوە هاتـوە، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾﴾ **الشعراء**، دوایـی فەرموویەتـی: ﴿وَإِنَّهُ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ﴿٤٤﴾﴾ **الزخـرف**، بـەڵام دوایـی فەرموویەتـی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ ﴿٢٨﴾﴾ **سبأ**، دیـارە پێغەمبـەر (**محمـد**) ﷺ لـە بازنـەی تەسـکەوە دەسـتی پێکـردوە: خـۆی و خزمەکانـی، بەڵکـو پێشـێ خـۆی و خێزانـی: خەدیجـەو کچەکانـی و، زەیـدی کـوڕی حاریسـەو عەلـی کـوڕی ئەبـی تاڵیـب، دوایـی هـاوەڵ و دۆسـتە نیزیکەکانـی، وەك ئەبـوو بەکـری صیددیـق و ئەوانـی دیکـە، دوایـی هـۆزی قورەیـش، دوایـی هۆزەکانـی دیکـە، پاشـان هەمـوو گەلـی عـەرەب، دواییـش هەمـوو مرۆڤایەتیـی، بازنـە بـە بازنـە، گرنـگ ئەوەیـە هـەر لـە مەککـەوە، خـوا ﷻ هەواڵیـداوەو، ڕایگەیانـدوە کـە موحەممـەد ﷺ کۆتایـی پێغەمبـەران و ڕەوانـە کراوانـی خوایـە، بـۆ هەمـوو بەشـەر، وەك فەرموویەتـی:

أ- ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴿٢٨﴾﴾ **سبأ**.

واتە: تۆمان نەناردووە مەگەر بۆ تێکڕایی خەڵك موژدەدەر و ترسێنەری.

---

(١) التحرير والتنوير: ٢١، ص٢٠٩.

ب- هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾الأنبياء.

واتە: تۆمان نەناردووە مەگەر بە بەزەیی بۆ جیهانییان.

ج- هەروەها فەرموویەتی: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ١٥٨ ﴾الأعراف، بلێ: ئەی خەڵکینە! من پێغەمبەری خوام بۆ تێکڕاتان، دواییش پەیامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە نێو هەموو مرۆڤایەتیی دا بڵاو بۆوەو، ئێستاش جگە لەوەی کە یەك لەسەر چواری مرۆڤایەتیی لەسەر ئیسلام حیسابەو بە مسوڵمان دادەنرێن، سێ لەسەر چوارەکەی دیکەش، کەم و زۆر دەنگوباسی پێغەمبەری کۆتایی و پەیام و بەرنامەکەییان پێگەیشتوە، بەڵام بێگومان دەنگ و باسی ئیسلام پێگەیشتن و ڕاست و دروست تێگەیشتنی، دوو شتی جیاوازن و، مەرج نییە هەرکەس دەنگ و باس و هەواڵی ئیسلامی پێگەیشتبێ بەڵگەی لەسەر تەواو کرابێ و بیانووبڕاو کرابێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**خستنە ڕووی چەند وەسف و کارێکی خوای بەرزو بێ وێنە، وەك: دروستکردنی گەردوون (ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیان)و، چوونە سەر تەخت و، بەڕێوەبردنی کاروبار لە ئاسمانەوە بۆ زەمین و، دروستکردنی هەموو شتێك بە باشترین شێوەو، دروستکردنی مرۆڤ لە قوڕ، پاشان لە پوختەیەکی تۆو، (واتە: وەچەکەی)و ڕێکخستنی جەستەی و دوای تێرو تەواو بوونی جەستەی، ڕووح بەبەردا کردنی:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا شَفِيعٍ ۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٤﴾ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦﴾ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە: لە چواردە بڕگەدا:**

١)- ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ﴾، خوا ﷻ ئەو کەسەیە، ئەو زاتەیە، کە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، لە شەش ڕۆژاندا هێناونە دی.

واتە: خوا ﷻ کۆی گەردوونی بە سەرو خوارییەوەو، بە سەرجەم پێکهاتەکانیەوەو ئەوەی دەکەوێتە نێوان سەرو خواریش، کە ئاسمان و زەویین، هەمووی بە شەش قۆناغ هێناونە دی، پێشتریش گوتوومانە: (أَیَّام)، کە کۆی (یَوم)ە، لە زمانی عەرەبییدا، یانی: ماوەیەك لە کات، بەڵام بەپێی عورف و

باوی ئێمەی مرۆڤ لەسەر زەوی، (يَوم): یان بە ڕۆژ دەگوترێ، یاخود بە شەوو ڕۆژان دەگوترێ، کە سەرجەم بیست و چوار (٢٤) سەعاتن، ئەویش بریتیە: لە سووڕێکی زەوی بە دەوری خۆی دا، لە بەرانبەر خۆردا، کە شەوو ڕۆژ پەیدا دەبن، ئنجا جاری وایە هەر بە ڕۆژەکەشیان گوتوە: (يَوم)، جاری واش هەیە کە گوتراوە: (يَوْمٍ وَلَيلَة)، شەوو ڕۆژ، جاری واش هەیە بۆ ڕۆژەکە (نَهار) بەکارهاتوەو بۆ شەوەکە شەو (لَيل) لە زمانی عەڕەبییدا، جاری واش هەیە (يَوم) بە شەوو ڕۆژەکە گوتراوە، بەڵام لە بەکارهێنانی قورئانداو لە ئەسڵی زمانی عەڕەبییدا، (يَوم)، یانی: ماوەیەك لە کات، دەگوترێ: (يَومٌ لَكَ، وَيَوْمٌ عَلَيْكَ)، ماوەیەك، جاری وا هەیە بۆ تۆیە، تۆ تێیدا زاڵ دەبی، تۆ تێیدا هاتت دەبێ، ماوەیەکیش تێیدا شکست دەخۆی و نەهاتت دەبێ، تووشی زیان و ناڕەحەتیی دەبی، هەروەها گوتراوە: (الأَيَّامُ دُوَل)، واتە: ڕۆژەکان دەستاو دەستیان تێدا دەکرێ، دەستاو دەستی دەستەڵات، دەستاو دەستی سەروەت و سامان، (فخر الدين الرازي) لە تەفسیرەکەی خۆی (التفسير الكبير)دا[1]، کە بە (مفاتيح الغيب) ناسراوە، دەڵێ: خوا ﷻ کە دەفەرموێ: بە شەش قۆناغان، ئەوە ئاماژەیە بۆ شەش حاڵان، چونکە ئاسمان و زەویی و ئەوەی نێوانیان، ئەوانە: سێ شتن، ئنجا هەر کامێکیان حاڵەتێکی تایبەتیی هەبووە، کەواتە: (٣ + ٣ = ٦)، یانی: سیفەتی ئاسمان و، سیفەتی زەمین و، سیفەتی ئەوەی دەکەوێتە نێوانیان، ئەوە سێ، خۆشیان سێ، ئەوە شەش، دەڵێ:

(وَإلاَّ قَبْلَ السَّمَوَاتِ، لَمْ يَكُن لَيْلٌ وَلاَ نَهَار)، پێش ئەوەی خوا ﷻ ئاسمانەکان بێنێتە دی، (زەوییش هەر دەچێتەوە نێو ئاسمانەکان)، ئەو کاتە نە شەوگار هەبووەو، نە ڕۆژگار.

قسەکەی جوانە، هەرچەندە زۆرێك لە توێژەرەوان و مانا لێکدەرەوانی قورئان، پێیان وابووە: ئەو دەقەی کە دەڵێ: خوای پەروەردگار فلان شتەی لە یەك

---

(١) ج٢٥، ص١٤٥.

شەمداو، فڵان شتەی لە دووشەم و، ئەو شتانەش لە ڕۆژەكانی دیكەی هەفتەدا، خوڵقاندوون، وا دەزانن ئەو كاتە شەممەو یەك شەم و دوو شەم و تاكو جومعە هەر هەبوون!! كە لە ڕاستییدا ئەوە بیركردنەوەیەكی سادەو سەر كێڵانەیە، چونكە دوای ئەوە ڕۆژەكانی هەفتە پەیدا بوون، كە شەوو ڕۆژ پەیدابوون، ئنجا دوای ئەوەش شەوو ڕۆژ پەیدا بوون، كە زەوی خولاوەتەوە بە دەوری خۆیدا، لە بەرانبەر خۆردا، كە خۆر هەبووەو، ئاسمانەكان هەبوون، كەواتە: بەر لەوەی ئاسمانەكان و زەوی ببن، لە ڕاستییدا ڕۆژ بەو چەمك و واتایەی ئێستای ئێمە كە هەیە، بوونی نەبووە، كەواتە: مەبەست پێی ئەسڵی واتایەكەیەتی، كە بریتیە لە ماوەیەك لە كات، نەك ڕۆژەكانی هەفتەو ئەو دەقەش كە لەو بارەوە هاتوە، زانایان مشت و مڕی زۆریان لە بارەیەوە كردووەو جێی متمانە نیە.

٢)- ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾، دوایی خوا ﷻ بەرز بۆوە بۆ سەر عەڕش، چووە سەر عەڕش، عەڕش یانی: تەختی حوكمڕانیی، كە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەمە تەعبیرێكی ڕەمزییە، واتە، خوا ﷻ گەردوونی خستە ژێر ڕكێفی خۆیەوە، دوای ئەوەی دروستیكرد، سیستمی بۆ داناو، كۆنترۆڵی كرد، هەندێك وایان لێكداوەتەوە، بەڵام ڕاستتر وایەو باشتر وایە، بگوترێ: چوونە سەر عەڕشی خوا ﷻو بەرزبوونەوەی خوا بۆ سەر عەڕشی و نیشتەجێ بوونی لەسەر عەڕش و تەخت و بارەگای خۆی، یەكێكە لە سیفەتەكانی خوا ﷻ، كە ئێمە نازانین چۆنە، چونكە وەك چۆن زاتی خوا بۆ ئێمە، چۆنیەتییەكەی دیار نیە، سیفەتەكانیشی بە هەمان شێوە.

## ڕوونكردنەوەیەك لەبارەی ﴿ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ﴾ەوە:

(فخر الدين الرازي) له تەفسیرەكەی خۆیدا[1]، دەڵێ:

**(إعْلَم إنَّ مَذَاهِبَ العُلَماءِ فِي تفسير هَذِهِ الأَيَه وَأَمْثَالِهَا عَلَى وَجْهَينِ: أولاً: تَركُ التَّعَرُّضِ إلى بَيانِ المُرادِ، ثانيَاً: التَّعَرُّضُ إلَيهِ، وَالأَوَّلُ أَسلَمُ وَإِلَى الحِكْمَةِ أَقرَبُ).**

واتە: بزانە كە بۆچوونی زانایان لە بارەی ماناكردنی ئەم ئایەتەو هاو وێنەكانیەوە، لە دوو ڕووەوەیە: ڕووی یەكەمیان: ئەوەیە كە نەچیە نێو وردەكارییەكانی مەبەست لەو ئایەتە، دووەمیان: ئەوەیە كە بچیە نێو وردەكارییەكانی، ئنجا یەكەمیان سەلامەترەو، لە حیكمەتیشەوە نزیكترە.

كەواتە: بۆچوونی هەندێك لەوانەی كە لەم ڕۆژگارەدا بەسەلەفیی ناسراون و، پێیان وایە ئیمام فەخرەددینی ڕازیی بە ڕەهایی لەگەڵ تەئویل دایە، ڕاست نیە، ئەوەتا دەڵێ: بۆچوونی یەكەمیان كە تەئویل نەكرێ و، نەچیە نێو وردەكاریی واتایەكەیەوە، سەلامەترەو، لە حیكمەتیشەوە نیزیكترە، چونكە كارەكانی خواو سیفەتەكانی خوا ﷻ لە سەرووی عەقڵی مرۆڤەوەن، بۆیە شتێك مەگەر بە ئاشكرا دیار بێ، كە مەبەست پێی سیفەتێكی خوا نیە، بەڵكو مەبەست پێی گەیاندنی واتایەكی دیكەیە، ئەگەرنا نابێ بچیە نێو وردەكاریی مانایەكەیەوە، بۆ وێنە:

أ- ﴿يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ...﴿١٠﴾﴾ الفتح.

ب- ﴿فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ...﴿٤٨﴾﴾ الطور.

ج- ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِي ﴿٣٩﴾﴾ طه.

د- ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ ...﴿٤٢﴾﴾ القلم.

---

(١) التفسير الكبير: ج٢٥، ص١٤٥.

لەم شوێنانەدا هەر دیارە كە خوا ﷻ مەبەستی نیە، سیفەتێكی خۆی باس بكات، چونكە هەر كامێك لەو ئایەتانە تەنیا لە یەك شوێندا هاتوون، نەك وەك باسی سیفەتەكان لە چەندان ئایەت دا هاتبن، بەڵكو مەبەست پێیان گەیاندنی واتایەكی دیكەیە، كە لە زمانی عەرەبیی دا، ئەو جۆرە تەعبیرانە بەكارهاتوون، ئنجا ئەو جۆرە شوێنانە ئاساییە بچیە نێو وردەكارییەكانیانەوە، لە زمانی عەرەبییدا:

أ- ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡۚ ١٠﴾ الفتح، بە مانای چاكەی خوا ﷻ بەسەر چاكەی ئەوانەوەیە، یان: دەسەڵاتی بەسەر دەسەڵاتی ئەواندا، دەشكێ.

ب- ﴿فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ...٤٨﴾ الطور، تۆ لە ژێر چاودێریی ئێمە دای.

ج- ﴿يَوۡمَ يُكۡشَفُ عَن سَاقٖ ...٤٢﴾ القلم، ئەو ڕۆژەی ڕۆژێكی تووش و مەترسییدارەو، ڕۆژێك كە خەڵك دەلینگان هەڵبكاو لێی ڕابكات، لە مەترسییەكانی.

بەڵام: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ﴾، كە لە حەوت شوێنان لە قوڕئاندا هاتوە، وەك ئێستا لە یادم بێت، ئەوە پێویست ناكات بچیە نێو وردەكارییەوەو تەئویل بكرێ، بەڵكو دەبێ بڵێین: ئەوە سیفەتێكی خوایەو، واتایەكەشی بەو شێوەیە كە بۆ خوا ﷻ شایستەیە.

٣)- ﴿مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيّٖ وَلَا شَفِيعٍۚ﴾، ئێوە جگە لە وی (خوا) هیچ سەرپەرشتیارو هیچ تكاكارێكتان نیە.

﴿مِن﴾، لێرەدا: ﴿مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ﴾، (مِن: الإبتِدَائِيَّةٌ) بۆ دەستپێكردنە، ﴿مِّن دُونِهِۦ﴾، (دُونِهِ)، یانی: (غَيرِهِ)، جگە لەو، (مِن)ی دووەم،﴿مِن وَلِيّٖ﴾، زیاد كراوە بۆ جەختكردنەوە، واتە: هیچ جۆرە سەرپەرشتیارو هیچ جۆرە تكاكارێك نیە، واتە: (لاَ يُوجَدُ لَهُم مِن مَعبُودِيهِم الَّذِينَ يَعْبُدُونَهُم، غَيرُ اللهِ وَلِيٌّ وَلا شَفِيع)، واتە: ئەو پەرستراوانەی كە لە جیاتی خواو جگە لە خوا، دەیانپەرستن، هیچ سەرپەرشتیارو مشوورخۆرو هیچ تكاكارێكیان نیە، لە نێویاندا (لە نێو پەرستراوەكاندا)، ئەگەرنا،

خـوا ﷻ بەڵـێ سەرپەرشـتیارە، بـەڵام شـەفاعەت نـاكات، تاكـو بگوتـرێ: جگـە لـە خـوا شـەفاعەتكاریان نیـە، بەڵكـو واتـە: لـە نێـو پەرسـتراوەكان دا كـە جگـە لـە خـوا دەیانپەرسـتن، هیـچ سەرپەرشـتیارو تكاكاریـان نیـە.

٤)- ﴿ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴾، ئایا بیرتان ناكەوێتەوە و، پەند وەرناگرن و فێرنابن؟

ئنجـا خـوا دێتـە سـەر باسـی سـیفەتێكی دیكـەی خـۆی، دوای ئـەوەی باسـی وەدیهێنانـی ئاسـمانەكان و زەویـی و ئـەوەی نێوانیانـی كـرد، لـە شـەش قۆناغـدا، دوایـی باسـی چوونـە سـەر تەخـت و عەرشـی خـۆی كـرد، ئنجـا باسـی ئەوەشـی كـرد: لـە نێـو پەرسـتراوەكاندا كـە دەیانپەرسـتن، هیـچ پەرسـتراوو سەرپەرشـتیارو تكاكارێكیـان نیـە، دوایـی دەفەرمـوێ:

٥)- ﴿ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ﴾، كاروبار بەڕێوە دەبات لەسەرێوە تاكو خوارێ، (ٱلسَّمَآءِ)، واتە: سەرێ، (ٱلْأَرْضِ)یش، واتە: خوارێ، واتە: لە سەرەوەی دروستكراوەكانیەوە تاكو خوارێیان، خوا ﷻ كاروباریان بەڕێوە دەبات.

﴿ يُدَبِّرُ ﴾، (**التَّدبِيـر: التَّفْكِيـر فِـي إِصْـدَارِ فِعْـلٍ مُتْقَـنٍ أَوَّلِـهِ وَآخِـرِهِ**)، (**تَدبِیـر**): بریتیـە لـە بیـر كردنـەوە، لـە ئەنجامدانـی كارێكـی ڕێـك و پێـك، لـە سـەرەتایەوە تاكـو كۆتایـی، (**الأَمـر**)، ﴿ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ﴾، (**الأَمـر**)، (**الحـالِ والشـأن**)، (**الأمـر**)، مەبەسـت پێـی حـاڵ و باڵـی دروسـتكراوەكانەو، ڕێـك و پێكییانـە، ئنجـا ﴿ ٱلْأَمْرَ ﴾، كـە (**أل**) ناسـاندنی لەسـەرە، بـۆ جینسـەو تێكـڕای تاكەكانـی كاروبـار دەگرێتـەوە، ﴿ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ﴾، یانـی: هەمـوو كاروبـارەكان، لـە سـەرێوە بـۆ خـوارێ، یاخـود لـە ئاسـمانەوە بـۆ زەوی بەڕێـوە دەبـات، كـە دەفەرمـوێ: ﴿ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ﴾، (**مِـن**) بـۆ دەسـتپێكردنە، ﴿ إِلَى ﴾، بـۆ كۆتاییـە، (**مِـن لِلإِبتِـداءِ، وَإِلَـى لِلإِنتِهـاء**)، ئنجـا مەبەسـت لـەو دوو پیتـە، كـە یەكێكیـان بـۆ دەسـت پێكردنـە و، یەكێكیـان بـۆ كۆتایـی پـێ هێنانـە، گشـتگیر پێشـاندانی مشـوورخواردنی خـواو، سەرپەرشـتییكردنی خوایـە، بـۆ جیهانییـەكان، بـۆ هەمـوو گـەردوون، بـە سـەرو خواریـەوە.

٦)- ﴿ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾، دوایی دەرەنجامی ئەو سەرپەرشتییکردن و مشوورخواردنە، بۆ لای بەرز دەبێتەوە، لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی هەزار (١٠٠٠) ساڵە، لەوەی ئێوە دەیژمێرن، کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ﴾، (**عُرُوج**)، بە مانای (**صُعُود**)ە، بەرزبوونەوە، ﴿يَعْرُجُ إِلَيْهِ﴾، بۆ لای بەرز دەبێتەوە.

## ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی ﴿ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ ەوە:

کە خوا دەفەرموێ: لە ڕۆژێك دا بەرز دەبێتەوە، ئایا تەنیا بەرزبوونەوەکە لە ڕۆژێك دایە؟ یاخود تەدبیر و مشوورخۆرییەکەش هەر لەو ڕۆژە دایە، کە ئەندازەکەی بریتیە: لە هەزار (١٠٠٠) ساڵ، بەپێی ژماردنی ئێمە؟

هەردوو واتایەکە دەگەیەنێ و، لە سووڕەتی (**الحج**)یشدا، هەمان تەعبیر هاتوەو لە قورئان دا، تەنیا لەو دوو شوێنەدا باسی ئەوە هاتوە، کە ڕۆژێکی لای خوا ﷻ بە هەزار ساڵی لای ئێمە هەیە، دەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ ۚ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾﴾الحج، پەلەت لێ دەکەن بە هاتنی سزا و، خوا بەڵێنی خۆی دوا ناخات، بەڵام ڕۆژێك لە لای پەروەردگارت بە ئەندازەی هەزار (١٠٠٠) ساڵە، لەوەی ئێوە دەیژمێرن.

ئنجا ئایا مەبەست لەو ڕۆژە چییە؟ چونکە لە سووڕەتی (**المعارج**)دا، دەفەرموێ: ﴿تَعْرُجُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾﴾، فریشتەکان و ڕووح (کە جیبریلە) بۆ لای بەرز دەبنەوە، لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی پەنجا هەزار (٥٠٠٠٠) ساڵە.

بەپێی سیاق دەزانرێ کە ئەو ڕۆژە پەنجا هەزار (٥٠٠٠٠) ساڵییە، لە قیامەتدایە، بەڵام ئەو ڕۆژە هەزار (١٠٠٠) ساڵییە، خوای پەروەردگار نەیبەستۆتەوە بە قیامەتەوە، بەڵکو لە ئێستای ژیانی ئێمەدایە، کە ژیانی دنیایە.

زانایـان لـەو بـارەوە زۆریـان قسـە کـردوە، کـە ئایـا ئـەو ڕۆژە کـە ئەندازەکـەی هـەزار (١٠٠٠) سـاڵە، لـەوەی کـە ئێمـە دەیژمێریـن، کـە لـەو دوو ئایەتـە موبارەکـەدا هاتـوە، مەبەسـت پێـی چییـە؟

أ- هەندێکیان گوتوویانە: کە دەفەرموێ: هەزار (١٠٠٠) ساڵ، واتە: کات لە لای خوا ﷻ، وەك کات لە لای ئێوە نیە، کە بە تەئکید وایەو، خوا ﷻ لە دەرەوەی کات و شوێن (**زمان، مکان**)ە، خوا ﷻ (**مُسْتوٍ عَلَى عَرْشِهِ، بَائِنٌ عَنْ خَلْقِهِ**)، خوا ﷻ لەسەر تەختی خۆیەتی و لە دەرەوەی جوغزی دروستکراوەکانیەتی، بۆیە ئەو سیستم و یاسایانەی گەردوونیان پێ بەڕێوەدەچێ، خوای پەروەردگار ناگرنەوە، خوا خۆی بەدیهێنەر و پەیداکەر و خاوەنی گەردوون و، ئەو سیستم و یاسایانەیە کە لە گەردووندا دایناون.

ب- هەندێك گوتوویانە: بۆ زۆرییە، واتە: کات لە لای خوا ﷻ، ڕۆژێکی لای خوا ﷻ بە هەزار (١٠٠٠) ساڵی ئێوەیە، مەبەست هەزار (١٠٠٠) ساڵی دیارییکراو نیە، واتە: ڕۆژێکی لای خوا ﷻ ژمارەیەکی زۆرە لە کات، لە لای ئێوە.

ج- هەندێك گوتوویانە: بە دیارییکراوی مەبەست ئەوەیە ڕۆژێ کە خوا کاروباری گەردوونی پێ بەڕێوە دەبات، بە ئەندازەی هەزار (١٠٠٠) ساڵی ئێوەیە، واتە: هەر ڕۆژێکی لای خوا ﷻ و، لە لای خوا کە ڕۆژێك تێدەپەڕێ، لە لای ئێمە هەزار (١٠٠٠) ساڵ تێ دەپەڕێ.

د- هەندێکیشیان گوتوویانە: مەبەست پێی قیامەتە، دوای ئەوەی خوا ﷻ کاروباری گەردوون بەڕێوە دەبات، لە ڕۆژی قیامەتدا، کە دەرئەنجامی کاروبارەکان بۆ لای خوا بەرز دەبێتەوە، ئەندازەکەی هەزار (١٠٠٠) ساڵە، بە ژماردنی ئێمە.

بـەڵام واپێدەچێ زیاتـر مەبەسـت پێی ئێسـتا بێـت و، ڕۆژە پەنجا هـەزار (٥٠،٠٠٠) سـاڵییەکەش مەبەسـت پێـی قیامەتـە، کـە لـە سـیاقەکەیەوە دیـارە، ئـەوەش کـە ڕۆژێـك لـە لای خـوا ﷻ هێنـدەی هـەزار (١٠٠٠) سـاڵی لای ئێمەیـە، ئایـا مەبەسـت پێـی زۆرییـە، یـان مەبەسـت پێـی شـتێکی دیارییکـراوە؟ هـەردووك ئەگـەرەکان هـەن.

منیـش وای تێدەگـەم: کـە خـوا ﷻ دەیـەوێ پێشـانمان بـدات: پێـوەری کات لـە لای خـوا ﷻ جیایـە لـە پێـوەری کات لـە لای ئێمـە، بـا ئێمـە وانەزانیـن کـە پێـوەری ئێمـە و تێڕوانینـی ئێمـە، دەگونجـێ بگشـتێنرێ و حوکمـی پێبـدرێ، بەسـەر هەمـوو دروسـتکراوەکانی خـوادا، نەخێـر، ئێمـە مەحکوومـی کات و شـوێنێکی دیارییکراویـن، کـە بریتیـە: لـە ژیانـی سـەر زەوی، زەوی ئێمـەش یەکێکـە لـە نـۆ خڕۆکەکەی بـە دەوری خـۆردا دەخولێنـەوەو، کۆمەڵـەی خـۆر پێکدێنـن و، خۆریـش یەکێکـە لـە ئەسـتێرەکانی کەهکەشـانی کاکێشـان، کـە گەردوونناسـان ژمـارەی ئەسـتێرەکانی کاکێشـان بـە (یـەك تریلیـۆن) واتـە: هـەزار (١٠٠٠ ملیـار) ئەسـتێرە مەزنـدە دەکـەن و، ژمـارەی کەهکەشـانەکانی نێـو گەردوونیـش بـە هـەزار ملیـار (ئـەك تریلیـۆن) مەزەنـدە دەکـەن.

٧)- ﴿ ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾، ئەو زانای پەنهان و ئاشکرایە.

خـوا ﷻ دوو سـیفەتی دیکـەی خۆی دەخاتـە ڕوو، دەفەرمـوێ: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾، ئا ئەوە کـە وەسـفکرا، ئـا ئـەو خوایـە ﷻ، زانـای پەنهـان و ئاشـکرایە، واتـە: زانـای هەمـوو ئـەو شـتانەیە کـە پەنهانـن و، هەمـوو ئـەو شتانەشـە کـە بینـدراو و بەرهەسـتن.

٨)- ﴿ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، باڵا دەستی میهرەبانە، باڵا دەست و زاڵە، هەموو دروستکراوەکانی کۆنترۆڵکردوون و، لە ژێر ڕکێفی دەستەڵاتی ویدان و، میهرەبانیشە، بە میهرەبانیی خواو بە بەزەیی و بەخشندەیی خواوە، ئەم گەردوون و کەون و کائیناتە بەڕێوە دەچێ.

٩)- ﴿ ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ ﴾، ئەو کەسەی دروستکردنی هەموو شتێکی بە باشترین کردوە، سیفەتێکی دیکەی خۆی بەیان دەکات: خوا ﷻ ئەو زاتەیە کە هەر شتێکی دروستیکردوە، بە باشترین شێوە دروستیکردوە، وشەی: ﴿ خَلَقَهُۥ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**خَلْقَهُ**)، (**الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيءٍ خَلْقَهُ**)، واتە: دروستکردنی هەر شتێکی بە باشترین شێوە کردوە، یاخود: هەر شتێکی دروستیکردوە، بە باشترین شێوە دروستیکردوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ ﴾، یـان (**خَلْقَـهُ**)، ئەمیـش دیسـان گـوزارە (**خبر**)یـە، بـۆ نـاوی ئامـاژە کـە نیهـاد (**مبتـدأ**)ەو لـە پێشـدا هـات: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾،

﴿ ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، یانی: (ذَلِكَ الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَه)، كە دەفەرمویٚ: (الَّذِي أَحسَنَ كُلَّ شَيءٍ خَلْقَهُ)، یان: ﴿ خَلَقَهُۥ ﴾، (الإِحْسَانُ: جَعْلُ الشَّيءِ حَسَناً أَي: مَحمُوداً غَيرَ مَعِيبٍ)، (إِحْسَان) بریتیە: لەوەی شتێك چاك بكرێ و، ستایشكراو بێ و عەیبدار نەبێ، كەواتە: خوا ﷻ هەر شتێكی دروستیكردوە، بە باشترین شێوە دروستیكردوە، لە قەدەر ژیانی دنیا، ئەگەرنا وەنەبێ توانای خوا ﷻ هەر ئەوەندەبێ، كە لە دنیادا دروستیكردوە، بەڵكو بە نسبەت ژیانی دنیاوە، باشترینە، ئەگەرنا بە نسبەت بەهەشتەوەو، بە نسبەت قۆناغی كۆتایی و ڕۆژی دواییەوە، بێگومان خوا ﷻ شتی باشتر دەخوڵقێنێ، بەڵام هی ئێرە لە قەدەر ئێرەیە، هی ئەوێش لە قەدەر ئەوێیە، هی ئێرە لە قەدەر ژیانێكی كاتییەو، بۆ تاقیكردنەوەی مرۆڤەكانە، هی ئەوێش لە قەدەر ژیانێكی هەمیشەیی و نەبڕاوەیە.

١٠)- ﴿ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَٰنِ مِن طِينٖ ﴾، دەستیكردوە بە دروستكردنی مرۆڤ لە قوڕ، واتە: سەرەتای دروستبوونی مرۆڤ لە قوڕەوە بووە، كە لێرەدا وشەی: ﴿ ٱلۡإِنسَٰنِ ﴾، مەبەست پێی جینسە، سەرەتای دروستكردن و دەستپێكەكەشی بریتیە: لە دروستكردنی ئەصڵی مرۆڤ، كە ئادەمە عليه السلام، ئادەم ڕاستەوخۆ لە قوڕ دروستكراوەو، قوڕیش بریتیە لە: (گڵ + ئاو)، ئێمە لە سەرەتای تەفسیری سووڕەتی (**الأعراف**)دا، بە تەفصیڵ باسی دروستكردنی ئادەممان عليه السلام كردوە، باسی بەسەرهاتی ئادەممان كردوە، كە خوا ﷻ لە شوێنێك دەفەرموێ: لە گڵ، لە شوێنێك دەفەرموێ: لە ئاو، لە شوێنێك دەفەرموێ: لە قوڕ، لە شوێنێك دەفەرموێ: ﴿ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ ١٤ ﴾**الرحمن**، لە شوێنێك دەفەرموێ: ﴿ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ٣٣ ﴾**الحجر**، ئەوانە هەموویان قۆناغەكانی دروستبوونی جەستەی ئادەمن، كە بەو قۆناغانەدا تێپەڕیوە، هەروەها لە سەرەتای تەفسیری سووڕەتی (**المؤمنون**)دا، لەوێشدا دیسان هەم لە ڕووی زانستییەوە، هەم لە ڕووی وەحییەوە، باسی دروستكردنی مرۆڤمان كردوە بە گشتیی و، ئادەم عليه السلام بابی مرۆڤایەتیی و، هاوسەرەكەشی حەووا بە تایبەت.

١١)- ﴿ ثُمَّ جَعَلَ نَسۡلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ ﴾، دوایی خوا ﷻ وەچەی ئەو مرۆڤەی (ئەو یەكەم مرۆڤەی)، لە پوختەیەك لە ئاوێكی بێزلێكراو، یان: ئاوێكی بە كەم دانراوو بە

کەم تەماشاکراو، وەچەکەی خستەوەو، لەوە دروستیکرد، وشەی (نَسْل): بە مانای وەچە (ذُرِّيَّة) دێ، چونکە وەچە لە ئەصڵەکەی جیا دەبێتەوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ ﴾، ﴿ مِن ﴾ لـە (مِـن سـلالة)دا، بـۆ دەسـت پێکـردن، (إبتِدائِة)یـە، بـەڵام (مـن) لـە: ﴿ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴾دا، بـۆ بەشـێکە، چونکـە نوتفـەی مـرۆڤ، لـە هەمـوو ئاوەکـە دروسـت نابـێ، بەڵکـو لـە زیندەوەرێکـی زۆر بچـووك کـە بەچـاو نابینـرێ (حَيْمَـن)، حەیوانـی مەنەویـی، کـە ئەویش یـەك دەگرێ لەگـەڵ هێلکۆڵـە (بویضـة) لـە ئـاوی ئافرەتـدا، لـەو دووانـە نوتفـە دروسـت دەبـێ.

١٢)- ﴿ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ﴾، دوایی خوا ﷻ جەستەی مرۆڤی ڕێکخست و لە ڕووحی خۆی فووی پێداکرد، کە دەگونجێ مەبەست پێی جەستەی ئادەم بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی جەستەی هەر مرۆڤێك بێ، کە لە ئەنجامی ئاوێکی قێزەون، (واتە: لە تۆو) دروست دەبێ.

دوای ئــەوەی خــوا جەســتەکەی ڕێکخســت، ﴿ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ﴾، لــە ڕووحێـك کـە تایبەتـە بـە خۆیـەوەو، لـە جینسـی مـاددە نیـە، فـووی بـە بـەردا کـرد، (التَّسـوِيَةُ: التَّقْوِيـمُ)، مەبەسـت (تسـوية) ڕێکخسـتن و چاککردنـە، کـە ئەگـەر ئـادەم بـێ، واتـە: دوای ئـەوەی جەسـتەکەی ڕێکخسـت و، ئەگـەر وەچەکەشـی بـێ، واتـە: دوای ئـەوەی نوتفـە دەبێتـە عەلەقـەو، عەلەقـە دەبێتـە **موضغـە و، موضغـە** دەبێتـە ئێسـقان و، ئێسـقان بـە گۆشـت و ماسـوولکە دادەپۆشـرێ و، بـە کەڵکـی ئـەوە دێ کـە ڕووحـی بـە بـەردا بکـرێ، پاشـان ڕووحـی دێتـە بـەرێ، وەك خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾المؤمنـون، دوایــی وەك دروسـتکراوێکی دیکـە پێمانگەیانـد، بەرزیـی و پێـز بـۆ خـوای باشـترین بەدیهێنـەر.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَنَفَخَ فِيهِ ﴾، (**النَّفْـخُ: تَمْثِيـلُ لِسَـرَيَانِ الـرُّوحِ فِـي الجَسَـدِ**)، (**نَفـخ**): نواندنێکـە، پێشـاندانێکە بـۆ چۆنیەتیـی ڕووح کـە دەچێتـە نێـو جەسـتەوەو پێیـدا دەڕوات، خـوای پـەروەردگار دەیـەوێ ئەوەمـان بخاتـە بەرچـاو، وەك چـۆن تـۆ

فوو لە شتێك دەكەی بەخێرایی، ئاواش بە خێرایی ئەو ڕووحە، بە بەر ئەو جەستەیەدا كراوە، كە ئەو ڕووحەش دروستكراوێكی خوایە، بەڵام دروستكراوێكی تایبەتەو، خوا ﷻ تەنیا خۆی چییەت و چۆنییەتەكەی دەزانێ.

١٣)- ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ﴾، بیستن و چاوەكان و عقڵەكانی بۆ دانان، دوای ئەوەی كۆرپەلە گەورە دەبێ، ئەو هەستەوەرانەی پەیدا دەبن، كە دیارە هیچیان بەكارناهێنێ تاكو لە دایك دەبێ، یەكەمجار دەبیستێ، هەستی بیستن بەكاردێنێ، دوایی دەبینێ، دوایی عەقڵ و هۆشی دەكەوێتە كار، عەقڵ و هۆشی بژاردەیی ویستەنیی (**الإختياري الإداري**)، نەك كارپێكردنی ئەو كۆئەندامانەی لە مێشكەوە فەرمانیان بۆ دێ، ئەوە دیارە هەر لەسەرەتاوە دەست بەكار دەبن.

١٤)- ﴿قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾، واتە: حاڵی ئێوە بریتیە لە كەم سوپاسگوزاریی، ﴿قَلِيلًا مَّا﴾، ئەم: (مَّا)یە، بۆ تەئكید كردنەوەیە، واتە: (**شُكراً قَلِيْلاً تَشْكُرُون**)، واتە: ئێوە سوپاسكردنێكی كەم، سوپاسی خوا ﷻ دەكەن، كە ئەو سوپاسە كەمەش، هی ئەو بەندانەیە كە بۆ خوا صوڵحاون و، وەفادارن بۆ خوا ﷻ.

## مەسەلەی سێیەم:

**نکووڵییکردنـی بێبڕوایـان لـە زینـدوو بوونـەوەو، ڕاگەیاندنـی ئـەو ڕاسـتییە کـە فریشـتەی مـەرگ، گیانیـان دەکێشـێ و، باسـی سەرشـۆڕیی و زەبوونیـی تاوانبـاران لـە بەرانبـەر خـواداو، دان بـە تاوانـدا هێنانیـان و داواکردنـی گێڕانەوەیـان بـۆ ژیانـی دنیـاو، ڕاگەیاندنـی ئـەو ڕاسـتییە کـە خـوا نەیویسـتوە زۆریـان لـێ بـکات، ئەگەرنا دەیخسـتنە سـەر ڕێـی ڕاسـت و، سەرزەنشـتکرانی بێبڕوایـان، لـە دۆزەخـداو، نائومێد کردنیـان لەلایـەن خـواوە ﷻ:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدِۭۚ بَلۡ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ كَٰفِرُونَ ١٠ قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ تُرۡجَعُونَ ١١ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلۡمُجۡرِمُونَ نَاكِسُواْ رُءُوسِهِمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ١٢ وَلَوۡ شِئۡنَا لَأٓتَيۡنَا كُلَّ نَفۡسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ مِنِّي لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ١٣ فَذُوقُواْ بِمَا نَسِيتُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمۡۖ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡخُلۡدِ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ١٤ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدِۭ ﴾، هەروەها گوتیان: ئایا ئەگەر لە زەوییدا ونبووین، ئایا لە نوێ دروستدەکرێینەوە؟!.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالُوٓاْ ﴾، دیـارە بکـەر (فاعل)ەکـەی کێیـە، ﴿ وَقَالُوٓاْ ﴾، یانـی: ئەوانـە گوتیـان کـە پێشـتر قسـەیان لـە بـارەوە کـراوەو، (و)ەکـە بـۆ گێڕانـەوەی ئـەو ڕسـتەیە، بـۆ سـەر ڕسـتەکانی پێشـێ، واتـە: بێبڕوایـەکان و هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان، گوتیـان، ئەمـە بـە سیاق دەزانیـن و، بـەوەی دوایـی دەزانیـن کـە (قَالـوا) بکـەر (فاعل)ەکـەی کێیـەو، کـێ وایگوتـوەو بێژەرەکـە کێیـە؟

﴿ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِى ٱلۡأَرۡضِ أَءِنَّا لَفِى خَلۡقٖ جَدِيدِۭ ﴾، بـە پرسـیار لێکردنـی نکووڵییلێکەرانـەوە، گوتیـان: ئایـا ئێمـە کاتێـك لـە زەوییـدا ون بوویـن، جارێکـی دیکـە لـە نـوێ دروسـت دەکرێینـەوە؟ ئنجـا هـەر کام لـە: ﴿ أَءِذَا ﴾، ﴿ أَءِنَّا ﴾، بـە شـێوەیەکی دیکـەش خوێنراونـەوە: (**وَقَالُـو إِذَا ضَلَلْنَـا فِـي الأَرض إِنَّـا لَفِـي خَلْـقٍ جَدِيـد؟**)، بـە شـێوەی پرسـیارکردن، کـە واتایەکەیـان هـەر یەکـە، تەنیـا بەپێـی خوێندنـەوەی یەکـەم هەمـزە (أ)یـەك لـە هـەر کامیانـدا زیـاد دەبـێ، کـە هەمـزەی پرسـیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیـە، هەڵبەتـە ئەگـەر هەمزەکـەش لابچـێ، دیسـان هـەر دەبێتـەوە بـە پرسـیارکردنی نکووڵییلێکەرانـە.

﴿ ضَلَلۡنَا فِى ٱلۡأَرۡضِ ﴾، واتـە: (**فُقِدْنَـا**)، یاخـود (**غِبْنَـا**)، ئەگـەر ون بوویـن، ئەگـەر پەنهـان بوویـن لـە زەوییـدا، مەبەسـتیان ئـەوە بـووە کـە جەسـتەیان دەبێتـەوە بـە خـاك، ئایـا جارێکـی دیکـە لـە نـوێ دروسـت دەکرێنـەوە؟ خـوا ﷻ لـە وەڵامیانـدا دەفەرمـوێ:

٢)- ﴿ بَلۡ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ كَٰفِرُونَ ﴾، بەڵکو ئەوان بە دیداری پەروەردگاریان بێبڕوان، ئەمە: (**إِضْرَابٌ عَنْ كَلامِهِم أَي: لَيْسَ إِنْكَارُهُمُ البَعْثَ لِلإِسْتِبْعَادِ وَالإِستِحالَةِ، إِذِ الدَّلائِلِ واضِحَةٌ، لَكِنَّ الباعِثَ عَلَى الإنكار، كُفرُهُم: بِلِقاءِ اللهِ ﷻ**)، ئەمە گواستنەوەیە لە قسەکەیانەوەو پاڵ پێوەنانی قسەکەیانە، واتە: نکووڵیکردنیان لە زیندوو بوونەوە، لەبەر ئەوە نیە کە دوورەو مەحاڵە، چونکە بەڵگەکان زۆر ڕۆشنن، بەڵکو هاندەریان بۆ نکووڵییکردن لە زیندوو بوونەوە، ئەوەیە کە بڕوایان بە دیداری خوا نیەو، حەز بە دیداری خوا ﷻ ناکەن.

٣)- ﴿ قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمۡ ﴾، بڵێ: ئەو فریشتەیەی مردن، کە پێتان سپێردراوە، دەتانمرێنێ.

(يَتَوَفَّىٰكُم)، واتـە: (**يُمِيتُكُـم**)، (وُكِّلَ بِكُمۡ)، (**أَي: وكِّلَ بِقَبـضِ أَرْوَاحِكُـم**)، واتـە: کێشـانی گیانەکانـی ئێـوەی پـێ سـپێردراوە.

٤)- ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ﴾، دواییش بۆ لای پەروەردگارتان دەگێڕدرێنەوە، مەبەست لەم تەعبیرە ئەوەیە کە خوا ﷻ لەبەر ئەوەی لە شوێنەکانی دیکە، زۆر ئەو قسەیانی بەرپەرچداوەتەوە، کە گوتوویانە: ئایا ئێمە زیندوو دەکرێینەوە، دوای ئەوەی بووینەوە خاك و ون بووین لە زەوییدا؟ لێرەدا خوا ﷻ بە پێویستی زانیوە ئەو حاڵەتەی ئەوان لە بەرانبەریدا دەستە پاچەن، کە بریتیە لە گیان کێشرانیان لەلایەن فریشتەی مردنەوە، ئەوەیان بخاتە بەر چاو، یانی: ئێوە چۆن ژیانەکەتان بە دەست خۆتان نیە، کەی پەیدادەبن و کەی کۆتایی بە ژیانتان دێ، بە هەمان شێوەش دروستکران و زیندووکرانەوەو هێنانەوەشتان، دیسان بە دەست خۆتان نیە، بە دەست ئەو زاتەیە کە لە سەرەتاوە ئێوەی دروستکردوەو، ئێوە لادەباو دەمرێنێ و، دواییش هەر خۆی زیندووتان دەکاتەوە.

٥)- ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾، ئەگەر تۆ ببینی کاتێك کە تاوانباران سەری خۆیان دانەواندوەو، شۆڕ کردوە، لە لای پەروەردگاریان.

ئەگەر تۆ ئەو حاڵەتە ببینی، حاڵەتێکی زۆر سامناك دەبینی، چونکە وەڵامی (لو) قرتێندراوە بۆ ئەوەی زەین بڕوا بۆ هەموو ئەو ئەگەرانەی کە لەگەڵیدا دەگونجێن.

(**نَكَسَ رَأْسَهُ: طَأْطَأَهُ، وَالنَّاكِسُ الَّذِي يَجْعَلُ أَعلَى شَيءٍ إِلَى أَسْفَل**)، (**نَكَسَ رَأْسَهُ**) واتە: سەری دانەواند، (**نَاكِس**) کەسێکە سەرەوەی شتێك بخاتە ژێری، ژێریشی بخاتە سەری، واتە: سەری خۆیان دانەواندوەو شۆڕکردوە، کە ئەمە بە تەئکید مەبەست پێی زەبوونیی و پەشێمانییە.

کە دەفەرموێ: ﴿عِندَ رَبِّهِمْ﴾، واتە: لە شوێنێك کە تەنیا دەستەڵاتی پەروەردگاری لێیە، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە، بیانبەنە خزمەت پەروەردگاریان و ئەو شەرەفەیان پێ نابڕێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە لەوێ جگە لە دەستەڵاتی خوا، هیچ دەسەڵاتێکی دیکە نیە، لە حزوور پەروەردگاریانداو، لەو شوێنەی کە تەنیا دەستەڵاتی پەروەردگاری لێیە، سەریان نزم و نەوی دەبێ.

٦)- ﴿ رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا ﴾، دەڵێن: پەروەردگارمان! دیتمان و بیستمان، واتە: ئەوەی کە پێشتر نکووڵییمان لێدەکرد، ئێستا ئەوە دیتمان بە چاوی خۆمان و، ئەوەش کە وەرمان نەدەگرت لە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) ئەو پەیامە، ئەوە ئێستا بیستمان، بۆمان دەرکەوت: ڕاستبووە.

لێرەدا (**رَأَيْنَا، وَسَمِعْنَا**)، هەردووکیان بەرکار (**مفعول بە**)ەکەیان قرتێنراوە، چونکە مەقام دەلالەتیان لەسەر دەکات، واتە: (**رَأَيْنَا مَا كُنَّا نُنْكِرُهُ وَسَمِعْنَا مَا كُنَّا نَرْفُضُهُ**)، ئەوەی کە نکووڵییمان لێدەکرد، ئەوە بینییمان، [کە پاداشت و سزای خوایە، بە هەشتە، دۆزەخە]، ئەوەش کە کاتی خۆی ئێمە لە پێغەمبەرانمان (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) وەرنە دەگرت، ئێستا بیستمان و، دەزانین کە هەقە.

٧)- ﴿ فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا ﴾، ئنجا بمانگێڕەوە، کردەوەی باش بکەین، واتە: بمانگێڕەوە بۆ ژیانی دنیا، یاخود جارێکی دیکە بمانگێڕەوە بۆ تاقیکردنەوە، بمانخەوە تاقیکردنەوەیەکی دیکە.

٨)- ﴿ إِنَّا مُوقِنُونَ ﴾، بێگومان ئێمە دڵنیاین، واتە: ئێمە دڵنیاین کە هەرچی تۆ فەرمووبووت و، بە پێغەمبەراندا نارد بووت، ڕاستە، ئەمە هۆکار هێنانەوە (**تعلیل**)یە بۆ ئەوە کە ئەگەر جارێکی دیکە بمانگێڕیەوە بۆ دنیا، ئێستا زۆر دڵنیاین کە کردەوەی باش دەکەین.

خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم ئایەتانەدا دەفەرموێ:

٩)- ﴿ وَلَوۡ شِئۡنَا لَأٓتَيۡنَا كُلَّ نَفۡسٍ هُدَىٰهَا ﴾، ئەگەر ویستباشمان، هەر کەسە ڕاستە ڕێ گرتنی خۆیمان پێدەبەخشی، واتە: ئەگەر ویستبامان مرۆڤەکانمان لەسەر ئەوە دەسروشتاند، کە بە دوای ڕێنمایی خوا ﷻ بکەون، بێ ئەوەی بۆ خۆیان ویستی ئازادیان لە کاردا هەبێ.

١٠)- ﴿ وَلَٰكِنۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ مِنِّي لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴾، بەڵام لەمنەوە قسە پێویست بووە، بڕیار پێویست بووە، کە دۆزخ لە تێکڕای جندو مرۆڤان پڕدەکەم، سیخناخ دەکەم.

ئەمە ماناکەی ئاوایە، واتە: بەڵام ویستمان سەرپشکیان بکەین و، تاقییان بکەینەوە، بۆیە ئازادمان کردن، نەمانویست زۆریان لێ بکەین، بە تۆبزیی بیانخەینە سەر ڕێی ڕاست، بەڵکو ویستمان ئازادیان بکەین و، سەرەنجامیش کە ئازادمان کردن، بڕیار لە منەوە پێویست بوو، کە دۆزەخ پڕ دەکەم لە جندو مرۆڤ، تێکڕایان، واتە: ئەگەر ویستبامان هەموویانمان دەخستنە سەر ڕێی ڕاست، وەك چۆن فریشتەکان بێ فەرمانیی خوا ناکەن، بەڵام ویستمان تاقییان بکەینەوە بە ویستی خۆیان، ڕێی ڕاست بگرن، یان نەیگرن، ئنجا کاتێك سەرپشکمان کردن و ئازادمان کردن، کەمێکیان ڕێی ڕاستیان گرت، کە بڕواداران و سوپاسگوزارانن بۆ خوا، بەڵام زۆربەیان ڕێی چەوتیان گرت، بۆیە بڕیار لە منەوە پێویست بوو، کە دۆزەخ لەو جۆرە دروستکراوانە لە جندو مرۆڤ پڕ بکەم، لە تێکڕایان، خوا ﷻ پێیان دەفەرموێ:

١١)- ﴿فَذُوقُواْ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ﴾، دەجا بیچێژن بە هۆی ئەوەوە کە دیداری ئەمڕۆتان فەرامۆشکرد، دیداری ئەمڕۆتان پشتگوێ خست و لە بیر کرد، ئەمە وەڵامی ئەو قسەیانە کە گوتیان: ﴿رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ﴾، خوا ﷻ پێیان دەفەرموێ: بیچێژن بە هۆی ئەوەوە کە دیداری ئەمڕۆتان لە بیر چوو، فەرامۆشتان کرد، پشتگوێتان خست، کات و قۆناغی تاقیکردنەوە، ژیانی دنیا بوو، ئەو قۆناغەش تێپەڕی، کاری خوا ﷻ هەمووی بە سیستمە، قۆناغێ کە تێپەڕیوە، دەرەنجامێکی بەدوادا دێ، مروڤ ناگەڕێتەوە بۆ ئەو قۆناغەو تاقیکردنەوەش یەکجارە.

١٢)- ﴿إِنَّا نَسِينَٰكُمْ﴾، ئێمەش ئەمڕۆ ئێوەمان لە بیر کرد، بێگومان خوا ﷻ شتی لە بیرناچێ: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾﴾مریم، واتە: پشتگوێتان دەخەین، وەك ئەوەی لەبیرمان چووبنەوە.

١٣)- ﴿وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، ئێستاش سزای هەمیشەیی و نەبڕاوە بچێژن، بەهۆی ئەوەوە کە دەتانکرد، واتە: سزاو ئازارەکەتان بەردەوامە، هۆکارەکەشی کردەوە خراپەکانی خۆتانن، کەواتە: دوو هۆکار هەن تاکو سزایەکی هەمیشەیی بچێژن:

**یەکەم:** دیداری ئەو ڕۆژەی خۆیان فەرامۆش کردوە، کە ڕۆژی دواییە.

**دووەم:** کردەوە خراپەکانی خۆیان.

## پرسیارێک و وەڵامەکەی

لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت لە بارەی ئەو ئایەتە موبارەکەوە کە ڕابرد، کە دەفەرمووێ: ﴿ قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ ﴾، بڵێ: فریشتەی مردن کە پێتان سپێردراوە دەتانمرێنێ، ڕووحەکانتان وەردەگرێ، یەکێك بۆی هەیە، بڵێ: لێرە لە سوورەتی (**السجدة**)دا دەفەرمووێ: فریشتەی مەرگ، گیانتان دەکێشێ.

بەڵام لە سوورەتی (**الزمر**)دا، دەفەرمووێ: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا ...﴿٤٢﴾ ﴾، خوا ﷻ ڕووحەکان وەردەگرێ لە کاتی مردنیانداو، لە سوورەتی (**الأنعام**)یشدا، دەفەرمووێ: ﴿ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۖ وَيُرۡسِلُ عَلَيۡكُمۡ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ﴾، بڵێ: خوا باڵا دەستە بەسەر بەندەکانیەوە، پارێزەرەکانتان دەنێرێتە سەرێ (کە فریشتەکانن)، هەتا کاتێ یەکێکتان مردنی بۆ هات، نوێنەرەکانمان گیانی دەکێشن، بێ ئەوەی کەمتەرخەمیی بکەن، ئایا لێرەدا جۆرێك لە تێکگیران دروست نابێ؟.

لە شوێنێك دەفەرمووێ: خوا گیانەکان دەکێشێ و، لە شوێنێك دەفەرمووێ: فریشتەی مەرگ و، لە شوێنێکی دیکەش دەفەرمووێ: نوێنەرەکانمان، واتە: فریشتەکانمان!

لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، بەڵکو مەسەلەکە بەو شێوەیە: مردن بە ویستی خواو، بە زانیاریی خواو، بە چاودێریی خوا، ئەنجام دەدرێ، بە سەرپەرشتیی فریشتەی مەرگ و، بە جێبەجێ کردن و ڕاستەوخۆ ئەنجامدانی فریشتەکان،

دیارە فریشتەی مەرگ (**مَلَكُ المَوت**) تەنیا نیە، بەڵكو هەر خوا دەزانێ ملیۆنان، یان ملیاران فریشتەی دیكەی لەبەر دەستدان، ئەو كارەی دەیەوێ، ئەو بەس ئیشراف دەكات و چاودێریی دەكات و، ئەو فریشتانەی دیكە كە لەبەر دەستیدان، كارەكە جێبەجێ دەكەن.

**ئێستاش با دووبارە سەرنجی ئەو چواردە (١٤) ئایەتەی ئەم دەرسە بدەینەوە:**

خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی دابەزاندنی كتێب دەكات، كە قورئانەو هیچ دوو دڵیی تێدا نیە، لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوەیە، دوای ئەوە بەرپەرچی ئەو قسەیان دەداتەوە كە دەڵێن: هەڵیبەستوە، دەفەرموێ: بەڵكو هەقە لە پەروەردگارتەوەو، بۆ ئەوەش دابەزێندراوە تاكو كۆمەڵێك كە لە پێش تۆدا ترسێنەرو هۆشیاركەرەوەیان بۆ نەهاتوە، وریایان بكەیەوەو بیانترسێنی، بەڵكو ڕێی ڕاست بگرن.

ئنجا دوای ئەوە خوا ﷻ باسی كۆمەڵێكی زۆر لە سیفەتەكانی خۆی دەكات، كە ئێمە بۆ ناسینی خوا ﷻ، جگە لە وردبوونەوە لە كارەكانی خواو، لە سیفەتەكانی خوا كە لە دروستكراوەكانیدا دەدرەوشێنەوە، هیچ ڕێیەكی دیكەمان نیە، چونكە ناتوانین ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە خواوە بكەین و، ڕاستەوخۆ پەی بە خوا ببەین، بەڵكو دەبێ لەمیانی سیفەتەكانیدا كە لە ئاوێنەی دروستكراوەكانیدا دەدرەوشێنەوە، هەروەها لە میانی فەرمایشتەكەیدا كە باسی خۆیمان بۆ دەكات: باسی كردەوەكانی خۆی، سیفەتەكانی خۆی، ناوە هەرە بەرزو پەسندەكانی خۆیمان بۆ دەكات، دەبێ لە میانی ئەو دوو كتێبەوە، كتێبی بیندراوی خوا، كە گەردوونەو، خۆشمان بەشێكین لەو گەردوونەو، كتێبی خوێنراوەی خوا، كە قورئانە، دەبێ لە ڕێی ئەو دوو كتێبەوە، هەوڵبدەین خوای پەروەردگار بناسین، بزانین چی لێمان داوا كردوەو، چ جۆرە ژیانێكی بۆمان داناوە، بەو شێوە بژین و، چ جۆرە هەڵسوكەوتێكی لێمان خواستوە؟ بەو شێوەیە هەڵسوكەوت بكەین.

تاكـو ئـەو حیكمەتـەی خـوا ﷻ ئێمـەی بـۆ هێناوەتـە دی، كـە بریتیـە: لـە تاقیكردنەوەمـان و هەڵگرتنـی ئەمانەتـی خـواو، جێنیشـینایەتیی كردنـی خـوا لەسـەر زەوی، ئـەو حیكمەتـە بێنینـە دی، وەك لـە مەوسـووعەی: (درەوشـاوەیی ئیمـان و پووچەڵیـی ئیلحـاد لەبـەر ڕۆشـنایی زگمـاك و عەقـڵ و زانسـت و وەحیـی)دا، باسـمان كـردوە.

ئنجـا لـە ڕاسـتییدا ئـەو پرسـیارانەی وەك: خـوا ﷻ بۆچـی ئێمـەی دروسـت كـرد؟ بۆچـی منـی هێنایـە ئێـرە، بەبـێ ئـاگاداری و ویسـتی خـۆم؟ بۆچـی لام دەبـات بەبـێ مۆڵـەت لـێ وەرگیرانـم؟ دوایـی بـۆ كـوێ دەچم؟ ئـەو پرسـیارانە لـە عەقـڵ و دڵێكەوە پەیدادەبـن، كـە وەك پێویسـت ناسـینی خـواو، قـەدرو پێگـەو پایـەی بـەرزو بـێ وێنـەی خوایـان تێـدا جێگیـر نەبووبـێ، ئەگەرنـا مـرۆڤ لـەوە بچووكتـرە بـەو شـێوەیە بیـر لـە خـوای پـەروەردگار بكاتـەوە، جـارێ ئەوە هـەر شـتێكی مەحاڵە، خـوا ﷻ پێش ئـەوەی تـۆ دروسـت بـكات، پرسـت پـێ بـكات! ئنجـا خـوا ﷻ لەبـەر ئـەوەی خاوەنـی ئـەو پـەڕی حیكمـەت و، ئەوپـەڕی زانیاریـی و، ئەوپـەڕی میهرەبانییـە، تـۆ دەبـێ متمانـەت بـە خـوا بـێ، ئنجـا ئەگـەر خـوا بناسـی متمانـەت پێـی دەبـێ، كـە ئـەوەی خـوا كردوویەتـی، هەمـووی لەجێـی خـۆی دایـەو، عەقڵـی ئێمـە لـەوە بچووكتـرە، كـە بتوانـێ هەمـوو كاروبارەكانـی خـوا ﷻو، هەمـوو نەخشـەی خـواو، هەمـوو سیسـتمی خـوا لـە خـۆی دا جـێ بكاتـەوە، بـەڵام خـوا ﷻ عەقـڵ و هۆشـێكی پێداویـن، دەتوانـێ ئـەوەی پـێ دەرك بـكات، كـە خـواو خاوەنـی خـۆی بناسـێ و، پاشـان ورد بێتـەوە، ئایا خـوا ﷻ ئێمـەی بۆچـی لێـرە دانـاوەو، چـی لێمـان داوا كـردوە؟ حیكمەتـی بوونـی ئێمـە چییـە؟ چ ئامانجێـك لـە دروسـتكرانماندا هەیـە، كـە ئێمـە بیهێنینـە دی؟ عەقڵـی مـرۆڤ بایـی ئەوەنـدە دەكات و، بایـی ئەوەنـدە دەكات پێـی لـەو دوو كتێبـە حاڵیـی بـێ: (كتێبـی گـەردوون) و (كتێبـی قورئـان، كتێبـی هیدایەتـی خـوا)، ئنجـا ئـەو دوو كتێبـەش كـە یەكیـان دروسـتكراوی خوایـەو، ئـەوی دیكـە فەرمایشـتی خوایـە، ئـەو دوو كتێبـەش یەكـدی پشـتگیر دەكـەن، عەقڵـی ئینسـان بایـی ئەوەنـدە دەكات، بـەڵام

بایی ئەوە ناکات کە پرسیارەکانی بوون (وجود) وەڵام بداتەوەو، مەتەڵەکانی بوون هەموویان پێی حەل بکات، بە تەئکید ئەوە لە توانای مرۆڤدا نیەو، مرۆڤ نابێ ئەو تەماعەی بێ و، ئەو کەڵکەڵەیەی لە کەللەدا بێ، ئنجا ئەوە یەکێکە لە هۆکارەکانی ئیلحاد، بەو جۆرە لە کەوڵی خۆ دەرچوونی مرۆڤ و، خۆ پێ زلبوون و، خۆ بردنە ئاستی خوا ﷻ، خوایە! ئەوەت بۆچی کردو ئەوەت بۆچی نەکرد؟ بۆچی پرست پێ نەکردم؟! لە ڕاستییدا ئەوە بێ ئەدەبیی و بێ ڕێزیی و حورمەتییە لە خزمەت خوادا، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ... ﴿٦٧﴾ ﴾الزمر، وەك پێویست، وەك بۆ خوا شایستەیە، ڕێزی خوایان نەگرت، پێگەی بێ بەرزو وێنەی خوای پەروەردگاریان دەرك نەکرد.

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِك، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە هەشـت (٨)، ئایـەت پێـك دێ، ئایەتەكانـی: (١٥ - ٢٢)، كـە باسـی بـڕواداران بـە ئایەتەكانـی خـواو، چەنـد سـیفەتێكی ناوازەیـان و، پاداشـتی بەرزیـان لـە بەهەشـت دا، كـراوە و، بەراوردێـك لـە نێـوان ئـەوان و بـڕواداران بـە ئایەتەكانـی خـواو بێبڕوایانـی لادەرو، سـزای دنیـاو دواڕۆژیـان كـراوە و، بـە چەنـد سـیفەتێكی زۆر خـراپ بێبڕوایـان وەسـف كـراون، وەك: لـە ڕێ دەرچـوون و بـە درۆ دانـان و، سـتەمكاریی و، تاوانباریـی.

﴿ إِنَّمَا يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَسَبَّحُواْ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَهُمۡ
لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا
وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ
يَعۡمَلُونَ ﴿١٧﴾ أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗاۚ لَّا يَسۡتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡمَأۡوَىٰ نُزُلَۢا بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ فَمَأۡوَىٰهُمُ
ٱلنَّارُۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمۡ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِي كُنتُم
بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَدۡنَىٰ دُونَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَكۡبَرِ لَعَلَّهُمۡ
يَرۡجِعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعۡرَضَ عَنۡهَآۚ إِنَّا مِنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ
مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ڕاستیی ئەوانە بڕوا بە ئایەتەکانمان دێنن، کە کاتێك (بەسەریاندا دەخوێنرێنەوەو)، بیریان دەخرێنەوە، بە کڕنووشدا دەکەون و، پەروەردگاریان بە ستایشکردنەوە بە پاك دەگرن و، ئەوان خۆیان بە زلناگرن (لە بەرانبەر خوای بێ هاوتاو ئایەتەکانیدا) ﴿١٥﴾ (کاتێك بۆ نوێژ هەڵدەستن)، کەلەکەکانیان (تەنیشتەکانیان)، لەسەر جێگاکانیان دوور دەکەونەوە، بە ترس و ئومێدەوە لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو، لەوەی پێمان داون دەبەخشن ﴿١٦﴾ هیچ کەس نازانێ چییان بۆ پەنهان کراوە لە بەهەشتدا، لەوەی کە شادمانکەرە، لە پاداشتی ئەوەدا کە (لە ژیانی دنیادا) دەیانکرد (لە کردەوەی باش) ﴿١٧﴾ ئایا کەسێك کە بڕوادار بووە بە ئایەتەکانی خوا ﷻ، وەك کەسێکە کە لادەر بووە (لە بەرنامەی خوا)؟ یەکسان نین ﴿١٨﴾ هەرچی ئەوانەن کە بڕوایان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردوون، بە هەشتەکانی حەوانەوەیان هەن، وەك میوان (نیشتەجێ دەکرێن)، بەهۆی ئەوەوە کە پێشتر کردوویانە ﴿١٩﴾ هەرچی ئەوانەشن کە لا دەرن، ئاگر شوێنی حەوانەوەیانە، بەردەوام تێیدان و، هەر کات ویستیان لێی بچنە دەرێ، دەگێڕدرێنەوە نێوی و، پێیان دەگوترێ: ئەو ئازاری ئاگرەی پێی بێبڕوا بوون، بیچێژن ﴿٢٠﴾ بە دڵنیاییش (لە ژیانی دنیادا) لە ئازاری کەمتریان پێ دەچێژین بەر لە ئازاری گەورەتر (لە ڕۆژی دوایی)دا، بەڵکو بگەڕێنەوە (سەر ڕاستە ڕێ) ﴿٢١﴾ ئایا چ کەسێك لەو کەسە ستەمکارترە کە ئایەتەکانی پەروەردگاری بیر دەخرێنەوە، ئنجا (لە جیاتی بڕوا پێهێنان) پشتیان تێدەکات! بێگومان ئێمە تۆڵەستێنین لە تاوانباران ﴿٢٢﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ذُكِّرُواْ بِهَا): (**أُعِيدُ ذِكْرُهَا عَلَيْهِم، وَتَكَرَّرَت تِلاَوَتُهَا عَلَى مَسَامِعِهِم**)، باسكردنی ئایەتەكانیان بۆ دووبارە دەكرێتەوە، خوێندنەوەی ئایەتەكانیان بۆ دووبارە دەكرێتەوە، پێیان دەبیستێنرێن.

(**خَرُّوا سُجَّداً**): لە پەو ڕوو بە كڕنووشدا دەكەون، (**الخُرُورُ: الهَوِّيُّ مِنْ عُلوٍ إِلَى سُفلٍ، السُّقُوط**)، (**خرُور**): كەوتنە لە بەرزییەوە بەرەو نزمیی، كەوتن.

(**تَتَجَافَى جُنُوبُهُم**): واتە: تەنیشتەكانیان و، كەلەكەكانیان بەرز دەبنەوە، دوور دەكەونەوە لەسەر ئەو جێگایانەی لێیان خەوتوون، (**التَّجَافِي: التَّبَاعُدُ وَالمُتَارَكَة**)، دوور كەوتنەوەو واز لێهێنان.

(ٱلْمَضَاجِعِ): (**جَمْعُ مَضْجِع، الفُرُش: جَمْعُ فِرَاش، وَهُوَ مَكَانُ الضَجْعِ أَي: الإِستِلقَاءِ لِلراحَة وَ (أَل) عِوَضٌ عَنِ المُضافُ إِلَيهِ أَي: مَضَاجِعِهِم**)، (**مَضَاجِع**): كۆی (**مَضْجِع**)ە، ئەویش بە مانای (**فِرَاش**)ە، كە بە (**فُرش**) كۆ دەكرێتەوە، كە بریتیە: لە شوێنی لێ ڕاكشان بۆ ئاسوودە بوون و پشوودان، (**أل**)ی سەر (**المَضَاجِع**) لە قەرەبووی (**مُضَافُ إِلَيْهِ**)، پاڵوێدراو دانراوە، كەواتە: (**مَضَاجِع**) یانی: (**مَضَاجِعِهِم**) جێگاكانیان.

(قُرَّةِ أَعْيُنٍ): واتە: شادمانكەر، شتێك كە زۆر جێی دڵخۆشیی بێ، دەگوترێ: (**قَرَّت عَيْنُهُ أَي: فَرِحَ ،لأَنَّ دَمْعَ الفَرَحِ بارِدٌ، وَالقُرُّ البَرد**)، (**قَرَّتْ عَيْنُهُ**): واتە: دڵخۆش بوو، چونكە فرمێسكی شادیی ساردە و، [فرمێسكی خەمباریی گەرمە]، (**قُرّ**)یش بە مانای ساردیی (**بَرد**) دێ، (**الحَرّ وَالقُرّ**)، واتە: گەرمیی و ساردیی.

(نُزُلًا): (**أَي ضِيافَةً، النُّزُلُ: أَوَّلُ مَا يُعْطَى الضَّيفَ**)، (**نُزُل**): واتە: میوانداریی، چونكە (**نُزُل**)، یەكەم شتێكە كە بە میوان دەدرێ.

(ٱلۡأَدۡنَىٰ): (الأَصغَـر وَالأَقَـلّ وَالأَقـرَب)، ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَدۡنَىٰ﴾، واتـە: سـزای گچکەتـر، کەمتـر، نیزیکتـر، کـە لـە ژیانـی دنیادایـە.

(ٱلۡمَأۡوَىٰ): (المَكَانُ الَّـذِي يُـؤْوى إِلَيـهِ، أَو يَرْجَـعُ إِلَيـهِ)، ئـەو شـوێنەی کـە پەنـای پـێ دەبـردرێ و، ئینسـان بـۆی دەگەڕێتـەوەو، تێیـدا پشـوو دەدا.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەو هەشـت (٨) ئایەتـەدا، بۆمـان باسـی بـڕواداران بـە ئایەتەکانـی خـۆی دەکات و، بـە باشـترینی خەسـڵەتەکانیان پێناسـەیان دەکات، خەسـڵەتە باشـە سـەرەکییەکانیان، هەروەهـا باسـی پاداشـتەکەیان دەکات، دوایـی بەراوردیـان دەکات لەگـەڵ کەسـانی لادەر و لاڕێ و، بێبـڕوا بـە ئایەتەکانـی خـوا و، باسـی سـزای ئەوانیـش دەکات.

سـەرەتا دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّمَا يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْۤ سُجَّدٗا﴾، تەنیـا ئەوانـە بڕوایـان بـە ئایەتەکانـی ئێمـە هەیـە، کـە کاتێـك وەبیریـان دەخرێنـەوە، واتـە: بەسـەریاندا دەخوێندرێنـەوەو، بـە گوێیانـدا دەدرێـن و بۆیـان بـاس دەکرێـن، ﴿خَـرُّوا سُجَّدَاً﴾، بەکڕنـووش بردنـدا دەکـەون، ﴿وَسَبَّحُواْ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ﴾، هەروەهـا بـە ستایشـکردنەوە پەروەردگاریـان بـە پـاك دەگـرن، ﴿وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ﴾، ئـەوان خۆیـان بەزلناگـرن، لـە بەرانبـەر خـوا و ئایەتەکانـی خـوادا خۆیـان بـە زل ناگـرن و ملکەچـن.

﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ﴾، تەنیشـتەکانیان، لـە جێیەکانیـان دوور دەکەونـەوە، بـەرز دەبنـەوە، واتـە: کـە بـۆ شـەو نوێـژ هەڵدەسـتن، یـان کاتێـك کـە دوای پشـوودان و خەوتـن، بـۆ نوێـژ هەڵدەسـتن، ئنجـا نوێـژی شـەو بـێ یـان ڕۆژ بـێ، خـوا ﷻ لێـرەدا بۆمـان وێنـا دەکات کـە چـۆن تەنیشـت و کەلەکەکانیـان

ورده ورده، بەرز دەبنەوەو هەڵدەستن و لە جێیەکانیان دوور دەکەونەوە، ئەوە وشەی: ﴿ تَتَجَافَىٰ ﴾، کە لەسەر کێشی (تفاعُل)ە، دەیگەیەنێ، ﴿ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا ﴾، دوای ئەوەی دەست بە نوێژ و تاعەت دەکەن، لە پەروەردگاریان بە ترس و ئومێدەوە دەپاڕێنەوە، هەم ترسیان لە سزای خوا هەیە، لەسەر کردەوە خراپەکانیان، هەم ئومێدیان بە ڕەحمەتی خوا هەیە، بە هۆی کردەوە چاکەکانیانەوە، ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾، لەوەش کەپێماندراون دەبەخشن، لەوەی کە پێماندراون، چ ماڵ و سامانە، چ زانیارییە، چ عەقڵە، چ جێگە و پێگەی کۆمەڵایەتییە، واتە: لەو شتە ماددیی و مەعنەوییانەی پێماندراون، خەڵکی دیکەیان لێ بەهرەمەند دەکەن و، دەبەخشن.

﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ ﴾، هیچ کەسێك نازانێ چی بۆ شاردراوەتەوە، لە پاداشتێك کە مایەی زۆر دڵخۆش بوون و شادمان بوونیەتی، ﴿ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾، لە پاداشتی ئەوەدا کە دەیانکرد، دەربارەی ئەوەی ئامادە کراوە وەك پاداشت لە بەهەشتدا بۆ چاکەکاران، ئەم دەقەی سوننەت هاتوە:

**{عَن أَبِي هُرَيْرَةَ t، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَالَ اللَّهُ تَعَالى: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لَا عَيْنٌ رَأَتْ، وَلَا أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلَا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾السجدة}، (أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ٨١٢٨، وَالبُخَارِيُّ: ٣٠٧٢، وَمُسلِم: ٢٨٢٤، وَالتِّرمِذِيُّ: ٣١٩٧).**

واتە: ئەبوو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی، خوای بەرز فەرمووی: بۆ بەندە چاکەکانم شتێکم ئامادە کردوە، کە هیچ چاوێك نەیدیوە و، هیچ گوێیەك نەیبیستوە و، بەسەر دڵی هیچ مرۆڤێکیشدا نەهاتوە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر دەتانەوێ [زیاتر لە چەمکی ئەوەی کە خوا فەرمووی، تێبگەن]، ئەو ئایەتە بخوێننەوە: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾**السجدة**، هیچ نەفسێك نازانێ چییان بۆ پەنهان کراوە، لەوەی کە مایەی شادمانیی و دڵخۆشییانە.

﴿ أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗاۚ لَّا يَسۡتَوُۥنَ ﴾، ئایـا کەسـێك کـە بـڕوادار بـووە، واتـە: بـڕوادار بـووە بـە خـوا ﷻ و بـە پێغەمبەرانـی خـوا (**عَلَيْهِـم الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**) و، بـە بەرنامەکانـی خـوا، بـە کتێبەکانـی خـوا و، بـە فریشـتەکان، بـە ڕۆژی دوایـی، ئایـا کەسـێك کـە بـڕوادارە، وەك کەسـێك وایـە کـە لادەرە؟ ﴿ لَّا يَسۡتَوُۥنَ ﴾، وەك یـەك نیـن، یەکسـان نیـن، وەك گوتـراوە: ئاسـمان و ڕێسـمانیان بەینـە، یـان وەك عـەرەب دەڵێـن: (**أَيـنَ الثُّرَيَّـا مِـنَ الثَّـرَى**)، ئەسـتێرە لـە کـوێ و، گڵ لـە کـوێ؟ ﴿ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡمَأۡوَىٰ ﴾، ئنجـا خـوای پـەروەردگار باسـی یەکسـان نەبـوون و وەك یـەك نەبوونـی بـڕواداران و لادەران ڕوون دەکاتـەوە، دەفەرمـوێ: هەرچـی ئەوانـەن کـە بڕوایـان هێنـاوەو کـردەوە باشـەکانیان ئەنجـام داون، ئەوانــە بــە هەشــتەکانی شــوێنی پشــوودانیان بــۆ هــەن، ﴿ نُزُلَۢا بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، میوانداریيـان لـێ دەکـرێ و، وەك میـوان پێشـوازییان لـێ دەکـرێ، بەهـۆی ئـەوەوە کـە دەیانکـرد.

﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ ﴾، بــەڵام ئەوانــەی کــە لادەر بــوون، لایانــداوە، ﴿ فَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ﴾، جێـگا و ماوایـان، ئـەو جێگەیـەی کـە تێیـدا پشـوو دەدەن و ئیسـڕاحەت دەکـەن: (ئاگـرە) ئەگـەر شـوێنێك هەبێـت تێیـدا پشـووبدەن ئاگـرە، ئاگـری دۆزەخـە، ﴿ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا ﴾، هــەر کاتــێ ویسـتیان لێــی بچنــە دەر، دەگێڕدرێنــەوە نێـوی، هــەوڵ دەدەن و پەلــە قــاژە دەکــەن بچنـە دەر، بــەڵام دەگێڕدرێنــەوە نێــوی، پەلکێــش دەکرێنــەوە بــۆ نێــوی، ﴿ وَقِيلَ لَهُمۡ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴾، پێیـان دەگوتـرێ: ئـەو سـزای ئاگـرە، کـە ئێـوە پێـی بێبڕوابـوون و بـە درۆتـان دادەنـا، بیچێـژن.

﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَدۡنَىٰ دُونَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَكۡبَرِ ﴾، بــە دڵنیایــی ئێمــە لــە سـزای نیزیکتـر و کەمتریـان پـێ دەچێژیـن، بـەر لـە سـزای گەورەتـر، بەڵکـو بگەڕێنــەوە، واتــە: لــە دنیـادا سـزایان دەدەیـن.

ئنجا لەو بارەوە کە ئایا مەبەست لەو سزایە چییە؟

زانایـان زۆریـان قسـه کـردوه، بـەڵام واپێدەچـێ مەبەسـت پێـی ئـەو دەردو نەهامەتیـی و ناخۆشـیی و نەخۆشـیی و ناڕەحەتییانـە بـێ، کـە لـە ژیانـی دنیـادا بـە تایبـەت دێنـە ڕێـی بێبڕوایـان، ئـەو دەردو نەخۆشـیی و ناخۆشـییانەی بەهـۆی لادان لـە شـەریعەتەوە، دێنـە ڕێیـان، چونکـە ئـەو کەسـانەی تووشـی گوناهـو تـاوان دێـن، دوایـی باجـی قـورس قـورس دەدەن، لەسـەر گوناهـو تاوانەکانیـان، شـتی حـەڕام و قەدەغـە دەخـۆن، جەسـتەیان و عەقـڵ و نەفسـیان نەخـۆش دەبـێ، گوناهـو تـاوان دەکـەن، دیسـان کاریگەریـی نەرێنیـی خراپـی هەیـە بـۆ سـەر جەسـتەیان، بـۆ سـەر ڕووحیـان بـۆ سـەر عەقڵیـان، هەروەهـا بـۆ سـەر تـاك و بـۆ سـەر خێـزان، هەروەهـا ئەرکـە شـەرعییەکان جێبەجـێ ناکـەن، دیسـان تووشـی ناڕەحەتیـی و گرفتاریـی دێـن، بۆیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: سـزای کەمتریـان پـێ دەچێژیـن، سـزای نیزیکتـر، پێـش سـزای گەورەتـر و دواتـر کـە لـە ڕۆژی قیامەتـدا دێ، بۆچـی؟ ﴿لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾، تاکـو بگەڕێنـەوە، بەڵکـو بگەڕێنـەوە سـەر ڕاسـتە شـەقام.

لـە کۆتایـی دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعۡرَضَ عَنۡهَآ﴾، ئایـا کـێ سـتەمکارترە لـە کەسـێك کـە ئایەتەکانـی پـەروەردگاری بیـر بخرێنـەوە (بـە سـەریدا بخوێنرێنـەوە)، بـۆی بـاس بکرێـن، ﴿ثُمَّ أَعۡرَضَ عَنۡهَآ﴾، دوایـی پشـتیان تێبـکات، ڕوویـان لـێ وەربگێـڕێ؟ ﴿إِنَّا مِنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُنتَقِمُونَ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە تۆڵەسـتێنین لـە تاوانبـاران، تۆڵەیـان لـێ دەکەینـەوە، لـە ڕۆژی دوایـی دا، بەڵکـو لـە پێـش ڕۆژی دواییـش دا، تاوانبـاران هـەر لـە دنیاشـدا تووشـی چۆرتمـی خۆیـان دەبـن، تووشـی زۆر بـەڵاو نەهامەتیـی دێـن، بەهـۆی لادانیـان لـە شـەریعەتی خـواو، تـاوان و لادان و خراپەکانیانـەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

پێناسەی بڕواداران بە ئایەتەکانی خوا، لە میانی ژمارەیەك لە سیفەت و کردەوە پەسندەکانیاندا، هەروەها خستنەڕووی ئەو پاداشتەی کە هیچ زمانێك ناتوانێ وەسفی بکات، نە هیچ چاوێك دیتوویەتی، نە هیچ گوێیەك بیستوویەتی، نە هیچ عەقڵێکیش دەتوانێ لە خۆیدا جێی بکاتەوەو، تاکو تووشی نەبین نازانین چۆنە:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا ﴾، بە دڵنیایی تەنیا ئەوانە بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە هەیە، کە کاتێك بیریان دەخرێنەوە، لەپەو ڕوو دەکەونە کڕنووش بردن.

(**آیات**) لێرەدا بە مانای ڕستەکانی قورئانە، وەك دوایی بۆمان دەردەکەوێ، ئەگەرنا وشەی (**آیات**) واتە: نیشانەکان، دەگونجێ ڕستەکانی قورئان بن، فەرمایشتی خوا، دەشگونجێ دروستکراوەکانی خوا بن، دەشگونجێ موعجیزەی پێغەمبەران بن (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**)، بەڵام بە هۆی ڕستەی دوابییەوە دەزانین

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُجَّدًا ﴾، ئەوانـەی کاتێـك ئایاتەکانـی خوایـان بیـر دەخرێنـەوە، بۆیـان دەخوێنرێنـەوە، بەسـەریاندا دەخوێنرێنـەوە، لەپـەوڕوو دەکەونـە کڕنـووش بـردن.

بـە (**فِعْـل المُضـارِع**) هێناویەتـی: ﴿ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا ﴾، کـە دەلالـەت لەسـەر بـەردەوام بوونـی کارێـك دەکات، لـە ئێسـتاو لـە داهاتـوودا، لەبـەر ئـەوەی ئیمانەکەیـان تـازە دەبێتـەوە بـە ئایاتەکانـی خـوا.

﴿ ذُكِّرُواْ بِهَا ﴾، (**التَّذْكِيـرُ: إِعَـادَةُ ذِكرِهَـا عَلَيْهِـم**)، واتـە: بیریـان دەخرێتـەوە، یاخـود بۆیـان بـاس دەکرێتـەوە، جـار لـە دوای جـار، واتـە: پێشـتر ئایاتەکانیـان بیسـتوون، گوێبیسـتیان بـوون، بـەڵام دووبـارە بیریـان دەخرێنـەوە، ﴿ خَرُّواْ ﴾، (**سَـقَطُوا**) کەوتـن، (**خُـرُور**) یانـی: (**سُـقوط**)، لەپـەوڕوو کەوتـن، ﴿ خَرُّواْ سُجَّدًا ﴾، (**أَي: سَـقَطُوا سَّـاجِدِينَ**)، (**سُـجَّد**) کـۆی (**سـاجِد**)ە، لەپـەوڕوو بـە کڕنووشـدا دەکـەون.

٢)- ﴿ وَسَبَّحُواْ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ﴾، بە ستایشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاك دەگرن، واتە: (**سَبَّحُوهُ مُتَلَبِّسِينَ بِحَمْدِهِ**)، بە پاکی دەگرن لە حاڵێکدا کە سەرگەرمی ستایش کردنیشینی، واتە: لە یەك کاتدا، هەم ستایشی دەکەن، هەم بە پاکی دەگرن، بە پاکگرتنی خواش یانی: دوورخستنەوەی خوا و، بە بەرزگرتنی خوا ﷻ، لە هەر شتێك کە شایستەی خوا نیە، لە زاتیدا، لە سیفەتەکانی دا، لە ناوەکانیدا، لە فەرمایشتەکانیدا، لە کردەوەکانیدا، لە پەیامەکەی دا، ستایشکرنی خواش، واتە: وەسف کردنی خوا بە سیفەتە بەرزو چاکەکانی و، پێشکەشکردنی ستاییش و مەدح و سەنا بۆی، وەك بۆی شایستەیە.

٣)- ﴿ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾، ئەوانە خۆیان بە زلناگرن، لە بەرانبەر ئایەتەکانی خواو ئایینی خواو پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆیان بە زل ناگرن.

٤)- ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ ﴾، (**تَتَجَافَى أَي: تَتَبَاعَدُ، جُنوُبهم عَنْ فُرُشِهِم وَتَرْتَفِع**)، کەلەکەو تەنیشتەکانیان دوور دەکەونەوە، لە جێگەی ئیسڕاحەت تێدا کردنیان و، بەرز دەبنەوە، ﴿ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ ﴾، وەك پێشتر گوتمان: (أل)ی، سەر ﴿ ٱلْمَضَاجِعِ ﴾، قەرەبوو

(عِوَض)ە، بۆ پاڵوە لادراو (مُضافُ إِلَيهِ)، واتە: (تَتَجافى جُنُوبُهُم عَنْ مَضَاجِعِهِم) کەلەکەو تەنیشتەکانیان لە شوێنی ڕاکشان و پشوودانیان، بەرز دەبنەوەو دوور دەکەونەوە.

٥)- ﴿ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا ﴾، بە ترس و ئومێدەوە لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، (أَي يَدعُونَ رَبَّهُم خائِفِينَ طامِعِين)، بە ترسان و هیواوە لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، هەم ترسیان هەیە لە سزای خوا، بە هۆی خراپەو تاوانەکانیانەوە، هەم ئومێدو تەماعیشیان هەیە بە بەزەیی خوا، بە هۆی چاکەکانیانەوە.

٦)- ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾، لەوەی کە پێمانداون دەبەخشن، لەوەی پێمانداون: ماڵ و سامانە، زانیارییە، عەقڵە، پێگەی کۆمەڵایەتییە، هەر شتێك کە پێمانداون و لێی بەهرەمەندمان کردوون، لێی دەبەخشن، واتە: خەڵکی دیکەی لێ بەهرەمەند دەکەن، ئنجا کەسانێك ئاوان، پاداشتیان چۆنە؟.

٧)- ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ ﴾، هیچ کەسێك نازانێ، ئەوەی بۆیان پەنهان کراوە، لە شتێك کە مایەی شادمانیی و دڵخۆشییانە، ﴿ مَّا أُخْفِيَ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (فَلاَ تَعْلَمُ نَفسٌ ما أَخفَى لَهُم)، یانی: ئەوەی خوا بۆی پەنهانکردوون، ﴿ مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ ﴾، لە: (قَرَّت عَيْنُهُ) دڵخۆش بوو، هاتوە، چونکە مرۆڤ کە زۆر دڵخۆش دەبێ، فرمێسکی شادیی دێ و، فرمێسکی شادییش فێنك وساردە و، بە پێچەوانەی فرمێسکی خەمباریی و دڵتەنگییەوە، کە گەرمە، ئنجا لەوەوە (قُرَّةُ عَين)، واتە: دڵخۆش بوون، شادمان بوون.

٨)- ﴿ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾، پاداشتی ئەوەیە کە دەیانکردو ئەنجامیان دەدا.

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی قودسیی دا - کە پێشتریش لە مانای گشتیی دا هێنامان - پێناسەی بەهەشت و ئەوەی تێییدا ئامادە کراوەی کردوە، کە ئەمە دەقەکەیەتی و مانایەکەشیەتی:

{عَن أَبي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَالَ اللَّهُ تَعَالى: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لَا عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، فَاقْرَءُوا إِنْ

شـتُتُمْ:﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾السـجدة}
(أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد: ٨١٢٨، وَالبُخَـارِيُّ: ٣٠٧٢، وَمُسـلِم: ٢٨٢٤، وَالتِّرمِـذِيُّ: ٣١٩٧).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە ﷺ دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی، خـوای بـەرز فەرمووی: بـۆ بەنـدە چاکەکانـم شـتێکم ئامـادە کـردوە، کە هیـچ چاوێك نەیدیـوە و، هیـچ گوێیـەك نەیبیسـتوە و، بەسـەر دڵـی هیـچ مرۆڤێکیشـدا نەهاتـوە،} [ئنجـا پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی:] ئەگـەر دەتانـەوێ [زیاتـر لـە چەمکـی ئـەوەی کـە خـوا فەرمـووی، تێبگـەن]، ئـەو ئایەتـە بخوێننـەوە: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾السـجدة، واتـە: هیـچ نەفسـێك نازانـێ چییـان بـۆ پەنهـان کـراوە، لـەوەی کـە مایـەی شـادمانیی و دڵخۆشـییانە.

کەواتـە: سـەرجەم خـوا ﷻ نـۆ وەسـفی هێنـاون، بـۆ ئـەو کەسـانەی مەدحیـان دەکات، لەبـەر ئـەوەی بەنـدەی چـاك و هەڵبـژاردەی خـوان:

**١- ئیمان:** ﴿ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا ﴾.

**٢- کڕنووش بردن:** ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا ﴾.

**٣- بە پاکگرتن و ستایش کردنی خوا:** ﴿ وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ﴾.

**٤- خۆ بەزل نەگرتن:** ﴿ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾، پێچەوانەی خۆ بەزلگرییش بریتیە: لە خاکیی بوون و خۆ بە کەمگرتن و، ملکەچیی لە بەرانبەر خوادا.

**٥- بەرزبوونـــەوەی تەنیشتەکانیان لەســـەر جـێیەکانیان:** ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ ﴾، واتە: هەڵدەستن لەسەر جێیەکانیان کە زۆر لە زانایان دەڵێن: مەبەست پێی شەو نوێژە، بەڵام لەڕاستیی دا مەبەست پێی هەڵسانە لە کاتی پشوودانیاندا، بۆ خواپەرستیی، ئنجا چ شەو نوێژ بێ، چ نوێژە فەڕزەکان بن، چ نوێژەکانی دیکەی سوننەت بن.

**٦- بە ترس و هیواوە لە خوا پاڕانەوە:** ﴿يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا﴾، لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە: هەم ترسیشیان هەیە لە سزای خوا، بە هۆی خراپەکانیانەوە، هەم ئومێدو هیواشیان هەیە بە بەزەیی خواو بە بەخششی خوا، بە هۆی کردەوە چاکەکانیانەوە.

**٧- بەخشین لەوەی پێیاندراوە:** ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾، ئەوەی کە پێمان داون، زۆربەی زانایان وایان لێکداوەتەوە: لەو ماڵ و سامانەی پێمانداون!

بەڵام پێم وایە: ﴿وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ﴾، لەوەی پێمانداون و کردوومانەتە بژیویان، هەم شتی ماددیی دەگرێتەوە، هەم شتی مەعنەویی دەگرێتەوە، شتی ماددیی هەموو جۆرەکانی ماڵ و سامانە، خواردن و خۆراکە، بەرگ و پۆشاکە، هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە، شتە مەعنەوییەکانیش: زانیارییە، عەقڵە، پێگەی کۆمەڵایەتییە، لایەنی ڕووحییە، لایەنی ڕەوشتیی و ئاکارییە، هەرچی کە پێمان داون، لە شتی ماددیی و مەعنەویی لێی دەبەخشن، غەیری خۆیانی لێ بەهرەمەند دەکەن.

**٨- نەزانینی پاداشتی بۆ پەنهانکراو:** ﴿فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ﴾، هیچ کەس نازانێ چی بۆ پەنهانکراوە، لەوەی کە مایەی شادمانیی و زۆر دڵ پێ خۆش بوونیەتی.

**٩- پاداشتدرانەوە بەپێی کردەوە چاکەکان:** ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾، پاداشتدانەوەی ئەوە کە دەیانکرد، کەواتە: لە ئەنجامی کردەوەکانیان دا، ئەو بەهەشتەو ئەو پاداشتەیان بۆ دەستەبەر بووە.

**مەسەلەی دووەم:**

**بەراوردێکی نێوان بڕواداران و لا دەران، لە ڕووی پاداشتی ڕۆژی دواییەوە، کە بڕواداران لە بەهەشت داو، لادەران لە ئاگری دۆزەخ دان و، لێشی قوتار نابن و، بەر لەوەش خوا ﷻ لە دنیادا سزای گچکەتریان پێ دەچێژێ، بەڵکو بگەڕێنەوە، هیچ کەسیش لەو کافرە ستەمکارتر نیە کە پاش بیرخرانەوەی ئایەتەکانی خوا، پشتیان تێدەکات و پشتگوێیان دەخات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا ۚ لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَلَهُمْ جَنَّـٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُوا۟ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَآ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ ۚ إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە شازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا ﴾، ئایا کەسێك بڕوادار بووبێ، وەك کەسێکە کە لادەر بووبێ؟ هەمزە (أ)ی سەر ﴿ أَفَمَن ﴾ و، (**مَن**)یش و (**مَن**) کە دوایی دەفەرموێ: ﴿ كَمَن كَانَ فَاسِقًا ﴾، هەر سێکیان بۆ پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەن، واتە: من نکووڵیی دەکەم کە بابای بڕوادار، وەك بڕوای لا دەربێ، چ لە دنیا داو، چ لە دواڕۆژدا، بۆیەش دوایی دەفەرموێ:

٢)- ﴿ لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴾ یەکسان و وەك یەك نین، ئایا کەسێك بڕوادار بووبێ، وەك کەسێك وایە لادەر بووبێ؟ ﴿ لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴾، بە تەئکید یەکسان نین، وەك یەك نین، کە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴾، ئەمە بادانەوەی ڕوونکردنەوە (**عَطفَ بَیان**)ی، پێ دەڵێن،

بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستەکەیە، یانی: ئەو دووانە وەك یەك نین و، پێکەوە ناخرێنە تەرازوویەکەوە.

جێـی سـەرنج ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ بـڕواداری بـەراورد کـردوە لەگەڵ لادەر (فاسـق) دا، کـە بـە دڵنیایـی لێـرەدا مەبەسـت لـە (**فاسـق**) کەسـێکە لـە ڕێـی خـوا دەرچـووە بـە تەواویـی، یـان: لـە حوکمـی عەقـڵ دەرچـوە و، لـە زگماکـی خـۆی دەرچـوە و، لـە حوکمـی شـەریعەت دەرچـوە بـە تەواویـی، چونکـە فاسـیق جـاری واش هەیـە بـۆ کەسـێك بەکاردەهێنـرێ، کـە بـە شـێوەی بەشـیی (**جزئـي**) دەرچووبـێ و تووشـی گوناهێکـی گـەورە بووبـێ، هـەروەك جـاری واش هەیـە (فسـق) لـە قوڕئانـدا بـە مانـای دەرچوونـی گەورەیـە، کـە دەبێتـەوە بـە پێناسـە بـۆ بابـای بێبـڕوا.

ئنجا خوا ﷻ ڕوونیان دەکاتەوە، بڕوادار و لادەر حاڵیان چۆنە؟

٣)- ﴿ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡمَأۡوَىٰ ﴾، ئنجا هەرچی ئەوانەن کە بڕوایان هێناوە، بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ و، کردەوە باشەکانیشیان ئەنجام داون، ئەوانە:

بـە هەشـتەکانی شـوێنی حەوانەوەیـان، هـەن، لێـرەدا: ﴿ جَنَّٰتُ ٱلۡمَأۡوَىٰ ﴾، (**إِضَافَةُ المَوْصُوفِ إِلَـى صِفَتـه**)، ئەمـە پاڵدانـی وەسـفکراوە بـۆ لای سـیفەتەکەی، چونکـە ئەمە وەك (**مَسـجِدُ الجامِـع**)ە، مزگەوتێـك کـە کۆکەرەوەیـە، لێرەشـدا: ﴿ جَنَّٰتُ ٱلۡمَأۡوَىٰ ﴾، یانـی: جێـی حەوانەوەیـەك کـە بریتیـە: لـە باخـەکان، هەروەهـا: (**مَسـجِدُ الجامِـع**)، یانـی: کۆکەرەوەیـەك کـە شـوێنی سـەجدە تێـدا بـردن و نوێـژ تێداکردنـە.

ئنجـا ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو کردەوە باشـەکان، ئەنجـام دەدەن، ئەوانـە باخەکانی شـوێنی حەوانەوەیـان هـەن، یـان شـوێنێکی حەوانـەوەو پشـوودانیان هەیـە، کـە لـە بـاخ و بێسـتان و گـوڵ و گوڵـزارە، ﴿ ٱلۡمَأۡوَىٰ ﴾ش، کـە (أل)ی ناسـاندنی لەسـەرە، بـۆ (عهـد)ە، واتـە: جێگـەی حەوانەوەکـەی بـڕواداران، یاخـود (أل)ەکـە، قەرەبـوو (**عِـوَض**)ی پاڵـوە لادراو (**مُضـافُ إِلَيـهِ**)ە، یانـی: ئـەو باخانەیـان هـەن، کـە جێـی تێـدا سـرەوتنیانن.

٤)- ﴿ نُزُلَۢا بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، ئەوە میوانداریی کردنیانە، بە هۆی ئەوەوە کە دەیانکرد، (نُزُل)، (عَطاءُ النَّازِل)، کەسێك کە دەچێتە لای کەسێك و دادەبەزێ لە لای، ئەو شتەی کە دەیداتێ، پێی دەگوترێ: (نُزُل)، دوایی چەمکەکەی گشتێنراوە، با کەسێکیش نەچێتە لای کەسێك و، با لە وڵاخێك و لە ئامرازی سوارییش دانەبەزێ، بەس بچێ بۆ لای، پێی دەگوترێ: (نَزَلَ عَلَیهِ)، واتە: بوو بە میوانی، لەبەر ئەوەی عادەت وابووە، بە زۆریی ئەو کەسانەی بوونە میوان، کە بە بار و سوار چوون و لایانداوەتە لای خانە خوێیەکەیان.

٥)- ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ فَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ﴾، بەڵام ئەوانەی کە لاڕێ بوون، لایانداوە، [دەرچوون لە بازنەی عەقڵ و زگماك و شەریعەت]، ئەوانە جێگای حەوانەوە و پشوودانیان ئاگرە، ئاگری دۆزەخ، کە بە دڵنیایی لەنێو ئاگری دۆزەخدا، نە پشوو دەدرێ و نە مرۆڤ ئیسراحەت دەکات، واتە: ئەگەر شوێنێك هەبێت بۆ ئەوان پشووی تێدا بدەن و، پەنای پێ بەرن، بریتیە لە ئاگری دۆزەخ.

٦)- ﴿ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا ﴾، هەر کاتێ ویستیان لێی بچنە دەر، دەگێڕدرێنەوە نێوی، ئەمە لە سووڕەتی (الحج)دا، بە تەعبیرێکی دیکە هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا مِنۡ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ ﴾، هەر کاتێك ویستیان لە خەم و خەفەتان (بە خەم و خەفەتی زۆرەوە) لێی بچنە دەر، لە ئاگری دۆزەخ، دەگێڕدرێنەوە نێوی و، (پێیان دەگوترێ:) بیچێژن سزای سووتێنەر.

٧)- ﴿ وَقِيلَ لَهُمۡ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴾، پێیان گوترا: بیچێژن ئازاری ئەو ئاگرەی کە ئێوە بە درۆتان دادەنا، بڕواتان پێ نەدەکرد، ئەم تەعبیرە لە سووڕەتی (سبأ)دا، ئاوا هاتوە: ﴿ وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾، بەوانەی ستەمیان کردوە، دەڵێین: بیچێژن ئەو سزای ئاگرە کە پێی بێبڕوا بوون، بە درۆتان دادەنا، لێرە لە (السجدة)دا، کە ناوی (موصول)ی نێر بەکارهاتوە: ﴿ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴾، ﴿ ٱلَّذِي ﴾، بۆ (عذاب) دەچێتەوە، ئەو ئازارەی کە پێی بێبڕوا بوون، بەڵام لە (سبأ)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ

﴿ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿٤٢﴾﴾سبأ، ناوی (موصول)، (التي) بۆ ئاگر دەچێتەوە، ئەو ئاگرەی بڕواتان پێی نەبوو، ئەوانەش کە بێبڕوان، هەم بڕوایان بە سزاو ئازارەکە نیە، هەم بڕواشیان بە خودی ئاگرەکەش هەر نیە.

٨)- ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ﴾، بە دڵنیایی لە سزای کەمتر یاخود: نزیکتریان پێ دەچێژین، پێش سزای گەورەتر، کە سزای دۆزەخە.

مەبەست لە پێچێژتنی سزای نیزیکتر، یاخود گچکەتر، یان لە پێشتر: ئەو بەڵاو گرفتاریی و نەخۆشیی و ناخۆشییانەن کە تووشی مرۆڤەکان دێن، بە تایبەتیی بێبڕوایان، کە ئەوان وێڕای هی گشتیی، هەندێك سزاو ئازار و نارەحەتیی و نەخۆشیی و ناخۆشیی تایبەتییشیان هەن، بە هۆی گوناهو تاوانەکانیانەوە، وەك ترس، دڵتەنگیی و، دڵە ڕاوکەو، نا موررتاحیی و، ئەو دەردو نەخۆشییە جەستەییانەی کە لە حاڵەتە دەروونە خراپەکانەوە پەیدادەبن، لە گومان و لە دوو دڵیی، لە شیرك، لە بێبڕوایی، لە نا ئومێدیی، لە هەست نەکردن بە چاودێریی خوا و، هەست نەکردن بە سەرپەرشتیی کردنی خوا و، بەزەیی خوا بەرانبەر مرۆڤ و، ترسان لە داهاتوو، هەمیشە دڵ لە مستدا بوون لە ترسی مردن و لە ترسی ڕزق و، لە ترسی نەخۆشیی و ناخۆشیی، ئا ئەوانە، وەك لە تەفسیری سوورەتی (**الشعراء**)دا، باسمان کرد: [ئایەتەکانی پێش کۆتایی]، لە ئەنجامی کوفر و شیرك و بێبڕوایی و دوو ڕوویی و لە خوا دوورکەوتنەوەدا، کۆمەڵێك نەخۆشیی و ناخۆشیی جەستەیی و، دەروونیی و عەقڵیی و ڕەوشتیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی، بۆ مرۆڤ دێنە پێش، کە ئەوەش هەمووی چەمکی: ﴿ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ﴾، دەیانگرێتە خۆی.

﴿دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ﴾، پێش ئازاری گەورەتر مەبەست پێی ئازاری و سزای دۆزەخە، کە گەورەییەکەی بەراورد ناکرێ لەگەڵ ئەو نارەحەتیی و نەخۆشیی و ناخۆشییانەی لە دنیادا، بەسەر مرۆڤەکان بە گشتیی و، بە تایبەت بەسەر بێبڕوایان و هاوبەش بۆ خوا دانەراندا دێن، بۆچی ئەوەیان پێ دەچێژین؟.

٩)- ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾، بەڵكو بگەڕێنەوە، واتە: لە كوفرەوە بۆ ئیمان بگەڕێنەوە، لە گوناهەوە بۆ تاعەت و فەرمانبەریی، لە خراپەكارییەوە بۆ چاكەكاریی و، لە خوا دووركەتنەوەوە، بۆ لە خوا نیزیك بوونەوەو، لە دژایەتیی خواوە، بۆ دۆستایەتیی خوا بگەڕێنەوە.

١٠)- ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ، ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ﴾، دیسان خوا ﷻ وەك پرسیاركردنی نكووڵییلێكەرانە دەفەرمویٚ: كێش ستەمكارترە لە كەسێك كە ئایاتەكانی پەروەردگاری دەخرێنەوە بیر، كەچی دوایی پشتیان تێدەكات؟ یانی: هیچ كەس لەو ستەمكارتر نیە، ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ﴾، كێ ستەمكارترە؟ واتە: كەس لەو كەسە ستەمكارتر نیەو، خراپەكارتر نیە، كە ئایاتەكانی پەروەردگاری دەخرێنەوە یادو بۆی باس دەكرێن، پێشتر بیستوونی گوێبیستیان بووە، بەڵام بۆی دووبارە دەكرێنەوەو بیری دەخرێنەوە، ﴿ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ﴾، كەچی دوایی ئەو پشتیان تێدەكات، ﴿ثُمَّ﴾ لێرەدا بۆ ڕیزبەندیی و بەدواداهاتن (**للترتیب و التراخي**)ە، چونكە پشتكردنە ئایاتەكانی خوا، دوورترەو، پلەكەی بەرزترە، لە ڕووی خراپییەوە و زیاتر جێی سەرسوڕمانە، لە حاڵەتی پێشتریان كە كوفرە، دوای ئەوەی كەسێك بێبڕوایە، بەڵام ئایەتەكانی خوای دەخرێنەوە بیر، كەچی هەر پشتیان تێ بكات، كەسی وا كوفرەكەی تۆختر دەبێتەوەو بەردەوام زیاد دەكات.

١١)- ﴿إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ﴾، بە دڵنیایی ئێمە تۆڵەستێنین، تۆڵەكەرەوەین لە تاوانباران.

كەواتە: سەرجەم ئەو سیفەتانەی كە لادەر و لاڕێیەكان پێیان پێناسە كران، دەتوانین بڵێین: پێنج خەسڵەتی زۆر خراپی بنەڕەتیین:

**١- لە ڕێ دەرچوون:** ﴿أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا﴾، فاسیق، واتە: لە ڕێ دەرچوو (لادەر) كە لێرەدا لە ڕێ دەرچوون و لادانی بنەڕەتیی و یەكجارەكیی مەبەستە، واتە: لە حوكمی عەقڵ دەرچوون و، لە حوكمی زگماك دەرچوون و، لە حوكمی شەریعەت دەرچوون و، بە هیچ شتێكەوە ناگیرێنەوە و، بە تەواویی دەرچوون.

**٢- بە درۆ دانان:** ﴿ وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴾، بێبڕوایی و بە درۆ دانان، لە دوای دەرچوون (فسق) ئنجا بە درۆ دانان، کەسێك کە لە شەریعەت دەردەچێ، لە حوکمی عەقڵ و زگماك دەردەچێ، بە تەئکید ئایاتەکانی خواش بە درۆ دادەنێ.

**٣- ستەمکاریی:** ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِۦ ﴾، بەڵکو ئەوپەڕی ستەمکاریی، واتە: کێ ستەمکارترە لە کەسێك کە ئایەتەکانی پەروەردگاری دەخرێنەوە یاد، بیری دەخرێنەوە و ئەو پشتیان تێ دەکات؟!.

**٤- پشت تێکردن:** ﴿ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ ﴾، پشتتێکردن و ڕوو وەرچەرخاندن لە ئایەتەکانی پەروەردگار.

**٥- تاوانباریی:** ﴿ إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە تۆڵەستێنین لە تاوانباران، واتە: ئەو تاوانبارانەی کە ئەو سیفەتانەیان تێدا هەن، ئێمە تۆڵەیان لێ دەکەینەوەو وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرناچن.

کەواتە: خوا ﷻ لە کاتی بەراوردکردنی بڕواداران و لادەران دا، بڕوادارانی بە نۆ سیفەتیان پێناسە کردن و، لادەران و لاڕێیانیشی بە پێنج لە سیفەتە بنەڕەتیی و، سەرەکییەکانیان پێناسە کردن، کە یەك لە یەك خراپترن.

## مامەڵەی ڕاست و دروست لەگەڵ قوڕئان دا:

لە کۆتایی ئەم دەرسەماندا دەڵێم:

بێگومان خوا ﷻ کە لە سەرەتاوە دەفەرموێ: تەنیا ئەوانە بڕوایان بە ئایاتەکانی ئێمە هەیە، کە ئەوە حاڵ و حیسابیانە: کاتێك ئایەتەکانمانیان دەخرێنەوە بیر بە کڕنووشدا دەکەون، پەروەردگاریان بە پاك دەگرن و ستایشی دەکەن، خۆیان بە زل ناگرن، کەلەکەو تەنیشتەکانیان لەسەر جێیەکانیان هەڵدەستن بۆ خوا پەرستیی، لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، بە ترسەوەو بە ئومێدەوە و، لەوەی کە پێمانداون لە هەموو جۆرەکانی پێدراوەکان، دەبەخشن، ئەوانە خاوەنی کردەوەی باشن، کاتێ خوا ﷻ دەفەرموێ: تەنیا ئەوانە بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە هەیە، واتە: ئەی مرۆڤ! ئەگەر دەتەوێ بە بڕوادار لە قەڵەم بدرێی، ئەو سیفەتانە لە خۆتدا بێنە دی و، خۆت بەو سیفەتانە بڕازێنەوە.

دواییش بەراوردی نێوان بڕوادار و لادەرو لاڕێ دەکات، ئنجا بە کورتیی باسی پاداشتی بڕواداران دەکات، کە بە هەشت و باخ و بێستانەکان شوێنیانن، پاشان دێتە سەر باسی لادەرەکان و، پێنج لە سیفەتە سەرەکییەکانیان دەخاتە ڕوو.

کەواتە: ئێمە دەبێ ئایەتەکانی قوڕئان بکەینە ئاوێنەیەك و خۆمانیان لە بەرانبەردا ڕابگرین: ئایا کام لەو سیفەتانەی کە خوا بۆ بڕواداران، بۆ دۆستەکانی خۆی، بۆ بەندە صاڵحەکانی بە کاری هێناون، تەماشای خۆمان بکەین، کام لەو سیفەتانەمان تێدان؟ سوپاس و ستایشی خوایان لەسەر بکەین، کامیش لەو سیفەتانەمان نوقسانە، چاو بە خۆماندا بگێڕینەوەو ئەو سیفەتانە لە خۆماندا بێنینە دی.

هەروەها بە پێچەوانەشەوە: جارێکی دیکە ئایەتەکان بکەینە ئاوێنەیەك و لە بەرانبەری خۆمانیدا دابنێین، خۆمان لە ئاوێنەی فەرمایشتی خوادا ببینین، بزانین

کام لەو سیفەتانەی کە خوا ناحەزان و دوژمنانی خۆی: بێبڕوایان و دەغەڵان و هاوبەش بۆ خوا دانەران و لاڕێیانی پێ پێناسە کردوون، کام لەو سیفەتانەمان تێدان، خۆمانیان لێ بێزار بکەین و، پاك بکەینەوە و، پێچەوانەکانیان لە خۆماندا بێنینە دی.

بۆیە دەبێ بەو چاوە تەماشای قورئان بکرێ و، لە ڕاستییدا قورئانیش بۆ ئەوە هاتووە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٢٩ ﴾ص، واتە: ئەمە قورئانێکە دامانبەزاندوە بۆ لای تۆ، بەرهەمدارە، بەپێزە، تاکو لە ئایاتەکانی ورد ببنەوە، بۆ ئەوەی خاوەن عەقڵان پەندی لێ وەربگرن.

یانی: ڕاستییەکانیان بەهۆی قورئانەوە بکەوێتەوە یاد و، ئەو ڕاستییانە کار پێبکەن و، خۆیان بە سیفەتە بەرزو پەسندەکان بڕازێننەوە و، خۆشیان لە سیفەتە نزم و پەستەکان بێزار بکەن.

خوا عزوجل بە لوتف و کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە هەرچی قورئان، دۆستانی خواو بەندە چاکەکانی خوای پێ مەدح کردوون، هەوڵبدەین ئەو سیفەتانە لە خۆمان دا بێنینە دی و، هەموو سیفەتانەی کە لە قورئاندا، دوژمنان و ناحەزانی خوا لە کافرو مونافیق و هاوبەش بۆ خوا دانەرو لادەرو لاڕێ، پێیان وەسف کراون، ئەو سیفەتانە لە خۆمان دوور بخەینەوەو، خۆمانیان لێ بێزار بکەین.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، سەرەنجامی دنیاو دوارۆژمان خێر بکات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان دەرسـی سـێیەم و کۆتاییـە، لـە تەفسـیری سـوورەتی (السـجدة)، ئـەم دەرسـەمان لـە (٨) ئایـەت پێکهاتـوە، ئایەتەکانـی: (٢٣ - ٣٠)، لـەم هەشـت ئایەتـەدا، خـوا ﷻ باسـی ئـەوەی کـردوە کـە کتێبـی بـە مووسـا ﷺ داوە، واتـە: تـەورات، وەك ڕێنمایـی بـۆ گەلەکـەی مووسـا، بـۆ بەنـوو ئیسـڕائیل، کـە بـە هـۆی خۆڕاگریـی و یەقینـەوە لـە نێـو گەلـی بەنـوو ئیسـڕائیلدا کەسـانێکی پێشـەواو، سـەرکردەو، سەرمەشـقیان تێـدا هەڵکەتـوون.

دوایـی خـوا ﷻ باسـی لێکهەڵاوێردرانـی پـاك و پیسـانی کـردوە، لـە قیامەتـدا، کـە لێکهەڵداوێردرێـن، لێـك جیـا دەکرێنـەوە، پاشـان سـەرنجمان بـۆ هـەر کام لـە مێـژووی گەلانـی ڕابـردوو و، دیـاردەی زینـدوو بوونـەوەی زەوی وشـك بـە ئـاوی ئاسـمان، ڕادەکێشـێ.

لـە کۆتاییشـدا لـە وەڵامـی پەلەکردنـی بێبڕوایانـدا، بـە هاتنـی بەڵێنـی خـوا، کـە مەبەسـتیان قیامـەت، یاخـود سـزای خـوا بـووە، باسـکراوە، کـە لـە کاتـی هاتنـی بەڵێنـی دادوەریـی کردنـی خـوادا، بڕواهێنانـی کافـران سـوودیان پێناگەیەنـێ و، هیـچ دادێکیـان نـادات.

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ ۖ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى
لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٣﴾ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا
يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٢٥﴾
أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ

لَأٓيَـٰتٍۚ أَفَلَا يَسۡمَعُونَ ﴿٢٦﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا نَسُوقُ ٱلۡمَآءَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡجُرُزِ فَنُخۡرِجُ بِهِۦ
زَرۡعٗا تَأۡكُلُ مِنۡهُ أَنۡعَٰمُهُمۡ وَأَنفُسُهُمۡۚ أَفَلَا يُبۡصِرُونَ ﴿٢٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡفَتۡحُ إِن
كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٢٨﴾ قُلۡ يَوۡمَ ٱلۡفَتۡحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِيمَٰنُهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ
﴿٢٩﴾ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَٱنتَظِرۡ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴿٣٠﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی کتێبەکەمان (تەوڕاتمان) بە مووسادا، ئنجا هیچ دوو دڵ مەبە لە دیداری وی [لەگەڵ خوادا] و کردیشمانە ڕێنمایی بۆ بەنی ئیسرائیل ﴿٢٣﴾ پێشەوایانێکیشمان لێ پەیداکردن، کە بە فەرمانی ئێمە، ڕێنمایی (خەڵك)یان دەکرد بە هۆی خۆڕاگرییان و بڕوا پتەوییانەوە بە ئایەتەکانمان ﴿٢٤﴾ بێگومان پەروەردگاری تۆ، خۆی لە ڕۆژی قیامەتدا، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونەتە ڕاجیاییەوە، دادوەرییان لە نێواندا دەکات ﴿٢٥﴾ ئایا ئەوە کە لە پێش واندا گەلێك سەدەمان فەوتاندوون، کە (ئەمان ئێستا)، بە نێو (شوێنەوارو)، خانووبەرەکانیاندا دەڕۆن، بۆیان نەبۆتە ڕێنمایی و بۆی ڕوون نەکردوونەوە (کە دنیا شاری بێ خاوەن نیە!)؟ بێگومان لەوەدا نیشانە هەن (لەسەر باڵا دەستیی خوا)، ئایا (هەق) نابیستن؟ ﴿٢٦﴾ ئایا نەیانبینیوە کە ئێمە ئاو بەرەو زەوییەکی وشك و ڕووتەن دەبەین، ئنجا کشتووکاڵێکی پێ (لە زەوی) دەردێنین، کە ئاژەڵەکانیان و خۆیان لێی دەخۆن، ئایا نابینن؟ ﴿٢٧﴾ دەشڵێن: ئەو دادوەرییە کەیە، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن؟ ﴿٢٨﴾ بڵێ: ڕۆژی دادوەریی ئەوانەی بێبڕوان، بڕوایەکەیان سوودیان پێناگەیەنێ و، ئەمان مۆڵەتیش نادرێن ﴿٢٩﴾ (کەواتە) ڕوویان لێ وەرگێڕەو چاوەڕێبە، ئەوانیش چاوەڕێن ﴿٣٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(مِرۡيَةٖ): (المِريَـةُ: الشـكُّ والتَّـرَدُّد)، (مِرْيَـة): دوو دڵیـی و دڵ لـە دڵدانـە، (ظَـنّ): بریتیـە لـە گومانێکـی زاڵ، (شَـكّ) و (مِريَـة) بـە مانـای لـە دوو دڵیـی و، دڵ لـە دڵدانن.

(يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ): دادوەرییـان لـە نێوانـدا دەکات، (الفَصْـلُ: القَضَـاءُ والحُكْـمُ)، (فَصْـل): بریتیـە لـە دادوەریـی و بڕیـاردان لـە نێوانـی دوو، یـان چەنـد لایەنێکـی پێکـەوە ناکۆکـدا.

(أَوَلَمۡ يَهۡدِ لَهُمۡ): ئایـا بـۆی ڕوونەکردوونـەوە، بـۆی دەرنەخسـتوون؟ (يَهْـدِي مِـنَ الهِدَايَـةِ، وَهِـيَ الدِّلَالَـةُ والإِرْشَـادُ، وَضُمِّـنَ فِعْـلُ يَهْـدِي مَعْنَـى يُبَيِّـنُ، فَعُـدِّي بالـلَّام)، (هَـدَاهُ)، بـە مانـای ڕێنمایـی کـرد، یـان خسـتیە سـەر ڕێ، وشـەی (يَهۡدِ) لـە (هداية) ەوە هاتـوە، بـە مانـای ڕێ پێشـاندان و ڕێنمایـی کردنـە، بـەڵام لێرەدا وشـەی (يَهۡدِ) مانـای (يُبَيِّـنُ)ی تێخـراوە، بـە بەڵگـەی ئـەوەی کـە بـە (ل) بـەرکار پێخـوازراوە (يَهۡدِ لَهُمۡ)، ئەگەرنـا دەگونجـا بفەرمـوێ: (أَوَلَـم يَهدِهِـم)، یانـی: ڕێنمایـی نەکـردن و بـۆی دەرنەخسـتن: (أَوَلَـم يُبَيِّـن لَهُـم)؟.

(ٱلۡجُرُزِ): (الأَرْضُ الجُـرز: الَّتِـي انْقَطَـعَ نَبْتُهَـا)، (جُـرز) زەوییەکـە کـە پێشـتر ڕووەکـی لێبووبـێ، بـەڵام ئێسـتا ڕووەکـی لـێ نەمابـێ و وشـك و ڕووتـەن بووبـێ.

(نَسُوقُ): لێـی دەخوڕیـن و دەیبەیـن، (السَّـوْقُ: إزجـاءُ الماشـي مـن ورائـهِ)، (سَـوق): ئەوەیـە کەسـێك لـە دواوە بـێ، شـتێك بداتـە پێـش خـۆی و بیبـات بـەرەو ئـەولا، بۆیـە بـە شـوفێری ئۆتۆمۆبێـل دەگوتـرێ: سـائیق، چونکـە سـەیارەکە بـەرەو پێشـەوە دەبـا، هەروەهـا کەسـێك کـە ئاژەڵ دەبـات بـۆ ئـاودان، یـان بـۆ لـە وەڕگا، ئەویـش دیسـان کارەکـەی پێـی دەگوتـرێ: لێخوڕیـن (سَـوْق)، خـواش ﷻ کـە هـەورەکان پـاڵ پێـوە دەنـێ و ئـەو ئـاوە دەبـات، دەفەرمـوێ: ﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا نَسُوقُ ٱلۡمَآءَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ

﴿ٱلۡجُرُزِ﴾، ئایا نابینن ئێمە ئاو دەبەین بەرەو زەوییەکی وشکهەڵاتو و، یاخود: ڕووتەن و کە پێشتر کشتوکاڵی لێبووەو ئێستا لێی نەماوە.

(ٱلۡفَتۡحُ): (**الفَتْحُ: النَّصْرُ والقَضَاء**)، (**فَتح**) بە مانای سەرخستن و دادوەریی لە نێوان کردن دا دێ.

(يُنظَرُونَ): (**يُمْهَلُون وَيُنْتَظَرُون**)، ﴿وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ﴾، واتە: مۆڵەتیان نادرێ و، چاوەڕێ ناکرێن.

(فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ): ڕوویان لێ وەرگێڕە، پشتگوێیان بخە، (**الإعْرَاضُ: إظْهَارُ العُرْضِ، وَهُوَ صفحة العُنُقِ**)، (**عُرْض**) بە لامل (**صَفْحَةُ العُنُق**) دەگوترێ، (**إعْرَاض**)یش ئەوەیە کە تۆ شتێك، یان کەسێك لاملی تێبکەی، ئەگەر ڕووی تێبکەی (**إقبال**)ی پێ دەگوترێ، ڕوو تێکردن، بەڵام (**إعْرَاض**) ئەوەیە لاملی تێبکەی، کە لاملت تێکرد مانای وایە ڕووت لێوەر گێڕاوە بەولاوە چووی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە کۆتایی سوورەتی (**السَّجْدَة**)دا، ئەو ڕاستییە دەخاتە ڕوو، کە لە پێش تۆشدا ئەی موحەممەد ﷺ! پێغەمبەرانی دیکە بوون و کتێبمان پێیداون و، کتێبەکە بۆیان بۆتە ڕێنمایی و ڕێ پێشاندەر، کە زەقترینیان و نیزیکترینیان، کە هەم خەڵکی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ پێی ئاشنا بووبێ و، ناوبانگی بیستبێ، مووسایە، کە هەم لە ڕووی جوگرافییەوە، هەم لە ڕووی کاتەوە، هەم لە ڕووی ئەوەشەوە کە جوولەکەکان، خاوەن کتێبەکان، لە نیوە دورگەی عەرەبییدا بوون، باس و خواسی تەورات و مووسا عليه السلام ئایینی جوولەکە، لە نێویاندا زۆرباو بووە، پاشانیش مووسا یەکێك بووە لە پێغەمبەرە زۆر دیارو پایە بەرزەکانی خوا ﷻ بەڵێ تەنیا بۆ گەلی بەنی ئیسرائیل نێردراوە، بەڵام هەڵبەتە بە پلەی

یەکەم بۆ بەنوو ئیسرائیل، ئەگەرنا خوا نارد بووی بۆ لای گەلی فیرعەونیش، قیبتییەکانی میسڕ، کە ئەو کاتەش مرۆڤایەتیی ئەوەندە زۆر نەبووە، لە شوێنێکی وەك میسڕ، لە شوێنێکی وەك میزۆپۆتامیاو، لە هیند و چین، لەملاو لەولا، لە نێوە دورگەی عەرەبیی، کەواتە: مووسا ﷺ زۆر دیار بووە، بۆیە خوا ئەو بە نموونە دێنێتەوەو، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە کتێبمان بە مووساش دابوو.

وشەی ﴿ ٱلۡكِتَٰبَ ﴾، کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، بۆ (عهد)ە، واتە: کتێبەکەمان بە مووسادا، ئەو کتێبەی کە دیارە تەوڕاتە، ﴿فَلَا تَكُن فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآئِهِۦ ﴾، ئنجا تۆ لە دوو دڵیی دا مەبە لە دیداری ویدا.

دوایی لە مەسەلە گرنگەکان باسی دەکەین، مشتومڕێکی زۆر بووە لە نێوان توێژەرەوانی قوڕئاندا، ئایا مەبەست لەو (لِّقَآئِهِۦ)، چییەوە؟ ڕاناوەکە بۆ کێ دەچێتەوە؟ ﴿فَلَا تَكُن فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآئِهِۦ ﴾:

أ- ئایا مەبەست ئەوەیە کە تۆ دوو دڵ مەبە، لەوەدا کە مووسا تەوڕاتی وەرگرتوە؟ هەندێك وایان لێکداوەتەوە.

ب- یاخود: مەبەست ئەوەیە: تۆ لە دوو دڵیی دا مەبە، لەوە کە ئەوەی تووشی مووسا بوو بە هۆی جێبەجێکردنی کتێبی خواوە، لە گرفتاریی و سەر ئێشە لەگەڵ بەنوو ئیسرائیل دا، دوو دڵ مەبە کە تۆش ئەو شتانەت تووش دەبن؟.

ج- یان: مەبەست ئەوەیە: تۆ دوو دڵ مەبە کە مووسات لە شەوی میعراج دا بینی؟.

د- یان: دوو دڵ مەبە کە تۆ لە بەهەشتێ مووسا دەبینی؟ ئەو ڕایانە هەموویان هەن، من ڕایەکم بە دڵە، کە لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشکی دەخەمە سەر، کە لە هیچ کام لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، ئەو سی (٣٠) تەفسیرەی لەبەر دەستم دان، پێموایە ئەو ڕایە لە هەموویان گونجاوترە، ئەویش ئەوەیە: ﴿فَلَا تَكُن فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآئِهِۦ ﴾، تۆ

دوو دڵ مەبە لە دیداری مووسا لەگەڵ پەروەردگاری دا، چونکە لە سوورەتی (**الأعراف**) دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا ﴿١٤٣﴾ ﴾، واتە: کاتێك مووسا هات بۆ دیداری ئێمە، ئەو ژوانگەیەی بۆمان دیارییکردبوو، مووسا ؏ کاتێك دەچێ بۆ دیداری خوای پەروەردگار تاکو تەوراتی لێ وەربگرێ، ئەمە گونجاوە لەگەڵ ئەم سیاقەی ئێرەدا، واتە: تۆ دوو دڵمەبە لەوەدا کە مووسا هات بۆ دیداری ئێمەو، تەوراتمان پێدا، ئنجا وەك چۆن تەوراتمان بەو داوە، ئاوا قورئانیشمان بە تۆ داوە.

﴿ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، ئەو کتێبەشمان گێڕا بە ڕێنمایی بۆ بەنی ئیسرائیل، ڕاناوەکە بۆ کتێب دەچێتەوە، ئەگەرنا دەشگونجا بۆ مووسا ؏ بچێتەوە، چونکە ئەویش ڕێنماییکار بووە بۆ گەلەکەی خۆی، کە بەنوو ئیسرائیلە، بەڵام لێرەدا باس باسی پێدرانی کتێبە بە مووسا ؏ و ڕاناوەکە وا نیزیکترە بۆ کتێب بچێتەوە، کە کتێبمان کردە ڕێنمایی بۆ بەنی ئیسرائیل، ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً ﴾، چەند پێشەوایانێکیشمان تێدا پەیداکردن، لە نێودا گێڕان، ﴿ يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا ﴾، بە فەرمانی ئێمە ڕێنماییان دەکرد، واتە: ڕێنمایی خەڵکیان دەکردو، ڕێیان پێشان دەدان، بۆیان دەبوونە سەر مەشق.

ئنجا بۆچی خوا کردنی بە پێشەوا؟ ﴿ لَمَّا صَبَرُوا۟ ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴾، دوای ئەوەی خۆڕاگر بوون و، عادەتیشیان وابوو بڕوایەکی پتەویان بە ئایەتەکانی ئێمە هەبوو، وشەی (**صبر**)ی بە کرداری ڕابردوو هێناوە، چونکە ئەوە تێپەڕیوە، خۆیان ڕاگرت، ئیمانیان هێنا، کردەوەی باشیان کرد، بەڵام ﴿ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴾، عادەتیان وابوو، یەقینیان هەبوو بە ئایەتەکانی ئێمە، لەبەر ئەوەی ئایەتەکان ڕۆژ بە ڕۆژ دابەزیون، بۆیە بە کرداری (**مُضارِع**) هێناویەتی بۆ ئێستاو، بۆ داهاتوو، بۆ بەردەوام بوونە.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوە هەر پەروەردگارتە کە لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، لێکیان جیا دەکاتەوەو، دادوەرییان لە نێواندا دەکات،

﴿ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾، لەوەدا کە تێیدا کەوتبوونە ڕاجیایی، پەروەردگارت کا و دانی مشتومڕەکانیان لێك جیادەکاتەوەو، دادوەرییان لە نێواندا دەکات، کە کێیان چەندەی هەق پێیەو، کێشیان چەندە ڕووی کردۆتە ناهەق؟!.

﴿ أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ ﴾، ئایا بۆی دەرنەخستوون، پێشانی نەداون، ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْقُرُونِ ﴾، ئایا فەوتاندنی ئێمە بۆ ئەو سەدانەی کە لە پێشیانەوە بوون، پێشانی نەداون، کە خوا ﷻ هەمە کارەی گەردوون و ژیان و مرۆڤە؟ دەبووایە پەندی لێوەربگرن، دەبووایە بۆیان ڕوونبکاتەوە، ئەوان ئێستا هەڵەی ئەو گەلە پێشووانە کە فەوتێنراون، بە هۆی کوفر و تاوان و خراپەوە، دووبارە نەکەنەوە، ﴿ يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ ﴾، ئەوانەی ئێستا بە نێو خانووبەرەکانیاندا دەڕۆن، واتە: بەنێو شوێنەوارەکانیان دا، کە هی خانووبەرەکانیانن، هی جێگاو ڕێگاکانیانن، بە نێویان دا دەڕۆن و سەفەر دەکەن، کاتێك سەفەر دەکەن، بە تایبەت سەفەر بۆ شام دەکەن، یان بۆ یەمەن دەکەن، شوێنەوارەکانیان دەبینن، شوێنەواری عادو **ثە**موود و، گەلی لووط و ئەوانی دیکەش، ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ أَفَلَا يَسْمَعُونَ ﴾، لەوەدا نیشانە هەن، ئایا نابیستن؟ نیشانە هەن کە خوا ﷻ لە مرۆڤەکان نەگەڕاوە خۆیان چۆنیان پێخۆشە وابکەن، هیچ سنوورێك نەبێ و هیچ لێپرسینەوەو سزایەك نەبێ، بەڵکو خوا ﷻ ڕستیان بۆ درێژ دەکات، تاکو کاتێکی دیارییکراو، بەڵام سەرەنجام خوا ﷻ وای مامەڵە کردوە لەگەڵ بەشەردا، کە هەندێ خەتی سووری دیارییکردوون، هەر کاتێ ئەو خەتە سوورانە بەزێنران، خوا سزای ئەو گەلە یاخیی و ملهووڕانە دەدا، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَسْمَعُونَ ﴾، ئایا نابیستن؟ دەبووایە کە هەواڵی ئەو گەلانە دەبیستن، لە قورئانداو، دەماو دەم کە دەیبیستن، دەبووایە پەندی لێوەر بگرن، ئایا نابیستن؟ پرسیارکردن، پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: ئەوانە وەك ئەو کەسانە وان، کە هیچ نەبیستن.

لە دوای مێژوو، ئنجا سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ دیاردەی هاتنە خواری ئاو لە ئاسمان و، ڕوانی شیناوردو کشتوکاڵ، لە زەوییەکی قاقڕی ڕووتەنی وشك دا،

دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ ﴾، ئایا سەرنجیان نەداوە، ئایا نەیانبینیوە؟ کە دەگونجێ لێرەدا بینین، بینینی چاو بێ، دەشگونجێ بینینی عەقڵ و دڵ بێ، ئایا نابینن و سەرنجیان نەداوە؟ ﴿ أَنَّا نَسُوقُ ٱلۡمَآءَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡجُرُزِ ﴾، کە ئێمە ئاوەکە دەبەین، لێدەخوڕین، بەرەو زەوییەکی ڕووتەنی بێ کشتوکاڵ، ﴿ فَنُخۡرِجُ بِهِۦ زَرۡعٗا ﴾، ئنجا کشتوکاڵێکی پێدەردێنین لەو زەوییە قاقڕو بێ ئاو وشکهەڵاتوودا، ﴿ تَأۡكُلُ مِنۡهُ أَنۡعَٰمُهُمۡ وَأَنفُسُهُمۡ ﴾، کە ئاژەڵەکان و خۆشیان لێی دەخۆن، لەو کشتوکاڵە، ئەو کشتوکاڵە، دەگونجێ مەبەست پێی کۆی ئەو شتانە بێ کە لەسەر زەوی دەڕوێن، وەك دانەوێڵە، گەنم و جۆو نیسك و نۆك و زوڕات و هەموو ئەو شتانە و، جگە لە دانەوێڵەش، هەموو ئەو شتانەی کە دواجار هەم بۆ ئاژەڵەکان دەبن بە لەوەڕ، بە تەڕیی یان بە وشکیی، هەم بۆ مرۆڤەکانیش دەبن بە مایەی بەهرە لێوەرگرتن و لە بەرهەمەکەیان دەخۆن، بە تایبەت ئەگەر دانەوێڵە بێ، ئەوە دیارەو، ئەگەر میوەکانیش بن، دیارە، هەروەها تەڕەکار و سەوزە، مرۆڤەکانیش لێی دەخۆن و ئاژەڵەکانیش لێیدەخۆن، ﴿ أَفَلَا يُبۡصِرُونَ ﴾، ئایا نابینن، ئایا سەرنج نادەن؟ دیسان لێرەدا، ئایا نابینن؟ پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: دەبووایە ببینن، دیتنیش هەم دەگونجێ دیتنی چاو بێ، هەم دەگونجێ مەبەست پێی زانین و دیتنی عەقڵ و دڵ بێ.

لە کۆتاییی دا خوا ﷻ هەڵوێستێکی زۆرجار دووبارە کراوەی کافرەکان لە سەردەمی هەموو پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) باس دەکات، کە بریتی بووە لە پەلە کردنیان لە هاتنی بەڵێنی خوا، لە هاتنی سزای خوا: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡفَتۡحُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾، هەروەها دەڵێن: ئەو دادوەرییە، ئەو لێکهەڵاواردنە ئەو دادوەریی کردنە لە نێوان مرۆڤەکاندا، کەنگێیە، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن؟ واتە: کاتەکەمان پێ بڵێن، ئەگەرنا مانای وایە ئێوە لە ڕاستان نین؟.

خوای پەروەردگار وەڵامیان دەداتەوە: ﴿ قُلۡ يَوۡمَ ٱلۡفَتۡحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِيمَٰنُهُمۡ ﴾، تۆ بفەرموو: ڕۆژی دادگایی کران و لێکهەڵاواردن و لێك جیاکردنەوەی

پـاك و پیسـان، ئەوانـەی بێبـڕوان، ئیمانەکەیـان سـوودیان پـێ ناگەیەنـێ، ﴿وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾، هەروەهـا مۆڵەتیـش نادرێـن، چاوەڕوانییـان ناکـرێ، بگەڕێنـەوەو پەشـێمان ببنـەوەو، لاپەڕەیەکـی سـپیی هەڵدەنـەوە، ئەگـەر ئێسـتا لـە فریـای خۆیـان بکـەون، ئەگەرنـا ئـەو شـتەی ئـەوان پەلـەی لێدەکـەن، کاتێـك ئـەو حاڵەتـە دێ، کـە بریتیـە: لـە ڕۆژی دوایـی، ئنجـا چ ئاخیـر زەمـان، چ قیامـەت، ئـەو کاتـە ئیمانیـش بێنـن، سـوودیان پێناگەیەنـی، وەك لـە سـووڕەتی (الأنعـام)دا دەفەرمـوێ: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾﴾، واتـە: ئایـا چاوەڕێـی چـی دەکـەن؟ جگـە لـەوەی فریشـتەکان بێـن، یـان پـەروەردگارت بـێ، یـان هەندێـك لـە نیشـانەکانی پـەروەردگارت بێـن، ئـەو ڕۆژە کـە هەندێـك لـە نیشـانەکانی پـەروەردگارت دێـن، هیـچ کەسـێك بـڕوا پێهێنانەکـەی سـوودی پێناگەیەنێ، کـە پێشـتر بـڕوای نەهێنابـێ، یاخـود لـە بـڕوا هێنانەکەیـدا کاری چاکـی نەکردبـێ، خێـر و چاکـەی وەدەسـت نەهێنابـێ، بڵـێ: چـاوەڕێ بـن، ئێمـەش چاوەڕێیـن.

کـە لـە کاتـی تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (الأنعـام)دا، لـە بـارەی واتـای هاتنـی ئایەتەکانـی پـەروەردگارو، هاتنـی پـەروەردگارو، هاتنی فریشـتەکانەوە، ڕوونکردنەوەی باشـمان داوە.

لـە کۆتایـی دا خوا دەفەرمـوێ: ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَٱنتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ﴾، تـۆ پشـتیان تێبکـەو ڕوویـان لـێ وەرچەرخێنـە، چاوەڕێبـە، ئەوانیـش چاوەڕێـن، واتـە: چاوەڕێبـە، کـەی بەڵێنـی خـوا دێـت، ئەوانیـش چاوەڕێـن، کـەی بەڵێنـی خـوا دێـت، کـە بـە تەئکیـد ئـەو کاتـەی بەڵێنی خـوا دێ، ڕۆژی دوایـی دێ، یـان سـەرەتای ڕۆژی دوایـی دێـت، کـە ئاخیـر زەمانـە، یاخـود ڕووداوەکانـی دیکـەی ڕۆژی دوایـی دێـن، کـە قیامەتـە، پاشـان زینـدوو کرانـەوەو هەڵسـێنرانەوەو هاتنەپێشـی لێپرسـینەوەو سـزاو پاداشـتە، ئـەوان زۆر مـاڵ وێـران و ڕەنجـەڕۆ دەبـن، بۆیـە ئەوانـە ئێسـتا پەلـە لـە شـتێك دەکـەن، کـە ئەگـەر بـێ، زۆر تێیـدا تووشـی زیانباریـی دێـن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**باسی کتێب پێدرانی مووساو، ڕێنمایی بوونی بۆ گەلی جوولەکەو، لە دوو دڵییدا نەبوون لە بارەی دیداری مووساوە، بۆ خوای تاك و پاك، هەروەها گێڕرانی کەسانێك لەو گەلە (بەنوو ئیسرائیل)، بە پێشەوا، بە هۆی خۆڕاگریی و بڕوا پتەوییانەوە، بە ئایەتەکانی خوا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٣﴾ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ ﴾، بە دڵنیایی کتێبمان بە مووسادا، ئەو (و)ە، (**واو العطف**)ەو، ئەم بابەتە دەگێڕێتەوە بۆ بابەتەکانی پێشێ، واتە: ئەو شتانەی پێشێ بوون، ئنجا بە دڵنیایی کتێبیشمان بە مووسادا، بۆچی دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ﴾، کە (ل) ی ( **وَلَقَدْ** ) بۆ سوێندە، یاخود ڕێخۆشکەرە بۆ سوێند، (**قَد**)یش بۆ ساغکردنەوە (**تحقيق**) و، دڵنیاکردنەوەیە، بۆچی خوا ﷻ ئەو شێوازە بەکاردێنێ؟ بۆ ئەوەی ئەو گەلەی کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ، بۆیان هاتوە، ئەو خەڵکە کە بە پلەی یەکەم گەلی عەرەب بوون، دواییش هەموو گەلانی دنیا بوون، وەك دوو دڵ و بە گومان بووبن، کە: ئایا دەبێ خوا کتێبی دابەزاندبن؟ موحەممەد ﷺ ئێستا دەڵێ: پەیامی خوام بۆ دێ و قورئانێکم بۆ

دادەبەزێندرێ، ئایا ئەمە ڕاستە؟ بۆیە خوا دەفەرموێ: بە جەختکردنەوەو، بە دڵنیاییەوە ئێمە کتێبمان بە مووساداو، ئەگەر لە هەموو شتێك لە گوماندا بن، کتێبەکەی مووسا زۆر ئاشکرا بووە، ئەوەتا گەلێك هەن، کە ئێستاش بە دوای ئەو کتێبەی مووسا دەکەون، بەڕاست یان بە هەڵە، کە بریتیە: لە گەلی جوولەکە، ئنجا گەلی جوولەکەش لە نیوە دوڕگەی عەرەبییدا بوون، جارێ سێ تیرەی ناوداریان بوون: بەنوو قەینوقاع و، بەنوو نەزیرو، بەنوو قوڕەیزە، کە زۆر ئاشکرا بوون، پاشان جوولەکە لە شوێنەکانی دیکەی دنیاش بوون، بە دڵنیایی کتێبمان بە مووسا دابوو، ﴿ٱلْكِتَٰبَ﴾، کە (أل)ی ناساندنی لەسەرەو بۆ (عَهد)ە، واتە: کتێبەکەمان بە مووسادا، کتێبەکەش مەبەست پێی تەوڕاتە، کەواتە: وەك چۆن کتێبمان بە مووسا ﷺ داوە، کە تەوڕاتە، تاکو بۆ گەلەکەی (گەلی بەنوو ئیسرائیل) بیکاتە چرایەکی ڕێ پێشاندەر بۆیان، بە هەمان شێوە قورئانیشمان بە تۆ داوە، بۆ ئەو خەڵك و کۆمەڵگایەی کە لە نێویاندا دەژی.

٢)- ﴿فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ﴾، ئنجا تۆ لە دوو دڵییدا مەبە، لە دیداری، (المِريَةُ: التَّرَدُّدُ والشَكُّ) **(مرية)**، بریتیە: لە دڵ لە دڵدان و دوو دڵیی، ﴿مِّن لِّقَآئِهِۦ﴾، پێشتریش لە مانای گشتیی دا ئاماژەمان پێدا، زانایان و توێژەرەوانی قورئان لەو بارەوە زۆر مشتومڕیان بووە، ئایا ئەو ڕاناوە ﴿مِّن لِّقَآئِهِۦ﴾، لە دیداری وی دا، ڕاناوەکەی بۆ چی دەچێتەوە؟

أ- هەندێك گوتوویانە: دەچێتەوە بۆ تەوڕات، بۆ کتێب، واتە: دوو دڵ مەبە کە مووسا تەوڕاتی وەرگرتوە، کتێبی وەرگرتوە.

ب- هەندێك گوتوویانە: دەچێتەوە بۆ دیداری پێغەمبەر ﷺ لە شەوی میعڕاج دا لەگەڵ مووسادا، کە پێغەمبەرانی بینیوەو، لە نێویاندا بە تایبەت مووسا، کە دوای ئەوەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: پەنجا نوێژم لەسەر فەڕز کراوە، پێشنیار دەکات بۆ پێغەمبەری خاتەم و ئامۆژگاریی دەکات، لەبەر ئەوە کە لەو ڕووەوە مووسا ئەزموونێکی هەبووە، کە جارێ موحەممەد پێغەمبەری کۆتاییەو، ئەو ئەزموونەی بۆ پەیدا نەبووە، کە داوا لە پەروەردگاری بکات بۆی دابەزێنێ، بۆی کەم بکاتەوە، تاکو دەگاتە سەر

پێنج نوێژ، ئنجا هەندێك گوتوویانە: مەبەست لە (لِقائه) واتە: دیداری پێغەمبەر ﷺ لە شەوی میعراجدا، لەگەڵ مووسادا! بەڵام ئایا ئەم سوورەتی سەجدەیە پێش میعراج بووە، یان دوای ئەو بووە؟ ئەو کاتە ئەوە دیار دەبێ.

ج- هەندێکی دیکە گوتوویانە: لە دوو دڵیی دا مەبە، کە تۆ لە بەهەشت دا مووسا عليه السلام دەبینی.

د- هەندێکی دیکە گوتوویانە: (لِقاء) لێرەدا بە مانای ئەوە دێ، وەك چۆن مووسا تووشی گرفتاریی و چەرمەسەریی زۆر بوو، بە هۆی ئەو کتێبەوە کە خوا پێی دابوو، کە دەیویست کتێبەکە جێبەجێ بکات بەسەر بەنوو ئیسرائیلداو، ئەوانیش لاملییان دەکرد، تۆش ئەی موحەممەد ﷺ! دوو دڵ مەبە: بە هۆی ئەو کتێبەوە کە بۆت دابەزێنراوە، تووشی گرفتاریی و چەرمەسەریی و ناڕەحەتیی دەبی، ئەوەتا ئەوانە بڕوا بە کتێبەکەت ناکەن و، خۆیشت بە جادووگەر دەزانن، کتێبەکەشت بە شیعرو بە جادوو دەزانن، کەواتە: دوو دڵ مەبە، کە تۆش ئەم حاڵەتەت بەسەر دێ، یان بە هۆی ئەوەوە، کە ئەوە حاڵەتەت بەسەر دێ، دوو دڵ مەبە.

بەڵام ئەوەی من بە دڵمەوە دەنووسێ، هیچ کام لەو ڕایانە نیە، کە هەموو تەفسیرەکان ئەو ڕایانەیان هێناون.

من ڕایەکی دیکەم بە دڵە، ئەویش ئەوەیە کە مەبەست لە: (لِقاء)، لە: ﴿فَلَا تَكُن فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآئِهِۦ﴾، تۆ دوو دڵ مەبەو لە گوماندا مەبە، خەتەرە نەچێتە دڵت، لەوەدا کە مووسا عليه السلام دیداری بووە لەگەڵ خوادا سبحانه وتعالى، وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا، دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ...﴿١٤٣﴾﴾، بۆچی ئەم ڕایەم هەڵبژاردووە؟.

چونکە ئەو ڕووداوە ڕووداوێکی زۆر گەورەو گرنگ بووە لە ژیانی مووسادا، کە بریتی بووە لەوەی مووسا لەو دیدارەدا، تەوڕات وەردەگرێ لە خوا سبحانه وتعالى، وەك چۆن موحەممەدیش ﷺ قورئانی لە خواوە بۆ دێ، مووساش تەوڕاتی وەرگرت لەو

دیدارەیدا لە خزمەت پەروەردگاردا، دوای ئەوەی خوا ژوانگەیەکی بۆ دیاریکردوە، بەڵێنگەیەکی بۆ دانا، دوای سی (٣٠) شەو، کردی بە چل (٤٠) شەو.

هەڵبەتە ئەو شتانەی خوا بە پێغەمبەری خاتەمیان ﷺ دەفەرموێ: دوو دڵ مەبە، یان ئەوە مەکە، یان وامەچۆ، هەم مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەر خۆی زیاتر دڵی دابمەزرێ، هەم مەبەستیش ئەوەیە بۆ شوێنکەوتووانیشی ڕێنمایی بێ، وەك گوتراوە: (دیوار لەگەڵ تۆمە، گوێ سوانە گوێت لێبێ)، جاری واش هەیە شتێك بە پێغەمبەر ﷺ دەگوترێ، بەڵام لەبەر ڕاهاویشتن و کنارەیە بۆ خەڵکەکە کە لە نێویاندا ژیاوە، بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە، بە تایبەت نامسوڵمانەکان، واتە: وەك چۆن ئەوان لە دوو دڵیی دان، تۆ دوو دڵ مەبەو وەك ئەوان مەبە، کە وەك وانیش نەبووی.

٣)- ﴿ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، هەروەها ئێمە ئەو کتێبەمان گێڕا بە ڕێنمایی بۆ بەنوو ئیسرائیل، دەشگونجێ ڕاناوەکە بۆ مووسا بچێتەوە، یانی: مووسامان کردە ڕێنماییکارو ڕێ پێشاندەر بۆ بەنوو ئیسرائیل، هەردووك واتای هەر ڕاستن، بەڵام زیاتر واپێدەچێ ڕاناوەکە بۆ کتێبەکە بچێتەوە، کە تەوڕاتە.

٤)- ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا ﴾، ئێمە پێشەوایانێکمان تێدا پەیداکردن، [لە نێو بەنوو ئیسرائیلدا]، کە بە فەرمانی ئێمە، ڕێنماییان دەکرد، واتە: ڕێنمایی خەڵکیان دەکردو خەڵکیان دەخستە سەر ڕاستە ڕێ و ڕێیان پێشان دەدان.

بەڵام بۆچی خوا ﷻ هەندێك لەوانەی گێڕان بە پێشەوا، هەر لە گۆترە؟ نەخێر.

٥)- ﴿ لَمَّا صَبَرُوا۟ ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴾، لە ئەنجامی ئەوەدا کە خۆڕاگرییان کردو، بڕوایەکی پتەویشیان هەبوو بە ئایەتەکانی ئێمە، ئایەتەکانی ئێمە، لێرەدا زیاتر واپێدەچێ مەبەست پێی ڕستەکانی فەرمایشتی خوا بێ، ئەگەرنا وشەی (آيات) وەك زۆرجار گوتوومانە: سێ واتایان هەڵدەگرێ لە قورئاندا:

**أ-** بە مانای دیاردە سرووشتییەکان، دێ، وەك لە سوورەتی (یوسف)دا دەفەرموێ: ﴿ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾، واتە: زۆر نیشانە هەن لە ئاسمان و زەویدا بە لایاندا ڕەت دەبن، بەڵام پشتیان تێدەکەن، پەندیان لێ وەرناگرن.

**ب-** هەروەها (**آيات**) بە مانای موعجیزەی پێغەمبەرانیش دێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ ﴾**الإسراء**، واتە: ئێمە نۆ ئایەتمان بە مووسا دابوون، واتە: نۆ نیشانە، نۆ موعجیزە.

**ج-** هەروەها (**آيات**) بە مانای ڕستەکانی فەرمایشتی خواش دێت، کە بە زۆریی لە قورئاندا بەو واتایە هاتوە.

ئەوانەی کە کرانە پێشەواو سەر مەشق لە نێو گەلی بەنوو ئیسرائیل دا، لە ئەنجامی ئەوەدا بوو، کە دوو سیفەتی سەرەکییان تێدابوون:

**یەکەم:** خۆڕاگر بوون، لە ڕووی کردەییەوە.

**دووەم:** لە ڕووی تیۆرییشەوە، خاوەنی بڕوایەکی پتەو بوون، خاوەنی دڵنیایی بوون، بە ئایەتەکانی خوا، زانایان گوتوویانە: (**بِالصَّبرِ وَاليَقِين، تُنَالُ الإمَامَةُ فِي الّدِين**)، بەهۆی خۆڕاگریی و یەقینەوە، پێشەوایەتیی لە دیندا دەستەبەر دەبێ، هەڵبەتە یەقین پێش خۆڕاگریی دەکەوێ، پێشێ مرۆڤ دەبێ یەقین و دڵ دامەزراویی و بڕوا پتەویی هەبێ بە ئایەتەکانی خوا، بە پەیامی خواو، دوایی پێویستیی بە خۆڕاگریی دەکات، بۆ ئەوەی ئەو پەیامەی خوا جێبەجێ بکات و پراکتیزە بکات لە ژیانی تایبەتیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی دا، بەڵام ئایا لێرەدا بۆچی خوا ﷻ صەبری پێشخستوە؟ لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەوەی زۆر گەورەو گرنگە بریتیە: لە خۆڕاگریی، لەبەر ئەوەش کە ئەو سیاقەی کە ئەم فەرمایشتەی تێدا هاتوە، هەمووی ڕێنماییە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺو، بۆ هاوەڵانی بەڕێزی و، بۆ شوێنکەوتووانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ تاکو ڕۆژی دوایی، ئنجا ئەوان لە هەموو شتێك زیاتر پێویستییان بە خۆڕاگریی و پشوو درێژیی و، نەپسان و، نەلەخشان بووە.

## مەسەلەی دووەم:

**دادوەریی کردنی خوا لە نێوان مرۆڤەکاندا لە ڕۆژی قیامەت دا، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونە ڕاجیاییەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ  ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوە بەس پەروەردگارتە کە لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، دادوەرییان لە نێواندا دەکات، لە نێوان کێدا؟:

أ- دەگونجێ بگوترێ: لە نێوان هاوبەش بۆ خوا دانەراندا.

ب- یاخود: لە نێوان خاوەن کتێبەکان (جوولەکەکان و نەصرانییەکان)دا.

ج- بەڵام ئەگەر بشگوترێ: ﴿ بَيْنَهُمْ ﴾، واتە: لە نێوان مرۆڤەکاندا بە گشتیی، چ خاوەن کتێب بووبن، چ موشریك بن، چ بڕوادار بن، هەر جۆرێك بن، ئەو واتایەش هەر گونجاوە.

لە چییدا دادوەرییان لە نێواندا دەکات، لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا؟.

٢)- ﴿ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾، لەوەدا کە تێیدا کەوتبوونە ڕاجیایی و ڕاجیاییان تێیدا هەبوو.

کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ﴾، (هو) پێی دەگوترێ: (**ضَمِيرُ الفَصل**)، ڕاناوی لێك جیاکردنەوە، بۆ ئەوەیە کردەوەکە لەسەر خوای بەرز کورت هەڵبێنێ، واتە: تەنیا پەروەردگارت خۆی لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، دادوەرییان لە نێواندا دەکات، لەو شتانەدا کە تێیدا کەوتوونە مشتومڕو ڕاجیاییەوە.

(**الفَصلُ: القَضَاءُ وَالحُكم**)، (**فصل**) یانی: دادوەریی و بڕیاردان، هەڵبەتە ئەگەر مەبەست پێی گەلی مووسا ﷵ بێ، بەنوو ئیسرائیل بێ، کە واپێدەچێ، چونکە ئەوان نیزیکترین باسکراون و، عادەت وایە: (**الضَّمِيرُ يَرْجَعُ إِلَى أَقْرَبِ مَذْكُور**)، ڕاناو بۆ نیزیکترین باسکراو دەچێتەوە، نیزیکترین باسکراویش گەلی مووسایە، بەنوو ئیسرائیل، کە دواتر بە گەلی جوولەکە ناسراون، ئەگەرنا لە ئەصڵدا بەنوو ئیسرائیل واتە: وەچەی ئیسرائیل، وەچەی یەعقووب ﷵ، بەڵام دوایی وەك گەلێك ناویان لێنراوە: گەلی جوولەکە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ڕاجیایی گەلی بەنوو ئیسرائیلی خستوونە نێو حاڵەتێکەوە، کە ئەو هیدایەت و ڕێنماییەی بۆیان هاتوە، بەشێکی هەڵبوەشێننەوەو لێی لابدەن!

کە بە تەئکید لێرەدا مەبەست لەو ڕاجیاییە، ڕاجیایی نیە لە لقەکانی دینداریدا، چونکە لق و پۆپەکانی دینداریی خوای پەروەردگار وای هەڵخستوون، چ لە شەریعەتی پێغەمبەری خاتەمدا، چ لە شەریعەتەکانی دیکەدا، ڕاجیایی و ڕای جیاواز هەڵبگرن، کەواتە: ئەوە حاڵەتێکی ناپەسندو خراپ نیە، مادام کەسێك بۆ ڕایەکەی خۆی بەڵگەیەکی پێبێ و پشت ئەستوور بێ بە بەڵگەیەك، هەڵبەتە لقەکانی دینداریی زیاتر لە بۆچوونێك و ئیجتیهادێك هەڵدەگرن، بەڵکو لێرەدا مەبەست لە: ﴿فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾، واتە: ئەوانەی کە لە ئەصڵی دیندا لایانداوە، لە ئیمان و عەقیدەدا، لە حەلاڵ و حەڕامە سەرەکییەکاندا، یاخود مەبەست لە: ﴿فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾، ئەوەی تێیدا کەوتوونە ڕاجیاییەوە، یانی: بڕواداران و بێبڕوایان، کە بڕواداران بڕوایان بە ڕێنمایی خوا بووەو، بێبڕوایان، پێی بێبڕوا بوون و نکووڵییان لێکردوە، کە ئەوەش هەر دەکاتەوە ڕاجیایی، ئەمەش بێگومان ئاگادار کردنەوەیەك بووە بۆ ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ کە خۆیان بپارێزن لە ڕاجیایی خراپ، ڕاجیایی زەمکراو، کە بریتیە لە ڕاجیایی لە بنچینەکانی دینداریدا، یاخود لە لق و پۆپەکانی دینداریدا، بەڵام بەبێ بەڵگە، هەروا بە شوێنکەوتنی ئارەزوو، کە بێگومان ئەوەش هەر شتێکی سەرزەنشتکراوو خراپە.

مەسەلەی سێیەم:

**سەرنج ڕاكێشان بۆ مێژووی گەلانی پێشوو، كە خوا فەوتاندوونی و ئەمان (ئەوانەی یەكەم جار قورئانیان بەسەردا خوێنراوەتەوە)، كە بە شوێنەوار و خانووەكانیاندا دەڕۆن، دەبووایە پەندیان لێوەر بگرن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ ۖ أَفَلَا يَسْمَعُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

**١)-** ﴿ أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْقُرُونِ ﴾، ئایا ئەو هەموو سەدانەی پێش وان فەوتاندوومانن، ڕێنمایی نەكردوون؟! چۆن لەگەڵ بێبڕوایان دا مامەڵ دەكەین؟!

(يَهْدِ لَهُمْ ) خوێندراویشەتەوە: (**أَوَلَم نَهْدِ لَهُم**)، ئایا پێشانمان نەداون، یان ئایا خوا پێشانی نەداون، هەمزە (أ) بۆ پرسیاركردنی نكووڵیلێكردنە، ڕاناوی ﴿ لَهُمْ ﴾، دەچێتەوە بۆ تاوانباران، یاخود بۆ ئەوانەی كە ئایەتەكانیان بیرخراونەوە، وشەی: ﴿ يَهْدِ ﴾، لە هیدایەتەوە هاتووە، یانی: ڕێ پێشاندان، بەڵام مانای (**يُبَيِّنُ**) ی، تێخراوە، (**ضُمِّنَ مَعْنَى يُبَيِّنُ**)، بۆیەش بە (ل) بەركاری خواستووە، ﴿ أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ ﴾، ئەگەرنا كار (فعل)ی (**هَدَى**)، بۆ خۆشی بەبێ پیتی دیكە بەركار دەخوازێ، (**هَدَاهُ، يَهدِيهِ**)، واتە: ڕێی پێشاندا، ڕێی پێشان دەدات.

(**الطبري**) لە تەفسیرەكەی خۆیدا[1]، ئاوا مانای ئەو ڕستەیە دەكات: (**أَوَلَم يُبَيِّن لَهُم إِهْلَاكُنَا القُرُونَ الخَالِيَة مِن قَبلِهِم: سُنَّتَنا فِيمَن سَلَكَ سَبِيلَهُ مِنَ الكُفرِ بِئايَاتِنا، فَيَتَّعظُوا وَيَنزَجِرُوا**)، واتە: ئایا بۆی ڕوون نەكردوونەوە فەوتاندنی ئێمە بۆ گەلە پێشووەكان، كە لە پێش واندا بوون: یاسای ئێمەی بۆ ڕووننەكردوونەوە،

---

(١) جامع البيان: ج٢١، ص١٤٧.

کە هەر کەسێك وەك ئەوان بکات، لە کوفر بە ئایەتەکانی ئێمە، هەمان شتیان بەسەر دێ، ئیدی پەند وەربگرن و، بپرینگێنەوەو بسڵەمنەوە، [لەوەی کە وەك وان بکەن، تاکو بە مەرەدی وان نەچن]؟

٢)- ﴿يَمۡشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمۡ﴾، بە خانوو و بەرەکانیاندا دەڕۆن، ئەمە حاڵە، لە بکەر (فاعل)ی ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ﴾، ئایا ئەوانەی ئەو پرسیارەیان لێدەکرێ نەیانبینیوە لە حاڵێك دا بە جێگاو ڕێگاو خانوو و بەرەو شوێنەواری ئەو گەلە پێشووانەدا دەڕۆن، کە خوا فەوتاندوونی؟.

٣)- ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍۚ أَفَلَا يَسۡمَعُونَ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانە هەن، ئایا نابیستن؟ ئەم پرسیار کردنەش:

أ- دەگونجێ بڵێین: نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: ئەرێ نابیستن؟.

ب- یاخود پرسیارکردنێکی سەرزەنشتکارانەیە، بۆچی نابیستن؟ لێرەدا دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَسۡمَعُونَ﴾، چونکە دەنگ و باسی مێژوو مرۆڤ لە ڕێی بیستنەوە، بۆی دەستەبەر دەبێ، دەبێ هەواڵەکان ببیستێ، لە قورئان، لە کتێبە پێشووەکانی دیکەی خوا تباك و تعالى، لە مێژووی تۆمار کراو، دەبێ هەواڵەکە ببیستن، ئەوجار تێبگەن و بزانن چی گوزەراوە؟.

**مەسەلەی چوارەم:**

**سەرنج ڕاكێشانیان بۆ دیاردەی ڕووانی ڕووەك و شیناورد، بە هۆی ئاوەوە، لە زەوییەكی ڕووتەن و وشك دا، كە مرۆڤەكان و ئاژەڵەكان لەو شیناوردو ڕووەكە دەخۆن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ أَفَلَا يُبْصِرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:**

١)- ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا ﴾، ئایا نەیاندیوە كە ئێمە ئاو بەرەو زەوییەكی ڕووتەن لێدەخوڕین، ئنجا ڕووەكێكی پێ دەردێنین! ئایا نەیانبینوە، یاخود: ئایا سەرنجیان نەداوە بە چاوی عەقڵ و دڵ؟ كە ئێمە ئاو لێدەخوڕین، ئاو دەبەین، (**سوق**): بریتیە لەوەی كەسێك بە پێیان بڕوا كەسێكی دیكە لە پشتیەوە دەنگی بداو لێی بخوڕێ، یاخود پێش خۆی بدات.

﴿ الْأَرْضِ الْجُرُزِ ﴾، زەوییەكی قاقڕو ڕووتەن، (**الجَرْزُ: القَطعُ**)، بڕین، ﴿ الْأَرْضِ الْجُرُزِ ﴾، زەوییەك ڕووتەن بووبێ و شیناوردو كشتوكاڵ و ڕووەكی لەسەر نەما بێ، وشەی (زَرع)یش، ڕووەكێكی دەستنێژە، وەك دارو درەخت، یان چێنرابێت وەك دانەوێڵە، هەندێكیش لە شارەزایانی زمان دەڵێن: (زَرع) هەر شتێكە بڕوێ، چ مرۆڤ ڕواندبێتی، وەك دانەوێڵەو كشتوكاڵ و تەرەكار، چ بۆ خۆی ڕوابێ و خوا ڕسك بێ، هەڵبەتە ئەوەی مرۆڤیش دەیچێنێ، هەر خوا دەیڕوێنێ، بەڵام مەبەست ئەوەیە: چ ڕوانی، دەستی مرۆڤی تێدا هەبێ، چ دەستی مرۆڤی تێدا نەبێ و خواڕسك بێ.

(الطبـری) لـە تەفسـیرەکەیدا[١]، ئـاوا مانـای ئـەو ئایەتـە دەکات، دەڵـێ: (نَسُـوقُ المـاءَ إِلَـى الأَرْضِ اليَابِسَـةِ الغَلِيظَـةِ الَّتِـي لا نَبَـاتَ فِيهَـا)، ئـاو لێدەخوڕیـن و دەیبەیـن، بـەرەو زەوییەکـی وشـکی ڕەق و پتـەو، کـە ڕووەکـی تێدانیـە.

٢)- ﴿فَنُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا﴾، کشتوکاڵێکی پێ دەردێنین، یان: ڕووەکێکی پێ دەردێنین.

٤)- ﴿تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَٰمُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ﴾، هەم ئاژەڵەکانیان لێی دەخۆن، هەم خۆشیان لێی دەخۆن.

بۆیـەش هەندێـك لـە شـارەزایانی زمـان گوتوویانـە: (زَرع) هـەر شـتێکە لەسـەر زەوی بـڕوێ، چونکـە ئـاژەڵ زیاتـر لـەوە دەخـۆن کـە خواڕسـکە، بـەڵام ئـەوەی مـرۆڤ بـۆ خـۆی دەیچێنـێ، وەك درەخـت دانەوێڵـەو تـەڕەکار، ئـاژەڵ لێـی ناخـۆن، بـەڵام دەشـگونجێ بڵێیـن: ئاژەڵەکانیـش دوایـی لێـی بەهرەمەنـد دەبـن و لـە کاو پووشـەکەی، مرۆڤەکانیـش دەنکەکـەی دەخـۆن، وەك گەنـم و جـۆو نیسـك و نـۆك و هـەرزن و مـاش و برنـج و ...هتـد، یاخـود: (زَرع) هـەر شـتێکە لەسـەر زەویـی بـڕوێ، کـە هەندێکـی بـە کەڵکـی ئـەوە دێ مـرۆڤ لێـی بخـوات و، هەندێکیشـی بـە کەڵکـی ئـەوە دێ ئـاژەڵ و ژیانـداران لێـی بخـۆن.

هەڵبەتـە لـە هەنـدێ شـوێنانیش وێنجـەو سـێپەڕە دەچێنـن، وەك ئاڵـف (عَلَـفْ) بـۆ ئـاژەڵ.

٣)- ﴿أَفَلَا يُبْصِرُونَ﴾، ئایا نابینن؟ هی پێشێ فەرمووی: ﴿أَفَلَا يَسْمَعُونَ﴾، چونکە هەواڵەکانی مێژوو بە گوێ دەبیسترێن، دەبێ مرۆڤ بیانبیستێ، بەڵام ئەمەیان دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يُبْصِرُونَ﴾، ئایا نابینن؟ هەم بە چاوی سەر، هەم بە چاوی عەقڵ و دڵ، یانی: ئەگەر سەرنج بدەن، دەزانن کە ئەو دیاردەی ناردنی ئاوو، دابەزاندنی ئاو لە ئاسمانەوەو، ڕواندنی ئەو هەموو ڕووەك و کشتوکاڵ و دانەوێڵەو هەزاران جۆرە ڕووەك، ئەوە دیارە دەستی خوایەکی پەروەردگاری تێدایەو هەر لە خۆوە نیە.

---

(١) جامع البيان: ج٢١، ص١٤٨.

## مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:

**پرسیارکردنی بێبڕوایان لە بارەی قیامەت و دادوەریی کردنی خوا تێیداو، وەڵامدانەوەیان بەوە کە لە ڕۆژی دادوەرییدا، ئیمان هێنانیان بێ سوودەو، مۆڵەتیش نادرێن و چاوەڕێش ناکرێن، فەرمانکردنیش بە پێغەمبەر ﷺ کە لێیان بگەڕێ و، چاوەڕێ بێ و، با ئەوانیش چاوەڕێ بن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْفَتْحُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٨﴾ قُلْ يَوْمَ ٱلْفَتْحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِيمَٰنُهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَٱنتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴿٣٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

**١)-** ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْفَتْحُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾، هەروەها بێبڕوایەکان دەڵێن: ئەو دادوەرییە کەنگێیە ئەگەر ئێوە ڕاستن! **(فَتح)** هەم بە مانای **(نصر)** دێ، واتە: ئەو سەرخرانەی ئێوەو، هەم بە مانای **(قَضاء)**یش دێ، واتە: ئەو دادوەرییە، بێبڕوایەکان دەڵێن: کە ئەو یارمەتییە کە ئێوە دەڵێن: ئێمە سەردەکەوین و ئەو ئایینە سەر دەکەوێ، کەنگێ دێ؟ یاخود ئەو دادوەرییە، کەی دێ؟.

یانی: بۆمان ڕوونبکەنەوە کەنگێیەو چۆنە؟!.

**٢)-** ﴿قُلْ يَوْمَ ٱلْفَتْحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِيمَٰنُهُمْ﴾، بڵێ: ڕۆژی دادوەریی بڕوای بێبڕوایان سوودیان پێناگەیەنێ.

بەس ئەوەندەیان پێ بڵێ، وەڵامیان ناداتەوە کەی دێ؟ چونکە لە چەندان ئایەت دا فەرموویەتی: ڕۆژی دوایی **(ساعة)** لێت دەپرسن، کەی دێ؟ [**(ساعة)** بە مانای ئاخیر زەمان دێ و بە مانای قیامەتیش دێ]، ﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ...﴿١٨٧﴾﴾**الأعراف**، بڵێ زانیارییەکەی لە لای پەروەردگارمە، جگە

لـه خـۆی کـەس دەری ناخـات، لـە چەنـد شـوێنان ئـەوە دووبـارە بۆتـەوە، بۆیـە لێـرە وەڵامـی ئـەوە ناداتـەوە، کەنگـێ دێ؟ چونکـە کاتەکـەی نادیـارە، بـەڵام دەفەرمـوێ: بڵـێ: ڕۆژی دادوەریـی یاخـود: ڕۆژی سەرخسـتنی ئەهلـی ئیمـان و سـەر خسـتنی ئیسـلام، بێبڕوایـان بـڕوا هێنانیـان دادیـان نـادات، لـە فریایـان نایـەت.

٣)- ﴿وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ﴾، هەروەها ئەوان چاوەڕێش ناکرێن، مۆڵەتیش نادرێن، ﴿وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ﴾، (**أَي: وَلا هُم يُمهَلُون**)، یاخود (**وَلا هُم يُنتَظَرُون**)، مۆڵەت نادرێن، یاخود چاوەڕوانییان ناکرێ، وەك پێشتر لە مانای گشتییەکەش دا گوتمان، لە سوورەتی (**الأَنعام**) یش دا، هەمان ڕاستیی هێناوە، کە دەفەرموێ: ﴿هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ يَأۡتِيَ رَبُّكَ أَوۡ يَأۡتِيَ بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَۗ يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفۡسًا إِيمَٰنُهَا لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ أَوۡ كَسَبَتۡ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيۡرٗاۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓاْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ١٥٨﴾.

لێـرەش بـە هەمـان شـێوە دەفەرمـوێ: ئایـا چاوەڕێـی چـی دەکـەن، جگـە لـەوە کـە فریشـتەکانیان بێنـە لا، یـان پـەروەردگارت بـێ، یـان هەندێـك لـە نیشـانەکانی پـەروەردگارت بێـن؟ ڕۆژێـك کـە هەندێـك لـە نیشـانەکانی پـەروەردگارت دێـن: نەفسـێك کـە پێشـتر ئیمانـی نەهێنـا بـێ، یاخـود کـردەوەی باشـی بـە هـۆی ئیمانەکەیـەوە نەکردبـێ، ئێسـتا ئیمـان هێنانـی دوای دەرکەوتنـی نیشـانەکانی خـوا، یـان دوای هاتنـی ڕۆژی دوایـی، ئـەو جـۆرە ئیمـان هێنانـە سـوودی پـێ ناگەیەنـێ.

٤)- ﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَٱنتَظِرۡ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ٣٠﴾، ئنجا ڕوویان لێوەرگێڕە، ڕوویان لێ وەرچەرخێنەو، چاوەڕێبە، ئەوانیش چاوەڕێن.

(ڕوویـان لێوەرگێـڕە)، لێـرەدا مەبەسـت ڕوو لێوەرگێڕانـە لـە شـەڕە قسـەو مشـتومڕ لەگەڵیانـدا، نـەك ڕوو لێوەرگێڕانـێ کـە بانگیـان نـەکات و ئامۆژگارییـان نـەکات و، ڕێنماییـان نـەکات، واتـە: ڕوویـان لێوەرگێـڕە لـە کاتێـك دا کـە هـەر دەیانـەوێ مشـتومڕو شـەڕە قسـە بکـەن، لەگەڵیـان مەچـووە نێـو شـەڕە قسـەو مشـتومڕەوە.

﴿إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ﴾، ئەوانیش چاوەڕێن، واتە: چاوەڕێ بە، تاکو ئەوەی ئەوان نکوولّیی لێدەکەن، دێ، ئەوانیش هەر چاوەڕێن، کە بە دڵنیایی ئەوان ئەگەر قیامەتی گەورەش نەبینن، قیامەتی گچکە کە مردنی خۆیانە، دەیبینن و بینیشیان.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، کە خۆمان بڕازێنینەوە بەو سیفەتە بەرزو خەسڵەتە پەسندو چاکانەی، کە بۆ ئەهلی ئیمانی لەم سووڕەتەدا باسکراون، یارمەتییشمان بدات خۆمان بپارێزین، لەو خوو و خەسڵەت و ئاکارو ڕەفتارە بەدانەی، کە نەیارانی خوا لەم سووڕەتە موبارەکەداو، لە سووڕەتەکانی دیکەی قورئاندا، پێیان پێناسە کراون.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# نێوەڕۆک

**تەفسیری سووڕەتی (لقمان)**

## تەفسيرى سووڕەتى (لقمان)